بەرگی یەکەم

أ - خ

# ئەلمونجید

## بە کوردی

فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە






وەرگێرانی

جەلال مەحمود عەلی سوبحانی

# ئەلمونجید

## بە کوردی

## فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە

بەرگی یەکەم

أ - خ

وەرگێڕانی

جەلال مەحمود عەلی سوبحانی

ناوی کتێب: ئەلمونجید بە کوردی - بەرگی یەکەم
فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە
وەرگێڕ: جەلال مەحمود عەلی سویحانی
تایپو مۆنتاژ: جەمال دەروێش
چاپی یەکەم - کوردستان - سلێمانی
تیراژ: ٥ هەزار دانە
ژمارەی سپاردن: ١٧٤٦
نرخ: ٢٠ هەزار دینار
چاپخانەی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم
www.serdam.org

## پێشکەش

پێشـــکەش بە گیانی پاکی هەموو ئەو مامۆســـتا گـــەورە کۆچکردوانە بێت و هەموو ئەو مامۆســـتا تەمەن درێژانە بێت کە نەتـــەوە خوازییان گرێکی وا گەرمی خزمەتی نەتەوەکەیانی خســـتە دڵیانەوە کە شـــەو بخەنە سەر ڕۆژ و ئەو ســـەرچاوانە بەرهەم بهێنن و بیکەنە چراوگێك کە من و گەلێکیتری وەك من ڕێگەی خزمەتی نەتەوەکەمانی پێدەربکەین هەروەها پێشـــکەش بەلاوانی نەتەوەکەم بێت و هەموو ئەو دڵســـۆزانە بێت کە دەیانەوێت لەوشەی ڕەسەنی کوردی کەڵك وەربگرن، پێشـــکەش بە گشت ئەو ڕۆشنبیرانە بێت، کە جگەریان بە نەتەوەکەیان ســـووتاوەو دەســـووتێتو لە پێناوی پێگەیشتنی نەتەوەکەیان شەویان خستۆتە سەر ڕۆژو وشەی کوردیان برەو پێداوەو ڕۆشنبیریی کوردیان خەملاندووەو دەیخەملێنن.

جەلال

# بسم الله الرحمن الرحيم

## مقدمة

بسم الله الرحمن الرحيم قالَ تعالى في كتابه الحكيم "وجعلناكم شعوباً وقَبائِلَ لتعارفوا" ومن آياته "خلق السماوات والأرض وآختلاف ألسنتكم والوانكم إن في ذلك لآيات للعالمين (ص)". إذن فاللغة وسيلة مباركة للتفاهم والمحبة والتعاون على البر والخير لذا على الأمم أن تنظم علاقاتها فيما بينها بواسطه لغاتها ويتعلم بعضها لغة البعض بغية التفاعل والتواصل الثقافي بين الأمم. وقد خدم الكرد منذ دخولهم الاسلامَ الدينَ الحنيفَ واللغة العربيـة فَألَّفوا بالعربية آلاف الكتب في الدين والفقه والآداب واللغة وبرز منهم فطاحل العلماء والأُدباءِ والشعراءِ واللغويين. ومَن يريد آلتَّحَقُّق من ذلك فاليتصفح كتب التأريخ العربى والإسلامي والآداب والعلوم الدينيه والدنيوية المختلفه. فالكرد كانوا ولايزالون من اكثر الشعوب الاسلامية إخلاصاً لدينهم. فكانَ مِن صلاح الدين ما كانَ.

فانتقمت الدول الاستعمارية مِن أحفاده الكرد، فقسمت كردستانهم إلى ماهي عليه الآن، كما انتقمت من العرب بزرع الكيان الإسرائيلي في قلبه. فللكرد تراث شامخ مِن تأريخ وأدب وتراث شَعْبيٌ مُدَوَّن من قبلهم باللغات الثلاث العربية والتركيه والفارسية. فَحَريٌ بمثقفي الكرد أن يتقنوا هذه اللغات ليكتشفوا ماكان لأجدادهم مِن الثقافة والعلوم بهذه اللغات الثلاث. هذا مِن جانِب ومِن جانب آخر، فنحن الكرد نعيش في وطن مُغلق وبواباتنا للإتصال بالثقافات الأخرى هي عَن طريق هذه اللغات الثلاث، لذا يجب أن تكون لَنا معاجمَ مشتركه مع هذه اللغات، لتساعدنا على إستعادة مالنا في هذه اللغات الثلاث أولاً وعلى الاستفادة من تطورات العالم الخارجي ثانياً. ولقد عانينا نحن في دراستنا باللغة العربية الكثير الكثير حيث لم تكن هناك معاجم مشتركه تساعدنا في تعلمنا ودراستنا. بسبب هذه العوامل جميعها فقد تكونت لديَ ومنذ شبابي قناعة حاجتنا الماسة الى معجم (عربي- كردي) شامل، فوجدت ضالتى المنشودة في معجم (المنجد في اللغة) لمؤلفه (الاب لويس معلوف) لشموليته. فاشتغلت فيه منذ شبابى، وفى الستينات القرن الماضي، ولكن الظروف القاهرة التى مرت بها كردستان، وظروفي الصحية كانت عائقة فمنعتنى مِن المضي في إتمام فكرتى. وفى التسعينات أَعدتُ الكرة ثانية فساعدنى إستقرار كردستان على المضي في العمل فاتممتُ ترجمة المنجد إلى الكردية في إحدى عشرة سنة، مِن الكَدِّ والأناة والمشقه في ظل ظروف صحية وعائلية شاقة. فاشتغلت ليلاً ونهاراً سبعَ ساعاتِ مضنية يومياً، أتصفح المعاجم والمصادر واستنجد بالأساتذة والمختصين في العلوم، وأهل المهن وأشاورُ وأناقِش واستفسر

وأتصفح الكتـب والمجلات والجرائد بَحثاً عن معنىً صحيح. حتى تحقق لي بفضل الله تعالى وعونه حُلمي الكبير والعزيز على نفسـي فأكملـتُ الترجمة. فأرجو اَن اَكونَ قد خدمتُ بها أُمّتي وأَخوتي من العرب الذين يحبونَ لغتي الكردية الجميلة. والآن ينبغي اَن أُشير الى هذه الملاحظات في اعداد هذه الترجمة.

١-المصطلحات الموجودة في الترجمة هي نفس المصطلحات الموجودة في المنجد

٢-طريقة إستعمال المنجد المترجم هي نفس طريقة استعمال المنجد الأَصلي.

٣-تسـهيلاً لفهم معاني الكلمات والتعابير والجمل وبعد إستشـارة الأَسـاتذة والمختصيين والملمين باللغة العربية أَخرت مصدر الفعل أو المفعول به في الجملة ووضعتها في نهاية الجملة مثل بَحَثَ. بَحثاً-هُ. أَي الفعل ثم المفعول به أو المصدر المطلق فكتبت الجملة هكذا (بَحَثَ- هُ بَحثـاً) مثالُ آخـر: حَجَمَ. حجماً النارَ. فكتبتها: حَجَمَ النار حجماً لأَن هذا الترتيب أَقرب إلى الفهم.

٤-أمـا الكلمات الموجـوده في الملحق فرأيت مـن الأفضل وضعها في متـن المنجد والحاقها بكلمتهـا وكتبت كلمة (الملحق) إشـارة لذلك وفي نهايته وضعت خطـاً لذلك تميزاً عن التي تأتي بعده.

٥-النقطتان (:) بعد الكلمة الأولى تفصل الكلمة عَن معناها أوشرحها.

٦-في المنجـد علامـة الخط العمودى (|) تقوم مقام (المفسـرة سـابقاً) وتغني عَن تكرار كتابتهـا. ولكنـي بدلاً مِن تلك العلامة وضعت أَرقاماً لهذه المعانـي نحو: البَداة (ج) بَدَوات: أَلكَمْأة | التراب.

١: دومـەڵان :٢: خـاك. مثال آخر: الرَّوح: الفَـرَح | الراحة | الرحمة: ١: دڵخۆشـی: ٢: حەسانەوەو ئاسوودەیی: ٣: بەزەیی / دڵنەرمیی.

٧-الخط المائل (/) يعني ترادف المعاني الكردية مثل: بَشَّ وبَشّاً وبَشاشَةَ: رووی خۆشبوو / رووی کرایەوە / رووی گەشبوو.

٨-العلامـة (-) تقـوم مَقامَ الفعل المُفَسَّـر والمكرر في الجمل وتغني عَـن تكراره كما هو متبـع في المنجد نحوَ: أَشـكَلَ الأَمرُ: إلتَبَسَ: (كارەكە ئاڵۆزبـوو). -الكِتابَ: قيده بالحركات: (سەروبۆری بۆ نووسینەكە كرد).

٩-أَتيـت بمفردات مختلفه لمعنى فعل مترجَم تعطى نفـس المعنى ووضعت خطاً مائلاً فاصلاً بينها مثل: أَسِـنَ- الماءُ: (ئاوەكە گەراوەتـەوە/ چێڕو بۆنی گۆڕاوە/ بۆگەنیكردووە) فهذه التعابير الثلاثة تعطى معنىً واحداً.

١٠-وضعت كلمات بين قوسـين والقوسـان يغنيان عَن تكرار الكلمة الـواردة قبل أَوبعد القوسـين والتي تشكل مع الكلمات الموجودة بين القوسين معانٍ أُخَر جديدة مثل: كردی بە (دەسك/ چەپك/ گورزە) والخط المائل يعني ترادف معانى الكلمات.

١١-ســجلت التعابير والامثلة الكثيرة الشارحة للكلمه والمتداولَة في اللغة العربية والمسجلة في المنجد بعد كلمة (يقال) ووضعت اربعة أقواس صغيرة كما هو في المنجد ولكن دون تسجيل كلمة (يقال) مثال: يقال "مافعلتُ أصلاً": هەر نەمكردووە. واتا هەرگيز نەمكردووە.

١٢-وضعت الفارزه بين الكلمات الكردية المتشــابهة أوالقريبة في المعنى مثل (دەفر، هۆر، توورەكە).

١٣-أحياناً ترى في الترجمة كلمتين مترادفتين في المعنى يتواســطهما حرف (و). كطريقة للإبقاء والمحافظة على الكلمات وسلامة التعبير في اللغة الكرديه والاستعمال البلاغي لتوكيد المعنى مثل: نظيف: پاك و تەميز.

١٤-وعلامة التساوى (=) تدل على أن الكلمتين لهما نفس المعنى.

(وهذه إيضاحات عَن بعض خصائص اللغة الكردية أوكتابتها).

أ-حروف اللغة الكردية الغير موجودة في اللغة العربية هي (ژ. گ. چ. ڤ. ڵ. ۆ. وو. پ).

ب-التشديد في اللغة الكردية يكون بتكرار كتابة الحرف مثل: جَراد: كولله.

ج-(الراء) في بداية الكلمة يكون ثقيلاً في التلفظ (مُشَدَّداً) ولايحتاج إلى أية علامة أما في الأماكن الأخرى مِنَ الكلمة فيكتب كالآتى (ڕ).

د-الحركات في اللغة الكردية تكون بالحروف: الفتحه: (ە). الضمة (و). الكسرة (يـ) مثل تَعالَ: وەرە. قُرآن: قورئان. الوَردة: گوڵ. الضرر: زيان.

ە-الــواو الــذي فوقهُ (ˇ) (ۆ) مثــل: كثير: زۆر الرائحه: بۆن. وهــذه لاتوجد في العربية الفصحى، أما في العامية فتوجد مثل شلۆن، دۆلمە

و-الواو الطويل التلفظ في الكردية تكتب بواوين (وو) مثل: الزوج: شــوو. العادة: خوو. وتكتب في العربية واواً واحداً مثل يَدور نور شروق كتابة هذه الكلمات بالكردية هيى: نوور شرووق يەدوور.

ز-الياء التي فوقها (ˇ) لاتوجد في العربية الفصحى اما في العامية العراقية الدارجة فهى موجوده مثل: لێش. زێن. بێش.

ح-الهمزة في الكردية تكتب على الكرسي هكذا (ئـ) مثل: ئەحمەد.

ط-حرف (أ) العربية تكتب في الكرديه بهذا الشكل (ئا) مثل سَهل: ئاسان. رغبة: ئارەزوو.

ى-المثنى غير موجود في اللغة الكردية ويأتي المثنى والجمع بصيغةٍ واحدة مثل:

| المفرد | المفرد | المثنى | الجمع |
|---|---|---|---|
| رَجُل | پیاو | پیاوان | پیاوان |
| شَعْب | گەل | گەلان | گەلان |

| اصطلاحات | | هێماكان |
|---|---|---|
| فا: | تعنى اسم الفاعل | بكەر |
| مفع: | اسم المفعول | كارلێكراو |
| ج: | الجمع | كۆ |
| جج: | جمع الجمع | كۆی كۆ |
| مص: | المصدر | چاوگ |
| م: | المؤنث | مێ |
| مث | المثنى | جووت/ دووانه |
| ة: | المفعول به | كارلێكراو |
| ز: | زراعة | كشتوكاڵ |
| (ع ا): | علم الأعضاء | زانستیی ئەندامەكان |
| ف: | فن البناء | خانه سازیی |
| ع ج: | علم الجبر | زانستیی جەبر |
| ع ح: | علم الحساب | زانستیی ژمێره |
| فك: | علم الفلك | گەردووناسیی |
| ن: | تعنى علم النبات | رووەك |
| ك: | تعنى علم الكيمياء | كیمیا |
| ت: | تعنى اصطلاح تجارى | بازرگانیی |
| ط: | تنعى اصطلاح مطبخى | چێشت و خواردنكردن |
| مو: | تعنى اصطلاح موسيقى | مۆسیقا |
| ا ع: | اصطلاح عسكرى | سەربازیی |
| ص: | اصطلاح صناعة | پشەسازیی |
| طب: | اصطلاح طب | پزیشكیی |
| هـ: | اصطلاح علم الهندسة | ئەندازه |
| ط: | علم طبقات الأرض | زانستیی چینەكانی زەوی |
| حِی: | اصطلاح علم الجبل | ئاوەدانیی |
| ح: | اصطلاح علم الحيوان | زیندەوەرزانیی |
| ف: | علم الفيزياء | فیزیا |
| ف ج: | اصطلاح الفنون الجميلة | هونەرەجوانەكان |

## تنبيهات لاستعمال المنجد

١-رتب المنجد الجديد وفقاً للمعاني بحيث قُسِمَت كلُّ مادة إلى فصائل مختلفة.
٢-إذا شئت البحث عَن كلمة فإذا كانت مجردة فاطلبها في باب أول حرف منها، وان كانت مَزيــدَة أوفيهــا حرف مقلوب عَن آخر فَجَرّدْها أو ردّهــا إلى الأصل ثم آطلبها في باب الحرف الأَول مِن حروفها الأَصلية.
٣-وضـــع الفعل المضاعَف الثلاثــي في أَول المادة أَما المضاعف الرباعــي فقد رُد الى الأَصل الثلاثي جرياً على القاعدة التي اتبعناها في ردّ كل كلمة الى أَصل ثلاثي نحو": صَمْصَمَ" فقد رُدَّ الى الأَصل "صمّ" ومَلْمَلَ فقد ذُكِرَ مع المادّة "مَلَّ". و"دَحرَجَ" فقد وُضِعَ في المادة (دحر).

## ( هەندێك لەو تێبینیانەی كە بە عەرەبییە )

١-لـــە منجدەكـــەدا هێڵێكـــی ســـتوونیی (|) لەنێوان واتـــا جیاكانی وشـــەدا هاتووە كە لێكدراوەتـــەوە من لەبری ئەو هێڵە ســـتونییە ژمارەم بۆ واتا لێكدراوە جیاكانی وشـــەكە دانـــاوە. وەك: البـــداة (ج) بَـــدَوات: أَلكمْأة | الـــتراب. واتاكان: ١- دومـــەڵان ٢- خاك/ خۆڵ. نموونەیەكیتر: الرَّوح: الفَرَح| الرَّاحَة | الرَّحمة: ١- دڵخۆشـــیی ٢- حەســـانەوە/ ئاسوودەیی ٣- دڵنەرمی / بەزەیی.
٢-هێڵـــی لار (/) هاوواتا دەگەیەنێت گەر لەنێوان وشـــە كوردییەكان یان نێوان رســـتە كوردییەكاندا بێت وەك: الآجل والآجلة: لە پاشـــاندا / لەدواییدا / دەمێكیتر: بَشَّ. بَشّـــاً: رووی خۆشبوو/ روویكرایەوە/ رووی گەشبوو.
٣-نیشـــانەی (-) لەبـــری فرمانە واتـــا دراوەكەیە كە لەوەپێش واتـــای دراوە بۆ ئەوەی فرمانەكە لە رســـتەتازەكاندا دووبارە نەنووســـرێتەوە ئەو داشە ( ) دادەنرێت وەك: أشْكَلَ الأمر: كارەكە ئاڵۆزبوو – الكتابَ: سەروبۆری بۆ وشەكە كرد.
٤-وێرگول (فارزە) لەنێوان ئەو وشـــە كوردیانەدا دانراوە كە واتایان لەیەكدەچێت یان لەیەكەوە نزین وەك: (دەفر، هۆر، توورەكە، گونیە).

# پێشەکی

زمان ناسنامەی نەتەوەیەو کەلەپووری سەرەکییەتی. زمان، واتا نەتەوە، کەسێک کە زمانی نەتەوەکەی نەزانێت، هەستی نەتەوایەتیی کز دەبێت یان دەمرێت مەگەر رۆشنبیرێك یان کەسێك هەستی نەتەوایەتی تێئالابێت. لە مێژوودا چەندەها نەتەوە بە لەناوچوونی زمانەکەیان و لەبیرچوونەوەیان، نەماون و لە نەتەوەیتردا تواونەتەوە، تەنها مەگەر لە کتێبەکانی مێژوودا ناویان مابێت. کورد مەینەتیی زۆری بەسەرهاتووە. گوان ئەو هەموو هەمەوەندانەی کە عوسمانییەکان بۆ سەماوە راگوێزیان کردن، ئەو هەموو کوردەی لەگەڵ سەلاحەدیندا لەشەری خاچەکاندا و دروستبوونی دەوڵەتی ئەیوبیدا چوونە سوریە، لوبنان و میسر. گوان ئەو هەموو هەمەوەندەی عوسمانییەکان بۆ جەزایر و باکووری ئەفەریقا، گوێزانیەوە) جگە لەو پاڵەوانانەی کە بە گەورەو بچووکیانەوە بەپێو بەشەو لە جەزایرو لیبیاوە هاتنەوە کوردستان کوا خێڵی (گاوانی) بنیاتنەری شاری حلە کە لەگەڵ خێڵێکی عەرەبدا دروستیانکرد. گوان ئەو هەموو خێزانە پەرەوازانەی ئەملاولای کوردستان کە خۆیان رۆیشتوون یان راگوێزکراون. زۆرن ئەو کوردانەی لە هەندێك شوێنی تورکیاو ئێران و ئەفغانستان و پاکستان و روسیاو گەلێك شوێنانیتر ونبوون، ئەوانە هەموو ناوی کوردیان بەسەرەوە نەماو توانەوە. لە ئەحمەد ئەمین و عەقاد و ئەحمەد شەوقی و تەیمورییەکانی میسر و مەحموود جۆمەردی موسل و رەسافی بەغدا و کەمال جومبلاتی لوبنان و سەدان کەلەپیاو و ژنی بەناوبانگی ناو عەرەب و تورك و فارس کە کوردبوون، بپرسن. کە خزمەتی وێژەو رۆشنبیریی و مێژوو رامیاریی و پەروەردەو گەلێك رووبەری ژیانی ئەونەتەوانەیان کردووە. بپرسن ئێوە کێن و چین. کەواتە ئەیلێمەوە زمان ناسنامەی نەتەوەیە، بە پاراستن و خزمەت گەشە دەکات، دەبێتە زمانی شارستانێتیی و زانست و وێژەو زانیاریی. (هوشیاریی نەتەوەیی) نەتەوەو زمان دەپارێزێت، گەشەی پێدەکات و قەوارەی نەتەوەییش دروستدەکات. وئەوەی کتێبەکەی (ئەولیا چەلەبی) و مێژووی کورد بخوێنێتەوە چاك لە بایەخی هوشیاریی نەتەوەیی دەگات. دەبێت ئەمە بڵێم: بەهەزاران مەلاو مامۆستای گەورەو خوێندەواری رۆشبینری بەرزی ئێمە لە نووسینەکانیاندا روویانکردۆتە ئەو زمانانەو پشتیانکردۆتە زمانی کوردی، تا کەلەپووری نەتەوەکەیشیان کردووە بە هی ئەو زمانانە. خۆ ئەگەر نەتەوەکە قایم و سەربەرزو جەربەزە نەبوایەو چنگی بە خاکەکەیەوە نەگرتایە ئەوەی کە هەیشە ئێستە نەدەماو دەفەوتا. ئیمپریالیزم کوردستانی بەشبەشکرد، ئەمرۆ ئێمە لەگەڵ تورك و

عەرەب و فارسـدا دەژین، مێژوویەکی زۆرو وێژەو کەلەپوورێکی ئێجگار فرەمان بەوسێ زمانە هەیە، کە کورد خۆی بەو زمانانە نووسیویەتی، جگە لە مێژووەکە. لەبەرئەوە زۆر پێویستە رۆشنبیرانی کورد، ئەوسێ زمانە بزانن و فەرهەنگی هاوبەشی ئەوسێ زمانەمان بۆ کوردیی هەبێت، بۆ ئەوەی ئەوەی کە بەو زمانانە هەمانە، بیگێرینەوە و وەربگێرێتەوە، هەروەها لە خوێندندا کەڵکی لێببینرێت و یاریدەی ئەوانە بدات کە پێویستیان دەبێت. ئێمەی کورد لە نیشتمانێکی داخراودا دەژین، دەرگای گەیشتنمان، بەگێتی و شارستانییەت و کەڵك وەرگرتن لە گۆرانی بەرەو پێشەوەچوونی جیهان، لە رێی ئەو سێ زمانەوەیەو لە دەرگای ئەو چوار وڵاتەوەیە، کە کوردستانی خراوەتە سەر.

هەروەها ئێمـە بەرەیەکبووین، لـە خوێندنەکەماندا کـە بە عەرەبییبوو تووشـی زەحمەتێکـی زۆر و گیروگرفتێکی سـەختبووین، چونکە فەرهەنگێکی هاوبەش نەبوو کە یارمەتیی خوێندن و فێربوونەکەمان بدات.

ئەمانە گشـتی پاڵپێوەنەرو هۆکاربوو بۆ ئەوەی بیر لە قاموسـێکی عەرەبی - کوردیی فراوان بکەمەوەو کاری بێپشـووی بۆ بدەم، لەبەر فراوانیی منجدیشم بەباشترین زانی. لە شەسـتەکاندا ماوەیەك کارم تێداکرد. بەڵام باری سەختی کوردستان و تەندروستیم وازی پێلێهێنام. بەڵام لەنەوەدەکاندا جارێکیتر دەسـتم بەوەرگێرانەکە کردەوە، باری ئاسایی و ئاشتیی کوردستانیش یارمەتیدام پاش یازدە ساڵ رەنجدانێکی بێپشوو و ماندوو بوونێکی زۆر و لەژێر باری گرانی ناتەندروسـتیو نا ئاسـایی باری خێزان و کۆششـی شەوو رۆژی حەوتسـەعاتی، بێوەرسبوون، و بێتابووشتیوون. بۆ واتای وشەو دەربرەی ناو قامووسەکە گەرام، قامووس و سـەرچاوەکانم پەرەپەرەکرد، کتێب و گۆڤار و رۆژنامەکانم هەڵدایەوە، بۆ واتای راسـتی وشـەیەکی منجدەکە، راموەرگرت، پرسـیم، راوێژمکرد، پەنامبردەبەر خاوەنپیشـەکان، بۆ ئەو زانسـتیانەی لە منجدەکەدایە هانامبردە بەر مامۆسـتا پسـپۆرە بەرێزەکان، سـوپاس بۆ خودا کە توانیم ئاواتە پیرۆزەکەی ساڵەهای ساڵی تەمەنم بهێنمە دی و وەرگێرانـە بەنرخەکەم تەواو بکەم، لە کۆتاییشـدا سوپاسـی بێپایانی هەموو ئەو مامۆسـتا گەورانەو دۆسـت و خاوەن پیشـەو هاورێو هەموو یەکێك دەکەم کە رووناکیی رێگەی گەیشـتنی ئاوات و رەنجەکەمبوون لە کۆتاییشـدا دەبێت منیش ئەوەی ئەو پایە بەرزو زانا گەورەیەی کەمنجدەکەی بە عەرەبی داناوە و لە پێشـەکیی چاپی حەڤدەهەم و بیسـت و شەشەمیشـدا دووپاتیکردۆتەوە بڵێم "وا دەزانم کە کارمـان بێهەڵە نابێت. ئینجـا روودەکەمە زمانەوانەکان و حەزدەکەین ئەگەر کە مو کووریيەك بێتە بەرچاویان ئاگادارمان بکەنەوە".

## ( رانومای چۆنییەتیی وەرگێرانەکەو )
## کلیلی منجدە وەرگێڕراوەکە

١ـ شـێوەی بەکارهێنانی منجدەکە، لە پێشەکیی منجدەکەدا بە عەرەبی نووسراوەتەوە، کە هی منجدەکە خۆیەتی، بەوشێوەیەش بەکاردەهێنرێت.

٢ ـ ئەونیشانەو ئامرازانەی کە پیشاندراوە هەر هی منجدەکەیەو پەیڕەو دەکرێت.

٣ ـ ئـەو خالآنـەی کە بە عەرەبی نووسـیومە و کلیلـی بەکارهێنانـی منجدەکەیە، بە پێویستم زانی بە کوردی دووبارە بینووسمەوە، هەر پەیڕەویی ئەوە دەکرێت.

(گەلێك خالی گرنگم لە نووسین و وەرگێرانەکەدا) — پەیڕەو کردووە.

١ـ لە وەرگێرانەکەدا من لە خۆمەوە شـتم نەنووسیوە، بەڵکو هەموو ئەو سەرچاوانەم کردووە بە رانومای راسـتیی وەرگێرانەکە، تا وشـەکە جێی خۆی بەراسـتیی وەربگرێت، وەك گوتم، پەنامبردۆتە بەر مامۆستایانی پسپۆر و لێزان و خاوەن پیشەو خەڵکێکی زۆری زمانزان. جاری وابووە، لە منجدەکەدا، وشـەکە بە عەرەبی بەوشـەیەك لێکدراوەتەوە کە واتاکەیم نەزانیوە، پتر لە بیسـت و پێنج خولەك پێـوەی خەریکبووم تا دۆزیومەتەوە و ساغمکردۆتەوە ئەوسا نووسیومە.

٢ـ دەشـێت وشـەیەك لە فەرهەنگێکی (عەرەبی- کوردی) تـردا هەبێت لە منجدەکەدا راسـتەو راسـت ئاماژەی بۆ نەکرابێت. ئەو فەرهەنگانە وشەیان هەڵچنیوەو هەڵبژاردووە بە زۆریی (چاوگن- مصدر)و کراون بە کوردی، من وشـەی منجدەکەم وەرگێراوەو رێگەی دۆزینەوەی وشەی تێدا دیاریکراوە ئەگەر بەسەلیقەو شارەزایی بۆ واتای وشەیەك بگەرێن لە منجدە وەرگێردراوەکەدا نەدۆزرێتەوە گوناهی من نییە چاوگە من فەرهەنگم دانەناوە منجدم وەرگێراوە من چاوگی فرمانەکانم لێکنەداوەتەوە ئەوانە نەبێت کە منجدەکە خۆی بۆ خۆی لێکیدابێتـەوە. دۆزینەوەی واتای چاوگە عەرەبییەکانیـش کەلێکنەدراونەتەوە لێکدانـەوەی ئاسـانە دەلێت: (نَحَت العودَ نَحتاً) چیلکەکـەی دادا. چاوگەکەی بە عەرەبی (نَحْـت)ە واتا (دادان). (نَحَرَ الشـاةَ نَحْراً): مەرەکەی سـەربری (نَحْـر) چاوگە. واتاکەی (سەربرین)ە.

لـە وەرگێرانەکەدا من شـوێن رێـرەوی منجدەکـە کەوتووم، کە لە پێشـەکییەکەدا روونیکردۆتـەوە، بۆ روونکردنەوەو راڤەکردنی واتاکان رسـتەی بەکارهێنانی وشـەکەو پەندو وتەیجێگرو دەربرەی زمانەکەی بەکارهێناوە، من ئەوانەیشـم وەرگێراوەتە سـەر کـوردی، مەگەر بە دەگمەن یەکێکم هەڵبواردبێت، کە زۆر پێویسـت نەبووبێت. من دوو بـەرگ کتێبـی ئیدیۆمم داناوە هەرچەنـدە زمانی کوردیی شـێوە ئیدیۆمە بەلاّم من بۆ

واتاكان وشەمداناوە نەك بە ئیدیۆم لێکمدابێتەوە.

٣-زۆر بە تەنگ دارشـتنی رستەکانەوە هاتووم، کە لەسـەر رێرەوی زمانی کوردیبێت، کە فرمان / کردار دوای رسـتە دەبێت. لەسـەر چۆنیەتی رێکخسـتن و نووسینی رستەو لەسەر ئەم باباتە چەندجارێك لەگۆڤارەکاندا نووسینم بلاوکردۆتەوە. بەلام لێرەدا دەڵێم: دەشـێت رستەش هەبێت کە پاشوپێشـم کردبێت و بەرچاوم نەکەوتبێت. من ئەوەندەی وەرگێرانەکـەم لا گرنگبـووە هێندەیـش لام گرنگبووە کە زمانی کوردیی بچەسـپێنم و بینوێنم، لەبەر ئەوە گەلێك جار بەچەند شـێوە رسـتەیەك واتای وشـەکەم خۆسـتۆتە بەرچاو، ئامانجیشم تۆمارکردن و بەرچاوخسـتنی هەموو زمانەکەیە. نموونەش (بَرَسَ| بَرْسـا): تەنگـی بە نەیارەکە هەڵچنـی/ زۆری بۆ نەیارەکە هێنا. لێـرەدا دەبێت بڵێم لە رستەدا کورد پشت بە فرمان دەبەستێت. زمانی عەرەبیی بەچاوگ دەبەستێت.

٤-لە منجدەکەدا رستەی هێناوە و واتای فرمانەکەی لێکداوەتەوە، بەلام بێئەوەی ناوی کارلێکراوەکـە (مفعول بە) بهێنێـت بەراناو ئاماژەی بۆ کردووە، من ناچارم هەرچی ناوو وشەیەك هاتبێت واتاکەی بنووسم. وەك: (لَحَبَ- الطریقَ: سَلَکَهُ): رێگەکەیگرت. (-أَوضَحَهُ): رێگەکەیدەرخسـت. (-الشيْ: اَثّر فیه): کاری کردە سەر شتەکە (-بالسیفِ: ضَرَبَـهُ بِهِ): بە شمشـێر لێیـدا. یان ناوی بکەرەکـە ناهێنێت وەك: (فـاءَ- الظلُ: رَجَعَ): سێبەرەکە گەرایەوە. (فَیَّأَ الشجَرُ) درەختەکە سێبەریکرد.

٥-منجدەکەم بەشـێوە کرمانجییە رەسـەنەکەی خواروو وەرگێراوە (نەك شێوە زاری سلێمانیی رووت) چونکە شێوەی سلێمانی گۆرانی بەسەردا هاتووە.

من لە (١٩٥٧)دا و لە چوار ژمارەی هەتاودا وتارێکم بە ناونیشـانی (گۆرانێك بەسـەر شـێوەی سلێمانیدا و بەناوی (ج. خەسـرەو)ەوە بلاوکردۆتەوە، تیایدا پیشانمداە کە چۆن دەنگ و پیتی (د) لەم شێوەیەدا وندەکرێت و چ گۆرانێکیتریش بەسەر شێوەکەدا هاتووە.

٦-یەکێك لە بریارەکانی کۆری زانیاریی کورد لەبری (ئە) (دە)ی فرمان بەکاربهێنرێت کە کرمانجی ژوورو و گەلێکی کرمانجی خوارویش هەر ئەوە بەکار دەهێنێت منیش (دە)م بەکارهێناوە.

٧-لێـم مەگرن کەمنجدە وەرگێراوە کەهێندە قەبەدەرچووە چونکە سروشـتی زمانی کوردی وەهایە. ئێمە لە دارشـتنی وشەدا وەك هەموو زمانە ئارییەکان و زمانی ئینگلیزی دوو رێرەومان هەیە یەکێکیان بەهۆی پاشـگرو پێشگرەوە دووەم بە لێکدان و پێکەوەنانی وشـە بە وشـەوە بەبێئامراز و یاریدەدەرە یان بە ئامراز و یاریدەدەرە. (ناوێك و ناوێك. ناوێك و سـیفەتێك و بـە پێچەوانەوە. لەگەڵ ئامـرازداو بێئامراز و لەگـەڵ فرماندا... هتد). وشەی عەرەبی لەسەر ئەو زانە/ کێشە. تاکە وشەیەکی عەرەبیی وا هەیە کوردییە بەرامبەرەکـەی لـە چەند پارچـە پێکدێت نموونـە: (إِعْتَرَفَ): پێی لێنـا/ دانی پێدا نا

(أَذَلَّهُ): ســەری پێشــۆرکرد. (تَرَك-ه) وازی لێهێنا. دەبینین نووسینی کوردیی جێگەیەکی زۆر دەگرێت و کات زۆر دەبات. بۆ چارەســەرکردنی ئەوە، گەلێك لەســەری نووســراوەو کۆشــش کراوە. یەکێتیی نووســەرانی کورد لە هەولێر ســیمینارێکی بۆ ئەوە رێکخســت، منیش تیایدا بەشــداربووم، گەلێك نووسەرو شارەزای زمانی کوردیی هەموو لایەك تیایدا بەشــدار بوون، رێرەوێکی باشــیان دانا، ئەمرۆیش زۆر گۆڤارو رۆژنامە و نووسەر بەپێی پێویست پەیرەویی ئەو شێوە نووسینە دەکەن، منیش بۆ کەمجێگەگرتن و کاتی کەمبردن، پەیرەویی ئەوەمکردووە. ئومێدەوارم ئەو رێرەوە بە باش بزانن. لێرەدا سەرنجدان بۆ ئەم خاڵە رادەکێشم. ئەو وشانەی کە چەند پارچەیەکن پارچەی پێشەوەی ستوونی وشەکەیە لە دارشتنی وشەکەدایە بە تایبەتی وشەی ئەندامانی لەش (سەر، چاو، دەست، گوێ، پشت، دان، چنگ... هتد). پێویســتە وشــە ستوونەکە بەجیا بنووســرێت و ئەوانیتر لێکبدرێن وەك: ســەری پێبەرزکردەوە. چاوی لێداگرت. دەستی لێومشاند دەرمانی تێهەڵسوو. تاڵاوی پێنۆشــی. هۆشــی لەبەربری). و گەلێك لەو جۆرە وشــانە. زمانی کــوردی زمانێکی زۆر بەرفراوانە، سروشــتی بەپیزو رەنگین و سەختی ژینگەکەی پێویستی بەوە بووە بێشومار وشە بۆ هەموو رەوش و وبارو دیمەن و هەڵوێست و واتایەك دابهێنێت بیروبرواو سەرنج و چێــژی میللەتە وریاکەی ئەوەی پێگرتووە. لە منجدەکەدا بۆ هەموو زیندەوەرێك دەڵێت: (ماتَ). کورد تەنها بۆ مرۆڤ وادەڵێت: مرد. بۆ زیندەوەرێك کە گۆشــتی بخورێت دەڵێت: مــردار بــووەوە. بۆ ئەوەی گۆشــتی نەخورێت دەڵێت تۆپی ئەمــە نموونەیەکی بچووکی بیرکردنەوەی کوردە.

٨-یەکێك لە رێرەوە گرنگەکانی نووسینی کوردیی، کە هەر لەسەرەتاوە دانراوە، ئەوەیە دەنگەکــە چۆن لەدەم دێتــە دەرێ ئاوا بنوســرێت و بۆ هەموو دەنگێــك پیتێك دانراوە (جگــە لە هەندێك دەنگی نزم کە بە پیتی عەرەبــی پیتی بۆ دانەنراوە وەك واوی کورت و (کســرە)ی عەرەبی واتا (یی) زۆر کورت. دیارە دانانی پیتەکان رەنجێکی زۆری بۆ دراوە تا گەیشــتۆتە ئەم رادەیەی کە ئێســتا هەیە. بەڵام یەکێك لە نووســینی ئەمرۆدا کە لای هەندێك گرێیە نووسینی دەنگی (ی) درێژەو پشتگوێدەخرێت. هەرچەند کۆری زانیاریی کورد ئەو کەلێنەی پرکردەوە، ســەرێکی بۆ پیەکە دانا ئاوا (یَ) بەڵام ئەوە پەیرەو نەکرا، بەلای منەوە پشتگوێخســتنی ئەو پیتە واتا (یی درێژ) لە نووســیندا هەڵەیە لەبەرئەوە من بە دوو (یی) نووســیومە. لە حەفتاکانیشدا لەپاشــکۆی خەباتدا وتارێکم لەژێر ناوی (باوا بنووسین) بڵاوکردەوە کە تیایدا ئاماژەم بۆ ئەو (پیە) کردووە هەرچەندە بەداخەوە نیوەی نووسینەکەیان بڵاوکردەوە.

٩-نــاوی هەندێك زیندەوەرو درەخت و گیا و رووەکیــتر لەمنجدەکەدا هەیە، بۆناویان بەکوردیی زۆر گەرام، بۆم ساغنەبوونەوە، ئەوانە هەیانە لە ژینگەی ئێمەدا نین، هەیشیانە

ناوەكانیان بە كوردیی لە سەرچاوەكاندا نەنووسراوەو بەرچاو ناكەوێت، پێویستیان بە ساغكردنەوەو بۆگەڕان هەیەو لەلایەن هەمووانەوە بەرچاو بگیرێت.

١٠-لە منجدەكەدا وشەیەك هاتووە واتای لێكدراوەتەوە، هەر ئەو وشەیە، لەگەڵ وشەیەكیتردا بۆ واتایەكیتر هێنراوە، بەڵام نەنووسراوەتەوە لە بری ئەو داشێكی بچووكی داناوەو واتا تازەكەی بۆ نووسیون من هەردوو وشەكەم بۆ وتا تازەكەش نووسیوە وەكو: القَرْقَق: الخَمر| الماء البارد. – القُرْقَف (ح) طائر صغير مِنَ الجواثم والمخروطية المناقير: من نووسیومە القَرْقَف والقُرقَف: باڵندەیەكی بچووكە هەڵدەنیشێت و دەنووكی شێوە قووچەكییە واتا بنی دەنووكەكەی پان و سەرەكەی تیژە.

١١-ئەو وشانەی كە پەیوەندیی بە ئاینەوە هەیە وەك زەكات و حەج و سوجدە و گەلێكیتر كە لە ناو میللەتانی ئیسلامدا هەیە لەلای ئێمەیش هەر وەهایە.

هەروەها هەندێك وشەی تازەیش، وەك تەلەفۆن و رادیۆ و سینەماو تەلەفزیۆن ئەوانە هاتوونەتە زمانەكەوە، بەكاردەهێنرێن. ئێمە كۆڕی زانیاریمان نییە، تا بۆ ئەو وشە تازانە وەك وڵاتە عەرەبییەكان لەسەر ڕێرەوو دەستووری زمانەكە وشەی بۆ دانێن و زمانەكەمان نەبێتە چێشتی سواڵكەر وەك ئێستە لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا بەرچاو دەكەوێت. لە كۆتاییدا دووبارەیدەكەمەوە بەهۆی باری نەتەوەكەوە ئەو گەشەیەی كە پێویستە زمانەكە نەیكردووە لەم دواییەدا نەبێت كە كۆششی بۆ كراو گەلێك لایەن بەتایبەتی مامۆستایانی پەروەردە ڕەنجێكی پیرۆزیان بۆ داو بنچینەیەكی چاكی زمانێكی زانستیان بۆ كورد ڕەخساند. منیش لەسەر ڕێرەوی زمانەكەو دەستووری چەند وشەیەكم دارشتووە كە ئەوانەش دەگمەنن و لەوەرگێڕانەكەدا بەكارم هێناون ئومێدم هەیە جێی خۆیان گرتبێت. وەك: (إغتيال): ناكاو كوشتن – (غيلة): ناكاو كوژیی (المسألة): پرسە بابەت. (مَركَبْ): هۆسوار الهلال: داسەمانگ. (عَزم): سوور خواستن (ألزَيت) شلە ڕۆن. (وَهم): ترسە خولیا. (رِۆتين): پاتبوونەوە. (ألتَمريض): خەستەوانیی/ نەخۆشداریی. (ظرف المكاتيب) بەرگەنامە (مُمَرِّض): خەستەوان.

## ئەمەیش هەندێك تێبینی منجدەكەیە

١-زمانی عەرەبی وەك هەموو زمانێكیتر، جیایی خۆی هەیە. لەوانە وشەی (ضد) كە لەگەڵ هەر وشەیەكدا بێت دوو واتای دژ بەیەك دەگەیەنێت وەك: لَجُبَتِ الشاةُ (ضد): قَلَّ لَبَنُها | غَزُرَ لَبَنُها: ١:مەڕەكە شیرەكەی كزبوو: ٢: شیرەكەی زۆربوو.

٢-جج: كۆی كۆی وشە وەك – ألشَرب (ج) شُروب (جج) أشارِب: بەزی ناوسك كە بەورگ و ڕیخۆڵەكانەوە دەبێت.

٣-وشەیەكی زۆر هەیە بۆ واتایەك، واتایەك دەگەیەنێت. بۆ (صَرَعَ) بۆ (ضَرَبَ) بۆ (شَرِبَ)

بۆ گەلێك گەلێك وشەیتر کەبەلای منەوە ئەوە هی هەموو خێڵەکانەو کۆکراونەتەوە.

٤-(نیشــانە/ ماك/ ســیفەتی)ی زیندەوەرکراوە بەناوەکەی، وەك هی شــێرو گورگ و زیندەوەریتر ئەوانە ناوێکی زۆریان لە زمانی عەرەبیدا هەیەو هەمووی لە سیفەتەکانەوە وەرگــیراوەو پێــی لێنــراوە وەك: جائب العَين: شــێر (چاوگێــر). ألأَجَبة: شــێر (لەبەر ناوچەوانپانیی واناونراوە). الهَوّاس: شیر (لە (هَوَس)ەوە هاتووە کە شێتگیریی و ئازایەتییە. ألهُزَع والهَزّاع: شیر لە تیشــکاندنی نێچیرەکەوە وەرگیراوە. شێر بێشومار ناوی بەوشێوەیە لێنراوە. هەروەها گورگیش ناوێکی زۆری هەیە.

٥-خوازە لەزمانی عەرەبیدا و لە وشــەدا، ناوەکاندا زۆر دەور دەبینێت. منجد لەگەلێك شوێندا ئاماژەیدەکات وشەکە لە چییەوە هاتووەو بۆ وا ناونراوە. من ئەوانەیشم وەك خۆی وەرگێڕاوەتە ســەر کوردیی وەکو: (ألفَيء): ســێبەر دەڵێت بۆیە وا ناونراوە چونکە سێبەر جێگۆڕکێــدەکات و دەگەڕێتەوە. ناوی (ناقة) لەبەر دروســتبوونی بالایەتی کە واناونراوە چونکــە لەگەڵ مالیات و زیندەوەریــتردا زۆرجیایی هەیە خوایش لە قورئاندا ئاماژەی بۆ دەکات: "أنظر إلى الابل كيف خُلقَتْ".

٦-بەدەم لێکدانەوەی وشــەکانەوە گەلێك نەریتی پێش و پاش ئیســلامی عەرەبی تێدا تۆمارکراوە، وەك: نار التَهويل: نار القرى: نار الإنذار: نار الإســتِكثار. هەروەها بە هەزاران دەربــڕەو تەجێکرو نموونە هێنراونەتەوە، کە تیایدا هەیە شــتی هیچ و وپووچە دەڵێت: أبْصَــرُ من الهُد هُدِ: لە هــود هود چاوی تیژترە گوایا پەپووســلێمانکە ئاو لە ژێر زەویدا دەبینێــت. هەروەها مێژووی ژیان و نەریت و چۆنیەتیــی بیرکردنەوەی نەتەوەکەیە، لە دێرزەمانــەوەو ئاوێنــەی ژینگە ســەختەکەیانەو چۆن لەگەڵ ئەو ژینگە وشــکوبرنگ و سەختەدا هەڵیانکردووە بۆ ئەوە چییان کردووە.

٧-گەلێك ناوی کەس و شــوێنی داوە بە وشەکان وەك (السُــيوف المشرقية). (مَشرقی). ئاوەدانییەکی ناوچەی شامە. (ألشُراعي مِنَ الرماح): نیزەی (شُراع). کە پیاوێکبووە نێزەی راســت و درێژی دروستکردوە. خۆزگە ئێمەیش لە فەرهەنگەکانماندا کەلەپووری خۆمان بەوشێوەیە تۆمار دەکرد.

جەلال سوبحانی

## بەشێکی ژیانم



لە ساڵی ١٩٣٢دا لە گەڕەکی مەڵکەندیی شاری سلێمانی لەدایك بووم، لە نەوەی سوبحاناغای شارەزوورم. قۆناغی سەرەتایی خوێندنم لە هەڵەبجەو سلێمانیو قەرەداغو قۆناغی ناوەندیم لە هەولێرو سلێمانیو ئامادەییم لە سلێمانی تەواو کردووەو خولی ئامادەیی مامۆستاییم لە کەرکوك کە ساڵێك بوو خوێندووە. لە مانگی ١٠ی ١٩٥١-١٩٥٢دا بووم بە مامۆستا، سێ ساڵ لە بەکرەجۆ بووم، گوێزرامەوە بۆ غازی، کە ناونرا پیرەمەگرون. لە ساڵی ١٩٦٤دا بۆ تەواوکردنی خوێندن چوومە بەغدا. (لە پۆلی چوارو پێنجی ئامادەییدا کە زانستیبوو مامۆستایەکمان هەبوو موسڵاوی، هەموو رۆژێك چارەکێك دەرسەکەی دەخواردو درەنگ دەهات، لەبەرئەوە هیچ کتێبێکی چوارو پێنجمان نیوەیش نەخوێند کە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریمان تێدا دەدا وەك جەبرو فیزیاو چیو چی..

ئێمە نزیکەی (٥٠) خوێندکار بووین، لە کۆی هەمووی، تەنها دە کەسێك چووە کۆلێجەوە کە ئەوانەش بووە بوونو مامۆستایان بۆ گرتبوون، ئەوانیترمان هەموو بووین بە مامۆستای سەرەتایی، پاش خولی ئامادەیی کەرکوك). ئەوە داخێکی زۆر بوو بۆ من لە پاش سیازدە ساڵی مامۆستایی، چوومە (کلیەی جامعە) لە بەغدا کە ئەهلی بوو، من بۆ بەشی ئینگلیزی هەوڵمدا، بەڵام لەبەرئەوەی بڕوانامەکەم زۆری بەسەردا رۆیشتبوو، (٣٦) نمرەیان لە کۆی نمرەکانم داشکاند لەبەرئەوە لە ئینگلیزیدا وەرنەگیرام. چوومە (ئیدارەو محاسبە)ەوە. بەڵام لەبەرئەوەی قوتابخانەکەی کە وانەم تێدا دەوتەوە، دوو دەوامبوو، دووریی ماڵەوەشمان کە لە (باب الشیخ) بوو، لە کۆلێجەکە کە لە (راغبە خاتوون) بوو، وایکرد کە خوێندنەکەم بۆ تەواو نەکرێت. زۆر کۆششم کرد بۆ قوتابخانەیەکی یەك دەوامی بگوێزرێمەوە، نەیانگوێزامەوە، ناچار وازم لە خوێندنەکە هێناو ساڵی ١٩٦٩ هاتمەوە بۆ سلێمانیو بۆ قوتابخانەی مەولانا خالد پاشان بۆ قوتابخانەی (توانا) و لە ساڵی ١٩٨٢دا خۆم خانەنشین کرد. وەك ژیانی منداڵیو لاویشم کەوتمە کاسبیکردن.

شارەکەی ئێمە پایتەختی ئەمارەتی بابانو حکومەتی مەلیك مەحمودو ئاواتە گەورەکانی کوردە. کە شاری تێکۆشانو قوربانیو هوشیاریی نەتەوەییە، هەرچی لەم شارەدا بووەو هەیە بە شێوەیەك بەشداریی تێکۆشانی نەتەوەکەی کردووەو دەکات. شاری رۆشنبیرانو بەرەی پێشکەوتنخوازو نەتەوە خوازانە. منیش یەکێکم لەوانە. بە نووسین

هەر لە سـەرەتای پەنجاکانەوە، پێش ئەوەش بە هەڵبەسـتو چیرۆکو رێزماننووسـینو ئیدیۆمو رافەو وەرگێران بۆ سەر زمانی کوردیو بابەتی زمانییترم لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە، دیوانێکی باشـی شـیعرم هەبوو لە (١٩٦٣)دا خسـتمانە ژێر گڵەوە بەڵام کە مناڵان دەریانهێنابوو پۆرتکابوو، نووسینەکەی تێکچوو بوو بەبێ پرسی من سووتاندبوویان. داخێکی زۆرم بۆ خوارد.. بەڵام تازە.. ئیتر وازم لە شیعر هێنا.

-لە (١٩٥٦)دا وتارێکم بە سـەر باسـی (گۆرانێك بەسەر شێوەی سـلێمانیدا) لە هەتاوو چـوار ژمارەیدا بڵاوکردەوە.-چیرۆکێکی زۆرم لە عەرەبییەوە وەرگێراوەتە سـەر کوردیو بڵاوەمکردوونەتەوە.

-لێکۆڵینەوەیەکی چروپرو درێژم لەسـەر رشـتە مروارییەکانی مامۆسـتا عەلائەدین سجادی لە گۆڤاری کاروانـدا بڵاوکردۆتەوە.

-رەخنـەی زمانییم لە گۆڤارەکاندا، وەك زمان لە چیرۆکی کوردیداو پاراسـتنی زمانی کوردی لە پاشاگەردانیی وشەی بێگانەی زۆر. بڵاوکردۆتەوە.

-لە سـەرەتای دامەزراندنـی یەکێتی نووسـەرانەوە لە (١٩٧٠)وە ئەندامم، لە بەشـی هـەرە زۆری کـۆرو چالاکییەکانیدا، لە هی لقی سـلێمانیدا، بەشـداریمکردووەو چیرۆکم خوێندۆتەوەو لە کۆنگرەکاندا ئامادە بووم.

-من لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی کەلەپوورو فۆلکلۆری کوردم، لە سلێمانی کە لە (١٩٩١)دا دامەزراوە، تا سیازدە ساڵ لە هەموو چالاکییەکانیدا گورجوگۆڵانە بەشداربووم، لە هەموو ژمارەیەکـی گۆڤارەکەماندا، (گۆڤاری کەلەپوورو فۆلکلۆری کورد) نووسـینو لێکۆڵینەوەو بابەتی فۆلکلۆریم بڵاوکردۆتەوە، بەڵام بە هۆی گرانیی کاری وەرگێرانی (منجد)ەکەوە بە داخ٢ەوە ناچار بووم کە لێی بپچڕێم.

-ئەندامی بنکەی ئەدەبیو رووناکبیری گەلاوێژم. لە گەلێك یادو سیمیناردا بە نووسین بەشـداریمکردووە لەوانە، یادی سەدساڵەی رۆژنامەنووسـی، نووسینێکیم بە ناوی (رۆڵی گۆڤاری هەتاو لە یەکخستنی زمانی کوردیا) خوێندەوە.

-لە سیمیناری (رێنووسی کوردی)دا بەشداربووم، کە لە لایەن یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر گیردرا لە (٢٠ و ٢١ و ٢٢ی ١٩٩٩/٩)دا بوو.

-لـە سـیمناری فەرهەنگی کوردیدا کە ئەویش لەلایەن نووسـەرانی لقـی هەولێرەوە رێکخـرا لە رۆژانـی (١٠ و ١١ و ١٢ی ٢٠٠١/١١)دا بوو لێکۆڵینەوەو نووسـینێکم لەژێر ناوی (فەرهەنگسازی) ئامادە کردو خوێندەوەو لە گۆڤاری نووسەرانی هەولێردا بڵاوکرایەوە.

ئەو کتێبانەی کە بەشداریی دانانیانمکردووە یان هی خۆمەو چاپکراوە:

١-سـەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کـوردەوە کە لیژنەیەکی نەقابەی مامۆسـتایان لە سـلێمانی داینا سـاڵی ١٩٦١ لیژنەکە (من و مامۆسـتایان ع. ع. شـەونمو حەمە رەشید هەورانیو عومەر عەلی) بووین. مامۆستا محەمەد صالح سەعیدیش بەشی ئەستێرەوانیی

ئامادە كرد. نەقابەی سلێمانی داخراو نەقابەی هەولێر بە چاپی گەیاند.
٢-كۆمەڵە كورتە چیرۆكی (ڕێبازی ژیان)ساڵی ١٩٧١.
٣-كۆمەڵە چیرۆكی منداڵانە (فریشتەكان).
٤-(كۆمەڵە چیرۆكی (هەڵۆ بەرزەكان)) ساڵی ٢٠٠٧.
٥-(ئیدیۆم لە زمانی كوردیدا) بەرگی یەكەم ١٩٨٢.
٦-(ئیدیۆم لە زمانی كوردیدا) بەرگی دووەم ٢٠٠١.
٧-(منجدی وەرگێڕدراو بۆ سەر زمانی كوردی) كە دەزگای چاپو پەخشی سەردەم چاپیانكرد.
٨-(ئەستێرە ورشەدارەكان) كورتە چیرۆك ساڵی ٢٠٠١.
٩-(مەهاباد) كۆمەڵە كورتە چیرۆك.
١٠-(چەپكە گوڵێك) كە كۆمەڵە چیرۆكێكی نووسەرە گەورەكانی گێتییە، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی، خانەی وەرگێڕان دەستەبەری چاپكردنی بوو بە چاپی گەیاند.

## ئەو كتێبانەی ئامادەی چاپن

١-ئیدیۆم لە زمانی كوردیدا بەرگی سێهەم. بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی دەستەبەری چاپییەتی.
٢-ئەو نووسینو لێكۆڵینەوەو وتارانەی لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا بڵاوەكردوونەتەوە.
ئێستاش سەروەر خەریكی چیرۆكنووسینو نووسینیترم.

## سوپاس

سوپاســێکی بێپایانی دەزگای چاپو پەخشی ســەردەم دەکەم بە سەرۆکیەوە شاعیری گەورەی کورد مامۆســتا شێرکۆ بێکەس‌و هەموو مامۆســتاو ئەدیبە گەورەو بەرێزەکان‌و هاورێیان: مامۆستا ئازاد بەرزنجی‌و مامۆستا ئەکرەم قەرەداغی‌و مامۆستا رەووف بێگەرد هەروەها کاکە جەمال دەرویش کە ئەرکی کۆمپیوتەرکردنی گرتە ئەســتۆو، هەروەها کاك یادگارو برادەرانی چاپخانە، مامۆستا دانا ئەحمەد کە ئەرکی هەڵەبری گرتە ئەستۆو هەموو ئەو هاورێیانەی کە بە هەر شــێوەیەك بەشــداریی هێنانەدی (منجد)ە وەرگێراوەکەمیان کردبێــت. هەروەهــا سوپاســی ئەو مامۆســتا بەرێزانە دەکــەم کە لە وەرگێرانی بەشــە زانستییەکانی ناو مونجیدەکەدا دەستی باڵایان بووەو یارمەتییان داوم:

١-مامۆستا شەماڵ غەفور سەرپەرشتیاری پسپۆر.

٢-مامۆستا جەمال ئەمین سەرپەرشتیاری پسپۆر.

٣-مامۆستا ئاورنگ محێدین مامۆستای دواناوەندی.

٤-مامۆستا نەوزاد محەمەد کەریم ئاغا مامۆستای ئامادەیی هەڵکەوت.

٥-کاکە عەلی محەمەد عەبدوڵڵا بەرێوەبەری گشتیی بانکەکانی سلێمانی.

٦-مامۆستا عەبدولستار تۆفیق.

٧-مامۆستا کەریم زەند.

٨-مامۆستا حسێن نێرگزەجاریی.

٩-مامۆستا د. خالید محەمەد مامۆستای زانکۆی سلێمانی.

١٠-مامۆستا د. رەووف نێرگزەجاریی.

١١-مامۆستا مستەفا عەبدوڵڵا هەڵەچن‌و پێداچوونەوەی بۆ کردووم.

-سوپاسی هەموو ئەو خاوەن پیشانەو هەموو یەکێك دەکەم، کە بە وشەیەکیش یارمەتی ئــەم ئەرکە گــەورەو گرانەو پیرۆزەی منیان داوەو رەنــجو تەقەلاکەی منیان هێنایە کۆو هێنایە بەردەستی نەوەی تازەو هەموو خوێندەوارێك‌و رۆشنبیرێکی کورد.

جەلال سوبحانی

المصادر:

١-المنجد الطبعة السادسة والعشرون الأَب لويس معلوف اليسوعى.
٢-الرائد –في مجلدين- معجم لغوى عصري تأليف جبران مسعود – بيروت دار العلم للملايين الطبعة الثالثة. كانون الثاني ١٩٧٨م.
٣-مختار الصحاح. تأليف محمد بن ابي بكر عبدالقادر الرازي. الناشر دار الكتاب العرب. بيروت لبنان ١٩٨١م.
٤-المعجم الوسيط (١-٢). قام باخراجه ابراهيم مصطفي واحمد حسن الزيات وحامد عبدالقادر ومحمد علي النجار (نشره دار الدعوة) (الجزء الأول والثانى).
٥-القاموس العلمى عربي – انكليزي –كوردي. تأليف كمال جلال غريب- كوردستان- السليمانية الجزء الأول.
٦-القاموس العلمي عربي. انكليزي كوردي. الجزء الثاني مطبعة المجمع العلمي الكردي ١٩٧٩م. والجزء الثالث مطبعة الميناء ١٩٨٣م. تأليف كمال جلال غريب.
٧-القاموس العلمى المصَور عربي انكليزي كوردي كمال جلال غريب مطبعة الاجيال الطبعة الاولى ١٩٧٥.
٨-فەرهەنگی زانستیی (عربی- ئینگلیزیی- کوردیی (کەمالنامە)، کمال جلال غريب-٢٠٠٢).
٩-دەستوورو فەرهەنگی زمانی کوردی – کوردی عەرەبی فارسی. دانەر عەلائەدین سەجادی چاپخانەی مەعاریف بەغدا/ ١٩٦١ م.
١٠-رابەر –فەرهەنگی ڤوتابخانەیی. عەرەبی کوردی دانەر: گیوموکریانی- هەولێر چاپخانەی کوردستان سالی ١٩٥٠م.
١١-الباكوره – قاموس عربي كردي – گيو موكرياني مطبعة الحوادث. بغداد ١٩٨٦.
١٢-فەرهەنگی کوردستان. گیو موکریانی. کوردی – کوردی. دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس. ١٩٩٩م.
١٣-فەرهەنگی مەردۆخ – ئایەتوڵڵای کوردستانی کوردی – کوردی – فارسی – عەرەبی بەرگی یەکەم و دووەم تاران ١٩٥٦م.
١٤-الوجيز في اللغة الكردية تأليف: رزگار عەلی عبدالرحمن مطبعة أسعد بغداد ١٩٨٧.
١٥-فرهنگ جديد عربى فارسى. ترجمة منجد الطلاب مترجم محمد بندر ريگى چاپخانه (لوحة- تهران) ١٣٧١ فارسي.
١٦-قاموس – فارسي عربي تأليف الدكتور عبدالمنعم محمد حَسَنَين.
رئيس قسم اللغات الشرقيه بكلية الآداب جامعة عين شمس. دار الكتاب اللبنانى- بيروت. الطبعة الاولى ١٩٨٢.
١٧-فەرهەنگی مەهاباد- گیو موکریانی- کوردی – عەرەبی چاپی یەکەم چاپخانەی کوردستان. هەولێر ١٩٦١.
١٨-فەرهەنگی خاڵ. شێخ محەمەدی خاڵ. کوردی – کوردی بەرگی یەکەم ١٩٦٠ چاپخانەی کامەران بەرگی دووەم ١٩٦٤. بەرگی سێهەم ١٩٧٤. چاپخانەی کامەرانی.
١٩-فەرهەنگی کشتوکاڵ کوردی کوردی. مەعروف قەرەداغی. بەرگی یەکەم و دووەم بەغداد ١٩٧٢.

٢٠-قاموسی زمانی کوردی (پیتی ئەلف و بێ) عەبدولرەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی چاپخانەی کۆری زانیاری کورد ١٩٧٩ م. بەغدا.
٢١-هەمبانە بۆرینە. کوردی کوردی فارسی هەژار – تەهران ١٣٦٨ و ١٣٦٩ فارسی.
٢٢-ئەستێرە گەشە- کوردی – عەرەبی. فاضل نظام الدین. کۆماری عێراق وەزارەتی راگەیاندن دەزگای رۆشنبیریی و بلاوکردنەوەی کوردی. مطبعة الأجیال بغداد ١٩٧٧م.
٢٣-فەرهەنگی شیرین عربی – کوردی. فاضل نظام الدین. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دووەم بەرگ ٢٠٠١ و ٢٠٠٢ چاپی دووەم.
٢٤-فەرهەنگی عەرەبی – کوردی دانەر عەلی عەبدوللا.
٢٥-فەرهەنگی گیا های داروئی. کوردی فارسی ئینگلیزی عەرەبی تألیف امیر أمینی. (انتشارات طاق بستان کرمنشاه) (١٣٧٤)
٢٦-فەرهەنگی زانستی مصطفی سلیمان. چاپخانەی رەنج سالی ٢٠٠١.
٢٧-بەرکولێکی زانستە زاراوەسازیی کوردی جەمال عەبدول یەکەم چاپ (٢٠٠١م) چاپخانەی قەشەنگ – سلێمانی.
٢٨-شەوکار فەرهەنگی تایبەتمەندی کیمیاییە ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی. جمال عەبدول ١٩٩٨.
٢٩-زیوار دەستە فەرهەنگێکی زانستیە. ئینگلیزی عەرەبی کوردی یەکەم چاپ ١٩٩٥ جەمال عەبدول.
٣٠-فەرهەنگی تاهیر صادق (فەرهەنگی هاو واتاکان). کوردی کوردی عەرەبی سلێمانی – کوردستان ١٩٩٨م.
٣١-زاراوە زانستیەکان. دانان و لێکۆلینەوەی لیژنەی زاراوە زانستیەکان کۆری زانیاریی کورد بەغدا ١٩٧٦.
٣٢-لەچاپکراوەکانی کۆری زانیاریی عێراق. دەستەی کورد سالی ١٩٨٤. (لیژنەی زاراوەی کوردی).
٣٣-فەرهەنگی زاراوە- عەرەبی کوردی تألیف بەدران ئەحمەد (لەچاپکراوەکانی کۆری زانیاریی کوردستان. ئایار ٢٠٠٢م.
٣٤-زاراوەی زانستی نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی عەرەبی – کوردی سلێمانی ١٩٦٠.
٣٥-لەبلاوکراوەکانی بەرێوەبەرێتی پەروەردەو فێرکردنی پارێزگای سلێمانی زنجیرەی (١) سالی ١٩٧١.
٣٦-گۆڤاری یاسا پارێزیی ژمارە (٦) سالی ٢٠٠١م (٢٧٠١) کوردی. کوردستان هەولێر.
٣٧-گۆڤاری ئابووریی لەژمارە (١-١٥) لە سالی (١٩٩٩)ەوە. کۆمیتەی بالای یەکێتی ژمێریاران و ئابووریناسانی کوردستان - سلێمانی دەریدەکات.
٣٨-خەرمانەی یاسا - سەردار عەزیز خۆشناو.
٣٩-فەرهەنگی جوغرافیای سروشتیی. ئینگلیزیی عەرەبی کوردی دانانی جەزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد. وردبوونەوەو تۆژاندنی ئەکرەم قەرەداغی - گۆڤاری زانستی سەردەم.




أ-(الألِــف): ئەلف یــان بێدەنــگ دەبێت واتا زەنــەدار دەبێــت وەكــو «قــاُم»: هەســتا، پێیدەوترێت ئەلفی نەرم یان ســەردار دەبێت و پێیدەوترێــت (هەمــزە). لــە ژمێرە كۆی ڕستەشــدا ژمارە یەكــە (١). هەمزە بە چەند واتایەك دێت:

١-(ألإستفهام): پرسیار: ئایا/ ئەریّ؟ وەك.

(أقرأت)؟ ئایا خوێندتەوە.

(أماقرأتَ)؟: ئایا نەتخوێندەوە.

(افلَم تَقْرَأ)؟: ئایا ئەی نەتخوێندەوە

(أفِي البَيــتِ أخوكَ)؟ ئایــا براكەت لە ماڵە؟/ ئەریّ براكەت لەماڵەوەیە.

٢: بۆ بانگكردنێكی نزیك: (لِلنداء القَریب) (أزَیدُ أقبِل): ئازەید وەرە.

٣-(لِلتَسـوِیَة): بۆ ڕێكخستن و ڕاستكردنەوە. ڕاگرەكەیشــی ئەوەیــە كــە ئەو ڕســتەیەی ئەلفەكەی دەچێتە سەر بەچاوگێك بگۆڕدرێت وەك: (سَــواءٌ عَلَــيَّ أقُمــتَ أم قَعَــدتَ)، أي («ســواءٌ عَلَيَّ قيامُكَ أو قُعــودُكَ»): بەلای منەوە وەك یەكە بە پێوەبێت یان دانیشێت/ بەدانیشتنەوە بیت.

٢-(آ): (حَرفُ نِداءٍ لِلبَعید أو ماهُوَ نَظیرُهُ): پیتی بانگكردنی دوورە یان نیمچە دوور. وەك بانگكردنی نووستوویەك یان بێئاگایەك

آب:١-(آب = أوغسطس): مانگی میوە گەنان كە هەشتەمین مانگی ساڵی زاینەو سیویەك ڕۆژە پاش خەرمانان و پێش مانگی گەلاوێژە.

٢-(ألآب): لای عیسایییەكان، یەكەمین خود لە خودێتی خوداوەند.

ابّ: ١-(أبَّ- إلیهِ. أبّاً وأبَاباً وَأبابَةً): تاســەی ئەویكرد، بیریكرد.

ألأب (ج) (أُوبَ): گیای تەڕو وشك

(ألأباب): ١-ئاو ٢-تراویلكە.

٢- (أبَّ. أبیباً وَأبّاً وَأباباً وَأبابَةً): خۆی سازو

تەیارکــرد، بــە کەلوپەلی پێویســتەوە خۆی ئامادەکرد

(-یَــدَهُ إلی السَّــیفِ): پریدایە شمشــێرەکە هەڵیکێشێت

(-أَبَّهُ): ئەمیش نیازەکەی ئەوی هەبوو.

(أَبَّ: هاواریکرد(تَأَبَّبَ- بِهِ): بەگەورمیزانی شانازیی پێوەکردو سەیری لەوهات.

٣-(أَلأَباتِي): ١-باوکێتیی ٢-ناســناوی سەرۆکی گشــتیی لە هەندێك پارسایەتیدایە ٣-پایەلای کلێسەی خۆرهەلاتییە بۆ پارسا

أَباً: (أَبَأَ يَأبَأُ- هُ بالسَّهْم): تیری تێگرت

ابــت: (أَبِــتَ وأَبِتَ- النَّهــارُ. أَبْتــاً وَأبُوتاً): گەرمای رۆژ تاویسەند.

(أَبْتٌ وَأَبِتٌ وآبِــتٌ): رۆژی زۆر گەرم/ رۆژی تاوسەندووی گەرما.

(تَأَبَّتَ- الجَمرُ): پشکۆکە تەواو سووربووەوە.

(أَبْتَهُ الغَضَبِ): ئەوپەڕی توورەیی و ســوور هەڵگەڕاند.

(أَبْجَــد): ئەلف و بێی عەرەبــی / پێکەوەنراوی دەنگەکانی پیتی عەرەبیی کە بەم شێوەیە دێت: «أَبْجَد. هَوَّز. حُطِّي. كَلَمَنْ سَعَفَصْ. قَرَشَتْ. ثَخَــذ ضظغ»: بەپێــی ژمێرە و بــۆ مێژوو زانین لە هەڵبەستدا، هەر دەنگەو ژمارەیەکی دراوەتێ، وەك ئەم نەخشەیەی خوارەوە

((ا) = ١، (ب)= ٢، (ج) = ٣، (د)=٤، (ه)=٥، (و)=٦، (ز)=٧، (ح)=٨، (ط)= ٩، (ي)=١٠، (ك)=٢٠، (ل)=٣٠، (م)=٤٠، (ن)=٥٠، (س)=٦٠، (ع)=٧٠، (ف)=٨٠، (ص)=٩٠، (ق)=١٠٠، (ر)=٢٠٠، (ش)=٣٠٠، (ت)=٤٠٠، (ث)=٥٠٠، (خ)=٦٠٠، (ذ)=٧٠٠، (ض)=٨٠٠، (ظ)=٩٠٠، (غ)=١٠٠٠.

ابد: ١-(أَبَدَ- الشــاعِرُ. أُبوداً): هۆزانڤانەکە/ هۆنەرەکە/ شاعیرەکە (وشەی وای بەکارهێناو ناخاوتنێکی وای وت کە تێنەگەن/ تەمومژی) بەکارهێنا).

(أَلأَبَدَةُ (ج) أَوابِد) ١-شتی سەیرو سەمەرە.

(«أَوابِدُ الكَلامِ»): ئاخاوتنی سەیر

(«أَوابِدُ الشِعرِ»): هۆنراوە/ هۆزان/ شیعر)ی لــە جوانیــی و ســەرواو چاکییــدا بێوێنە.

٢- کارو قەومــاوی ســەخت و دژوار/ کە لێی رەوبکەیت.

٢-(أَبَدَ. أَبَداً): بوو بە درندە/ دایە دەشــت و کێو.

(أَبَــدَ – الحَیَــوانُ. أُبُــوداً): زیندەوەرەکــە درندەبوو/ بەلەسەبوو.

(تَأَبَّدَ): وەك درندە یان کێویلەی لێهات

(-المَكانُ): شــوێنەکە چۆڵ و هۆڵبوو، بوو بە جێی درندان.(أَلآبِدَةُ (ج): أَوابِد): درندە.

٣-(أَبَــدَ- بالمَــكانِ. أَبــوداً): لەشــوێنەکەدا نیشتەنیبوو، مایەوە.

(أَبَّدَ-هُ): نەمرییکرد، نەمریی (پێبەخشــی/ دایە).

(تَأَبَّدَ): ١-نەمربوو/ هەتا هەتایە مایەوە ٢-کێویلە بوو.

(اَلآبِدَةُ (ج) أَوابِد): خاکە ساریی و فەوماوێکی لەبیرەوە نەچوو

(أَوابِدُ الدُّنیا): وەی و چورتومی جیهان.

(اَلأَوابِد): باڵندە کۆچنەکەرەکان کە زستان و هاوین لە شوێنێکدا دەمێننەوە.

(اَلأَبَــد (ج) آبــادَ وأُبُــود): رۆژگــار، کــۆن، هەمیشەیی هەتاهەتایی، بێکۆتا.

(«لا آتیهِ أَبَدَ الأَبدین والآبَدِ وَأَبَدَ الأَبدَ وأَبَدَ الآباد وأَبــد الدَّهر»): هەرگیــزاو هەرگیز/ بڕایبڕ/ هەتا هەتایە ئەو کارە ناکەم.

(«لا أَفْعَلُهُ أَبــداً أَو أَفْعَلُهُ أَبداً»): هەرگیزاو هەرگیز/بڕایبڕ/دەکەم.

(أَبــداً): ١-هەتا هەتایە/ بڕایبــڕ/ هەرگیز، هەرگیزاو هەرگیز ٢-هەمیشــە. (ئاوەڵفرمانی کاتییــە بۆ جەختکردنی کار ئــەرێ بێت یان نەرێ بێت).

(لاأفعَلُهُ أَبَداً أَو أَفعلُهُ أَبداً): هەرگیزاو هەرگیز ئەو کارناکەم یان هەمیشە ئەو کارەدەکەم.

(اَلأَبَــدي): هەتــا هەتایــی / بێبرانــەوە/ هەمیشە.

(اَلأَبَدیَّة): ١-ئەوە دنیا ٢-هەتا هەتایە.

٤-(أَبِدَ -عَلیهِ. أَبَداً) لێیتووڕە بوو.

الملحق:

(اَلمُؤَبَّد) : هەمیشەیی / سەرانسەریی

(ســجنٌ مُؤَبَّد) : بەندکردنی سەرانســەریی ژیان.

(إبادَة): کۆمەڵکوژیی / قڕکردن.

---

أبر: ١-(أَبَرَ-ُ أَبْراً وَإِباراً): ١-دەرزیخواردیکرد ٢-پێومیدا.

(«أَبَــرَتِ العَقْرَبُ فُلاناً»): دووپشــکەکە بە فیساریەوەدا.

(أَبَــزَ-ُ): ١-لە پاشــملە بە خراپــە ناویبرد/ غەیبەتیکرد ٢-فەوتاندی

(اَلأَبّــار): ١-دەرزیگەر ٢-دەرزیفــرۆش ٣-کێچ (چونکە خەڵك دەگەزێت).

(اَلإِبْــرَةُ (ج) إِبَــرُ و إِبار وَإِبَــرات): دەرزیی درووман.

(شُغْلُ الإِبرة): دروومانکردن / دەرزیکاریی

(إِبْرَة مُغناطیسیَّة): (ف): قیبلەنما

(اَلإِبــرَة أَو الحُمَّــة) (ح): چــزووی هەنگو دووپشك و زەردەواڵەو زەردە زیرەو شتی وەها کە بە خەڵکەوە دەدەن.

(إِبْرَةُ القَرْن): نووکی قۆچ

(اَلإِبرَة): دووزمانیی/ بەدزمانیی

(اَلإِبريّ): دەرزیفرۆش

(اَلمِئبَرَ وَالمِئبار): دەرزیدان.

(اَلمِئبَرَةُ (ج) مَآبِر): دووزمانیی/ بەدزمانیی.

٢-(أَبَرَ — الزَرعَ. أَبرْاً وإِباراً) (ز): ١-کشتەکەی چاکســاز کــرد و پەینیکرد. ٢-تــۆوی نێری بەسەردا بڕژاند/ هەڵاڵە پرژیکرد.

(اَلأَبَّار): ئەوەی هەڵاڵە پرژێ دارخورمای مێ دەکات.
(اَلمِئبَر): ئامێری هەڵاڵە پرژێنی دارخورما.
٣-(إِئتَبَــرَ – البِئرَ) : (چاڵاوەکە / بیرەکە)ی هەڵکەند/ چاڵاوی لێدا.
٤-(اَلإِبْرَشِــيَّة والأَبْروشــيَّة): کەســانێك و شوێنانێك کە لە ژێر دەسەڵاتی قەشەیەکدابن (یۆنانیە).
٥-(اَلإِ بْريز والإِبْريــزِيّ) (یونانية): زێڕی پوختەو ساغ.
٦-(اَلإبريْسِم والإِبْريسَم) (فارسية): ئاوریشم.
٧-اَلإبريق (ج) أَباريق (فارســية): مەسینە/ لوولێنە.
٨-(إِبريــل) = نيســان (لاتينيــة): مانگــی شەســتە باران/ مانگی گوڵان. چوارەم مانگی ساڵی زایینە.
ابز: ١-(أَبَزَ – الظَبيُ- أَبزاً وَ أُبوزاً): ئاسکەکە ڕاپەڕی و ڕایکرد.
(آبِز وَ أَبَّــازو أَبُوز): ڕاپەڕیــوو و ڕاکردوو/ هەڵاتوو.
(أَبَــزَ – بصاحِبهِ أَبْزاً) : زۆر و ســتەمی لە دۆستەکەی/ لە هاوڕێکەیکرد.
٢-(اَلإبزِيم والإِبْزَام (ج) أَبازيم: بە لەزوانە/ نێرو مێی پشتێن، تەرەقە (فارسية)
(«إِنْشَــبَ الإبزيــمُ»): بەلەزوانەکــە لەیەك گیربوو.

أَبَشَ: (أَبَشَ-ەُ. أَبْشاً): کۆیکردەوە
(أَبَّشَ- ەُ): کۆیکردەوە
(تَأَبَّشَ – القَومُ): خوێشگەل کۆبوونەوە.
(اَلأُ بَاشَــةُ مِــن الناس): کۆمەڵــە خەڵکێکی هەمە چیزە.
ابــض: (أَبَــضَ – البَعــيرَ أَبْضــاً): بە پەت سەرووی دەستی حوشترەکەی بە خوارووییەوە بەست.
(تَأَبــضَ – البَعــيرَ): بە پەت حوشــترەکەی بەستەوە.
(فتَأَبَّضَ): بەسترایەوە.
(اَلأُبْــض (ج) آبــاض) (ع أ): ١-(نــاو/ بن)ی ئەژنۆ ٢-مەچەك.
(اَلإباض): پەتی پێبەستنەوەی حوشتر.
اَلمأبِــض) (ع أ): ١-(پشــتی نــاوی) ئەژنــۆ ٢-مەچەك
ابط: (تَأَبَّط – الشــيءَ): شــتەکەی خســتە بنەهنگڵیەوە/ بنباخەڵیەوە
(اَلإبــط (ج) آباط) (ع أ): بنباخەڵ (بەمێ و نێر دەکرێت).
(إبطُ الجَبَل): قەد پاڵی شاخ.
(اَلإباط): شتی بنباخەڵنراو
ابق: (اَبَقَ وَأَبِقَ – العَبدُ) إباقاً وَأَبْقاً وأَبَقاً): کۆیلەکە لە خاوەنەکەی هــەڵات، دەربازبوو/ قوتاربوو.
(آبِــق (ج) أُبَّــق وَأُبَّاق): کۆیلــەی لە خاوەن

هەلاتوو/ قوتاربوو.

(تَأَبَّق): خۆیشاردەوە.

ابــل: ١-(أَبَــلَ وَ أَبِل. أَبالَةً وَأَبَلاً): حوشــترە وانییەکی باشیکرد.

(ابلَ وَ آبل (ج) أَبَّال): حوشترەوانی چاك

(أَبَّلَ): حوشتری زۆربوو

(-الإبلَ): حوشتری پەیداکردو ڕاگرت

(تَأَبَّلَ-الإبلَ): حوشتری پەیداکردو ڕاگرت.

(ألإبل والإبْل (ج) آبال): حوشتر / وشتر.

(ألمَأْبَلَة): حوشترگا جێیەك وشتری زۆربێت.

٢-ألإبالَــة:١-كۆمــەڵ ٢-گەل ٣-باشــڕاگرتن و بەخێوکردنی ماڵیات/ پاتاڵ.

(ألأَبابيل): پۆل (ئەمە تاکی نییە).

(طيرَ أَبابيــل): پۆلە (پەلەوەر/ باڵندە) وەك پۆلی کۆتر و سەقاقوش.

(ألأُبُلَّة): خێل

(«جاءَ في أُبُلَّتِهِ»). لەگەڵ خێلەکەیدا هات.

(ألأَبيلَة والإيبالَــة والإبَّالَة): گورزە گیا. یان بەستەکە دار.

(«ضِغْثٌ على إبالَةٍ»): وەی بەسەرومیدا

٣-(أَبَلَ. أَبالَةً): خودا خوازییکرد/ بوو بە پارسا.

(ألأَبيل (ج) آبال وَأُبْــل وَالأَبيلي والأَبْيُلِيّ): پارسا/ ڕەبەن.

٤-(إِبْلِيس (ج) أَبالِيس وَ أَبالِسَــة): شەیتان/ عەزازیل (ناوی ڕەگەزی شەیتانە).

ابن: ١-(أَبَنَ- هُ بِشَيءٍ أَبناً): خەوشی شتێکی لێگرت، بەشتێك گومانباریکرد

(أَبِنَ- الدَمَ في الجرح): خوێنەکە لە برینەکەدا ڕەشداگەرا.

(أَبَّــنَ-هُ): ١-(ضد): لەکەداریکردو خەوشــی لێگرت ،٢: هەڵینا

(ألأُبْنَةُ (ج) أُبَن): ١-خەوش ٢-ڕك و قین

٢-(أَبَّــنَ-هُ): (ضــد) ١-ستایشــی مردووەکە یکردو پیایــدا هەڵیدا ٢-خراپەی مردووەکەی باسکرد.

(ألتَأْبين): بەمردوودا هەڵگوتن و ستایشکردنی

(حَفلَــةُ التَأْبــين): كــۆڕی یادکردنــەوەو ستایشکردنی مردووەکە.

٣-(أَبَّنَ-هُ وتَأَبَّنَ-ه) ١-دوایکەوت و شــوێنپێی هەڵگرت ٢-چاوەچاویکرد/ چاوەڕێیکرد.

(إبانَةُ الرَجُل): گشت دۆستەکانی پیاوەکە.

٤-(ألإبن): کوڕ.

(ألأُبْنَــةُ (ج) أُبَن) ١-مێخەکەی قاچ. (ڕەشــە خەڵکەکــە پێیدەڵێن (مِســمار) ٢-گرێی دار/ درەخت.

(إبانُ — الشيءِ): (سەرەتای/ هەڕەتی) شتەکە| دەمی شتەکە.

(هُــوَ في إبّــانُ شَــبابِهِ): ئــەو لــە هەڕەتی لاویدایە.

٥-(ألأَبَنُوس والآبَنوس) (یونانیة): درەختی ئەبەنــووس لەوڵاتــە گەرمەکانــدا دەڕوێت دارەکەی ڕەشەو زۆر قایمەو بەنرخە.

بــه: ١ -(أَبَهَ- لَــهُ. أَبْهاً): بۆیچــوو پێیزانی/ لێئاگادار بوو/ ئاوری لێدایەوە

(لا یُــؤ بَه لَــهُ): گوێی نادرێتــێ/ بەهیچی نازانن

(أَبَّهَهُ): وشــیاریکردەوەو وایلێکرد تێیبگات/ پێیبزانێت.

(تَأَبَّهَ- عَن كذا): خــۆی لەوە دوور ڕاگرت و خۆی لێپاراست.

(اَلأُبَّهَــةُ والأُبْهةُ): ١:مەردایەتــی و مەزنیی/ گەورەیی :٢: فیزو دەعبە

(تَأَبَّهَ- علیه): فیزی بەســەردا نواند/ خۆی بەسەردا بادا.

(اَلأُبَّهَة: وَالأُبْهَــة): ١-مەزنیی ٢-لووتبەرزیی/ فیزو دەعیە ٣-مەردایەتیی.

ابا: (أَبَا. إبــاوَةً وَأَبُوَّةً وَأُبُــوّاً): بوو بە باوك (-ەُ) وەك بــاوك بەتەنگیەوە هات/ باوکێتیی لەگەڵدا کرد.

(أَبْوَتُهُ وَأَمَمْتُهُ): باوکێتیی و دایکێتیمکرد.

(أَبِّــی – فُلانــاً): بەفیســاری وت باوکم بە قوربانت بێت.

(تَأَبَّی - فُلاناً): فیساریکرد بە باوکی خۆی.

(اَلآب عنــد المســیحیین. الأُقنــوم الأول مِــن أَقانیــم الإلهیَّــة): یەکەمــین خود لە خودێتــی خوداوەنــد (ئەمــەلای دیانەکانە) عیسايیەکانە.

(اَلأَب (ج) آباء وَأَبون): ١-باوك ٢-ئەوکەســەی هۆی پەیدابوون یان چاککردنی شــتێك بێت. وشەی

(أَب): لە زمانی عەرەبیدا لەپێنج ناوەکەیە.

(جاءَ أَبُوك): باوکت هات

(رَأَیتُ أَباك): باوکتم دی

(مــررتُ بِأَبیــكَ): بەلای باوکتــدا ڕابوردم/ تێپەڕیم.

بــۆ بانگکردن دەڵێی: (یا أَبــي ویا أَبَتي) هۆ باوکە/ ئەرێ باوکە.

(لا أَبَ لَكَ ولا أَباكَ ولاأَبَكَ): هەتیو/ بێباوك (ئەمــە بــۆ جنێوە) بــاوك چــاك (ئەمە بۆ هەڵنانە) (بە باوکدارو بێباوك وا دەوترێت)

(بِأَبی أَنتَ): باوکم بە قوربانت بێت.

(أَبو الیقظان): کەڵەشێر/ کەڵەباب.

المُلْحَق

(أَبو: اَلأُبُوَّة): باوکێتیی

(أُبُــوَّة شَــرعِیَّة): باوکێتیــی ڕاســتەقینە/ باوکێتیی سروشتیی

(اَلنِّظــام الأَبَــويّ أَو الأَبَويَــه): ١-(باوکســالاریی. (شیرازەیەکی کۆمەڵایەتیی تایبەتییە کە باوك تیایدا دەسەڵاتێکی ڕەهای بەسەر خێزانیان خێڵەکەیدا هەیە. دەشــێت پێیبڵێین: (اَلنِّظــام أَو الدَور البطریرکی) کــە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە. هەروەها لەنێوان خاوەنــکارو کرێکارەکانیــدا یــان ســەرۆك و ژێــر دەستەکانیدا دەبێت وەك باوك و خێزانەکەی دەبێت ٢-پارسا کە گیانی باوکێتیی دراوەتێ.

أَبی: (أَبی وتَأَبّی الشیء. إباءً وَإِباءَةً): نەویستی شتەکەبوو، رقی لە شتەکە بوو.
(آب (ج) آبُون وأُباة وَأُباء): مەرد/ نەویست/ سەربەرز.
(آبیَة): کەسێکی مەرد/ سەربەرز/ نەویست.
(أَبی الشیءَ عَلَیهِ): ڕێی شتەکەی (لێبەست/ لێگرت).
(أَبـی —عَلَیـهِ): ملینەدا/ سـەرپێچییکرد/ نەیویسـت. تَأَبّی: نەیویسـت/ خوازیارنەبوو ملینەدا.
(آباهُ — الشـیءَ إیبـاءً): وایلێکرد شـتەکەی نەوێـت/ بەلایـدا نەچێت (الأَبـیّ واحِدَته الأَبیَّة): مەرد/ سەربەرز/ خۆلەنەنگیپارێز.
(نَفـسٌ أَبیَّة): دەروونێکـی پاك و لەنەنگیی بەدوور کە چاو بۆ شتی نزم دانەخات.
(أَبّاءُ): مەردێك بەستەم و دەستدرێژیی کەس قایل نەبێت/ سەربەرز.
(ررجَلٌ أَبّاءُ): پیاوێکی مەرد/ سەربەرزی پاك.
أَتب: ١-(تَأَتّبَ وُائتَتَبَ): کراسێکی بێیەخەی لەبەرکرد.
(ألإِتب (ج) أُتُوب وآتُب وَإِتاب وآتاب): کراسی بێیەخە.
(أَتابـك) (تُرکیَّة): مـیر گەورە (لەپێشـدا بـە بەخێوکـەری منداڵانی پاشـاکانی تورك دەوترا.
(أَتد: أَلإِتاد (ج) آتِدَة وأُتُد): گوریس و پەتی پێبەستنەوەی مانگا کاتی دۆشینی.
اترج: (أَلأُتـرُج والأُتْرُنج واحدَتُـهُ الأُتْرُجَّة والأُتْرُنْجَـة) (ن): ١-درەختـی ترنـج. (ڕەشـەخەڵکەکە کـە پێیدەڵێـن (أَلکَبـاد): ٢-بەری ترنج (درەختێکە لە ڕەگەزی لیمۆیە).
اتل: (أَتَلَ. أَتَلاً وأَتْلاناً وَأَتَلالاً): لە تووڕەییدا ورد ڕۆیشت، هەنگاوەکانی کورتکردەوە.
اتـم: (أَتَـمَ أَتْمـاً): دووشـتی پەکخسـت/ کۆیکردنەوە.
(-بِالمَـکانِ): ١-لەشـوێنەکەدا نیشـتەنیبوو ٢-خاوخاویکرد.
(أَلمَأْتَـم (ج) مَآتِم): پرسـە/ خەڵکێکی زۆر کۆببنەوەو هەموو دڵگیربن.
أَتَـنَ: (إِسـتأْتَن: ١-ماکەرێکی کـری ٢-بوو بە ماکـەر. دەوترێـت (کانَ حماراً فاسـتأْتَنَ): نێرەکـەر بـوو بوو بـە ماکەر (بۆ سـووکی وا بەیەکێـك دەڵێـن کە لەپێشـدا مەردبوو بێت ئێسـتەکە یان لەپاشـدا کوونیی بێت و وادەرچووبێت).
(أَلأَتان (ج) أُتُن وَأُتْن وَآتُن): ماکەر.
٢-(أَلأَتُون (ج) أُتُن وَأَتاتین: ١-(توونی گەرماو ٢-کوورەی گەچ و قسل، بەردەکە کۆدەکەنەوەو ئاگری تێبەردەدەن تا بەردەکە هەموو دەبێتە گەچ یـان قسـل پێیدەڵێن (أَتـون الکلس): کوورەی گەچ.
أَتا (أَتا — الشَـجَرُ. أَتْـواً وإِتاءً): ١-درەختەکە

بەریگرت ٢-بەرەکەی زۆر بوو.
(إتاءُ الأرضِ): بەروبوومی زەوی.
(ألإتــاوَة (ج) أتــاوی): ١-بــاج و خــەراج ٢-سەرانە.
٢-(أتا- بِهِ وعَلَيهِ): بوختانی بۆکرد.
(ألإتاوَة (ج) أتاوی): بەرتیل.
(أتَوْتُهُ إتاوَةً): بەرتیلمدایە.
أتــی: ١-(أتی. إتْیانــاً وأتْیاً وإتیانَــةُ ومَأتاةً): هات
(-المَــكانَ): هاتە شــوێنەکە، لەشــوێنەکەدا ئامادەبوو.
(-الرَّجُلَ): هاتە لای پیاوەکەو سەری لێدا.
(إسْــتَأْتی-الرَّجُلُ):١-داوایلێکرد کە خاوەخاو بکات / هێواشبێت ٢-داوای لێکرد کە بێت.
(ألأتِيّ والأتاويّ): نامۆ/ نەناسراو/ نەزانراو
(سَــیْلُ أتِيّ وأتاويّ): لێشــاوێك/ لافاوێك کە نەزانرێت لە کوێوە دێت.
(ألمأتی والمَأْتاة): هاتگە/ لای لێوەهاتن
(أتی الأمرَ مِنَ مَأتاهُ أو مأتاتِهِ): لەسەرچاوەی کارەکەوەو لەرێی راســتەوە بــۆ ئەنجامدانی کارەکە هات.
٢-(أتی – الشيءَ): شتەکەی (ئەنجامدا/ کرد).
(علــی الشــيء): ١-شــتەکەی تەواوکــرد ٢-جێبەجێیکرد ٣-گەیاندیە کۆتایی.
(أتی علیه الدَّهْرُ): رۆژگار فەوتاندی.
(أتَّی- الماءَ. تأْتِيَةَ) وتَأتِّياً): رۆیشتنی ئاوەکەی ئاسانکردو ئاوەرۆگەکەی پاککردەوە.
(آتی-هُ علی الشيءِ مُؤاتاةً): لەگەڵیدا لەسەر شتەکە پێکهات و قایلبوو
(-إلَيهِ الشيءَ إيتاءً): شتەکەی بۆ بەکێشکرد.
(-الرجُلَ): پێبەپێی پیاوەکە رۆیشت
(-فُلاناً الشيءَ): شتەکەیدایە.
(آتِنا غَداءَنــا): خواردنی نیوەرۆمان بدەرێ/ بۆ بهێنە
(تأتَّی – الأمرُ): کارەکە ئامادەو ئاسانبوو.
(-لِلأمرِ): بۆ ئەنجامدانی کارەکە ئامادەبوو و لەوروووەوە بۆی هاتە پێشەوە.
(-لِمَعروفِهِ): بەرچاکەی ئەو کەوت
(-لَــهُ): لێیقەومــا/ ئــەوەی (لێــرووودا/ لێبەسەرهات).
أث: (أثَّ- النبــاتُ أو الشَــعَرُ. أثاثــاً وأُثوثاً وأثاثَــةً): رووەکەکە، گیاکە یــان قژەکە زۆر بوو و چنگی دایە یەك
(أثٌ وأثِیثُ (ج) إثاث): زۆرو بەیەکیدا چوو.
(أثّــثَ- الفِــراشَ): نوێنەکــەی ئامادەکردو رایخست
(-البَیتَ): کەلوپەلی تازەی خستە ماڵەکەوە.
(تأثَّثَ): خێر و بێری دەستگیر بوو.
(ألأثــاث): ١-کەلوپــەلی نــاو مــاڵ ٢-دارایی و سامان.
أثــر: ١-(أثَرَ –الحَدیثَ أثْــراً وأثارَةً وأثْرَةً): فەرمودەی پێغەمبەری گەیاندو گێرایەوە.

(الحَديث المأثور): فەرمــوودە یان ئاخاوتنی ســەدە دوای ســەدە گەیەنــراو گێــڕراوە./ فەرموودەی پێغەمبەری گێڕراوەو گەیەنراو.
(السَّیفُ المأثور): شمشێری کۆنی پشتاوپشت بەجێماو/ شمشێری کۆنینە.
(الأثَر (ج) آثار): قورئان و دەستووری ئاینیی ئیســلام و فەرمودەو هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (ص).
(عِلــمُ الآثــار عِنــدَ المســلمین): زانیاریی دەســتوورو ســونەتی پێغەمبەر کە بەرە بە بەرەی دەگەیەنێت وەك زانســتیی لاســایی و لەســەر ڕۆیشــتنی ئاینی حەزرەتی عیسا کە پێیدەوترێت (عِلمُ التَقلید).
٢-(أثَرَ-ە وآثَــرَ-هُ أثْراً وأثارَةً وأُثْرَةً): ڕێزی لێگرت/ پایەی گەورەیی دایە
(ألأثارَة والأُثْرَةُ (ج) أُثَر والمأْثَرَة والمأْثُرَة (ج) مَآثِــر): جوامێریــی و پیاوچاکیی/ کردەوەو کاریباش کە پشتاوپشت ناوی بمێنێتەوە.
(الأثــیر (ج) أُثَراء): ڕێز لێنراوو پایەدارکراو هەڵبژاردەی لێهاتوو.
(رَجلٌ أثیر): پیاوی بەڕێزی لێهاتووی لەدڵەوە نزیك و هەڵبژاردە.
٣-(أثِرَ- عَلَیهم. أثَراً): خۆدویســتی لەگەڵدا کردن و چی باشبوو بۆ خۆی هەڵبژارد.
(آثَرَهُ إیثــاراً): ئەوی هەڵبژاردو لە هەموانی بە چاکتر داناو زانی.

(إسْــتَأْثَرَ – بالشــيءِ علی الغَیرِ). شتەکەی بۆخۆی هەڵبژاردو داناو بەکەسی نەدا.
(ألأثَــرَةُ): ١-هەڵبــژاردن ٢-بۆخــۆ چنگ بە باشترین شتدا داگرتن و نەدانی بەهیچ کەس. ٣-خۆ پەرستیی.
٤-(أثِــرَ – علی الأمرِ أثَراً): بۆ کارەکە لێبڕا/ سوور خواستبوو.
(-لِلأمر): خۆی بۆ کارەکە تەرخانکرد.
(-بِفِعلِ کذا): دەستی بە کردنی ئەوەکرد.
٥-(أثَّرَ-فیه): کاری تێکرد/ شوێنکاری لەسەر بەجێهێشت.
(ألمُؤَثِّر): کاریگەر/ کارتێکەر.
(آثَرَ-کــذا بِکَــذا): ئەوی بــەدوای ئەویتردا هێنا.
(تَأَثَّرَ وأتَثَرَ –مِنــهُ وَبِهِ): کەوتە ژێرکاری ئەوەوە/ ئەو کاری تێکرد.
(مُتَأَثِّر): کارتێکراو/ کارلێکراو.
(تَأَثَّــرَ وَ ائتَثَرَ-فلافــاً): شــوێنپێی ئــەوی هەڵگرت/ دوای ئەوکەوت.
(ألأثَر (ج) آثار وَأُثُور): ١-نیشــانە ٢-شــوێن دەســت/ شــوێنپێ ٣-شــوێنەوار، کۆنینــە/ پاشماوەی دێرین ٤-شوێنکار.
(عِلمُ الآثار): زانســتیی پاشماوە دێرینەکان/ زانســتیی کۆنینە (کەبینــاو خانەو پەیکەرو پــارەو/ دراو گەلێــك شــتی کۆنی پاشــماوە دێرینەکان دەگرێتەوە).

(ألأَثَري): كۆنینەناس/ زانای كۆنینە.
(لُغَةٌ أَثَريَّة): زمانێكی كۆنی فەوتاو.
(ألأَثَر والإثر): بەدوایدا/ لەدوای
(خَـــرَجَ في إثرِهِ وأَثَـــرِهِ): دواوبـــەدوای ئەو دەرچوو
(على الأَثَر): دەســـتبەجێ، گورج، یەكســـەر، راستەوخۆ. ٢-ئەوەی كە لەبەر چاو دابێت
(يَطلُبُ أَثَراً بَعـــدَ عَين): ئەمە بۆ نموونەی شـــتێكە كە زوو لەبـــەر چـــاودا بووبێت ئەو كەسە پاش تێپەڕبوونی بۆی بگەڕێت.
(هـ) ألأَثَر: أَثَرٌ مستقيم على مُستَوٍ): شوێنی هێڵێكی ڕاســـت لەســـەر ڕووتەختێـــك خاڵی بەیەكگەیشتنیانە.
(أَثر مُســـتَوٍ علـــى مُســـتَوٍ) هُوَ مُسْـــتَقيمُ تقـــاً طِعهما: شـــوێنی ڕووتەختێك لەســـەر ڕووتەختێكیتر هێڵی بەیەكگەیشتنیانە
(ألأَثَرْ والأُثُر (ج) آثار وأثور): جێبرین.
(ألأَثارَة والأَثْرَة (ج) أُثَر): پاشماوەی زانست
(أثير): كارتێكەرێكی بەهێز/ شوێنكاری دیار بەجێهێڵەر.
(فَـــرَسٌ أَثـــير): چارەوێیەكە جێســـمی چاك بەجێدەهێڵێت.
(ألمَأْثُـــرَة والمأثُـــرَة (ج) مَآثِـــر): كاری چاك كە یادگاری باش و شوێنكاری چاك بەجێهێڵەر بێت.
٦-(إستَأْثَر-اللّه بِهِ): خوادا (مراندی/ بۆخۆی بردەوە)

(ألأَثَر): مەرگ.
٧-(ألأَثْـــرُ (ج) أُثـــور والأَثـــير (ج) أُثَـــراء): گەوهەری شمشێر.
(ألأَثـــير (فـــك): ئەمە لەلای هـــەرە كۆنەكان گەردوونـــی نـــۆ هەمـــە :2: (ف) لـــەلای سروشتزانەكان مادەیەكە ناكێشرێت و دەچێتە تەنەكانەوەو بەهۆی شەپۆلەكانیەوە دەنگ و گەرما دەگات و بلاودەبێتەوە (یونانیة)
(ألأَثيراتُ المِلحيَّة) (ك): خوێكانی ئەســـیر كە ئاوێتەی ئەندامین لەچەوری و گوڵ و میوە و بەردا هەیە.
(ألأثرجَة) (ك): لەئەنجامی كارلێكی كوهول و ترشەكاندا خوێكانی ئەسیر و ئاو پێكدێت. ألمُلحَق
(الإيثـــار): هەڵبـــژاردن و لاباشـــتربوون/ لە پێشگرتن
(إيثار الصَديق على الأَقارِب): لاباشتربوون و لەپێشگرتنی دۆست لەخزم/ خویش.
(إيثـــارُ الشـــرف علـــى المَنفعَة): لەپێشـــگرتن و لاباشتربوونی شكۆو سەربەرزی لەكەڵك و قازانج.
(تفضيل خَيرُ الآخرين على الخير الشخصي بتَجَرُّدِ كُلَّـــي): چاكەو خێری خەڵكیت لەهی خـــۆت بەتـــەواوی لاباشـــتربێت و لەپێشـــتر بگریت.
(إيثـــار الضَيـــف): میـــوان لەپێشـــگرتن و لەپێشدانان.

اثــف: (أَثَــفَ-ەُ أَثفــاً): ١-شــوێنیکەوت ٢-خواستی

(أَثَّــفَ –الْقِــدرَ. تَأْثِیفــاً): مەنجەڵەکــەی سەرسێپاکە (نا/ خست)

(تَأَثَّــفَ –الرجُــلُ المَــکانَ): پیاوەکــە خۆی لەشوێنەکەدا گرت و مایەوە

(-القَومُ الأَمرَ وعَلَیه) بۆکارەکە ولەسەرکارەکە کۆبوونەوە و کۆمەکی یەکتریانکرد.

(اَلأُثفِیّــة أَو الإِثْفِیَّة (ج) أَثافِي): ١-(ســێپای/ سێکوچکەی) بەرد.

(ثالِثَةُ الأَثافِي): پارچەیەکی شاخ کەدوو بەردی بخرێتە بەردەم و مەنجەڵی بخرێتە سەر.

(رَماهُ بِثالِثَةُ الأَثافِي): هەموو جۆرە خراپیی و میەکی تێئالاَند ٢-کۆمەڵە خەڵکێك.

اثل: ١-أَثُلَ وَأَثَل. إِثالَةً وأُثُولاً): رەســەنبوو/ خانەدانی تەواوبوو.

(أَثِیــل وَمُؤَثَّــل): خانــەدان/ وەجاخزادە/ رەسەن.

(أَثَّــلَ-ەُ): (رەســەنیی/ خانەدانیــی) ئەوی دەرخست

(-المرءَ: مرۆڤەکەی بە گەورەگرت

(-المَجدَ): خۆی شکۆدارکرد.

(تَأَثَّلَ): ریشــەدار و بنجبەســتبوو/ بەنەژاد بوو.

(اَلأَثَلَة) ریشە/ نەژاد/ رەسەن.

(اَلاثَلَــة وَالأَثال والأُثال): ئەو ماڵ و شــکۆو گەورەیی یان خانەدانییەی بۆی بەجێماوە.

(نَحَــتَ أَثَلَتَــهُ): تەشــەری لەرەســەن و خانەدانێتیەکەیدا.

٢-(أَثَلَ وأَثُل أُثُولاً وَإِثالَةً): ریشەی بەزەویدا چەقاند.

(أَثِیل ومُؤَثَّل): بنجداکوتراو/ بە بنج و بێخ

(تَأَثَّل): بنجی داکوتا/ بنجبەســت و ریشەدار بوو.

(-البئرَ): چاڵاوەکەی (لێدا/ هەڵکەند)

٣-(أَثَّلَ-المالَ): دارای پێکەوە ناو خەملاَند.

(تَأَثَّلَ): کۆبووەوە.

(-المالَ): داراو سامانی پەیداکردو خەملاَندی

(اَلأَثَلَــةُ والأَثَلَــةُ): ١-کەلوپــەلی ناومــاڵ ٢-ئامادەبوون.

٤-(اَلأَثَل) الواحِــدَةُ أَثَلَة (ج) أَثَلاث وآثال وَ أُثُــول) (ن): دارگــەز. درەختێکە نزیك ئاوو لــە زەویی لماویــدا دەڕوێ گەڵاکــەی باریکە. گوڵەکــەی بەهێشــووە. جاروبار بــۆ جوانیی دەروێنرێت. دارەکەی سەختە و چاکە.

(أَثْلَة): دارگەزێك.

(أَثِــم: أَثِــمَ. إِثْماً وَ أَثَمَــاً وأَثامــاً وَمَأْثَماً): گوناهیرکد/ کاری نەشیاویکرد.

(أَثِیم (ج) أُثَمَاء وآثِم (ج) أَثَمَة): گوناهبار/ گوناهکار/ سوچدار.

(أَثِــمَ وأَثَــمَ- اللهُ فُلانــاً فِي کذا)أَثْماً: خودا لەسەر ئەوە فیساری گوناهبارکردو سزایدا.

(أَثَّمَهُ): گوناهیدایه پاڵ.
(آثَمَهُ): تووشی گوناهیکرد
(تَأَثَّــمَ):١-له گوناه و خراپــه دوورکەوتەوە
٢-تۆبەیکرد/ پەشیمانبووەوەو وازیهێنا.
(الإثــم (ج) آثــام):١-گوناه/ کاری نەشــیاو
٢-خراپەکردن
(المَأْثَم والمأْثَمَــة (ج) مَآثِم): گوناه/ خراپە، کاری نابەجێ و نەشیاو.
اثــن: (الأَثنولوجیــا) (یونانیه): زانســتیی رەگەزەکانی مرۆڤ و رەوشت و تایبەتمەندیی وبڵاوبوونەوەیان.
اثا: (أَثَا- بــهِ وأَثى بهِ). أَثواً وإِثــاوَةً وَأَثْياً وَ إِثايَــةً): بوختانــی بۆکــردو وبیســتی تووشیبکات.
(تأَثَّــوا وَتَآثَــوا): لەبــەردەم ســوڵتاندا بــۆ دادپرسینەوە وەستان.
(المَأْثِيَــةُ وآ لمَأْثاةُ (ج) مَــآثٍ): بەدزمانیی/ بوختانکردن.
اج: (أَجَّ- الماءُ. أُجوجاً): ئاوەکە تاڵ و ســوێر بوو.
(آجَ- الماءَ): ئاوەکەی تاڵ و سوێرکرد.
(أُجاج): ئاوی تاڵ و سوێر.
٢-(أَجَّ. أَجيجــاً): کڵپەیســەند/ گڕیگــرت/ زمانەی کێشا.
(أَجّاج وأَجُوج): گرگرتوو کڵپەسێن.
(أَجَّجَ- النارَ) ئاگرەکەی خۆشکرد/ کڵپەی بە ئاگرەکە سەند
(تَأَجَّــجَ وتَآجَــجَ وأْتَتَــجَّ):١:کڵپەیســەند/ گڕیگرت.
(-تِ النــارُ): ئاگرەکە تینــی زۆر بوو و گڕی بەرزبووەوە
(الأَجَّــةُ (ج) إِجــاج): تینــی گەرمیــی یان گەرما.
(لإشْــتَدَّت أَجَّــةُ الصَّيفِ): گەرمــای هاوین تاویسەند
(الأَجيج): گڕەی گەرما.
(أَجيجُ النَّار): تینی گەرمیی ئاگر.
٣-(أَجَّ — على العَدُوِّ): پەلاماری دوژمنیدا و هێرش لەسەر هێرشی بردە سەر/ لە دوژمن گەرمبوو
(الأَجَّــةُ والأَجيجُ): غەڵبــە غەڵبلای خەڵك وترپە ترپی پێی رۆیشتنیان.
(أَجيجُ- الماءِ): خوڕەی ئاو
(أَجيــجُ القــومِ): ژاوە ژاوی خوێشــگەل و غەڵبەغەڵبیان.
اجد: (أَجَدَ وَآجَدَ وأَجَدَّ-ەُ): بەهێزیکرد.
(أُجُد): بەهێزو بەکێش.
(ناقَةٌ أُجُد) مێحوشترێکی بەهێزو بەکێش
(الأَجاد) (ب): کورتە تاقێك
(المُؤَجَّد): قایمکراو/ پتەوکراو
(بناءٌ مُؤَجَّد): خانەیەکی/ بینایەکی قایم.
(ثَــوبٌ مُؤَجَّــدُ النَّســيج): بەرگێکی قایم و

سفتچن.

اجر: (١-أَجَرَ وآجَرَ- الرَجلَ على كذا). أَجْراً وإجارَةً وإيجاراً: كرێ و وپاداشتی لەسەر ئەوە بەپیاوەکەدا.

(إئتَجَرَ): ١-خێریکرد ٢-داوای کرێی خۆیکرد

(ألأَجْـــر (ج) أجور وآجار): ١-کرێی کارکردن ٢-تۆڵەی چاکە ٣-پاداشت.

٢-(آجَــرَ واْســتَأْجَر- الرَجُــلَ مُؤاجَــرَةً): پیاوەکەی بەکرێگرت

(ألأَجــارَة والأُجْــرَة (ج) أُجَــر): کرێــی بەکرێگیراو.

(ألأَجير (ج) أُجَــراء): ١-کارکەری بەکرێگیراو ٢-نۆکەر ٣-رەنجبەر ٤-کرێکار.

٣-(آجَرَ -اْلــدارَ فُلاناً وَمِن فُــلان إيجاراً): خانووەکەی بەکرێ بەفیساردا.

(مُؤَجِّر): خــاوەن خانوو کــە بەکرێیدەدات (ناوترێت (مُؤاجر).

(إسْتَأْجَرَ- الدارَ): خانووەکەی بەکرێگرت.

٤-(أَجــرَ - العَظمُ. أجْراً وَأجــاراً وَأُجوراً): ئێسکە شکاوەکە خۆیگرتەوە.

(-العَظمَ): ئێسقانە/ ئێسکە شکاوەکەی رێکو باش نەگرتەوە.

٥-(أَجرَ- الطينَ): قورەکەی کرد بەخشــت و سووریکردەوە.

(ألآجُرَّة (ج) ألآجُر) (فارسية) خشتی سوور. (رەمەکە خەڵکە کە پێیدەڵێن (قرمید).

اجــص: (ألإجّــاص): ١-هەڵــووژە ٢-داری هەڵووژە.

(إجَّاصَة): هەڵووژەیەك (درەختێکە بەرەکەی شــیرین و خۆشــە لەئەوروپــاو خۆرهەڵاتی ناوەراستدا دەروێنرێت)

(إجَّاصُ بَرِّي): هەڵووژە کێویلە (ن) درەختێکە لە کۆمەڵــەی قەزوانە بەرەکــەی هێلکەییەو وەك بــەری هەڵووژەیــە. هەندێك جۆری بۆ بەرە خۆشــەکەی دەروێنرێت. سەرچاوەکەی وڵاتە گەرمەکانــی ئەمەریکایە بۆ جوانیی لە خۆرهەڵاتی ناوەراستدا دەروێنرێت.

أجــل: (أَجَلَ- عليه شَــرّاً. أَجْــلاً): خراپەو چورتومی بەسەردا هێنا.

(أَجْل): ١-لەبەر ٢-بۆ ٣-بەهۆی ٤-خاتر.

(أَجْــل) چاوگــی (أَجَــل)ە. لەپێشــدا بــۆ لێکدانــەوەی خراپیی بەکارهێنراوە پاشــان بەهۆی هەموو کارێکەوە بەکار هێنراوە).

(مِن أَجلِــكَ ولأَجلِكَ فَعَلْتُ هذا): لەبەر تۆو لەبەر خاتری تۆ ئەو کارەمکرد.

٢-(أَجِل. أَجْلاً): دواکەوت

(أَجَّــلَ- الشــيءَ): شــتەکەی دواخســت و ماوەوکاتی کردنی کارەکەی دیاریکرد.

(أَجِّلــوا اْلإجتِمــاع): کۆبوونەوەکەیــان دواخست.

(تَأَجَّلَ): دواکەوت، دواخرا

(تَأْجيل): دواخستن

(تَأْجيل الْجَلْسَــة أو المُحاكَمة): دواخســتنى دانيشتنەكە يان داد پرسييەكە.

(إسْتَأجَلَ): داواى دواخستنيكرد

(ألأَجَل (ج) آجال): كاتى ١-دياريكراو ٢-كاتى مردن/ سەرەمەرگ

(ألآجِــلُ والآجِلَة): ١-لەپاشــاندا/ لەدواييدا/ دەميْكيتر ٢-رۆژى دوايى.

٣-(أَجِلَ أُجْلاً): هاواريى مليكرد.

(أَجِلَ وَ أَجيل): كەســيْكە هاوارى ئازارى ملى بكات/ مليەشەيبيْت.

(ألإجل): ژانى مل

(أَجَّلَ – الرَجْلَ): دەرمانى ملى پياوەكەيكرد.

٤-(أَجَلْ): بەلْێ.

٥-(ألإجْــل): گاگــەلى كيْويــى/ گەلەمانگاى كيْويى.

(أجــم: ١-أَجَــمَ – النَهــارُ أَجْمــاً وَأجيماً): گەرماى رۆژ تاويسەند.

(تَأَجَّــمَ – النَهــارُ): رۆژ زۆر گەرمبــوو/ تاويسەند.

(تَأَجَّم – عليه): ليْيگەرمبوو/ ليْيتووڕەبوو.

٢-(تَأَجَّــمَ – الأَسَــدُ): شــيْرەكە چــووە بيْشەكەيەوە/ چووە لانەكەيەوە.

(ألأَجَمَةُ (ج) أجَــم وأُجُم وأَجَمات و (جج) آجــام: ١-لانــەى شــيْر ٢-جەنگەلْ/ بيْشــە/ بيْشەلان.

(ألأُجُم (ج) آجام): قەلاّ

اجــن: (أَجَنَ – الماءُ أَجْنــاً وَأُجوناً وَ أَجِنَ – المــاءُ أَجَناً): ئاوەكە گەراوەتەوە/ چيْژو بۆنى گۆراوە/ بۆگەنبووە.

(آجن وأَجِن): ئاوى گەراوە/ ئاوى بۆگەن.

٢-(أَجَــنَ – الثَوبَ أَجْنــاً): جلەكەى بەگەلاّ كوتك شت.

(ألإجانَة (ج) أَجاجين): ١-تەشت يان سويْنەى جلشتن ٢-گۆزەى گەورە.

(أَلمئجنَة والمئْجَنَة (ج) مَآجن): گەلاّكوتك.

أَح: (أَحَّ. أَحّاً): كۆكى

(ألأُحَاح): ١-تينويْتيى ٢-تووڕە بوونيْكى زۆر

(ألأَحِيــح وَالأَحِيحَــة) دەمارگيريــى/ رقهەستانيْكى زۆر.

أحد: ١-(أَحَدُو وَحَّدَ المُتَعَدِّدَ): ژمارە زۆرەكەى كرد بەيەك/ يەكيخستن

(-العَــدَدَ)(ع ح): يەكيْكيترى خســتە ســەر ژمارەكە.

(أَحَدْتُ – العَشَرَةَ): دەكەمكرد بەيازدە

(إتَّحَدَ- بِه): ١-لەگەلْيدا يەكيگرت/ تيْكەلْبوو

(إتَّحَــدَ –المــاءُ بالخَمــر) ئاوەكــەو مەيەكە تيْكەلْبــوون و يەكيانگــرت ٢-كۆبوونــەوەو گونجان/ ريْككەوتن/ يەكيانگرت

(إتَّحَدَ) – الفَريقان): دووتيپەكە يەكيانگرت و بوون بەتيپيْك.

(إسْتَأحَدَ): تاكبووەوە

(ألأَحَــد (م) إحدى (ج) آحــاد): ١-يەك ٢-(ع

ح) یەکانــی ژمارە (وەك چۆن دەڵێین دەیان و سەدان) ٣-بێهاوتا/ بێوێنە/ تاك

(فُـلان أَحُــدُ الأَحَدَيــن): فیسـار تاکـەو بێوێنەیە.

(ألأحد): یەکشەممە

(ألإحَد): خراپەکارییەکی گەورەو ناشیرین

(أُحادَ): تاکە تاکە/ یەکە یەکە

(جاؤوا أُحادَ أَحــادَ): تاکە تاکە هاتن/ یەکە یەکە هاتن/ یەك یەك هاتن

(أَلأُحَدِیَّة): یەکتایی/ یەکلایی/ تەنیایی.

(إحدی عَشَرَ): یازدە.

(حادي عَشَرَ) یازدەهەم.

٢-(وَحَّــدَ – اللهَ): خــودای بە تــاك و تەنها زانی و وتی

(لا إلهَ إلاّ الله): هیچ خودایەك نییە تەنها ئەو خودایە نەبێت کە تاك و تەنهایە.

(أَلأَحَد): لەناوە پیرۆزەکانی خودایە

(عبــد الأَحَد): ناوە: کۆیلــەی خودای تاك و تەنیا.

(أَلتَوحید): بەتاکزانینی خوداو پەرستنی ئەو تاکە خوادیە دژی هاوبەش بۆ پەیداکردنی

(أَلمُوَحِّد): ئەو کەســەی خــودای تاك و تەنیا دەپەرستێت دژی هاوبەش بۆ خودا پەیداکەر

احــن: (أَحِــنَ. أَحْنــاً): ڤینــەی کێشــاو دوژمنایەتیی لەدڵدا هەڵگرت.

(آحَــنَ – الرجُلَ. مُؤاحَنَــةً): دوژمنایەتیی لەگەڵ پیاوەکەدا کرد.

(ألإحْنَــةُ (ج) إحَــن): ڤینەبەرایەتی/ ڤین/ رقەبەرایەتیی

اخبط: (أَخْبوط وَأُخْطُبوط) (ح): هەشتیمار زیندەوەرێکی دەریایی پێ بەســەرەوەیەو لە نەرمۆڵەکانە. هەشــت پێی بەسەریەوە هەیە دەمتەســکە. لەســەر زینــدەوەرە دەرياييــە بێهێزەکان دەژی.

(أَخَذ: (١-أَخَذَ. أَخْــذاً وَتَأْخاذاً): وەریگرت، هەڵیگرت

(-ه): لێیوەرگرت/ گرتی، وەریگرت

(-مِن شــاربِه): لەســمێڵی گرتەوە/ سمێڵی کورتکردەوە

(-فیه الخَمرُ): مەیەکە (مەستیکرد/ گرتی/ کاری تێکرد)

(-عنهُ): ١-لێوەی وەرگرت ٢-لێوەی فێربوو.

(أَخَذَ عَن كُتُبِ الأَوَّلین): لەپەڕاوە دێرینەکانی وەرگرت و لێومیانەوە فێر بوو.

(أَخَــذَ عَنــهُ الجَبــرَ والهَنَدَســةَ): جەبــرو ئەندازەی لێوەوەرگرت و فێر بوو.

(أَخَذَ إخْذَهُ وَبِإِخذِهِ): ڕەفتاری ئەویگرت یان لەسەر ڕەوشتی ئەو ڕۆیشت خووی ئەویگرت

(-علی یَدِهِ): دەســتی نایە بەری و نەیهێشت ئەو کارە بکات کە دەیویست بیکات.

(-علی نَفسِــهِ): بەڵێنیــداو لە خۆی کرد بە ئەرك/ کارەکەی گرتە ئەستۆی خۆی.

(إتَّخَذَ-هُ وَتَخِذَهُ. تَخْذاً) كردى به.

(إتَّخَذَ-هُ صَدِيقاً): كردى به دۆستى خۆى

(ألأَخِيذ (ج) أخذى): ديل

(ألأَخِيذَةُ): ١-دەسكەوت و تالآنيى شەڕ كه لە دوژمن وەردەگيريت. ٢-ئەوەى بەزۆر زەوتكرابێتو برابێت.

(ألمَأْخَذ (ج) مَآخِذ): ١-شوێن و كات و چۆنيەتى و شێوەى بردن و دەسكەوتن ٢-بەرنامەو ڕێڕەوى هەڵسوكەوت ٣-شوێنوەرگرتن.

(ألمَآخِذ): ١- ڕاوگەكان.

(مَآخِذُ اللُّؤْلُؤ في الخليج): شوێنى دەرهێنانى مروارى لە نۆكەندى خليجدا.

(مَآخِذ الكتاب): ١-سەرچاوەى دانانى كتێب/ پەرتووك ٢-سەرچاوەى خوێندنو لێكۆڵينەوە.

٢-(أَخَّذَ-هُ): ئەفسوونى لێكردو سەرساميكرد/ دڵڕفاند/ شەيدايكرد

(ألأُخْذَةُ): نوشتە.

٣-(أَخَذَ-هُ بِذَنبِهِ أَخْذاً وَتَأْخاذاً): لەسەر گوناهەكەى سزايد.

(آخَذَ-ه. مُؤَاخَذَةً): سەرزەنيشتيكردو گلەيى لێكرد

(-هُ على ذَنبِهِ وَبِذَنبِهِ): لەسەر گوناهەكەى سزايدا.

٤-(إتَّخَذَ: زەبوونانە سەرى شۆڕكردو خۆى بەدەستەوەدا.

(إسْتَأْخَذَ): خۆى بەدەست ئازارەوە داو سەرى شۆڕكرد/ متبوو

(ألآخِذَةُ) (طب): سڕبوون و وشكبوونى ئەندامى لەش.

(ألأُخُذْ) (طب): وەردينەى چاو/ تراخومەى چاو.

٥-(أَخَذَ- يَفعَل): دەستى بە كاركرد

(-في كذا): دەستى بەوەكرد.

٦-(ألإخاذَة (ج) إخاذات وَإخاذ (ج) أُخُذْ وأُخْذُ): ئەستێل/ ئەستێرك/ شوێنيكە وەك گۆم ئاوى تێدا دەوەستێت.

اخر: (أَخَّر-هُ عَنهُ): تَأْخيراً): ئەوى لەودواخست/ ئەى خستە دوايەوە.

(تَأَخَّرَ وَاسْتَأْخَرَ): دواكەوت/ بەجێما

(ألآخَر (ج) آخَرون (م) أُخرى وَأُخْراة (ج) أُخَر وَأُخْريات): يەكێكيتر/ ئەويتر/ ئەويەكەيتر (دەبێت لەڕەگەزى پێشووترى بێت.

(جاءَنِي رجُلٌ وآخَرَ مَعَهُ): پياوێك هاتە لام كە يەكێكيتريشى لەگەڵدابوو واتا (پياوێكيترى لەگەڵدابوو كە لە خۆمانبوو)

(أَبْعَدَ اللهُ الآخَرَ): خودا ئەويتر دوور بخاتەوە كە لە خۆمان نييە .

(ألآخِر (ج) آخِرون (م) أُخرى (ج) أُخرَيات): ١-دوايين ٢-سەرئەنجام/ كۆتايى

(لا أَفْعَلُهُ آخر الدَّهر وأُخرى اللَّيالى) : تاهەتايە/ هەرگيزاو هەرگيز بەڵاى ئەو كارە

داناچم و نایکەم
(اَلأُخر = المُؤَخر): پاشین/ دواوە
(شَقَّ – الثوبُ أُخراً أَو مِن أُخرٍ): کراسەکەی لەدواوە هەڵتلیشاند/ پاشینی کراسەکەی هەڵتلیشاند.
(اَلأَخْرَة): ١-هێواش/ لەسەر خۆ ٢-لەدواییدا لە پاشان
(جاءَ أَخَرَةً وبِأَخَرَةٍ): لەدواییدا هات.
(اَلآخِرَةُ والأُخرى): ئەومدنیا/ ڕۆژی دوایی.
(أُخْرويّ): ئەوە دنیایی.
(اَلمُؤخِر (ج) مَآخِر): قنچکی چاو.
مؤخَّرُ- الشيء: (دواوەی/ پاشەوە) شت/ پاشووی شتەکە – پاشین.
(مُؤَخَّرُ السَّفينَةِ): دواوەی پاپۆرەکە
(اَلمئخار (ج) مَآخير – مِنَ النَّخلِ): (ن): ئەودار خورمایەی کە تا دوای زستانیش بەری پێوە دەمێنێتەوە.
(اَلمُتَأَخِّر): دواکەوتوو/ کۆنەپەرست/ کەسێکە کە پێبەپێی سەدەکەی لە ڕووی ڕۆشنبیری و شارستانەتییە وە نەڕوات جنگی لە نەریت و بیرو بڕوا کۆنەکان بەرنەدات ئەمە بە پێچەوانەی تازەخوازو کەسی ڕوو لە گۆڕانەکە لەگەڵ سەردەمەکەو سەدەکەدا دەڕوات.
٢-(اَلأَخُور (فارسی): تەویلەی وڵاخ.
اَلمُلحَق
اخر: (اَلمُؤَخَّرَة): پاشوو/ دوایین/ بەشی دواوەی شتەکە.
(مُؤَخَّرةُ السَفينَةِ أَو السَيَّارَةِ): بەشی دواوەی پاپۆرەکە یان ئوتومبیلەکە.
(مُؤَخَّرَةُ الجَيش) (ا ع): دەستەی پاشینی/ دواوەی سوپاکە لە ڕۆیشتندا کە پارێزگاریی دواوەی سوپاکە دەکات (ئەمە پێچەوانەی پێشەنگە).

---

اخط: (اَلأُ خُطبوط): (ح): تەماشای (أُخْبُوط) بکە.
أَخل: (اَخيليا = قَيسون): ڕێحانە کێویلە. لەرەگەزی گیایە. گوڵ لوولەیە. بۆنخۆشە و ڕەنگی زۆرە گوڵی سەوزو سپیە، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرە.
أَخن: (اَخْيون (یونانیە)(ن) ڕووەکێکە (سەرەمار)ی پێدەڵێن. جۆرێکە لە (زمانە گا) لە پزیشکیدا بەکاردێت چونکە بەڵغەمی خەستەوە بووی سنگ هەڵدەکەنێت و میزیش بەمرۆڤ زۆر دەکات.
أَخا: ١-(اَخا-ُه وآخى-ُه أُخْوَةً وإِخاءً وَمُؤاخاةً وَإِخاوَةً): بوو بە برای و وەك برای یان بوو بە دۆستی.
(تَأَخى-ُه): کردی بە برای خۆی و بەبرای خۆی زانی.
(تَآخَيا): بوون بە برای یەکتر.
(اَلأَخُ والأَخُّ والأَخُو والأَخْوُ): برا
(أَخَوان): دوو برا (ج)

(إِخْــوَة وَأُخْــوَة وَإِخْــوان وَأُخْــوان وأَخُون وآخاء): برای دایك و باوكیی. یان برای دایكی یان برای باوكیی كه زربران.

(أخ (ج) ألإِخْــوَة – مِــنَ النَسَــب): بــرای هاوپشت

(هؤُلاء إِخْوَةُ فُلان): ئەوانە برای هاوپشــتی فیسارن.

(ألإِخْوَة): دۆســت/ برادەر (لە هاورێیەتیەوە دەبنە دۆست)

(هؤُلاء إِخوَةُ فلان): ئەوانە برادەرو دۆســتی فیسارن

(هؤُلاءِ إِخوانُ الصفا)(يُسْــتَعارُ لِكُلّ مشاركٍ لِغَــيرِهِ في القبيلَة أَو في الدنيــا أَوفي الصَنعَة أَوفي المعامَلَةِ أَوفي غير ذلك مِن المُناســبات): بەهەموو هاوبەشــێك لە خێڵدا یان لە جیهان و ژیاندا یان لە پیشــەدا یان لە هەڵسوكەوتی كاردا یان لە هەر هاوبەشییەكیتردا دەڵێن برا و دۆست.

(ألأُخْــوَةُ في عُــرفِ الرُّهْبــان): لــە نەریتی پارســاو ریســایاندا بەوانە دەڵێن كە هێشــتا نەگەیشــتوونەتە پلــەی رەبەنیــی و وئــەو برایانــەن كــە دەســتپێكەرو خوێنــدكارن ئەوانــەش برایانی كارن كە نەگەیشــتونەتە ئەو پلەو پایەیە.

(ألأُخت): خوشك.

((ج) أَخَوات): خوشكان.

(أَخَــوِيّ وَأَخِــيّ): برادەرانــە/ دۆســتانە/ برایانە.

(ألإِخــاء): ١-برایەتیــی ٢-دۆســتایەتیی و هۆگریی.

(أَخَوِيَّــة): بەدەســتەیەك بــرادەر دەڵێن كە هاوئاین یان هاو هەرشتێكیتر ببن و بەشداریی رێرەوێك بكەن.

٢-(أَخِيّ- للدابَّةِ): پەتی بۆ وڵاخەكە كرد كە پێی ببەستێتەوە

(ألأَخِيَّــة والآخِيَــة (ج) أَواخِــيّ وَأَخايــا وَأَواخ): مێخناخور/ پەتێكە كە بەمێخزنجیر قایمدەكرێت وڵاخی پێدەبەستنەوە

(شَــدَّ اللهُ بَينَكُما أَواخي ألإِخــاءِ): خودا بە پەتی برایەتی پێكەوە بتانبەستێتەوە

(تَأَخّى وتَوَخّى- الشــيءَ): بەنیازی شــتەكە بوو، بۆ شتەكە گەراو سۆراغیكرد.

اد: (أَدَّ-هُ الوَيــلُ أَدّاً): (وەی/ چورتــوم)ی تووشبوو

(-هُ الأَمــرُ): كارەكــە باری شــانی گرانكردو سەراسیمەیكرد

(-الرَجُلُ في الأَرض): سەری خۆی هەڵگرت و رۆیشت/ وێڵبوو.

(تَأَدَّدَ- الأَمرُ): كارەكە سەخت و دژوار بوو.

(أَديد): كاری سەخت و دژوار.

(ألإِدّ والإِدَّةُ (ج) إِداد وَإِدَد): ١-كاری نــا هەموارو نابەجێ و زشت ٢-ئاپۆرەی گران كە

هەڵنەگیرێت.

أَدب: (أَدُبَ. أَدَباً): ناسـکبوو ڕەفتارو ڕەوشت جوانبوو.

(أَدَّبَ-هُ): بەوێل و ڕەوشتجوانیکرد.

(مُؤَدَّب): ڕەوشتبەرز.

(أَدَبَ-هُ): تەمێیکـرد/ لەسـەر خراپـەو سەرپێچیی سزایدا.

(ألتَّأديبات الكَنَسِيَّة): تەمێکردنی کڵێسەیی

(تَأَدَّبَ): جوان پەروەردەو بەرەوشتی بەرزبوو

(-بِهِ): لە ڕەوشت و ڕەفتاردا چاوی لەو کرد

(-عَن فُلان): ڕەوشتی ئەویگرت.

(إسْـتَأْدَبَ = تَأَدَّبَ): ١-جوان ڕەوشـت و چاك پەروەردە بوو ٢-تەمێخواردوو بوو.

(أَلأَدَب (ج) آداب): ١-وێـلـو ناسـکیی و ڕەوشتبەرزیی ٢-پەروەردە جوانیی

٢-(آدَبَ السُلطانُ البلادَ إيداباً): سوڵتان/ میر دادو یەکسانیی لەوتدا بەرپاکرد.

٣-(أَدُبَ. أَدَبـاً): بووبـە وێژەوان/ نووسـەر (کەسێکە لەوێژەو زماندا شارەزاو ڕۆشنبیرێکی بەرزە).

(أَديب): وێژەوان/ نووسەر

((ج) أُدَباء). (أَدَّبَ-هُ): فێری وێژەیکرد.

(تَأَدَّبَ): فێری وێژە بوو.

(ألأَدَب (ج) آداب): وێـژە بەجۆری گشـتیش بە هەموو زانسـتیی و زانیاریی یان بەشتێك بەکەسێك دەڵێن کە شیاوبێت.

(آدابُ الدَرس): دەستووری فێرکردن

(آدابُ القاضي): دەستووری دادوەر.

(عِلمُ الأَدَب): زانسـتیی وێژە. زانستیەکە کە ئاخاوتن و نووسـین ڕێکدەخات و بێخەوشیی زمان ڕەچاو دەکات.

٤-(أَدَبَ وآدَبَ. أَدبـاً. إيداباً): میوانداریکرد/ نانی بۆ میوانکرد

(-هُ): بـۆ نانخواردن و میوانیـی بانگیکرد/ میوانداریکرد.

(أَدَبَهُم- على أمرٍ): بۆ کارێك کۆیکردنەوە.

(أَلأَدْبة والمَأْدَبَـةُ (ج) (مَآدِب): میوانداریی/ نان بۆ میوانکردن بەبۆنەیەکەوە وەك شـایی و هەربۆنەیەکیتر.

(أَقامَ مَأْدُبَةً على شَرَفِ فلان): میوانداریەك و نانخواردنێکـی ڕێزلێنانی بۆ فییسـارکەس ڕێکخست.

أَلمُلحَق

ادب: (أَلأَدَبـيّ) = المَعْنَـوي١-ئامادەیـی – دەروونیی و سـۆزو ئاوەزیی، کە کەسـایەتی بەهێز دەکات/ وتایی کە پێچەوانەی مادییە.

(مركز أَدَبيّ): مەڵبەندێکی وێژەیی.

(أَذىً أَدَبـيّ): سـزایەك کـە پەیوەندیی بە ڕەوشتەوە بێت.

(لاهوت أَدَبي): هەموو بەرهەمی بیری مرۆڤ بەشـێوەیەکی بەرفـراوان کە بەشـێوازێکی هونەریی دەربڕابێت.

(بَحث أَدَبي): راڤەیەکی وێژەیی.
(نَقدٌ أَدَبِيّ): رەخنەی وێژەیی.
(إلتزام أدَبي): ئەوەی کە بەپێی دەستووری رەفتاری باشەو لەلای خەڵك و کۆمەڵ بە رەفتار و هەڵسوکەوتێکی باشی دادەنێن و پەسەندە.
(ذوقٌ أَدَبيّ أَسْلوبٌ أَدَبيّ): ئەوەیە کە پەیوەندیی بەلایەنی جوانیی ئاخاوتنەوەیە بەشێوازی وێژەیی و پەیوەنداریی بەلایەنی جوانیی گوفتارو قسە کردنەوەیە.
(اَلتَّأديب) = اَلتَهذیب: فێرە رەوشت و رەفتاری جوانکردن.
(تَأديب الشَّباب): لەسەر رەوشتی جوان لاوان پەروەردەبکرێت.
(اَلتَّأديب: ترويض الحيوان): رامکردنی زیندەوەر.
(اَلتَّأديب): سزادان بە ئامانجی راستکردنەوەی سەرپێچیکەر و خراپەکار و جوانکردنی رەفتاری
(تَأديب وَلَد) سزادانی کورێك بۆ راستکردنەوەی هەڵسوکەوتی.
(تَأديب تلميذ): فێرکار فێری وێژەو هونەرەکانی بکرێت.
(أَدَّبَني رَبّي فَأحسن تَأْديبي): خودا پەروەردەیکردووم پەروەردەیەکی چاك و بەرزیکردووم (ئەمە فەرمووده‌یەکی پێغەمبەرە).
(اَلتَّأديب في الفِقه): لەشەرعدا سووکە سەرزەنشتێکە بۆ ئامانجی راستکردنەوەو چاککردنەوەیە
(مَجلِسُ اَلتَأْديب أَو اَلمَجلِسُ اَلتَأْديبي): ئەنجوومەنی چاککردن و راستکردنەوەی رەفتارو تەمێکردن: دەسەڵاتێکە دەروانێتە سەرپێچیی کارمەندان لەرووی کارو شیرازەوە و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات.

---

ادم: ١-(أَدَمَ- اَلخُبْزَ. أدماً): نانی بەپێخۆرەوە خوارد.
(اَلخُبْزُ مَأْدُوم وَأَديم): نان بەپێخۆرەوە
(إئتَدَمَ): نانەکەی بە پێخۆرەوە خوارد.
(اَلإدام (ج) آدام وأُدُم): هەموو گونجاوێك و رێکەوتوویەك
(إدامُ الطَّعام): پێخۆری نان.
(اَلأَدَم): ئەوەی دەکرێت بە پێخۆری نان/ بەنانەوە دەخورێت.
٢-(أَدَمَ- أَهْلَهُ. أدْماً): بوو وبە نموونەی فامیلیاکەی/ خێزانەکەی.
(أَدَمَ وآدَمَ مُتَخاصمين. إيداماً): ناکۆکەکانی رێکخستنەوە/ یەکخستنەوە.
(آدَمْ (ج) أَوادِم): ئادەم/ باوکی مرۆڤان بە هەموو تاکە مرۆڤێکیش دەوترێت.
(آدَمِيّ): مرۆڤ/ ئادەمی.
(اَلأُدْمة): ١-خزمایەتی خوێشایەتی/

کەسایەتیی ٢-هۆ/ هۆکار/ ڕێگە.
٢-(أَدِمَ وأَدُمَ. أَدَماً وَأُدْمَةً): بۆر بوو/ ڕەنگبۆر بوو.
(ألآدِم (م) أَدَماء (ج) أُدْم): بۆر/ ئەسمەر.
(ألأُدمَــةُ): ڕەنگبۆریــی/ بۆریــی/ ســووکە ڕەشتاڵیی.
٤-(ألأَدَمَــةُ والأَدَم): ١-ناوەوەی پێســت/ ژێر پێست ٢-ســەرەوەی پێســتی لەش ئەوەی کە بەدەرەوەیە
(فُــلانٌ إدامُ قَومِــهِ وَآدَمُ بَنِي أَبيــه وَأَدَمَةُ قَومِهِ): فیســار پێشەنگ و پێشەوای نەتەوەو میللەتەکەیەتی کە بەوەوە دەناسرێن
(ألأَديم (ج) أَدَم وَأُدُم وآدَمَة وآدام): پێستەی خۆشەکراو/ دەباغیکراو.
(-الضحى): سەرەتای چێشتەنگاو
(-السَّماءِ أَو الأَرضِ): ڕووی ئاسمان یان زەوی ئەوەی کە دەرکەوتووە.
(-النَّهارُ): ڕووناکیی ڕۆژ واتا هەموو ڕۆژەکە
(ظَلَّ أَديمُ النَّهارِ صائِماً): بەدرێژایی ڕۆژەکە بەرۆژوو بوو/ هیچی نەخواردو نەخواردەوە.
(ألأَدَّام): بازرگانیــی پێســتەی خۆشــەکراو پێستە فرۆش.
ادا: ١-(أَدا- الثَّمَــرُ. أُدُواً): بــەری درەختەکە پێگەیشت
(-اللَّبَنُ): شیرەکە مەیی.
٢-(أَدَا —اللَّــبَن. أَدْواً): ماســتەکەی ژەنــدو کەرەکەی لێگرت.
٣-(أَدا- لِلرَّجُلِ. أَدْواً): خۆی بۆنایەوە و فێڵی لێکرد/ لە خشتەیبرد
(تَــأَدَّى وَتَــآدى): ١-ئامێــری بەکارهێنــاو خــۆی ئامادەکرد ٢-خۆی بــۆ ڕۆژانی ڕەش و لێقەومان/ بۆ ڕۆژگار ئامادەکرد ٣-خۆی گورج و ئامادەکرد.
(ألأَداة (ج) أَدَوات): ١-ئامێــر ٢-دەســکەلا ٣-ئامراز
(أَداةُ التَّعْبيرِ): ئامرازی دەربڕین کە زمانە.
(أَدواة النِجارَة): کەرەستەو ئامێری دارتاشی.
(أَداة الجَــزم): پیتــی زنــەکار لــە زمانــی عەرەبیدا.
(ألإداوَة (ج) أَداوى): دەفری بچووکی لەچەرم دروستکراو.
أَدى: ١-(أَدى- الشيئَ أَدياً): شتەکەی گەیاند.
(أَدَّى —الشى تَأْدِيَةً): شتەکەیگەیاند.
(أَدّى إِلَيهِ الخَبَرَ) هەواڵەکەی پێگەیاند.
(تَأَدَّى- إِلَيهِ الخَبَرُ): هەواڵەکەی پێگەیشت.
(ألأَداء): ٢-گەیاندنــی شــتەکە بــەوەی کــە بۆیدەنێردرێت ٢-بەجێهێنان/ بەئەنجامگەیاندن.
٢-(أَدى —هُ. أَدياً): بەجێیهێنا/ جێبەجێیکرد.
(أَدى ماعليه مِن دَينٍ): وامەکەی/ قەرزەکەی بەخاوەنەکەیدایەوە.
(أَدَّى واجِبَ الإحترام): پێویستی ڕێزلێگرتنی بەجێهێنا.

(تَـأَدّى- لَـهُ مِن حَقِّـهِ): مافەکـەی خۆی دایەوە

(ألأداء): بەجێهێنـان ٢-بەئەنجامگەیانـدن ٣-گەیاندنی شت.

٣-(آدا-هُ عَلَيـهِ. إيـداءً): ١-کۆمەکیکـرد/ یارمەتیدا. ٢-خـۆی ئامادەکـرد ٣-بەهێزبوو/ قایمبوو.

(إسْـتَأدى – آخَـرَ عَلَيـهِ): یەکێکـی لێراسـتکردەوەو بەگژێداکرد/ پەنایبردە بەر یەکێک دژی ئەو.

(- فُلاناً المالَ): دارای لە فیسار وەرگرت

(-عليه) خەڵکی لێراستکردەوە.

(أدّی – اليَمينَ): سوێندیخوارد.

(-الشهادة): شایەتیدا.

(-الی): بوو بەهۆی.

اذ: ١-(إذ): ئاوەڵـکارە بـۆ رابـوردوو (تەنها رستەی لەدواوە دێت. دەشێ رستەکە لابرێت لە بری ئەوە دوانە بزوێنە بکرێت

(مَتی جاءَ كُمُ المَـوتُ فيحينَئِذٍ تَعْلَمون): لە پێشدا ئەمە ئاوابووە

(فَحـينَ إذ يَجـيءُ تَعلَمـون): هەردەمێـک مردنتان بۆ هات ئەوسا دەزانن و تێدەگەن.

(إذ تَأْتي للمُفاجَئَة): نخو: بۆ لەناکاودا دێت

إذ: للمفاجأة: بۆ لەپڕ، لە ناکاودا وەک:

(بَينَما أَنا جالِسٌ إذ جاءَ زَيدٌ): من دانیشتبووم کە زەید لەناکاو/ لەپڕهات/ پەیدابوو.

(إذ تَأتي حَرفـاً بمَعنى لام التَعليل): لەبەر ئەوەیکە/ چونکە

(ضَرَبتُ إبني إذ أَساءَ): لەکورەکەمدا (لەبەر ئەوەی/ چونکە) خراپ جووڵایەوە.

٢-(إذا: ظَـرفٌ لِلمسـتقبل مُتَضَمّن معنى الشَـرط): ئەگەر/ هەر دەمێک (ئاوەڵکارە بۆ دوا رۆژ/ بۆ ئایندە و بەمەرجەوە.

(إذا إجتَهَـدْتَ نَجَحْتَ): ئەگەر کۆششـتکرد دەردەچیت.

(إذا): پیتە بۆ لەنـاکاو/ لەپڕ: کاتێکم زانی/ هێندەمزانی/ لەپڕا.

(خَرَجْتُ فَإذا أَسَدٌ بِالباب): چوومە دەرەوەو کاتێکم زانی شێرێک لەبەردەرگایە.

(إذمـا = إن الشَـرطِيَّة): پیتـی مەرجـە: هەرکاتێ/ ئەگەر

(إذ ما تَقُمْ أَقُمْ): ئەگەر تۆ هەستایت منیش هەڵدەستم.

(إذَن وإذاً): پیتی وەڵام و وپاداشت یان سزایە: کەواتە. ئەگەر یەکێک بڵێت: سەردانت دەکەم لەوەڵامـدا دەڵێیـت کەواتـە منیـش رێزت لێدەگرم/ پێشـوازیتدەکەم. بـەڵام ئەگەر بۆ هۆیەکی دەسـت بەدەسـتبێت هەر دەوترێت (کەواتە) ئەوە رێگەی راسـتەو ئەوە راسـتە. (إذاً هذا هُوَ الصَّواب).

اذر: ١-(أذار وَآذار): (سـريانية) = مـارس: نەورۆز/ ئایار سیویەک رۆژە سێهەمین مانگی

زاینه.

٢-(أَلاّ ذَريون: هەمیشــە بەهار جۆرە گوڵێکە پرتەقاڵــی لەوڵاتەکانــی دەریای ناوەراســتدا زۆرەو لە باخچەکاندا دەروێنرێت.

اذن: ١-(أَذِنَ- بالشــيءِ. إذنــاً وَ أَذَنــاً وأذاناً وَأَذانَةً): بەشتەکەیزانی

(-إليهِ وَلَهُ. أَذَناً): بەپەرۆشــەوە تەواو گوێی بۆ شلکرد/ گوێی بۆ هەڵخست

(حَدَّثْتُهُ فَأَذَن لي أَحْسَنَ الأَذَن): قسەمبۆکرد زۆر چاك گوێی بۆ شلکردم و گوێی لێگرتم

(آذَنَ – فُلانــاً الأمــرَ وبالأمــر. إيذانــاً): کارەکەی بەگوێی فیســاردا دا/ پێی راگەیاندو لێی ئاگادارکرد.

(أَذَّنَ – بالصَّــلاةِ. تأذيناً): بانگی (نوێژیدا/ راهێلا).

(تأَذَنَ): سوێندیخوارد.

(-الأمرَ): لەکارەکــەی ئاگادارکرد/ کارەکەی پێراگەیاند.

(-بالشَرِّ): هەرەشەی خراپیکرد.

(ألإذْن): ئاگایی/ ئاگاداری/ ئاگالێبوون.

(فَعَلَهُ باذني): بەئاگاداریی من و رێدانی من ئەو کارەیکرد.

(أَلأذان: ١-بانگدانی نوێژ (لەلای موسوڵمانان) ٢-پێراگەیاندن

(أَلأذِين): ١-بانگدەر/ بانگهێشت ٢-دەستەبەر/ کەفیل ٣-سەرۆك.

(أَلمِئْذَنَة (ج) مَآذِن): بانگگە/ منارە.

(أَلمُؤَذِّن): ١-بانگدەری نوێژکردن لە ئیسلامدا ٢-بانگهێشت کە بانگی پێراگەیاندن بە ئاشکرا دەکات.

٢-(أَذِنَ- لَهُ في الشيءِ إِذْناً وَأَذِيناً): مۆڵەتی بۆ ئەوشتەدایە/ رێگەی پێدا/ هێشتی.

(مأذون لَهُ): رێپێدراو/ مۆڵەتدارو/ هێڵراو.

(إسْــتَأْذَن-هُ): رەپێپێدانی لێخواست/ مۆڵەتی لێوەرگرت و داواکرد.

(-عَلَيــهِ): داوای لێکرد دیداری بکات/ بچێتە لای/ سەری بدات.

(أَلأذِين): پەردەدار/ سکرتێر.

(ألإذْن): مۆڵەت/ رێگەپێدان/ هێشتن.

(أَلمَــأْذون): ١-قازی ٢-کەســێکە کە بروانامەی زانستیی باڵایان یاساگەریی هەبێت.

(أَلمَأْذونِيَّة): ١-رێپێدان لە زانســتیی باڵادا یان لە یاسادا ٢-مۆڵەت/ ریدان/ هێشتن.

٣-(أَذَنَ-هُ أَذنــاً): زیانــی بەگوێیــدا/ گوێی زەدەدارکرد.

(أُذِنَ): هاواری ئازاری گوێیکرد.

(آذَنَ – الرَجُلَ إيذاناً): ئازاری بە گوێی گەیاند.

(أَذَّنَ – الوَلَدَ): گوێی منداڵەکەی هەڵگلۆفت

(أَلأُذْن والأُذُن): (لــە عەرەبیــدا وشــەیەکی مێیە) (ج) آذان): گوێ/ گوێچکە.

(أُذَينَة): گوێچکۆلە.

(فُلانُ أذنٌ مِنَ الآذان): فیســارکەس گوێ بۆ

هەموو کەسێك شلدەکات و هەڵدەخات/ گوێلە مشــتە (بۆ هەمووان هەر ئــەو واتایە بەکار دەهێنرێــت)، دەوترێت. (هي أُذنٌ وَ هُما أُذنٌ وَهُم أُذنٌ... الخ): ئــەو ئافرەتە گوێهەڵخەرو گوێلەمشــتە. ئەودوانە. ئەوان گوێشلکەرن... هتد.

(جاءَ ناشِراً أُذُنَيه): هاتووە گوێی تەپکردووەو بێئاگایە.

(أُذنُ اِبريق): دەسکی مەسینە.

(آذانُ الجَدي (ن)): گوێبەرخە.

(آذانُ الأرنَب) (ن): گوێکەروێشکە.

(آذان الفيل) (ن): گوێفیل.

(آذان الفَأر) (ن): گوێمشــکە. (ئەمە گوڵێکە لەبنەچــەی حِمحِميــات ڕەنگشــینەو بچووکە/ وردە لە ئەوروپا زۆر پەسندە.

(آذانُ الــدُبِّ) (ن): گوێورچــە. ڕووەکێکــە بەزۆریــی تەمەندرێــژەو گــەڵا گەورەیــە. گوڵەکەی زەردەو بەهێشووە

(أَلآذَن والآذانيّ): گوێگەورە.

(أَلأُذَين الأيسَروَ الأيمَن): گوێچکۆڵەی چەپ و گوێچکۆلەی ڕاستی دڵ.

٤-(آذَنَ- العُشــبُ إيذانــاً): گیاکــە خەریکی وشکبوونە.

الملحق:

اذن: (المُؤَذِّن): بانگهێشــت/ کەســێکە بانگی پێراگەیاندن بەدەنگی بەرزو ئاشکرا دەدات و دەگەیەنێت.

(المُؤَذِّن – اســلامِياً): بانگــدەری نوێژکردن لــە ئیســلامدا کە بــە دەنگی بــەرزو خۆش بانگدەدات.

---

اذی: (أَذِيَ. أَذىً وَأَذاةً): ئازاری پێگەیشت.

(آذى – الرَجُــلَ. ئيــذاءً): (ئــازار/ ئێش)ی پێگەیاند.

(أَلأَذى وآلأَذِيَّة والأَذَاة): ١-(ژانێکی ئازارێکی/ ئێشێکی) کەم ٢-زیانێکی کەم.

(أَلأَذِيّ): (ژانێکی/ ئازارێکی/ ئێشــێکی) زۆر پێگەیشتوو/ ئازار کارتێکردوو ٢: زیانبەخش ٣: ئازاردەرێکی زۆر.

(أَلآذِيّ): شەپۆل.

(تَأَذّى): ئازاری پێگەیشت.

أَرِب: ١-(أَرِبَ. أَرَباً): کارامەبوو/ شارەزابوو.

(أَرِبٌ وأَريــبُ (م) أَريبَــةُ): کارامە/ کارزان/ شارەزا.

(أَرِبَ- بالشيءِ): لەشــتەکەدا شارەزایی باش پەیداکرد/ کارامەبوو/ لێزانبوو.

(أَرُبَ. أَرابَةً وإِرَباً): چاوی کرایەوەو هوشیاریی پەیداکرد/ ژیربوو.

(أَريــب وأَرِبٌ (م) أَريبَة): وریا و وچاوکراوە ژیربوو، کارزانبوو.

٢-(أَرِبَ- إليه): پێویستی بەو بوو

(-بالشيءِ): شتەکەی خرایە ئەستۆ/ شتەکەی پێسپێردرا.

(ألأَرَب (ج) آراب): ١-نيــاز/ نامانــج ٢-پێداویستیی

(أَلمَأْرَب والمَأْرَبة وَالمَأْرُبَة والمَأَرَبَة (ج) مَآرِب): ١-پێداویستی ٢-مەبەست/ نامانج/ مەرام.

٣-(أَرَبَ - العَقْــدَ أَرباً): (ب) تاقەکەی پتەو دروستکرد.

(أَرَّبَ -الشــيءَ): شــتەکەی (توند و تۆکمە/ پتەوکرد)/ پتەو دامەزراند

(تَــأَرَّبَ - تِ العُقْــدَةُ): گرێکــە چەســپ و پتەوبوو/ توندبوو

(-الأمرُ کارەکە گیربوو/ گرفتی تێکەوت

(أَلأُربَةُ (ج) أُرَب): ١-گرێقایمە ٢-بۆینباخ.

٤-(أَرَبَ -هُ مُؤارَبَةً): فریویدا/ لە خشتەیبرد

تَــأَرَّبَ: خــۆی بــەزۆرزان و زرنــگ (نواند/ پیشاندا)

(إسْــتَأْرَبَ): ١-وامــی خواســت/ قەرزیکــرد ٢-کەڵەکبازییکرد ٣-بەهەڵەیدابرد ٤-لە دڵەوە رقی لێهەڵگرت و دەرینەخست

(ألإرب والإرْبة): ١-زۆرزانیی و فێڵبازیی.

٥-(أَرِبَ- الرَجُــلُ): ئەندامەکانــی پیاوەکــە بەربوونەوە.

(-الرَجُــلَ. أَرْبــاً): کێشــای بــە ئەندامێکی پیاوەکەدا.

(أَرَبَ - الشاةَ): مەرەکەی کوتە کوتەکرد.

(ألإرْب (ج) آراب): ئەندام.

(قَطَعْــتُ الذَبيحَةَ إِرْباً إِرْباً): ســەربڕاوەکەم پارچەپەرچە کرد/ کوتە کوتە کرد.

(الأُربِيَّة): بنی ران.

٦-(إربيان وروبيان) (ح): رۆبیان لە رەگەزی قرژاڵی دەریاییە لــە توێکڵدارە دەپێکانە زۆر جۆری هەیەو گۆشــتی خۆشــە. لــە کەناری دەریــای ســپی ناوەراســت و ئۆقیانوســدا راودەکرێت پێشیدەوترێت (قُرَیدس).

أَرث: (١-أَرَثَ): ئاگریکردەوە

(-بَينَهُــم): ئاگــری ئاکۆکیــی و ئــاژاوەی تێبەردان.

(تَأَرَّثَ- تِ النَّارُ): ئاگرەکە کلپەیسەند

(أَلأَرْثَــةُ وَالإِراثُ): ئــەوەی کــە ئاگــری پێدەکرێتەوە/ چاوگی ئاگری.

٢-(إرث): میرات پاشماگە/ جێماوە.

(أَرِج: (أَرِجَ. أَرَجــاً وَأَرِیجــاً وتَــأَرَّجَ): بۆنی خۆشیدایەوە

أَرِج): بۆنخۆش.

٢-(أَرَجَ - الحَــقَّ بالباطِل أَرجاً): راســتییو ناراســتیی تێکەڵکــرد/ هــەق و ناهەقــی بەیەکدادا.

(أَرَّجَ - القَــومَ وبَينَهُم): خوێشــگەڵی لەیەك وروژاندو کردنی بە دوژمنیی یەکتر.

(أَرَّاج): ئاشوبگێر و خەڵك تێکبەردەر.

(أَرَّجَ - النارَ): ئاگرەکەیکردەوە.

٣-(أَرِجَ -النــاسُ. أَرَجــاً): خەڵکەکە دایانە پرمەی گریان.

أَرجــن: ١-(أُرجُــوان) (ن) = زَمريق): ١-دار ئەرخەوان (فارســية) درەختێكــى بچووكە گوڵەكــەى مــۆرە و لەســەرەتاى بەهــاردا دەردەكەوێت و پێش گەڵاگرتنيەتى بەزۆريى لە خۆرهەڵاتى دەرياى سـپى ناوەڕاستدا زۆرە بۆ ڕازاندنــەوەش دەروێنرێت ٢-بۆيە يەكى ســووره فينيقيەكان بەكاريــان دەهێنا بە تايبەتى دانيشتوانى (سوور) كە لە سەدەفى (مۆركس) دەرياندەهێنا ٣-بەرگێكە سوور كە بە ئەرخەوان بۆ يەدەكرا.

(الرُقْعَه الأُرجوانِيَّــة): دەربڕيەكى وێژەييە لە بنچينەدا ئينگليزييــە. بەدەربڕەى ڕەوان و جوان دەوترێت كە لە دارشــتەيەكى لاواز و بزردا ببينرێت.

٢-(أَرجون) (ك): گــازى ئارگۆن. گازێكە بە بڕێكى كەم لە هەوادا هەيە. بۆ پڕكردنەوەى گولۆپى كارەبا بەكار دێت. هێماكەى (AR)ە.

ارخ: ١-(أَرَخ وآرَخ الكِتــابَ أوالحادِث. تأريخاً وَمُؤارَخَــةً): دەمى نووســينى پەڕاوەكە يان كاتى قەوماوەكەى تۆماركرد.

(أَلتَأْريــخ والتاريــخ (ج) تَواريخ): مێژوو/ دەمى ڕووداو/ ناسينى سەردەم.

(تأريخُ — الشيء): (مێژوو/ دەم)ى ڕوودانى شتەكە

(عِلمُ التَأريخ): زانســتيى مێژوو كە باســى قەومان و كات و هۆى ڕووداوەكان دەكات

(أَلمُؤَرِّخ): مێژوونووس.

٢-(أَلأَرْخَبيل) (يونانيه): كۆمەڵە دوورگەيەكى نزيك يەك.

٣-(أَرخيولوجيــا أوأَركيولوجيا) (يونانيه): زانســتيى پاشــماوە دێرينــەكان و هونــەرە كۆنــەكان كــە بەشــێكى كۆنينەو پاشــماوە دێرينەكانن.

اردب: (أَلإِرْدَب (ج) أَرادِب): ربــە: پێوەرێكى گەلى ميسرە كە (٢٤) صاعە.

أَرز: ١-(أَرَزَ. أَرْزاً وأُرُوزاً): كرژبــوو/ چووميەك.

(-ت الحَيةُ): مارەكە خۆى بە كونەكەدا كردو خۆى تێدا قايمكرد.

(فُــلان يَــأرُزُ إلى وَطَنِهِ): بۆ هەر شــوێنێك بچێت هەر بۆ نيشتمانەكەى دەگەڕێتەوە.

(آرِز): بنجبەست و قايم

(شجرَةٌ آرِزَةٌ): درەختێكى بنجبەست و قايم.

(أَريزُ — القَوم): گەورەو ڕاگرى خوێشــان يان سەروەرو پشتيوانى نەتەوە.

٢-(أَرَزَ- اللَيلُ): شەو زۆر ساردیكرد.

(أَريز وآرزوأَرُوز): شەوى زۆر سارد.

(بِتْنا لَيْلَةً آرِزَة): شەوێك ماينەوە لەسەرماندا لەشمان تەزى و كرژبوو.

(أُرَزَت أَصابَعَــهُ مِــنَ البَردِ): لەســەرماندا پەنجەكانى كرژبوون، پەرين.

٣-(أَلأَرُز والآرُز والأُرُزّ والــرُزّ) (ن): برنـــج،

چەڵتــووك. ڕووەكێكــە لەگــەڵ گەنمــدا خواردنێكــی ســەرەكیی مرۆڤــە. لــە وڵاتە گەرمەكانــدا لە گۆلدا كە هەمیشــە پڕلە ئاو بێت دەچێنرێت.

(ألأَرْز) (ن): داری هاڤریســك درەختێكــە لە كۆمەڵــەی كاژە دارەكەی بــۆ ڕەقیی و چاكیی باشــترین دارە زۆر جۆریشــی هەیە بەناوێر ترینیــان هاڤریســكی لوبنانی و ئەتڵەســی و شاخی هیمالایەیە.

(ألأَرزيَّــة) (ن): درەختێكە لە كۆمەڵەی كاژە و دارەكەی باشــترین دارە لە وڵاتە ساردەكاندا و لــە كێوەكانــدا دەڕوێــت لــە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا نییە.

ارس: (ألأَرسْــتُقراطي) (يونانية): كەسێكی چینی خانەدانەكانە.

(ألأَرستُقراطِيَّة): ١-چینی سەرەوەی كۆمەڵ/ چینــی خانەدانــەكان و پیــاوە ماقــووڵان ٢-بەڕێوەبەرێتی چینی خانەدانەكان و پیاوە ماقوڵان.

ارش: ١-(أَرَش-ە) ١-بەشت لاسیدا، شتەكەی لا خۆشەویستكرد ٢-هانەهانەی شتەكەیدا.

(أَرَّش- بَينَهُــم): نێوانی تێكــدان و لەیەكی هاندان.

(-الحَربَ أَوِ النَّارَ): شــەڕەكەی هەڵگیرســاند یان ئاگرەكەی كردەوەو خۆشكرد.

(ألأَرْش (ج) أُرُوش): ١-بەرتیل ٢-خوێنبایی.

٢-(أَرش-ە. أَرْشــاً): ١-خوێنبایــی دایــە ٢-بەرتیلی دایە.

(ألأَرْش خوێنبایی (ج) أُرُوش.

٣-(أَرشــيمَندريت) (يونانيــة): خــاوەن پلەیەكە لە كڵێسەی دیانەكاندایە.

أَرض: (أَرَض و أَرُض – المَكانُ. أَرْضاً وأَراضَةً): شــوێنەكە گژوگیــای زۆر بــوو ڕازایــەوەو لەبەرچاو جوانبوو.

أَرِيض: (شوێنێكی سەوزو پڕگیاو گوڵزار.

(أَرَّض – الــكَلامَ وغَــيرَهُ): ئاخاوتنەكــەی ئامادەو ڕێكوپێككرد/ پوختەیكرد.

(تَأَرَّض- بالمَكانِ): لەشوێنەكەدا نیشتەجێبوو تێدامایەوە

(-لِكَــذا): بەرەنگــاری ئــەوە بــووەوەو پەلاماریدا.

(إسْتَأْرَض – السَّحابُ): هەورەكە نیشتەزەوی و لەنگەریگرت و كشا.

(ألأَرْض (ج) أَرْضُــون وَ أُرُوض وَ أَراضٍ وَ آراضٍ): گۆی زەوی كە ئێمە لەسەری دەژین/ زەوی/ خاك بوم، زەمین.

أَتانــا إبنُ أَرضٍ): نەناســێك هاتەلامان كەس نەدایكی و نە باوكی دەناسێت.

(أَرضُ النَعــلِ): پێڵاو/ ئەوەی كە بەر زەویی دەكەوێت/ بنی پێڵاو.

(ألأَرضِيّ شوكي (ن) = خُرْشُوف): شەكرۆكە/ كەرتەشــی: جــۆرە گیایەكــی دڕكاوییە پاش

کولاندن دەخورێت لەگیا لوولەییەکانە لە سەدەی چواردەهەمدا لە ئیتالیادا زانراو دەرکەوت.

٢-(أَرض- ت الخَشَبَة. أَرَضاً): دارەکە تەختە کالۆس خواردی

(الأَرَضَة) (ح): تەختەکالۆس. مۆرانەی دارەکە بەکۆمەڵ دەژین و شاردەکەن و دار دەخۆن و لەولاتە گەرمەکاندا دەژی.

ارط: ١-(الأَرطی) (ن): یاسەمینی زەرد.

(أَرطاة): یەك یاسەمینی زەرد (ج).

(أَراطی وأَراطٍ وَ آراطٍ): بنجە درەختێکە لە بیاباندا دەروێت وەکو تێلا ڕاست بەرزدەبێتەوە گەڵاوگوڵی وردە و بەرەکەی وەك عەناب/ دلیق وایە وشك و تاڵە ڕەنگی سوورەو حوشتر دەیخوات.

٢-(الاُطماسیا): (ن) ڕێحانە کێویلە لەو ڕووەکانەیە کە گوڵەکەی لوولەییە لەسوریا پێیدەڵێن (أَلشیح) لەناوچە دەشتییەکاندا دەروێت.

٣-(أرطَنیسیا) (ن): دەوەنێکە لەباخدا دەروێنرێت. لە یابانەوە بڵاوبۆتەوە. گوڵەکەی سپی یان پەمەییەو بەچەپکە.

ارغ: ١-(الأُرغُل (مو): جووزەڵە ئامێرێکی مۆسیقای خۆرهەڵاتییە دوو قامیشی کونکراوی پێکەوە بەستراوە. پەنجەی بەسەردا دەگێڕن و لەکاتی لێدانیدا دەنگێکی دڵگیری لێپەیدا دەبێت.

٢-(الأُرغُن والأُرغُون: (مو) (یونانیة): (ئارگۆن) وەك پیانۆ پەنجەی پێدا دەنرێت واتا شوێنپەنجەی هەیە.

ارق: (أَرِقَ و ائتَرَقَ. أَرَقاً): شەوخەوی لێزڕا.

(أَرِق وآرِق وَ أَرُق وَ أَرْق): خەولێزڕاو/ شەوبێدار.

(أَرَّقَ-هُ وآرَقَ-هُ. إِبراقاً): خەوی لێزڕاند/ شەو بەیاریکرد.

٢-(الأَرْق) (ح): مێشکەزۆ ڕەگەزە مێرووییەکە لەشی لینجە لەسەر پەل و قەدیدار کۆمەڵدەبەستێت شیلەی دارەکە دەمژێت ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن (أَلمَن)

(ألیَرقان والأَرَقان والإِرقان والإِرَقان والأُرقان والأَرَقان): زەردوویی. دەردێکە دەداتە کشتوکاڵ یان تووشی خەڵك دەبێت ڕەنگیان زەرد یان ڕەش هەڵدەگەڕێنێت ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن (داءُ الصَفِیرَة): زەردوویی.

٣-(الأَریقی) (ن): ڕووەکێکە گوڵی سوورو پەمەیی دەگرێت.

أَرك: ١-(أَرَكَ- الجَمَلُ أُرُوکاً): حوشترەکە گەڵای درەختی سیواکی خواردو ژانی پێکرد.

(الأَراك): درەختی سیواك.

(أَراکة): درەختێکی سیواك (ج)

أُرُك وَ أَرائِك): درەختێکە دڕکاوی و قەد درێژ. گەڵاو پەل زۆر. لاسك نەرم. دارسیواکی

لێدەكرێت و وەردەگیرێت.

٢-(أَرَكَ وَ أَرِكَ- الجرحُ أركاً. أُروكاً): برینەكە خۆشبووەوە/ سارێژبوو/ چاكبووەوە.

٣-(أَروكاريــا) (ن): درەختێكــی بــەرزە لە كۆمەڵەی ســنەوبەرە/ كاژە. لــە ئەمەریكای باشوورەوە هاتووە. لە باخچەكاندا بۆ جوانیی دەروێنرێت. گەڵای شــێوە دەرزییەو لەســەر قەدەكەیشی دەروێت.

٤-(ألأَريكــه. (ج) أَريــك وَ أَرائك): (چرپا/ تەختەبەند)ی رازاوەی نوستن.

ارم: ١-(أَرَمَ — الأَرضَ أَرْمــاً): پاكتــاوی زەویەكەیكردو رووەكەكانی لەبنەكۆتەرەدا

(أَرْمــاء وَ مأْرُومَــة): زەوییەكی پاكتاوكراوو رەگ لێدەرهاتوو.

(-الشــيءَ): رەگ و ریشــەی شــتەكەی لەبن دەرهێنا واتا هیچی نەهێشت.

(-ما على المائِدَة): هەرچی خواردنێك لەسەر خوانەكەبوو ماشییەوەو خواردی.

(ألأُرَّم): خرێكان/ دانە كاكیلەكان

(يَحــرِقُ عَلَيــهِ الأُرَّمُ): لەرقانــدا دانــی لێدەكورۆژێت.

(ألأُرَّم): سەری پەنجەكان

(أَلأَرومَة و الأُرومَة و الأَرُوم (ج) أُرُوم): ١-بن و بێخی شتەكە/ سەرچاوەی ٢-نەژاد

«هُو شَــريفُ الأُرُومَة»: ئەو نەژاد رەسەنە/ خانەدانــە/ وەجاخزادەیــە ٣-بن و ریشــەی

درەخت كە پاش برینەوەیشی لەناوزەوییەكەدا دەمێنێتەوە.

٢-(ألأُرَّم): بەرد

(ألإِرَم و الأَرِم (ج) آرام وأُرُوم): بــەردی سەرەرێ كە بۆ دیاریكردنی رێگەكە لەبیاباناندا دادەنرێت و بۆ رزگاركردنی رێبوارانە/ بەردی رێنیشاندەر.

(مابها إِرَمٌ وَ أَرِمٌ): كەسی تێدا نییە.

(ألأُرمَةُ (ج) أُرَم): بەیداخ

ارن: (أَرِنَ — البَعــيرُ أَرَنــاً وَ أَرِينــاً وَ إِراناً): حوشترەكە هێزی دایە خۆی و چابوكبوو.

(بَعيرٌ أَرِن و أَرُون): حوشتری چابوك.

ارنب: (ألأَرْنَب (ح): كەروێشك

(ألأَرْنَــب البَرِّيَــة أو الأَرْنَــب الوحْشِــيَة): كەروێشكی كێوی.

أرو: (أَلأُرْوِيَّــة والإرويَّــة (ج) أراويّ وأَرا وأَروى (ح): مەرەكێویــی و كەڵەكێویــی (بە هەردووكیان وادەڵێن).

أَرى: ١-(أَرى — النَحْــلُ. أَريــاً): هەنگەكــە هەنگوینی (پێكەوەنا/ كرد).

(ألأَرْيُ): هەنگوین.

٢-(أَرِيَ- صَدْرُهُ عَلَيَّ): ســنگی لێدەرپەڕاندم و لێم تووڕە بوو.

(أَرّى- النــارَ): ١-ئاگرەكــەی خۆشــكرد ٢-ئاگرەكەی كردەوە

(-الدابَّةَ: كۆزی بۆ چوارپێكە كرد.

(تأرّى –بالمَكان): لەشوێنەکەدا جێگیر بوو و مایەوە

(-عَنهُ) لێیدواکەوت.

(الأريَّه) کۆز/ گەوڕ/ شـوێنێکە چوارپێکەی تێدا دەهێلرێتەوە.

أزّ: (أزَّ-تِ القِـدرُ أزّاً وأزَازاً وَ أزيـزاً): مەنجەڵەکە هاتە کوڵ و کەوتەگیزە گیز.

(أزَّ- القِـدْرَ وَبِهـا): ئاگـری نایـە ژێـر مەنجەڵەکەوە کە بکوڵێت.

(تَأزَّزَ- المَجلِـسُ): ئەنجومەنەکە کەوتە ژاوە ژاو و بەیەکداچوون.

(الأزَّةُ): ژاوەژاو دەنگە دەنگ و بەیەکداچوون.

(الأزيـز): ١-گرمـەی هـەور/ هـەورە گرمە ٢-تەرزە.

٢-(أزَّ-هُ على كذا): بۆ ئەوە لاسیدا/ فریویداو هانەهانەیدا.

(-الشـيءَ): شـتەکەی بەسـەریەکدا داو بەسەریەکدا کرد.

ازب: ١-(أزَبَ- المـاءُ أزبـاً): ئاوەکـە کشـا/ ڕۆیشت

(المِئْزاب (ج) مَآزيب والميزاب (ج) مَيازيب): پلوسك (پێی ناوترێت مَزاریب).

٢-(الأزَب): ١-کورتەبنە ٢-بەدخواز/ زمانبەد.

أزَج: (أزَّجَ –البَيـتَ): خانووەکەی بەدرێژیی دروستکرد.

(الأزَج (ج) آزاج وآزُج): خانـووی درێـژ دروستکراو.

ازح: ١-(أزَحَ وتَـأزَّحَ أزوحـاً): سسـتبیکرد/ خاوەخاویکردو دواکەوت

(أُزوح): (سست/ خاو) و دواکەوتوو.

٢-(أزَحَ-ت قَدَمُهُ): پێی (هەڵخلیسکا/ ترازا/ خزا)

(إزاحَة): خزاندن/ ترازاندن/ دەرپەڕاندن.

ازد: الأزَاد: (ن) جۆرە خورمایەکە.

٢-(الأزْدَرَخت (ن) والأزادارخت) (فارسية): درەختێکـە گوڵـی وردەو شـینێکی تێـرە، دارێکی سـەختی چاکی هەیە پێشی دەوترێت (زنزلخت).

ازر: ١-(أزَرَ- بالشَيءِ): چوار لای شتەکەیگرت/ دەوری شتەکەیگرت

(-النَّباتُ): ڕووەکەکە خۆی لەیەك ئاڵاند.

(أزَّرَ-ه) دایپۆشی

(تَأزَّرَ واتَّزَرَ وأتْتَزَرَ): ١: بەرکۆشیبەست

(الإزار (ج) آزِرَة وأُزُر): ١-کاڵا/ بەرگ/ پۆشاك ٢-لێفە ٣-پاکدامێنیی

-ألأزَر: پشت

(شَـدَّبِهِ أزرَهُ): پشـتی خۆی بەوە بەسـت و قایمکرد.

٢-ألإزر = ألإزار = شـێوەی بەستنی پشتێن یان شێوەی کاڵا/ پۆشاك.

الإزرة= الازار: ١-بەرکۆش ٢-پۆشـاك، خەڵکە ڕەشۆکەکە پێی دەڵێن «هيضة الأئتزار».

«الوزرة»: شێوەی پۆشاك یان پشتێن.
«لِکل قوم إزرةٌ یأتذرونها»: هەموو نەتەوەیەك شێوە بەرگێکیان هەیە پێی دەناسرێن.
المِئزَر والمِئزَرَة (ج) مَآزِر: ١-پۆشاك ٢-پشتێن.
«لکل قَوم إزرَةٌ تأتَزرونَها»: هەموو نەتەوەیەك شێوە بەرگێکیان هەیە پێی دەناسرێن.
(المِئزَر والمِئزَرَة (ج) مَآزِر): پۆشاك.
(شَدَّ للأمر مِئزَرَهُ): بۆ کارەکەی (چاکی بەلاداکرد/ پشتێنی بۆبەست).
٢-(آزَر وأزَّرَ- فُلاناً): پشتی فیساریگرت/ کۆمەکیکرد/ بەهێزیکرد/ یارمەتیدا.
(آزَرَ-هُ. مُؤازَرَةً): کۆمەکیکرد/ یاریدەیدا/ یارمەتیدا.
(الأزْر): ١-هێز ٢-یاریدەدان پشتگرتن
(الإزار (ج) آزِرَة وأُزُر): فیلپایە/ دیوارۆکێکە دەدرێتە پاڵ دیوارێك بۆ قایمکردنی.
٣-(ألإزر): ١-بنچینە، ریشە، نەژاد.
ازف: (أزِفَ. أزَفاً وأُزُوفاً): نزیکبووەوە.
(أزِفَةُ الآزِفَةُ وأزِفَتِ السَّاعَةُ): رۆژی لێپرسینەوە نزیکبۆتەوە.
(تآزَفَ): هاتە بەرەوە/ نزیکبووەوە
(تآزَفَ القَومُ): خۆێشگەل لەیەك نزیکبوونەوە.
(الآزِفَةُ): رۆژی (لێپرسینەوە/ حەشر/ قیامەت)
٢-(أزَفَ-الرَجُلُ. أزفاً وأُزُفاً): پەلەیکرد.
(آزَفَ-هُ إيزافاً): پەلەی پێکرد.
(الأزَفى): خێرایی و چابوکیی/ چالاکیی گورجیی/ ئازایی
(یَمشي الأزَفى): گورجانە دەروات. چالاکانە هەنگاو دەنێت.
٣-(تَأزَّفَ- المَكانُ): شوێنەکە (تەسکبوو/ تەنگبوو)
(-الرَجُلَ: ١-شکستیهێناو دایەدواوە/ دایەکەمیی و بێهێزیی ٢-بەد رەوشت و کەمچیکلدانە بوو.
(الأَزَف): تەنگانەو کەمدەرامەتیی/ بەدگوزەرانیی.
٤-(أزِفَ- الجرحُ): برینەکە (هاتەوەیەك/ سارێژبوو)
ازق: (أزَقَ وأزِقَ أزْقاً وأزَقاً): تەسکبووەوە/ تەنگبوو.
تَأزَّقَ: تەنگبوو/ تەسکبوو.
(المَأزِق (ج) مَآزِق): ١-گەروو/ ئاوێك كە لەنێوان دوو زەویدا دەبێت وەك گەرووی کێوی ٢-کۆڕی جەنگ/ شەڕ ٣-تەنگەبەریی ٤-تەنگانە ٥-تەلەزگە/ هەڵوێستی دژوار/ باری ناهەموار.
ازل: ١-(أزَلَ. أزلاً): کەوتە تەنگانەو بێدەرەتانییەوە

((أَزِل): ١ـداماو/ تەنگەتاو ٢ـبێدەرەتان.
(أَزَل-ہُ): بەندیکرد
(تَــأَزَّلَ): کەوتە تەنگانــەو بێدەرەتانییەوە/ نەبوو بوو.
(اَلأَزِل): دامــاو/ تەنگەتــاو/ بێدەرەتــان و نەبوو
(إلازِل): چورتوم/ وەی/ داماویی.
٢-(الأَزَل): زۆر کــۆن/ جاوید. هەمیشــە کە هەر بووە و هەر دەبێت/ بێسەرەتاو کۆتایی.
(الأَزِلي): نەمریی/ هەمیشەیی/ هەتاهەتایی/ هەربووەو هەر دەبێت.
ازم: ١-(أَزَم-ہُ. أَزْماً وَأُزُوماً): گەســتی/ گازی لێگرت.
(أَلآزِم والآزِمه والأَزُوم (ج) أُزَّم وَ أَوازِم وَأُزُم): دانی کەڵبە.
٢-(أَزَمَ- العامُ): نەهامەتی و قاتوقڕیی ساڵەکە سەختبوو.
(-الدُهــرُ عَلَيهِ): ڕۆژگار ســەختیی لەگەڵدا نواند
(تَأَزَّمَ- القَومُ): تووشی تەنگو چەڵەمەبوون.
٢: پەژارەو نەهامەتیی ڕۆژگار دایگرتن.
(الأَزْم): پــارێــزکــردن/ دوورکــەوتــنــەوە خۆپارێزیی لە هەموو زیانبەخشێك.
(أَصْــلُ كُلِّ دواءٍ أَلأَزْمُ): لەهەمــوو دەرمانێك باشتر پارێزە.
(أَلأَزمَــة والآزمــة (ج) إِزَم وأَزم وأَزَمــات وأَوازِم): تەنگوچەڵەمــە/ تەنگژە/ تەنگانە/ تووشیی.
(أَزَمَة إقتِصادِيَّة): تەنگژەیەکی ئابووریی.
(أَزَمَة سِياسِيَّة): تەنگژەی ڕامیاریی/ گرانی قاتوقڕی.
(أَلمأْزِم (ج) مَآزِم): ١ـدەربەند ٢ـشەرگە.
٣ـ(أَزَمَ- الحَبْلَ): ١ـپەتەکەی توندبادا
(-بِصاحِبِهِ): بە هاوڕێکەیەوە لکاو بەندبوو.
(-عَلَيهِ): پاراستی
(-عَــنِ الشَــيءِ): خــۆی لەشــتەکە لاداو دوورخستەوە.
(أَلآزِم (ج) أُزَّم): خۆ پەنادەر/ خۆ لێپارێز.
ازن: (أَلأُزُون (ك) گــازی ئــۆزۆن. گازێکــە گەردەکانــی لەســێ گەردیلــەی ئۆکســجین پێکهاتووە و شینباوە بۆ پاکژکردنەوەی هەواو ئاو بەکار دێت هێماکەی (O3) یە.
أَلملحق
أزو: (الأَزُوت) (ك) تەنێکــی ســادەیە. گــازە نەرمنگی هەیــەو نە بــۆن و نەچێژی هەیە چوار لەسەر پێنجی هەموو هەوایە.

ازی: (آزَى- الرَجُــلَ. مُــؤازاةً): بەرامبــەر پیاوەکە بووەوە و لێی نزیکبووەوە
تَــآزَى – القَــومُ. تَآزِياً): خوێشــگەل لەیەك نزیکبوونەوە.
(تَــأَزَّى – عَنهُ): لێــی پاشــگەزبووەوەو وازی هێنا.

(إزاءَ): بەرامبەرو لەبەردەمدا/ رووبەروو.
(جَلَسَ إزاءَهُ وَ بِإزائِـهِ): بەرامبـەری و لەبەردەمیدا دانیشت/ ڕێکی ئەو دانیشت.
(هُم إزاؤُهُم): ئەوان هاوکوفێ یەکترین، ئەوان بەرانبەریانن.
(إزاءُ – الأَمـرِ): کار ڕێکخـەرو ڕەنگرێـژی کارەکە.
اسّ: ١-(أَسَّ – الدارَ أَسّاً): سنووری خانووەکەی دیاریکردو بنچینەیدانا.
(أَسَّـسَ – البَيـتَ): (بنچینــە/ بناغــە)ی خانووەکەی دانا.
(تَأَسَّسَ): (بنچینە/ بناغە)ی دانرا/ نرا.
(الأَسّ والإِسّ والأُسّ (ج) إساس):١: (بنچینە/ بناغــە)ی خانــوو :٢: بنچینــەو ســەرەتای هەمووکارو شتێك/ بنەڕەت
(الأَســاس والأَســس (ج) أُســس): بناغــە/ بنچینەی خانوو/ خانە
(الحجـر الأَساســي): ١-بــەردی بناغــە ٢- سەرەتای هەموو (کار/ هەموو شتێك) بنەماو سەرچاوەی هەموو شتێك.
(الأَسَس أوالقاعِدة) (ك) تەنێکە وەك سۆدەو پۆتاس و گەچ ڕەگی (OH) ە لەگەڵ ترشەکاندا یەکدەگرێت ئاوو خوێی لێپەیدا دەبێت
(التَأسِيسِـيّ: دامەزرێنــەری خانەیــەك یان پرۆژەیەك یان کۆمەڵەیەك.
(المَجلِسُ التَأسِيسِيّ): ئەنجومەنی دامەزرێنەر کە یاسابنەڕەتیەکانی وڵات دادەنێت.
(مُؤَسَّسَــة): دامەزراوێــك (کۆمەڵەیەکـە یــان پەیمانگایەکــە یــان کۆمپانیایەکــە/ هاوبەشــییەکە/ دەســتگایەکە بۆ ئامانجێکی زانســتی یــان خێرخوازیــی یــان ئابووریی دامەزرابێت. دەوترێت
(مُؤَسَّسَة علمية): دامەزراوێکی زانستی.
(مُؤَسَّسَــة صِناعِيَّــة): دامەزراوێکــی پیشەسازیی.
٢-(أَسَّ بَـيـنَ النَّاسِ): بەدیی لــە ناوخەڵکدا کردو تێکیدان،
(الأَسَّاس): زمانبەد/ پشێونە.
أَسب: ١-(إِسْبانـج) (ن): سپێناخ. سەوزەیەکە ئاسیایی گەڵاکەی بە لێنان خۆشە.
٢-(أَسْبِيذاج وَ إِسْـفِيداج) (ك) (فارسية): سپیاو کە بۆ ئارایشتی ئافرەتە.
٣-(ألاسْــبرين) (ك): ئەســپرین ترشــی سالیســیلێك. تەنێکی ســپییە بۆ سەریەشەو وئازارو تا بەکاردێت.
است: ١-(الإِســت): بنەڕەت بنچینە/ پامان. بێخ.
٢-بن/ قنگ، کۆم.
٢-(الأُســتاذ (ج) أَساتِذَة وأَساتيذ): ١-فێرکار، مامۆستا ٢-وەســتای پیشەیەك کە شاگرد فێر دەکات ٣-زانا ٤-گــەورە دەفتەرداری بازرگانیی (فارسیە).

٣-(اَلإستار (ج) أَساتير – في العَدَد): لەژمارەدا ژمارەی چوار.

(-في الوَزن): لە کێشـــاندا چوار مسقاڵ و نیو (فارسیە).

٤-(اَلإسْتَبرَق): ١-بەرگێکی ئاوریشمینە بەتاڵی زێر نیگار کێشــکراوە (فارســیە) ٢-بەرگێکی ئاوریشمینی ئەستوور.

٥-(اَلإستراتیجیَّة) (اع) (یونانیە) ستراتیژی. هونەرێکە لە هونەرەکانی سەربازیی، هونەری جۆنیەتیی بەڕێوەبردن و سەرۆکایەتیکردنی ســوپاو گرتنی ئەو هۆیانەی کە ئەو ئامانجە بێنێتەدی.

الملحق:

است: موقع ستراتیجي: شوێنێکی ستراتیژی.

هدف ستراتیجي: ئامانجێکی ستراتیژی.

٦-اَلإسْــتیخارَة: (یونانیە) بەرگێکە شاپارسا خۆرهەڵاتیەکان دەیپۆشن.

٧-(إسْــتِیدْیو أَو إسْــتُودْیو) (ف ج): ستۆدیۆ: شوێنی وێنەگرتن یان فیلمدەرهێنان و گرتنی.

٨-(اَلأسیتلین) (ك): گازی ئەسیتلین. گازێکە بێڕەنگەو بێبۆنە. ژەهــرەو بەکارهێنانی پڕ مەترســییە بۆ توانــەوەی کانــزاو لێکدانیان هەروەهــا بــۆ ڕووناککردنــەوە بەکاردێــت هێماکەی ($C_2H_2$)ە.

أَسِـــد: (أَسِدَ. أَسَداً): ١-شێری دی و لەترساندا زەندەقیچوو. ٢-ڕەوشت شێرانە بوو

(-عَلَیــهِ): لێی بوو بە شــێر/ شــێرانە لێی راپەری

(تَأَسَّدَ واسْتَأسَدَ- عَلَیهِ): ١-وەك شێر پێیوێراو لێیراپەڕی ٢-وەك شێری لێهات

(الأَسَد (ج) أُسْد وَ أُسُودو أُسْد وآسُد وَ آساد): ١-شێر

(لَبُوَة): ماشێر/ مێشێر.

(أَلشبل) بەچکە شێر.

(العَرین): لانەی شێر

(الأَسَد (ح)): بەنێرو مێی شێر دەوترێت.

(هُوَ الأَسَد وهيَ الأَسَدُ) ئەو شێرە (بۆ نێرینەو مێینەیە) ٢-ئازا/ دلێر/ نەبەرد.

(داءُ الأَسَد أَو الجُزام): گولیی

(أَلْمَأْسَــدَةُ (ج) مَآسِد): شــێرگا/ شوێنێك کە شێری زۆر تێدا بێت یان تیایدا بەخێوبکرێت و رابگیرێت.

٢-(أَسَدَ وَ آسَدَ وأَسَّدَ – الکَلْبَ بالصَّیدِ. أَسْداً و إیســاداً و تَأْسیداً): ســەگەی بۆڕاو هانداو کردی بە شێرو ئازای کرد.

(آسَدَ - بَینَ القَوم): زمانبەدیی لەنێوانیاندا کردو لەیەکیکردن لەیەکیبەردان.

٣-(إسْتَأْسَــدَ- النَبــتُ): ڕووەکەکە باڵایکرد/ درێژ بوو پەلی بەهەموو لایەکدا (بڵاوکردەوە/ هاویشت)

اسر: ١-(أَسَرَ-هُ أَسْراً وإسارَةً): ١-بەقایش توند بەستیەوە/ باڵبەستیکرد ٢-گرتی و بردی

(إِسْتَأْسَـــرَ): خـــۆی بـــه دیلگرتنـــدا/ خـــۆی بەدەستەوەدا

(-ه): گرتی و بردی

(اَلأَسْـــر): (مـــص): ١-دیلیەتـــی ٢-ســـەراپا/ هەمووی / گشتی

(هذا لَكَ بِأَسْرِهِ): ئەمە ســـەراپای/ گشـــتی بۆتۆ.

(اَلإِســـار) أَلقِـــدُّ: پشـــتێنی قایـــش/ بەندی چەرمین.

(اَلأُسر): میزگیران.

(اَلأَســـير (ج) أَسْـــری وَ أُسَـــراء وَ أُســـاری وَ أَســـاری): ١-دیـــل ٢-کەســـێك کـــە گیرابێت/ باڵبەستکرابێت.

(أَسرى الحَرب): دیلی جەنگ/ شەر.

(تَأَسَّـــرَ – عَلَيه): خاوەخاویکرد/ هێواشـــی کرد.

اَلإِسار): چەپ. پێچەوانەی ڕاست.

(اَلأُسْرَة (ج) أُسَـــر): ١-خێزان/ خاووخێزان/ خانەوادە/ بنەماڵە. ٢-قەڵغانی پتەو.

٣-(مَاسُـــورَة (ج) مَواسِـــير): ١-لوولە ٢-بۆری ٣-قەنـــدە ٤-جورنـــە (بە هەمـــوو بۆرییەکی خـــری بۆش دەوترێت کە لە دار لە ئاســـن لە قورقوشم لە قوری ســـوورەوەکراو لە قامیش بۆ قلیانکێشـــان لە هەر شتێك بێت و بۆ هەر ئامانجێك بەکاربهێنرێت هتد.

٤-(اَلأُسْرُب واَلأُسْرُوب وَ الأُسْرُبّ): (فارسیة): قورقوشم.

اســـط: (اَلإِسْـــطاطِيقِيّ) (ف ج) زانســـتیی جوانیی (زانســـتێکە باســـی جوانیی بەگشتی دەکات هەروەها ئەو هەســـتەی کە جوانیی لە دەروونندا دەیبزوێنێت (یونانیە).

٢-(اَلإِســـطَبل (ج) إِسْـــطَبلات) (لاتینیە): تەویلە پشتێر/ گەوڕ.

٣-(أَسْطَر الصين = (ن) أَللُؤ لُؤيَّة): مرواری/ ئەستێرە گوڵ. ڕووەکێکی ساڵانەیە لە باخچەدا دەروێنرێت و لەبەر جوانیی گوڵەکانیەتی کە سپی و سوور و پەمەیی و وەنەوشەییە.

٤-(اَلأَسْطَرا غالُس) (ن) گەون/ تەپڵەگەون، درەختێکـــی باڵابەرزە بەزۆریی دڕکاوییە زۆر جۆری هەیە. هەیەتی کەتیرەی لێدەگرێت یان بۆ پزیشکیش کەڵکی لێدەبینرێت.

٥-(اَلأُسْـــطُرْ لاب) (فـــك) (یونانیة): قیبلە نمـــا. ئامێرێکی دیدەوانیـــی کۆنە بۆ پێوان و زانینی شـــوێنی هەسارەکان و کاتی شەوو ڕۆژ و لێکدانەوەی گەلێك کێشـــەو پرســـە بابەتی ئەســـتێرەوانیی پێدەکرێت و زۆر جۆریشـــی هەیە. پان و تەخت و خڕ.

٦-(اَلأَسْـــطَقِس و الإِســـطَقِس): (یونانیة) بنچینە/ ڕیشـــەو توخم کە بەپێی ڕای هەرە کۆنەکان ئاوو خاك/ زەوی و ئاگرو هەوایە.

٧-(اَلأُسْـــطوانە (ج) أَســـاطین وأَســـاطِنَة): ١-ستوون/ کۆڵەکە.

(هُم أَساطِينُ الزَّمانِ): ئەوان دەرکەوتوان و دانایانی چاخن و ڕاگری سەردەمن ٢-لاقێکی چوارپێ ٣-قەوانی گۆرانی و ئاخاوتن و شتیتر (قەوانی فۆتۆگراف).

٨-(اَلأُسطوانه: (ە) لوولەك) تەنێکە ڕوویەکی لوولەکیی بەدەوریدایە دوو ڕووی تەختە تەریبی ئەمسەرو ئەوسەری دەگرن پێیاندەڵێن دوو بنکەی لوولەکەکە.

(إرْتِفاع الإسطوانَة) بەرزیی لوولەك

(حَجْم الإسطِوانَة): قەبارەی لوولەك = ڕووبەری بنکە × بەرزی لوولەك. بەورووی لوولەکەی کە لە نێوان هەردوو بنکەکەدایە دەڵێن ڕووی تەنشت.

(قطع الإسطوانه القائِم): بڕینی لوولەکی وەستاو بەجۆرێکە کە لەشی وەستاوی لوولەکەکە بەبڕەکێك بڕێت کە ستوونبێت لەسەر لەشەکەی لەسەر تەنشتە لێوەرەکەی ڕووبەری تەنشتی لوولەك+ چێوەی بنکە × بەرزیی لوولەکەکە.

(اَلإسطوانه القائِمَة): لوولەکی وەستاو ئەو لوولەکەیە کە بەرزییەکانی لەسەر هەردوو بنکەکەی ئەستوونبن.

(اَلإسطوانه المائله): لوولەکی کەچ/ لار ئەو لوولەکەیە کە بەرزییەکانی لەسەر هەردوو بنکەکەی ئەستوون نەبن. لوولەکی بازنەیی ئەوەیە کە بنکەکانی بازنەییبن.

(اَلإسطوانه الدَوَرانِيَّة): ئەو لوولەکەیە کە لاکێشەیەك لەسەر لایەکی سووڕێکی تەواو بسووڕێتەوە پێشیدەڵێن "لوولەکی بازنەیی وەستاو".

(الاسطوانه الناقصه أَو «جذع الاسطوانه» جسم يحده سطح إسطواني ومستويان غير متوازيين مقطعان «سمات السطح ويسمى مقطعا السطح بالمسنويين "قاعدة الاسطوانه الناقصه»): لوولەکیی ناتەواو تەنێکە ڕوویەکی لوولەکیی خولیەتی هەروەها دوو ڕووی تەختی ناتەریب کە بەرزییەکانی ڕووەکە لە دەببون دوو بنکەی لوولەکە ناتەواوەکە.

(السطح الإسطواني: هو سطح حادث من حركه مستقيم (ب ح) يبقى موازياً لنفسه ومت تكثراً على منحن ثابت (ن) دون أن يكون (ب ج ن) في مستوٍ واحد وإذا كان (ن) دائرة أو إهليلَجياً يسمى السطح الاسطواني دائرياً أو إهليلَجياً): ڕووی لوولەکی: ڕوویەکە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی جوڵەی ڕاستەهێڵی (ب ح). تەریب بەخۆی دەمێنێتەوە دەنیشێتە سەر چەماوەیەکی نەگۆڕ کە (ن)ە بەبێ ئەوەی (ب ح ن) لەڕووتەختێکدا بن (ب ح وێنەکێش دروستکەری (ن) ئاڕاستەکار نیشاندەر). ئەگەر (ن) بازنەبێت یان هێلکەیی بە لوولەکە دەوترێت لوولەکی هێلکەیی یان بازنەیی.

٩-(ألأُسطورَة (ج) أَساطِير): ئەفسانە: چیرۆك یـان حیكایـەت كە داهێنـراوە ئەندێشـەی داهێنراوو نەریتی گەلی تێدایەو تێكەڵیەتی.
١٠-(ألأسْـطول (ج) أسـاطيل): (يونانية): كەشـتيگەل/ گەمیگـەل كۆمەڵە پاپـۆڕ یان كۆمەڵـە فرۆكەی جەنگیی یان بازرگانیی یان هی ڕاوكردنە.
اسـف: ١-(أسِـفَ - عَلَيهِ أَسَـفاً): داخی بۆ خوارد/ ژان چووە دڵیـەوە بۆی/خەفەتی بۆ خواردو بۆی شپرزەبوو.
(أسِف): داخخواردوو، بۆ سووتاو/ داخبردوو.
(آسَفَ-هُ إيسافاً): دڵگران و توورەیكرد.
(تَأَسَّفَ: خەفەتیخوارد و بەپەرۆشبوو.
(يا أَسَـفي وَيا أَسَـفاً علـى كـذا): داخەكەم/ ئەفسووس/ ئەوە جێی داخ و خەفەت و ژانەدڵە.
(ألأسافِة): داخخواردن و ژانە دڵ بۆ شتێك.
(ألأسُوف): دڵناسـك و مەراقاویی كەشت زوو كاری تێبكات.
(ألأسـيف (ج) أُسَـفاء (م) أسـيفَة): داخلـەدڵ/ خەفەتبار/ دڵگران. (وشـەیەكە بۆ سەرەخۆشـیی لەنامەی سەرەخۆشـیدا بۆ پرسەدارەكە دەنوسرێت)
الأسـن: دڵگرانـیو بـۆ سـوتان/ حەیـفو ئەفسوس.
٢-(ألأَسافَة): تەنكیی زەویی.
(ألأَسِيف (ج) ألأُسَفاء (م) ألأَسِيفَة): كەسێكە كە هەر قەڵەو نەبێت.
(أَرضٌ أَسِـفَةٌ وَ أُ سـافَة): تەنكـە زەوییەك كـە ڕووەك و گیـای بـاش لێنەڕوێـت و شكۆفەنەكات.
٣-(الإسْـفَنج) (ح) (يونانية): ئیسـفەنج/ كەفیدەریا
إسْفَنجَة: یەك ئیسفەنج زیندەوەرێكی ئاوییە لەبنی دەریاكاندا پەیـدا دەبێت. پەیكەرێكی لفكەیـی هەیـە كـە تەنەگوشـتینەكەی ڕادەگرێت.
٤-(ألإسْفَند والسَّفَنْد) (ن): خەرتەلەی سپی/ قانگ.
اسق: ١-(إسْـقُمري) (ح): ماسییەكی درێژی دەریاییەو گۆشتەكەی خۆشە.
٢-(ألإسْـقَنْقُو/ والسَـقَنْقُو) (ح) يونانيـة: جۆرە خشۆكێكە لەولاتە گەرمەكاندا هەیە لە بزنمژ گەورەترەو ئەستوورترە. كلكی كورتە پێیدەڵێن: تیمساحی وشكانی.
اسكل: (الإسْـكِلَه (ج) أسـاكِل) (ايطالية): ئەسكەلە/ بەندەر.
اسل: (أسِلَ وَأسُلَ. أسَلاً وَ أسالَةً): نەرم و ڕێك و درێژو لووسبوو.
(أسِيل (م) أسِيلَة): ساف و نەرم و درێژو ڕێك
(خَدٌ أسِيل)ڕوومەتی لووس و شل و مل.
(أَسَّـلَ- الرمـح): نێزەكـەی تیژو سـاف و ڕێككرد.

(تَأَسَّل-هُ): لەڕەوشت و خوو نیشانەی چاكدا لەو چوو.
(هُوَ على آسالٍ مِن أبيهِ): ئەو كوتومت چۆتەوە سەر باوكی. (تاكی وشەی (آسال) نەبیستراوە.
(اَلأَسَل): نیزەو هەموو شتێك كە لە ئاسنبێت و تەنك و ڕێكبێت وەك چەقۆو شمشێرو كێرد كە دەمتەنك و لووس و تیژبێت.
(جَمَعَ بَينَ اليَراعِ والأَسَلِ) نێزەو پێنووسی یەكخست واتا زانست و زانستی جەنگی پێكەوە گرێداو گرتە دەست.
(اَلأَسَل): درەختی كفر. درەختێكە پەلباریك و درێژ بۆ دروستكردنی سەبەتەو كورسی و نشینگە بەكاردێت.
(أَسَلَة): یەكێكە لەو ڕووەكە.
(اَلأَسَلَة): ١: سەری زمان
(لايَزالُ هذا الأَمرُ على أَسَلَةِ لِسانِهِ): هێشتا ئەم باسی كارە هەر بەسەری زمانیەوەیە واتا هەر دەیلێ و دەیلێتەوە ٢-باسك/ قۆڵ.
اسم: ١-(اَلإِسم: ناو ٢-أُسامَة: ناوی شێرە ٣-(اَلإِسْمَنت) (ك) (لاتينية): چیمەنتۆ.
(اسَنَ- الماءُ أَسناً وَ أُسوناً): ئاوەكە (گەڕاوەتەوە/ بۆگەنبووە).
(ماءٌ آسِن) ئاوی گەڕاوە كە بۆن و تام و ڕەنگی دەگۆڕێت.
(أَسِنَ -الرَجُلُ. أَسَناً): پیاوەكە لە بیرەكەدا بوورایەوە/ چووە چاڵاوەكەوە بۆ گەنێكی بەسەرداهات و بوورایەوە (بۆگەنی ئاوی بیرەكە كاری تێكرد).
(أَسِن): بووراوەی هەوای بۆگەنی ناو چاڵاو/ بیر.
(تَأَسَّنَ- الماءُ): ئاوەكە گەڕاوەو بۆگەنبوو.
(-وُدُّهُ): سۆز و خۆشەویستیەكەی گۆڕا
(-أَباهُ): ڕەوشتی باوكی وەرگرت.
(اَلأُسُن (ج) آسان): پاشماوەی بەزی كۆن.
(اَلآسان): ١-پاشماوەی هەموو شتێك ٢-پاشماوە دێرینەكان.
(آسانُ الثياب): بەرگی كۆن/ شڕكەوپڕكەی جل/ بەرگ
اسا: ١-(أَسا- الجرحَ. أَسواً وَأَساً): برینەكەی تیماركرد.
(أَسى – الرَجُلَ تَأَسِيَةً): پیاوەكەی تیماركرد/ چارەسەركرد.
(اَلإِساء (ج) آسِيَة): دەرمان.
(اَلأَسُوّ): دەرمان.
(اَلآسِي (ج) أُساة وَإِسَاء (م) آسِيَة (ج) آسِيات وأَواس): پزیشك.
٢-(أَسا- الرَجُلَ. أَسواً وَأَساً): سەرخۆشیی لەپیاوەكە كرد.
(أَسِيٌّ وَمَأسُوٌّ): سەرخۆشیلێكراو دڵنەواییكراو.
(أَسَّى – الرَجُلَ. تَأْسِيَةً): سەرخۆشی لە پیاوەكە كرد.
تَأَسى: سەرخۆشیی لێكرد، دڵی ئارامكردەوە.

تأسيةً: هێمنیکردەوەو هاتەوە سەرخۆی

(اَلتَّأسِي): سەبووریهاتنەوەو فەرامۆشبوون.

(تَآسى — القَومُ): خوێشــگەل سەرخۆشییان لەیەکترکرد.

(اَلْأُسْوَة والإِسْــوَة (ج) أُسىً وَ إِسىً): ١-نمونە ٢-ئەوەی سەرخۆشیی پێدەکرێت و سەبووریی پێدێت.

(اَلأَسوان): پرســەدارو خەفەتبار/ خەمگین/ پەژارەداگرتوو.

(اَلتَأساء)= اَلتَّعْزِيَة): پرسە.

٣-(أَســا- بَينَهُم. أَسْواً وَأَســاً): ناوبژێکردن/ رێکیخستنەوە

(-هُ بِفُلانٍ) فیساریکرد بە نموونە بۆی.

(أَسّى —الرَجُلَ. تَأسِيَةً): یاریدەی پیاوەکەیدا/ کۆمەکیکرد.

(آسى- الرَجُلَ فِي مالِهِ. مُؤاساةً): لەداراکەیدا کابرایکــرد بە هاوبەشــی خۆی و یەکســانی خۆیکرد.

(آسَيتُهُ بِنَفسي): ئەوم یەکسانی خۆمکرد.

(تَأَسَّى وَ اُئتَســى- بِهِ): چاوی لەوکرد/ رێی ئەویگرت

(اَلأُسْوَة وَالإِسْوَة (ج) أُسىً وَ إِسىً): ١-نموونە/ سەرمەشق ٢-پێشەنگ.

اسی: (١-أَسى —لَهُ مِنَ الشيءِ. أَسْياً): بەشێکی لەشتەکە بۆ هێشتەوە.

(اَلآسِيَة (ج) أَواسٍ): ستون/ کۆڵەکە/ راگر.

(مُلكٌ ثابِتُ الأَواسي): موڵکێکە دەسەڵاتێکە، سەڵتەنەتێکە چاك دامەزراوو ستوون قایمە.

٢-(أَســِيَ. أَسَــىً): خەفەتیخــوارد، پــەژارە باربوو.

(آس وَ أَسْــيان (ج) أَسْــيانون (م) آســِيَة وَ أَسْــيانَة (ج) أَسْيانات وَ آسْــيِيات وَ أَسَايا): کۆستکەوتوو/ پەژارەبار/ خەفەتبار/ دڵپڕ لە جەخار.

(المَأْســاة): ١-کۆســتکەوتن/ ناســۆر بەخش/ پەژارە ناك/ قەوماوی جگەر بڕ/ بەسەرهاتی خەفەتنــاك ٢-شــانۆگەریی پەژارەنــاك/ تراجیــدی (قەوماوێکی ترســناکە لــە نێوان پیاوە گەورەکانــدا روویداوە ســام و بەزەیی دەبزوێنێت)

الملحق:

اسو: (اَلتَّأَسِّي) دڵئارامبوونەوەوسەبووریهاتنەوە و هێمنبوونەوە.

---

اش: (اَلأَش): نانی وشك.

اشــب: ١-(أَشَــبَ- القَومَ أَشْــباً): خۆیشگەلی بەیەکدا کردو تێکەڵیکردن.

(تَأشَّــبَ وَاُئتَشَبَ — القَومُ: خوێشگەل تێکەڵ بە یەکبوون/ بەیەکدا چوون.

(اَلْأُشابَة (ج) أَشائِب): ١-خەڵکــی هەمە چیزە ٢-دەرامەتێکی بەحەرام تێکەڵ.

(نَسَــبٌ مُؤْتَشَــبٌ): نەژادێکی/ رەســەنێکی ناپوختە رەسەنناوێتە.

٢-(أَشِبَ وَ تَأَشَّبَ – الشَجَرُ أَشَباً):درەختەکە.. چربوو بە یەکداچوو./ پەلەکانی لەیەکئالاٚ.
(غَيْضَةٌ أَشِـبَة): زەبەندێکی/ دارسـتانێکی چڕی بەیەکداچوو.
(الأَشَــب): جەنگەڵ/ بێشــەلاّن/ دارستانێکی چڕ کە نەتوانرێت هاتوچۆی تێدا بکرێت.
٣-(أَشَب-ُه. أَشباً): سەرزەنشتیکردو تەشەری لێدا/ تیرو توانجی تێگرت.
اشــر: ١-(أَشَــرَ – الخَشَبَةَ أَشْــراً):دارەکەی برییەوە/ داهێنا.
(أَشَرُ المِنشار): دانەکانی (هەرە/ مشار)
(إِشْر وأُشْرَة المِنشــار): یەك دانەی هەرەکە/ مشارەکە
(المِنشار (ج) مَآشير وَمَواشير): هەرە/ مشار.
٢-(أَشَرَ وَ أَشَّرَ- الأَسنانَ): دانەکانی تیژکرد.
(الأُشُــر والأَشَــر (ج) أُشــور): تیژیــی دان سروشتیبێت یان دەستکردبێت.
٣-(الآشِــر (ج) أَواشِــر) (ح):١-چقڵــی لاقی کوللە ٢-گریی سەری کلکی کوللە.
(التَأْشــير (ج) تَآشــير) (ح)گازگرەی کوللە/ ئەوەی کە کوللە گازی پێدەگرێت.
٤-(أَشَّرَ –على وَرَقَة): کاغەزێکی (نیشانەدا/ نیشانەکرد)
(أَشَّــر على جَوازِ سَــفَرِه أَو إِجازَتِه)مۆری پەســاپۆرتەکەی/ گوزەرنامەکــەی یــان مۆڵەتەکەیکرد
(التَأْشير):لە کاروباری میریدا نیشانە خستنە سەر نوسراوێك بە واتای ئەوە بینراوە.
٥-(أَشِــرَ. أَشَراً): خۆشــیی پێکەوت و کەوتە گۆرانیی و هەڵپەرین/ جرت و فرت.
(أَشِرٌ وَأَشْــرٌ وَأَشْرانٌ (ج) أَشِــرُون وأَشُرون وأَشَارى وَأُشــارى):کەسێکە کە لە خۆشیاندا بکەوێتە گۆرانی و هەڵپەرین و جرت و فرت.
اشــقل: (الإِشْــقيل) (ن) = (بصــل الفأْر): پیــازە مشــکانە رووەکێکــە لــە پزیشــکیدا بەکاردەهێنرێت.
اشن: ١-(الأُشْنان وَ الإِشْنان) (ك) (يونانية) ئەسپۆن ســپی هەیەو زەردی هەیە سپیەکەی پێیدەڵێن (خَرء العصافير)ریقنەی چۆلەکە زەردەکەی پێیدەڵێن (الغاســول):ئەسپۆن بۆ دەست شتن و پاککردنەوە بەکاردێن.
٢-(الأَشْــنَة) (ن): لــەو رووەکانــەن کــە گوڵەکەیان شاردراوەیە لە شوێنە شێدارەکاندا دەردەکــەون (لەســەر دارو درەخــت و تاوێر یان لــە ئاوەشــیرینەکان و دەریاکاندا مادەی کولۆرۆفیلی تێدا نییە بە (طُحْلُب)واتا قەوزە ناسراوە.
اص: (أَصَّ –الشــيءَ)١-شــتەکەی شــکاند ٢-لووسیکرد
(أَصَّص- الشيءَ): شــتەکەی توند شەتەکداو بەیەکیەوە لکاندو قایمکرد.
(تَأَصَّصوا وأْتَصوا): گردبوونەوەو شــانیان

دایه یەك/ قەڵەباڵغیانكرد

(اَلأَصِیــص (ج) أُصُــص):١-لەتە ســواڵەت/ پارچەی قاپی شــكاو ٢-ئینجانەی گوڵ ٣-قاپی میزتێكردن.

(اَلأَصِیصَــة): كۆمەڵە خانــووی نزیكیەك و بەپاڵیەكەوە.

(أَصد: (أَصَّدَ وَ آصَدَ- البابَ):دەرگاكەی داخست.

(مُوصَد):دەرگای داخراو.

(أَصَدَّ-هُ):كراسە بچووكەكەی لەبەركرد.

(اَلأُصْدَة (ج) أُصَد وَإِصَاد):كراسێكی بچووكی بێیەخە.

أَصر: ١-(أَصَرَ —الشيءَ أَصْراً):شتەكەیشكاند.

٢-(أَصَرَ- فُلاناً علیه. أَصْراً):ســۆزی ئەوی بۆ جووڵاند

(اَلآصِرَةُ (ج) أَواصِر)ئەوەی هۆی میهرەبانیو ســۆز بێت بەرامبەر یەكێك وەك خزمایەتیو ناســیاوی و دۆســتایەتی و هاوخوێنییو هاو ئاینیی... یان چاكە/ پیاوەتی.. هتد.

(مــا تَأْصِرُنی علی فُلان آصِــرَةٌ)ئەوەی بە فیسارەوە دەمبەستێتەوە خزمایەتییە.

٣-(أَصَــرَ- الخَیْمَــةَ):مێخــی بــۆ دەوارەكە داكوتی.

(آصَــرَ-هُ مُؤاصَــرَةً):بــوو بە هاوســایەی/ دراوسێی.

(تَآصَــروا):بوون بــە دراوســێی یەكتری و تەكیان بەیەكەوە دا.

(مُؤاصَرَة):دراوسێیەتیی.

(إِئتَصَــرَ —النَبتُ):رووەكــەكان درێژ بوون و زۆر بــوون/ بــە یەكــدا چــوون و لەپــاڵ یەكدابوون

(-القَومُ):ژمارەیان زۆر بوو.

(اَلإِصــار (ج) أُصُــر والأَیْصَــر (ج) أَیاصِــر والإِصارَة):(مێخ/ سنگ)ی دەوار.

(اَلأَصر والإِصْر والأُصْرُ (ج) آصار):پەیمان.

٤-(اَلأَصْــر والإِصْــر والأصــر (ج) آصــار): ١-قورسیی/ قورسایی ٢-گوناه

(رَبَّنــا لا تَحْمِــل عَلَینــا إِصْــراً): خــودا بــاری گرانمــان لێمەنێ یــان گوناهی گەورە تووشنەبین.

اصط: ١-(إِصْطبل = إِسطَبل):گەور/ تەویلە/ پشتیر.

٢-(أَصْطُرَك) (ن): نەستوورەك. پێشیدەڵێن (لُبن): دیمەنی جوانە ســێ تا شــەش مەتر بەرز دەبێتــەوە. ژێرەوەی گەڵاكەی ســپییە گوڵەكەی ســپییە لەهــی پرتەقــاڵ دەچێت لەسەر رۆخی دەریای ســپی ناوەراست زۆرەو كەڵكی پزیشكیی هەیە.

٣-(اَلأُصْطُوانــه (ج) أَصاطــین وَأَصاطِنَة): (فارسیة)لوولەك.

اصــف: (الأَصَــف) (ن)= أَلكَبَــر):تەڵەمار/ مەرگەمــار (رەشــە خەڵكەكــە پێیدەڵێــن (أَلقَبّار).

أَصــل: ١-(أَصُــلَ. أَصَالَةً): ١-بەرەســەنبوو/ ريشــەداربوو ٢-بنجی داكوتا/ ريشــەيداكوتا ٣-(خانەدان/ وەجاخزادە/ رەسەن) بوو.
(أَصيل): خانەدان/ رەسەن/ وەجاخزادە.
(أَصَّلَ-ە): ١-بێخداريكرد ٢-نەژادو رەســەنی دەرخست/ بنچينە رەسەنەكەی دياركرد.
(تَأَصَّــلَ): ١-رەســەنبوو ٢-بنجــی داكوتــا/ بێخداربوو.
(إِسْــتَأْصَلَ- الشيءَ): شــتەكەی لەبن و بێخ دەرهێنا/ ريشەكێشيكرد.
(-تِ الشَــجَرَةُ): درەختەكە (بنجبەســتبوو/ بنجی داكوتا).
(اَلأَصْل (ج) أُصول: ١-بنكی شت ٢-دامێنی چيا ٣-بنی / يان قەدی دەرخت.
(مافَعَلْتُــهُ أَصْلاً): هەرگيز ئەوەم نەكردووە/ ئەوەم هەرنەكردووە.
(اَلأَصْل): ١-باوك ٢-چاوگ/ سەرچاوە
(لا أَصْــلَ لَــهُ ولافَصْل): نەنــەژادی هەيە و نەوەچــە يان نە ســەرچاوەی هەيە و نەلك/ نەرەسەنيهەيەو نەزمانی دەزانيت.
(الأَصل): باوك.
(الفَصْل): زارۆلە.
يان (الأَصْل): نەژاد/ رەسەن.
(الفَصْل): زمان
(الأُصول): دەستوورو وياساو بنچينەيەك كە زانستيی لەسەر رادەوەستيت و هەڵدەستيت.

(أُصول الدين): دەستوورو ياسای ئاين.
(أُصول العُلوم) ياســا و دەســتوورو بناغەی زانست.
(اَلأَصيل): ١: خانەدان/ وەجاخزادە/ رەســەن ٢: كەسێك كە سەربەستانە خۆی كاری خۆی بكات و بريكاری نەوێت.
(الأَصيلَة رەسەن/ بەبنەچە خانەدان
(جاؤُوا بِأَصِيلَتِهِم): هەموويان هاتن.
٢-(أَصُلَ – رَأْيُهُ أَصالَةً): راكەی دروستبوو.
رَأْيٌ أَصِيل): رايەكی دروست و چاك.
(أَصَالَة وإِصالَةُ الرَأْي) = جودَتُه: رای چاك/ دروست/ بەجێ.
٣-(آصَــلَ. إِيصالاً): كەوتــە دەمی ئێوارە يان دەمی نێوان عەسرو ئێوارە كەهات.
(اَلأَصِيــل (ج) آصــال و أَصَائِــل وَ أُصُــلْ وَ أُصْلان): دەمی نێوان عەســرو زەردەپەڕ يان دەمی تاريكداهاتن.
أَلْمُلحَق:
أَصل: (اَلأَصَلَة) (ح) مارێكی گەورەی بێژمەر درێژيەكەی لە حەوت تا دەمەتريە. دەناڵێتە نێچيرەكەيــەوەو تێكيدەشــكێنێت و ئەوســا قووتيدەدات.

---

اض: (أَضَّ-هُ إِلَيهِ. أَضّاً): تەنگی پێهەڵچنی و ناچاريكرد پەنا بۆ ئەو بەرێت
(-فُلاناً: فيساری ماندووكرد. (إِئْتَضَ- إِلَيهِ): بەناچاری پەنايبۆبرد.

(أَضّ): زۆرلێکردن/ تەنگپێهەڵچنین.
(ألإضْ): ڕەسەن/ نەژاد ڕەچەڵەك.
فُـلانٌ كريـمُ الإضّ: فيسـار بەڕەسـەنە وە جاخزادەیە/ خانەدانە.
(ألإضاض): پەناگا.
أضل: (أَضاليا) (ن) گوڵە داليا.
أضي: (ألأضاة (ج) أضىً وَ أَضيات): گۆم.
اط: (أَطَّ. أَطيطاً): دەنگی لێبەرزبووەوە
(-الرَجُلُ): برسيبوو.
(-تِ الإبلُ): حوشترەكە بۆراندی
(أَطّطت لَهُ رَحِمي): سـۆزم بۆی جووڵاو دڵم پێی سووتا.
(أَطّت بِـكَ الرَّحِمُ): سـكت پێیان سـووتاو سۆزت بۆیان جووڵا.
(هُم أهـلُ أَطيطٍ وَ صَهيـلٍ): ئەوان خاوەن حوشترو ئەسـپن كە دەحیلێنن‌و دەپرمێنن، واتا بووەن.
أطر: (أَطَرَ-هُ وأَطَّرَ-هُ. أَطْراً): چەماندیەوە/ نوشتاندیەوە.
(إنْأَطَرَ: نوشتايەوە/ چەمايەوە
تَأَطَّرَ: خواربووەوە/ چەمایەوە/ نوشتايەوە.
(ألأُطرْ): چەماوەی كەوان.
(ألإطار (ج) أُطُر): چیوەی شت، چوارچێوەی وێنـەو كەمـەی بێژنـگ و دەف و هێڵەك و كەو.
(ألأُطْرَةُ): گۆشتی چیوەی/ چێوەی نینۆك

(ألأَطير): سووچ، گوناه
(أَخَـذَهُ بأطيرِ غَيرِه): بـە گوناهی یەكێكیتر گرتی/ یەكێكیتر گوناهیكردو نایە مل ئەو.
اطـل: (ألإطْل والإطِلْ (ج) آطَـال والأَيطَل (ج) أَياطِل): كەمەر/ ناوقەد.
اطم: ١-(أَطَّمَ-الآطام): بەرزیكردەوە.
(تَأَطَّـمَ- السـيلُ): شـەپۆلەكانی لافاوەكـە بەرزبوونەوە.
(-عَلَيـه): لووتبەرزیی لەگەڵـدا نواندو لێی توورەبوو بە بێزەو پیاهەڵشاخا.
(ألأُطـم (ج) آطام): كۆشـك و قـەلا كە بە بـەرد دروسـتكرابێت/ بەردینبێت و هەموو خانوویەكـی چوار گۆشـەی سـەربان تەخت و هەمـوو خانەیەكی بـەرز ٢-(اع) قەلایەكی بەپەڵـە كراو بە ئاسـن و قـەدی دارو چل و چێو بۆ بەرگریی.
٢-(تَأَطَّـمَ-تِ النارُ): گـڕی ئاگرەكە زمانەی كێشاو بەرزبووەوە.
(ألأطِيمَـةُ (ج) أَطائِم): ئاگـردان/ كوورەی ئاگر.
٣-(ألأطـوم (ج) أُطُـم وَآطِمَة (ح)): مانگای دەریـا/ گیانداریكـە دەچێتە ئـاوەو دواوەی وەكو هی ماسـییە. دوو دەستی هەیەو قاچی نییـە درێژییەكـەی نزیكەی هەشـت پێیە. گۆشتەكەی دەخورێت.
اف. (أَفَّ وَتَأَفَّـفَ وَأَفَّفَ. أَفّـاً): لە داخدا یان

لەبێزاریـــدا/ لەوەرســـیدا ئـــاخ و ئۆفیكـــرد/ ئایشیكرد/ ئاهی هەڵكێشا.

(ألأَفَف: ١-وەرسیی و بێتابوشتی ٢-دەم و كاتی هاتوو.

(ألأُف: ١-نینۆكی وەریو ٢-چڵكی گوێ.

(أُفٍ): بێـــزارم/ وەرســـم ٢-هایـــش: داخ لەدڵ خۆم

(أُفاً لَهُ وعَلَیهِ): ئۆف لە دەســـتی و پیسیی بە سەروچاوی.

(ألأَفّاف): كەسێكە كە ئاخ و ئۆف زۆر بكات و هەناسە زۆر هەڵكێشێت.

افخ: ١-(أَفَخَهُ): كێشای بەسەر مەلاشوویدا.

(ألیأْ فُوخ (ج) یَآفیخ) (ع١) شوێنی مەلاشووی ساوا كە نەرمەو پاشان رەقدەبێت.

٢-(ألأَفْخارسْـــتیا) (یونانیـــة) لای دیانەكان نهێنیی قوربانیی پیرۆزە.

افـــد: ١-(أَفِدَ. أَفَداً): پەلەیكـــرد/ گورجبوو/ خێرایكرد.

(أَفِد): گورج/ بەپەلە/ خێرا.

(أَفِـــدَ واُسْـــتَأفَدَ- التَرَحُـــلُ) كۆچكـــردن نزیكبووەوە.

٢-(ألأُفُـــود) (عبرانیـــة): جـــۆرە بەرگێكـــە گەورە كۆن پیـــاوە ئاینیە جوومكان/ مالوومە گـــەورەكان لەبەریاندەكـــرد دوو پارچـــە بوو یەكێكیان ســـنگ و بەشێكی ســـكی دادەپۆشی ئەویـــتری بە پشـــتیدا شـــۆڕ دەبـــووەوە ئەم دوو پارچەیە لە سەرشـــاندا بـــەدوو تەرەقە بەیەكەوە دەبەسترایەوە لەسەر هەر یەكەیان مووورویەكی رەش و ســـپی پێوە بوو كە ناوی گەورەی جوولەكەكانی پێوەبوو.

افرنـــج: (أَلإفْرَنـــج وَ الإفْرَنجَـــة والفَرَنـــج): دانیشتوانی ئەوروپا جگە لە تورك و رۆم.

أفز: (أَفَز. أَفْزاً): ١-قەڵەمبازیدا ٢-راپەری.

افس: (أَلأَفَسَـــنْتین) (یونانِیَّة): ئەپسەنتین رووەكێكە لە گوڵە لوولەییەكانە زۆر بۆنخۆشە. تاڵە. گەڵاكەی لە هی جاترە دەكات دەشتەكی و دەستچێنە بۆ دروستكردنی هەندێك جۆری كوهول بەكاردێت.

الملحق:

افس: (أَلأُفسِـــت): چاپی ئۆفســـێت كە جۆرە چاپ پێكردنێكە لوولەكێكی لاســـتیكە بەسەر تەختێكی كانزایـــی مەرمەكەباویدا دەروات كە نووسین یان وێنەی لەســـەرەو دەیگوێزێتەوە بۆ سەر كاغەزو چاپیدەكات.

---

(الأُفسیت): ئامێری ئۆفسێت.

افق: ١-(أَفَقَ. أَفْقاً): بەملاولادا كەوتە گەڕان.

(أَفِقَ. أَفَقاً): گەیشـــتە ئەوپەڕی بەخشندەیی یان ئەوپەڕی زانستی.

(آفِـــق وَ أَفِیق): بەخشـــندەیەكی بێوێنە یان زانایەكی تەواو یان لە هەرشتێكدا گەیشتبێتە ئەوپەڕی شارەزایی.

(أَفَـــقُ – الطَریـــقِ): ڕووی دیـــارو ڕێبـــازی

ریگەکەو رەوتی

(ألأُفُق وَ الأُفْق (ج) آفاق): ١-ئاسۆ ٢-سیله ٣-لا ٤-کەنار.

(هُوَ جَوابُ الآفاق): ئەو جیهانگەڕە/ گەڕۆکە ٥-هەڵگەی با.

(دائِــرَةُ الأُفُــق) (فــك): بازنەی ئاســۆ ئەو شوێنەیە کە ئاســمان بەچاو وادەبینرێت کە بەزەوییەوە نووساوەو وەکو ڕووی ئاوێکە.

(أُفُقِي) ئاسۆیی.

(ألخط الأُفُقِي): (ه) ئەو هێڵە ئاسۆییەیە کە هێڵی شاقووڵی/ ستوونیی دێتە سەری.

(ألأفَاق): چەرچی/ کەسێکە بۆ نانپەیداکردن هەمووولایەك دەگەڕێت.

٢-(أفَقَ – الجلدَ. أفْقاً): پێستەی خۆشەکرد

(جلْدٌ أفِيــق (ج) أفِقَة وأفَق) پێســتەیەکی خۆشەکراو.

(ألأفيقة) پێستەی خۆشەکراو.

افــك: ١-(أفِكَ وأفَــكَ. أفَكاً وأفْــكِاً وَأفُوكاً): درۆیکرد/ فشەیکرد.

(أفيك (ج) أُفكاء وَأفُوك (ج) أُفُك وأفَّاك (ج) أفَّاكون): درۆزن/ درۆ هەڵبەست/ فشەکەر.

(أفَّكَ): درۆیکرد/ درۆی هەڵبەست.

(ألإفْك و ألإفْكَةُ والأفِيكَة. جَمعُ أفائك): درۆ.

(حَديــثُ الإفــك): ئاخاوتنی هەڵبەســتراو، فەرموودەو حەدیســی هەڵبەســتراو بەزمانی پێغەمبەرەوە.

٢-(أفَكَ-هُ عَــن رَأيِهِ أفَكاً): ڕاکەی پێگۆڕی و لایدا/ پێیهەڵگێرایەوە.

(إئْتَفَــكَ- البَلَــدُ بأهلِــهِ): شــارەکە بــە خەڵکەکەیەوە ژێرەو ژوور بوو/ ژێرەو زەبەر بوو.

(ألمُؤْتَفِكات): باگێژ/ بای زۆرو چەواشە/ بای هەڵگەجیــا جیا. عەرەب دەڵێت: ئەگەر باگێژ زۆربــوو زەوی ژێرەو زەبــەر دەبێت :٢: ئەو شــارانەی خودا فڕیهێنان و بە خەڵکەکەیەوە لەناویبردن وەك(سَدوم وعَمورة).

٣-(أفِكَ – المكانُ): شوێنەکە بارانی لێنەباری، وشکایی گەیشتی

(إئتَفَــكَ-تِ الأرضُ): زەویەکــە بێبارانــی سووتاندی. هەڵیپڕووکاند.

(ألآفِكَةُ (ج) أوافِكُ- مِن الســنين): ســاڵانی بێباران/ وشکە ساڵان.

(الأفيك والمأفوك): ئەوەی خێر و بێری هیچ (دەستگیر نابێت/ چنگ ناکەوێت).

٤-(أفِكَ- الرَجُلُ): ئاوەزی/ ئەقڵی سووکبوو.

(ألأفيــك والمأْفُــوك): بوودەڵــەو بیر کورت/ بێراو بێهۆش.

٥-(أفوکاتــو) (ن): درەختێکــی بــەردارە. بەرەکەی خۆشەو گۆشــتەبەرە وەك هەڵووژە وایــە بــەڵام گەورەتــرە لەوانەیــە یەکێکی کیلــۆو نیوێك دەرچێــت لەوڵاتە گەرمەکاندا دەروێنرێت.

افل: (أَفَلَ وَأَفِلَ- القَمَرُ): مانگەکە ئاوابوو.
(قَمَرٌ آفِلٌ): مانگێکی ئاوابوو.
(ج) (أُفَّــل وَ أُفُول) (فُلان كَعْبُهُ سـافِلٌ ونَجْمُهُ آفِلٌ): فیسـار پاژنەی داکەوتووەو ئەسـتێرەکەی ئاوابووە.
(أَفَلَ وَأَفِلَ- الرَجُلُ أُفولاً وَأَفَلاً): چالاکبوو.
(-المُرضِــعُ): شـیردەرەکە شـیرەکەی نەما/ وشکیکرد.
(تَأَفَّلَ): لووتبەرزیی نواند
(الأَفيل (ج) أَفَال وَأَفائِل (م) أَفيلَة): حوشتری بچووك.
افــن: ١-(افــن: ١-(أَفِــنَ وَأُفِــنَ. أَفَنــاً): را (پووچەڵبوو/ نادروستبوو).
(أَفين وَمَأْفُون): بێهۆش، بوودەڵە و بیرا.
(أَفَــنَ- الله فُلانــاً): خــودا هۆش و گۆشــی لەبەربری و کەمئاوەزیکرد/ گەمژەیکرد.
(أَفَنَ- الناقَةَ): مێحوشترەکەی لەکاتی خۆیدا نەدۆشی/ لەناکاتدا دۆشی.
(تَأَفَّــنَ): ڕەوشــتێکی نوانــد کــە هی خۆی نەبوو.
(-الشيءُ): شتەکە کەموکووڕبوو.
(-أَواخِرَ الأُمورِ): شوێن کۆتایی کارەکانکەوت.
(الإِفّان): (کات/ دەم)ی خۆی
(جاءَ في إِفّانِ ذلك): لەکاتی خۆیدا هات.
٢-(الأَفْيون (ن)): (فارســیة) تلیاك/ بەنگ / شــیلەی ڕووەکی خاشخاشە. بەنگکێشەکان بۆ سەرخۆشیی و بێهۆشــبوون بەکاری دەهێنن. مادەی خەو هێنەری تێدایە.
اق: ١-(الأُقَّة (ج) أُقَق: هۆقە.
٢-(الأَمافيا (ن)= الشَوكَة المِصْرِيَّة): ئەکاکی = دار=جەوی. درەختێکە لەوڵاتە گەرمەکاندا زۆرە بــە تایبەتــی لــە ئوســترالیادا بۆ بۆنە خۆشــەکەی دەروێنرێت و بــۆ قایمکردن و چەسپکردنی خاك. بەزۆریی گوڵەکەی زەردەو سپی و پەمەییش دەگرێت.
أقــح: ١-(أَقاحِيُّ الأَمــرِ): ١-ســەرەتای کار/ ٢-نۆبەرەی شت.
٢-(الأُقْحُوان والقُحْــوان (ج) أَقاحي وَأَقاح): هەمیشــە بەهار/ گوڵە بەیبــوون ڕووەکێکە کــەڵای گوڵەکــەی بــڵاوەو بچووکــە، دانــی پێدەچوێنن، هەر لــە کۆنەوە لە خۆرهەڵاتی دوور دابــووە. جوانترین گوڵــی باخچەکانەو بە ڕەنگەکانیەوە لە کۆتایی پایزو ســەرەتای زستاند گوڵدەگرێت.
(أُقحــون الحَدائِــق): گوڵێکــە لوولەیــی ڕەنگزەردی زێرینییە لە دەشت و دەر دەڕوێت بەتایبەتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. زۆریی لەناو کشــتوکاڵدا زیانێکی زۆ دەبەخشێت بەو کشتوکاڵەی تیادا دەڕوێت.
أَقص: (الأُقصَليص) (ن): ترشۆکە.
(أَقط: اَلأَقْط و الإِقْط وَالأُقط والأَقَط والأَقِط والأُقْط والإِقِط): پەنیر

(اَلإقْطة): پارچە پەنیرێك.

اقنث: (الأَقْنَثا وَالأقَنثوس) (ن): ڕووەکێکی گەڵا جوانە بەزۆریی لە ڕۆخی دەریای سپیدا هەیە.

أَکــت: (اَلأَکتینیــوم) (ك): تەنێکی ســادەی تیشکدارە هێماکەی (AC) یە.

اکــد: ١-(أَکَّــدَ وَ وَکَّــدَ- العَهدَ أو السَــرْجَ): جەختی لەسەر پەیمانەکە کردو چەسپاندی و پتەویکرد/ سەلماندی. یان زینەکەی قایمکرد و چەسپیکرد.

(تَأکَّدَ وَتَوَکَّدَ): ١-چەسپا/ قایمبوو ٢-شەتەکدرا ٣-لێدڵنیابوو/ بۆی ساغ بووەوە.

(الأکیــد): ١-دامــەزراو وقایــم ٢-لێدڵنیــا چەسپاو.

(اَلأکائِدو والتَأکید): ئەو قایشەی کە زینەکەی پێ قایمدەکرێت/ تەنگەی ولاخ.

(إکاد) یەك قایشی قایمکردنی زین.

٢-(أَکَّــدَ و وَکَّدَ-الشــيءَ): بڕیــاری تەواوی شتەکەیدا/ لەسەر شتەکە سووربوو/ جەختی لەسەر کرد.

(تَأکَّــدَ وتَوَکَّــدَ): جەختیکــرد لێیدڵنیابوو، بڕیای تەواوی لەسەردا.

(اَلأکید): دامەزراو/ مســۆگەر: لێدڵنیابوون/ ڕاست و چەسپاو.

٣-(اَلأکیدنیــا) (ن): یەنگیدنیــا: درەختێکە بەرەکــەی بەشــێوەی هێشــوو دەبێــت.

ڕەنگپرتەقاڵییەو خۆشە لەناوچە گەرمەکاندا دەروێنرێــتو لــە ڕۆخــی دەریای سپیشــدا دەروێنرێت.

اکر:١-أَکَــرَ وَتَأکَّــرَ- الأرضَ. أکْــراً) (ز): زەویەکەی کێڵا. ٢: هەڵکەند

(اَلأکّار (ح) أکَرَة وَأکّارون): کێڵەر/ جوتیار

(اَلأُکْرَة (ج) أُکَر): ١-چاڵ ٢-تۆپ.

(الإکارات- عِنــدَ الفُقَهــاء) ئــەو زەویانەی بەجوتیــار دەردێــت چاکیبکــەن و بیکەنــە کشتوکاڵ.

٢-اَلأُکارینا) (مو): ئامێرێکی مۆســیقایە لە کانزا یان کاشــی دروستکراوە هێلکەییە لوولە دارەو هەشت کونی تێدایە.

٣-(اَلأکوردیون) (مو): ئۆکۆردیۆن ئامێرێکی مۆسیقایە بەپەنجەو بە هەوا لێدەدرێت.

اکس: ١-(أکاسیا أَو رو بْنِیَّة) (ن): ئەکاسیا درەختێکــە پەلەکانــی دڕکاوییــە گوڵەکەی بۆنخۆشە سپی یان پەمەییە لە بنچینەدا هی ئەمەریکایە.

٢-(اَلأکسَدَة) (ك): یەکگرتنــی مادەیە لەگەڵ ئۆکســجیندا ئەمیش چەند جۆرێکە: لەوانە ژەنگی ئاسن و سووتانی مادە.

(اَلأکســید) (ك) (یونانیة): تەنێکە لە دوو تەنی سادە پەیدا دەبێت یەکێکیان ئۆکسجینە.

الأکید القاعِدی: ئۆکســیدی تفت کەلە ئاودا توایەوە تفتیی دەدات.

(الأُكسـيد الحمضي): ئۆكسيدی ترش كه به توانهوەی له ئاودا ترشيی دەدات.
(أَلْوُكْسَـد) (ك): ئۆكسـێنەر مادەيەكـه ئۆكسجينەكەی لێ جيادەبێتەوە.
٣-(الأكْسَرَ خوس): پايەيەكی پياوە ئاينيە ديانەكانە كه سەر بەكڵێسەی خۆرهەڵاتين.
٤-(ألأُكسـجين) (ك): ئۆكسـجين گازێكـی بێرەنـگ و بۆنە. بۆ هەناسـەدان و سـووتان پێويسـتە بەرێـژەی ٥/١ له هـەواد هەيە و هێماكەی (O) يە.
(ألحَجر الأُوكسـجيني) (ك): تەنێكی سپاتە ئەويـش ئۆكسـيدی (Na2o2)ە خوێيەكـی سۆديۆميی تێكەڵ بە مسـەكە خرايە ئاوەوە ئۆكسجينەكەی لێدەردەچێت.
(الماءُ الأُكسجيني): شلەيەكی لينجه بەشێوەی گيراوەيــه لــه ئــاودا و دەفرۆشـرێت. بـۆ پاككردنەوەو سپيكردنەوەی رەنگ و لابردنی بەكاردێت به پەيتی ١٠:١ جار.
اكـف: (أَكَّـفَ وآكَـفَ – الحِمـارَ إيكافـاً): كورتانەكەی له كەرەكه قايمكرد
(-الأُكاف) كورتانی (دروو/ دروستكرد)
(أَلأُكاف (ج) أُكُف و آكِفَة): كورتان/ كۆپان.
(أَلأَكّاف): ١-كۆپاندروو ٢-كورتانفرۆش.
(أَكَلَ- الطَعـامَ أَكْلاً وَ مَأْكَلاً): (چێشـتەكە/ خواردنەكە)ی خوارد. جووی و قوتيدا.
(أَكَّلَ وآكَلَ- فُلاناً الشيءَ) شتەكەی دەرخواردی فيساردا.
(آكَلَ-هُ مُؤاكَلَـةً): ١-خواردنی لەگەڵدا خوارد ٢-خواردنی دەرخواردا.
(إئتَكَلَ): هەندێكيان هەندێكيتری خوارد.
(-تِ النـارُ): ئاگرەكـه تيژبـوو و بەيەكدا چوو.
(-مِنَ الغَضَبِ): له ڕقاندا خۆی خۆيخواردەوە/ گڕی لێبوەوە.
(إسْـتَأْكَلَ-هُ الشـيءَ): داوايلێكـرد شـتێكی دەرخوارد بدات/ خواردنێكی بۆ بكات.
(فُـلان يَسْـتَأْكِلُ الضُعَفـاءَ): فيسـار ماڵی بێدەسـەڵات و بێچارەكان دەخوات و بە تاڵان دەبات.
(أَلأَكل والأُكُل): ١-ميـوە، بـەری دەرخـت ٢-ئەوەی دەخورێت/ خۆراك ٣-ڕۆژيی فراوان.
(أَلأَكْلَةُ): ١-خواردەمەنی/ ئەوەی كه دەخورێت ٢-له پاشمله بەخراپيی لێدوان/ غەيبەتكردن/ ژەمە خواردنێك.
(آكِلُ النَمـلِ): مێروولـه خـۆر: گياندارێكه بربرە دارو شـيردەرە. بێدانه بەزمان مێروو له ڕاودەكات و لەسەری دەژی.
(أَلآكِلَة): دەرديكه له ئەندامێكدا، ئەندامەكه دەخواتەوەو پەكيدەخات
(أَلأَكال والأَكيـل والأَكُول والأُكلَة: زۆر خۆر/ چڵێس/ بەخۆرا.
(أَلمَـأْكَل (ج) مَآكِل): ئـەوەی كه دەخورێت/

خواردەمەنی.

(المَأْكُلَةُ): شتی خوراو.

(شاةٌ مَأْكُلَةٌ): مەری دابەستەکە بۆ خواردنی قەڵەو دەکرێت.

(المِنْكَلَة): لەگەنێکی بچووك/ هەر دەفرێك شتی تێدا بخورێتو بخورێتەوە.

(المِنكال (ج) مَآكيل): کەوچك/ چەمچە.

(المَأكول (ج) مَآكيل): خۆراك/ خواردن

(المَأْكُول وَ المَشْرُوب): خواردن و خواردنەوە.

٢-(أَكَلَ- الشيءَ أَكْلاً وَمَأْكَلاً): شتەکەی (فەوتاند/ لەناوبرد)/ خوارد.

(أَكَلَ فُلانٌ عُمْرَهُ): فیسار تەمەنی خۆی تەواوکرد/ بەسەربرد.

(أَكِلَ وتَأكَّلَ السِنُ أَوالعودُ أَكَلاً): دانەکە کولۆربوو/ خورا یان تووڵەکە خوراو کولۆربووو کەوت.

٣-(أَكَلَهُ-هُ رَأْسُهُ) إِكْلاً وَأُكالاً وَأَكالاً): سەری هاتە خوروو/ سەری خورا.

الملحق

اکل: (أَلتَأَكُّل والتَأكُل) داخوران و لێکهەڵوەشانی مادەو تەنەکان بەلێخشان یان بەکارلێکی کیمیایی.

(تَأَكُّلُ الحَديدِ: ژەنگهەڵهێنانی ئاسن و هەڵوەرینی.

(تَأكُلُ الصُخور): داخوران و هەڵوەرینی تاوێرو بەرد.

اکم: (إِسْتَأكَمَ- المَوْضِعُ): شوێنەکە بوو بە تەپۆڵکە/ گرۆدڵکە.

(أَلأَكَمَةُ (ج) أَكَم وَأَكَمات و(جج) آكام وأُكُم وإكام): تەپۆڵکە، گردۆڵکە. یان شوێنێك کە لەملاولاکەی بەرزتربێت.

ال: (أَلْ): کە (پیتی پێناسینە)

١-(أَل العَهديَّة): بۆ پێبەستەیە

(إشتَرَيتُ عَبداً ثم بِعْتُ العَبدَ): کۆیلەیەکم کری پاشان کۆیلەکەم فرۆشتەوە.

٢-(أَل الجنسيَّة) بۆ رەگەز.

خُلِقَ الإنْسانُ ضَعيفاً: هەموو رەگەزی مرۆڤ بێتوانا دروستکراون.

٣-(أَل) تَأْتی إسماً موصولاً): دەخرێتە سەر ناوی بکەرو کارلێکراو وەك:

(الحامِل): هەڵگرەکە.

(أَلمَحمول): هەڵگیراوەکە.

أَلَ: (أَلَّ- الرَجُل. أَلاًّ): پەلەیکرد (-ەُ): ١-سونگییەکی پێداکرد ٢-دەریکرد/ دەرپەڕاند

(-اللَونُ): رەنگەکە روون و ساف و شەوقدار بوو.

(-المَريضُ أَلاًّ وأَلَلاً وَأَليلاً): نەخۆشەکە ناڵاندی نرکاندیی.

(-الرَجُلُ في دُعائِهِ): پیاوەکە بە دەنگی بەرز نزایکردو پاڕایەوە/ لە نزاکەیدا دەنگی هەڵبری.

(أَلِلَ-تِ الأَسنانُ. أَلَلاً): دانەکان خوران/

کرمێ بوون/ خراپبوون.
(أَلَّ- الشـيءَ): سـەری یان نووکی شتەکەی تیژکرد.
(أَلإل: ١-پەیمان ٢-بەئاشکرا دەربڕین/ جاردان ٣-بنەچەی ڕەسـەن ٤-دوژمنایەتی/ خەشم و قین/ قینەبەرایەتی.
(أَلأَلّة): ١-سـونگی ٢-هەموو جۆرە ئامێرێکی جەنگ.
(فَـرَسٌ مِئَـلّ): چارەوێیەکی خێـرا/ تیژ/ تیژڕەو.
الا: (ألا): پیتێکە سەری قسەی پێدادەمەزرێت و بەچەنـد ئامانجێـك دێـت ١-بۆ ڕاسـتیی ڕوودانی ئەو کردارەی کە لە دوایەوە دێت
(أَلا إِنَّهُـم هُمُ السُـفَهاءُ): بەڕاسـتی ئەوانن بەدرەوشـت و ناتـەواون ٢-پیتـی بـە ئاگاهێنانەوەیە بەواتای (ئەرێ)یە.
(أَلا یا صاحِ قُم): ئەرێ بەخەبەر/ بەئاگا دە هەستە. ٣-پیتی داوایە بەلاّم بەنەرمی.
(أَلا تَنزِلُ إِلَینا): ئـەرێ/ دە لانادەیتە لامان ٤-پیتی داوایە بە توندی.
(أَلا تَتُوبَ وَتَرتَدَّ عَن غَیِّك): ئەرێ ئیتر تۆبە ناکەیت و بێیتەوە سەر ڕێگەی ڕاست.
٢-(أَلاَّ: حـرف تخضیـض): پیتـی هاندانە بەتوندی: أری بۆ
(أَلاَّ تُکـرِم أَبَوَیكَ): ئەرێ بـۆ ڕێز لەدایك و باوکت ناگریت.

٣-(إِلاَّ: أَداة إِستِثناء): ١-ئامرازی هەڵاوێردنە/ جیاکردنەوەیە: جگە لە:
(جاءَ القَومُ إِلاَّ زَیداً): خوێشگەل هەموو هاتن جگە لە زەید/ زەیـد نەبێت ٢-بە واتا (جیا)
دێتلِيَ رِجالٌ إِلاّ رِجالَكَ): من پیاوانێکم هەیە کە لەگەڵ پیاوانی تۆدا جیان. واتا لەوانەی تۆ باشترن ٣-بەواتای هەرتەنها ئەونەبێت:
(أَداة الحَصر بَعدَ النَفي): بۆ دیاریکردن دوای نەرێ دێت.
(ماضَرَبَ إِلاَّ زَیدٌ): کەس دەسـتی نەوەشاند تەنها زەید نەبێت/ ئەو نەبێت کەس دەسـتی نەوەشاند.
الب: (أَلَبَ. أَلْباً): کۆیکردەوە.
(أَلِبَ): کۆبووەوە/ مۆڵیخوارد
(أَلَّـبَ) (ضـد): ١-پێکـەوە کۆیکردنـەوە/ یەکیخسـتن ٢-لەیەکیکـردن و لەیەکـی ڕاستکردنەوە.
(تَأَلَّـبَ): کۆبوونەوەو چـڕ بەیەکداچوون/ قەڵەبالغیانکرد.
(أَلإِلب): ١-گەلە کۆمەکێکردن لەیەکێك
(هُم عَلَيَّ إِلبٌ واحد): ئەوان دەستە دوژمنێکی یەکگرتووی منـن/ بە هەموان گەلەکۆمەکێم لێدەکـەن ٢-قلیشـی نێـوان پەنجەگـەورەو پەنجەی شەهادەت/ دۆشاوەژە.
٢-(أَلأَلبَکـة) (ح): جـۆرە گاکێوییەکـە. زیندەوەرێکـی کاوێژکـەرە لـە ئەمەریکای

باشووردا دەژی ٢-چنراوێکی خورییە لە تووکی ئەو جۆرە گاکێوییە دەچنرێت.

الت: (أَلَتَ-الشيءُ أَلْتاً): شتەکە کەمیکرد/ کەمبوو.

(-الرَجُلَ حَقَّهُ): لەمافی پیاوەکەی بری و مافی پیاوەکەی کەمکرد.

(-الرَجُلَ): نەیهێشت بۆ نیازەکەی بچێت/ ڕێی لێگرت و دووریخستەوە.

(-هُ يَميناً): سوێندیدا یان داوایلێکرد شایەتیەکی بۆ بدات

(آلَت-إيلاتاً): کەمیکرد.

(أَلأُلَتَهُ): ١-بەخشینێکی کەم ٢-سوێندی درۆ.

الذی: (أَلَّذي): ئەومیکە/ ئەوکەسەیکە.

(أَللَّذان) واللَّذَينَ): ئەو دوانەیکە

(ج) (أَلَّذينَ وَالَّذُون): ئەوانەیکە

(أَللَّذَيا واللَّذَيان): ئەو دوو بچووکانەیکە.

(أَللَّذَيُّون): ئەو کۆبچووکانەیکە

(أَلَّتی): ئەومیکە (بۆمێ).

أَللَّتانِ واللَتانِّ): ئەو دوانەیکە (بۆمێ) (ج)

(أَللَواتی وَاللاَّتِ واللاَّءِ): ئەوانەیکە (بۆ کۆی مێ).

(أَللَّتَيا وَاللُّتَيا): ئەو دوو بچووکانە (بۆ مێ)

(وَقَع فُلان فِي اللُّتَيا والتی): فیسارکەوتە بەلای گەورەو بچووکەوە.

الس: ١-(أَلَسَ-هُ أَلْساً): ناپاکیی و دەغەڵیی لەگەڵدا کرد.

(آلَسَ-هُ مُؤالَسَةً): ناپاکیی لەگەڵدا کردو ساختەی لێکرد/ فێڵیلێکرد.

(هُوَ لا يُدالِسُ ولايُؤالِس) ئەو نەخەڵك لە خشتە دەبات/ نە فێڵیلێدەکات و نە ناپاکیی لەگەڵدا دەکات

(أَلأَلْس): ناپاکیی.

٢-(أُلِسَ): مێشکی تێکچوو.

(مَأْلوس): مێشك تێکچوو.

(أَلأَلس): شێتیی.

الف: (أَلِفَ-هُ أَلْفاً): هۆگریبوو/ لەگەڵیدا راهات و خۆشیویست

(-أَلْمَكانَ): بەشوێنەکە راهات و دڵی پێکرایەوە.

(آلَفَ-هُ. إلافاً وَمُؤالَفَةً): هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرد. دۆستایەتیی لەگەڵدا گرت و لەگەڵیدا راهات/ گونجا.

(آلَفَ- المكانَ. إيلافاً): بەشوێنەکە راهات و لای خۆشبوو/ دڵی پێیکرایەوە.

(-هُ المكانَ): بەشوێنەکەی راهێناو لای خۆشکرد.

(أَلَّفَ- بَينَهُم): هۆگری یەکتریکردن و دڵی بە یەکەوە نووساندن.

(تَأَلَّفَ-هُ): لەگەڵیدا میهرەبانیی نواند و دڵی راگرت.

(إسْتَأْلَفَ): خوازیاری دۆستێك و هاودەمێکبوو.

(إلْف (ج) آلاف وأَليف (ج) أَلائِف وآلِف (ج) أُلاَّف): دۆست و هاودەم.

(أَوالِفُ الطَيرِ): باڵندەی ماڵی.
(ألإِلْــف والأُلْفَــة): هۆگریی و دۆســتایەتی/ پێکەوە ڕاهاتن و گونجان/ هاودەمیی.
(ألإيلاف): پەیمان و نیمچە ڕێدان.
أليف:١-ماڵی ٢-ئاشنا ٣-باو.
(ألمَألَف (ج) مَآلِف): باو/ پێراهاتووی خەڵك
(ألألوف (ج) أُلف):١-هۆگری تەواو ٢-دۆست و هاودەمی چاك ٣-تەواو ڕاهاتوو.
(صَديقٌ أَلوفٌ): دۆست، هۆگرو خۆشەویست/ هاوڕێ و دۆستی گیانیی بە گیانیی.
٢-الف: (أَلَّفَ- الشــيءَ): پارچەکانی شتەکەی لێکدا.
(-الكِتابَ):(پەرتووکەکەی/ کتێبەکەی) داناو دەریکرد/ پێکیهێنا.
(تَأَلَّفَ- الشَيءُ): شتەکە پێکهات و دروستبوو/ ڕێکبوو دامەزرا.
(تَأَلَّفوا): کۆبوونەوە.
(إئتَلَفــوا وتَآلَفــوا): کۆبوونــەوەو هۆگــری یەکبوون.
(ألتَأليــف والمُؤَلَّــف):(پەرتــووك/ کتێب)ی دانراو. زانســتی تێــدا تۆمارکــراوە یان هەر بابەتێکیتر.
(ألمُؤَلِّــف): دانــەری کتێــب/ نووســەری پەرتووکەکە.
٣-(أَلَفَ-هُ أَلْفاً): هەزاری دایە.
(آلَفَهُم): کردنی بــە هەزار. (آلَفوا)بوون بە هەزار.
(أَلَّفَ- الأَلْفَ): هەزارەکەی تەواوکرد
(ألأَلْــف (ج) أُلُــوف وَآلاف) (ع ح) هــەزار (١٠٠٠).
٤-(ألأَلِــف): یەکەمــین پیتــی هیجایــە/ عەرەبییە
(كِتــابُ الأَلِف بــاء):کتێبێکــە/ پەرتۆکیکی عەرەبیە کــە پیتە هیجاییەکانــی عەرەبی تێدا دەخوێنرێت.
(الأَلف):یەکێکی هەموو شتێك
(ألأَلِــف واليــاء): ســەرەتای شــتەکەو کۆتاییەکەی
(هذا الأَمرُ هوَ الأَلف والياء):ئەم کارە هەموو شتەکەیە.
(أَلأَلْفِيَّــة): ڕێزمانی زمانــی عەرەبی کە بە هەڵبەست دانراوەو هەزار دێرە هەڵبەستە.
الملحق:
الــف: (أَلإئتِــلاف): گونجــان پێکهاتــن و یەکگرتن
(إئتِلاف أَشــخاص):لەگەڵ یــەك گونجان و یەکگرتنی کەسان و پێکهاتنیان.
(ألإئتِلاف في المُوســيقى): (مو): یەکگرتن و یەکبوونی دەنگەکان بەشــێوەیەك کە ئاوازی مۆســیقاکە لەگــەڵ یەکــدا بگونجێنێــت و جوانییکات
(ألإئتــلاف في البَلاغَــة): لەڕەوانبێژیدا لە

باربوونی وشه لەگەڵ واتاکەدا.

(اَلإئْتِلاف فِي السِّياسة):لە رامیاریدا ئەوەیە هێــزە جیاجیاکان و هێزە نەیارەکان لەســەر هەندێــك خاڵی گرنگ رێکبکــەون و پێکەوە کاربەن.

(حكومَــة إئْتِلاف):حکومەتێکی/ میرییەکی کاربەدەســتی یەکگرتوو کە هی چەند بەرەو هێزێکە و لەســەر بەرنامەیــەك پێکهاتون و کاردەکەن.

(إئتلاف إنتِخابِــي):پێکهاتن و یەکگرتن لە هەڵبژاردنــدا چەند پارت و هێزێك لەســەر بەرنامەیەك رێك دەکەون و لیستەی هاوبەش دادەبەزێنــن و لە هەڵبژاردنەکەدا کۆمەك بۆ دەرچوونی لیستەی هاوبەشەکە دەکەن.

---

الق: (أَلَقَ وَتَأَلَّقَ وَأئتَلَقَ- البَرقُ):برووسکەکە درەوشایەوە/ شەوقیدایەوە.

(تَأَلَّقَ-تِ المَرأَةُ):ژنەکە ئارایشــتیکردو خۆی نەخشاند

(تَأَلُّــق) (ف):درەوشــانەوە/ بریســکانەوە/ شــەوقدانەوەی مــادە لەخــۆوە بەبــێ بەرزبوونــەوەی پلــەی گەرمــای. ســتوونی شــەقامەکان و مینــای هەندێــك کاتژمێــر ئــەو تەنــە شــەوقدارانەی تێهەڵدەســوون. درەوشــانەوەش جۆرجۆرە. یان فۆسفۆرییە. کــە درێژخایەنــە یــان فلۆرییــە زۆر زوو دادەمرکێتەوە.

(أَلإلاق):هەورە برووســکە درۆزنە کە بارانی لەگەڵدا نییە.

٢-(أَلِقَ- الرَجُلُ. أَلْقاً):درۆیکرد.

أَلإلْق (ج) إلَق:١.بەد رەوشت ٢.گورگ.

٣-(أُلِقَ. أَلْقاً):شێتبوو/ تێکچوو.

(مِئلَق ومَألُوق):شێت/ تێکچوو/ دێوانە

(أَلأَولَق:شێتیی/ دێوانەیی/ تێکچوون.

الك: ١-(أَلَكَ وَآلَكَ. أَلْكاً وأُلُوكةً وأَلُوكاً ومَألَكاً وَآلَكَ. إلاكَةً):(پەیامەکە/ نامەکە)ی گەیاند

(إسْــتَأْلَكَ- أُلُوكَتَــهُ):پەیامەکەی/ نامەکەی هەڵگرت

(أَلْمَلَك والمَلاك (ج) مَلائِك ومَلائِكَة (مُخَفَّف مَــلْأَك والأَصل مَأْلَــكَ):نــێرراو. نێرراوێك فریشتەیەك. مەلائیکەتێك. پەیامبەر.

(أَلأَلُوك والأَلُوكَــة والمَأْلُك والمَأْلُكة (ج) مَآلِك والائِك):پەیام/ پەیخام/ نامە.

٢-(الإلكْــترون) (ف) (یونانیة):ئەلیکترۆن: تەنۆڵکەیەکی ئەوپەڕی وردیی هەیە بنچیەییە بچووکترین بارگــەی کارەبایی هەڵگرتووە کە نێگەتیڤە.

الملحق

الك: (الإلكترون:تەنۆڵکەیەکی بنچینەیی یان ســەرەتاییەکە/ بچووکترین بارگەی کارەبایی هەڵگرتــووە، دەتوانرێــت جیابکرێتــەوە پێیدەوترێت کارەباویبوون یان بارگاویبوون.

الم: ١-(أَلِمَ. أَلَمــاً):ژانیکرد/ ئازاری لێیەیدا

بوو. (أَلِـمٌ: ژانکـردوو/ ئازاردار/ ئێشـدار/ بەئازار.

(أَلَمَّ-ەُ. تَأْليماً): ئازاری پێگەیاند/ ئێشیدایە. ژانی پێکرد.

(آلَمَهُ. ئیلاماً) ئازاری پێگەیاند/ پەشاندی.

(تَأَلَّمَ): ئازاری چەشت و هاواری ئازاریکرد.

(الأَلَم (ج) ئالام): (ئازار/ ئێش)ی زۆر/ ژانی سەخت/ گل.

(الأَلیم): ئـازاردەر/ بەژان و ژوور/ بەئێش و ئازار.

(مُؤلِم): ژاندەر/ ئازاردەر بەسوێ/ بەئازار.

٢-(الأَلماس) (ك) (یونانیة): ئەلماس بەردێکی گرانبەهای زۆر سەختە.

٣-(الألومنیوم) (ك): فافۆن هێماکەی (AL)ە. کانزایەکی سـپیی سووکە گەیەنەرێکی چاکی گەرمـی و کارەبایـە. دەفرێکـی زۆری ماڵی لێدروستدەکرێت.

اله: ١-(أَلَـهَ. أُلوهَةً وَإلاهَـةً وأُلوهِیَّةً: خودا پەرستیکرد/ بەندەیی خودایکرد.

(أَلَّهَـهُ: ١-کـردی بە خـودای خـۆی ٢-پایەی خودایی دایە ٣-کەساس و زەبوونیکرد ٤-کردی بە کۆیلەی خۆی.

(تَأَلَّـهَ: ١-بوو بـە خودا ٢-خۆی کـرد بە ودا ٣-خـودا پەرسـتییکردو وازی لـە دنیا هێناو گۆشەگیر بوو.

(إِسْـتَأْلَهَ): وەك خودا خۆی پیشـانداو خۆی بەخودا چواند.

(الإِلـه (ج) آلِهَـة): خوداوەندی پەرسـتراو/ خودا.

(ألله): ناوی بەرزی خودای هەمیشە بوو.

(أَللَّهُـمَّ= یـا ألله): هـاوار خودایـە. ( میمە گوشـراوەکە لەبری پیتی بانگکردنەکەیە کە لابراوەو ئەو دوانە پێکـەوە نایەن. ناوترێت (یاأَللّهُمَّ).

(الأُلوهِیَّـة والأُلوهَـةُ والأُلاهَـةُ والإِلَهِیَّـةُ والأُلْهانِیَة): خودایەتی.

(الإِلَهِیَّـات): زانسـتییەکە باسـی خـوداو ئـەوەی پەیوەندی بە خـوداوە بێت دەیکات/ زانستەکانی خودا ناسیی.

٢-(أَلِـهَ. أَلهـاً): سەرسـامبوو/ حەپەسـا/ واقیورما.

(أَلِهْتُ- علیه): حەپەسـام و لێیترسام شتێکی لێبەسەر بێت.

الا: (أَلا وَأَلَّـى. وائْتَلى- في الأَمـر. أَلْواً وأُلُوّاً وَأُلِیّـاً وَتَأْلِیَةً وإئْتِلاءً): لە کارەکەدا سسـتیی نواند و کەمتەرخەمییکرد/ کەموکوڕیکرد.

(لَـم یَأْلُ جَهداً): سسـتیی و کەمتەرخەمیی نەکرد/ کەموکووڕیی نەنواند.

(آلی وتَأَلَّی وائتَلی إِیلاءً): سوێندیخوادر.

(آلَیـتُ أَفْعَلُ کـذا) (أی لا أَفْعَل بحذف (لا) بَعدَ فعل القَسـم): سـوێندم خواردووە ئەو کارە نەکەم.

(أَلْألو): ١ـبەخشش ٢ـپشقلی مەڕ

(أَلْأُلــوَ والأَلُــوَّة والأُلُــوَّة والإلِيَّـــة (ج) ألا ويَـــة): دار عود كــە دەســووتێنرێت و بۆنی خۆشدەداتەوە.

(أَلْأَلْوَةُ والأُلْــوَةُ والأَلِيَّةُ). وجمع أَلِيَّة. ألايا): سوێند.

(أَلْأَلِــيُّ): باوەڕقایم/ باوەڕپتەو/ بڕوا دارێکی ساغ.

(أَلمِئْــلاة (ج) مَآل) دەستەســڕ یان پەڕۆیەك ئافرەتی شیوەنکەر بە دەســتیەوە دەگرێت‌و بەدەم لاواندنەوەوە ڕایدەوەشێنێت و ئاماژەی پێدەکات.

الي: ١-(أَلِــيَ- الكَبْشُ أَلْياً): دووگی بەرانەکە گەورەبوو.

(أَلْيــان وآلى (م) أَلْيــاء وأَليانَـــة (ج) أُلْـــي): دووگن/ دووگگەورە.

(أَلْيَـــة) (دوانیەکـــەی): (أَلْيـــان) (ج) أَلايـــا وَأَلْيات): دووگ.

٢-(أَلإِلْـــي والإِلَـــى والأَلَـــى (ج) آلاء): نـــازو خۆشگوزەرانیی.

٣-(أَلألاء والأَلَى) (ن): ژاڵــە. درەختێکــە هەمیشە سەوزەو تاڵەبەرە.

(أَلألاءَة): درەختێکی ژاڵە.

٤-(أَلألاي (ج) أَلايـــات (تركيه)= الفرقة مِنَ العَسكر) فیرقەیەکی سەرباز.

إلى: ١-(إلى: ١ـبۆ ٢ـتا کۆتایی کات و شوێن.

(دَرَسَ إلى المَســاءِ): تـــا ئێـــوارێ کۆششـــی خوێندنیکرد.

(ســـار إلى البَيـــتِ): تا ماڵەوە ڕۆیشـــت ٣ـهاو واتای (عِنْدَ) یە. (لەلا).

(كلامُهُ أَشــهى إلَيَّ مِن الرحيقِ): قســەکانی لەلای من لە بۆنی خۆش خۆشترە. ٤ـهاو واتای (ل) یە (هی).

(الأَمْـــرُ إلَيـــكَ): کارەکە هی تۆیـــەو خاوەنی فەرمانیت .٥: هاو واتای (مع) یە لەگەڵ.

(ضَـــمْ هذا إلى ذلـــك): ئەمە لەگـــەڵ ئەوەدا دابنێ/ لەپاڵ ئەوەدا دابنێ.

(إلَيْكَ): ١ـلاچۆ/ دوورکەوەرەوە ٢ـبگرە:

«إلَيكَ عَنی»: لێم دوورەوەکەوە.

(إلَيْـــكَ الكِتـــابَ): پەرتووکەکـــە بگـــرە/ ها کتێبەکە.

٢-(أُلى) (لەبری (أُولى) یە کە کۆی (الذی) یە و لەوتەی خۆی نییـــە): نَحنُ الأُلى: أَی (نَحْنُ الذين): ئێمە ئەوانەین.

(أَلعَرَب الأُلى): عەرەبە پێشینەکان.

(أُولى): ناوی ئاماژەی نزیکە بۆ کۆی نێرو مێ.

ام: (أَمْ): ١ـپیتـــی پەیوەندییە بۆ هەڵبژاردن پاش (هەمزەی پرسیار).

(أَقَريبٌ أَم بعيد): نزیك یان/ یا/ یاخود دوور ٢ـبەواتای (بَل): یاخود دێت.

(هَل يَستوي الأَعمى والبَصير أَم هَل تَستوى الظُلُماتُ والنُور): ئایا کوێرو چاو ســـاغ وەك

یەكن یاخود تاریكیی و رووناكی وەك یەكن؟
أَمَّ: ١-(أَمَّ وَأَمَّــمَ وَتَأَمَّــمَ وائْتَــمَّ-هُ. أَمَّــاً): روویتێكرد/ نیازی ئەوی هەبوو.
(أَممْــتُ- الرَجُلَ إمامَةً): پیاوەكەم (خســتە بەردەمی خۆم/ پێش خۆم خست)
(ألأمام): بەردەم/ پێش/ بەر.
(أمامَــكَ): ئاگــات لەبەردەمــی خۆتبێــت/ لەپێشی خۆتبێت (بۆ ئاگاداركردنەوەیە)
٢-(أَمَّ-هُ): كێشــای بــە تەوقــی ســەریدا و شكاندی/ قرنجاندی.
(أُمُّ الرَأْسِ) (ع ا): پێســتی ســەر كە كاسەی سەر دادەپۆشێت و كاسەكە مێشكی تێدایە
(ألأَميم والمأْمُوم): كەسێكە كە بە تەوقیسەریدا كێشرابێت.
٣-(أَمَّ- القَــومَ وَبِالْقَوم إمامَــةً وَأَمَّاً وإماماً): بوو بە پێشــەوای خوێشگەل/ بوو بە رابەری، بوو بە پێشنوێژو نوێژی پێكردن.
(إئْتَمَّ-بِهِ): وەك ئەویكرد و شوێن پێی ئەوی هەڵگرت/ شوێن ئەو كەوت.
(إسْتَأْمَهُ: كردی بە ئیمامی خۆی/ بە پێشەوای خۆی، بە پێشنوێژی خۆی.
(ألإمام): (بۆ نێرو مێ)یە
(ج) (أَيِمَّة وَأَئِمَّة): ١-ئیمام/ پێشنوێژ ٢-رابەر/ پێشەوا ٣-كەســێك كە نموونەییبێت و چاوی لێبكەن و دوای بكەون ٤-رێی راست و رەوان و روون ٥-تەنافی (خانەسازیی/ بەنایی).

(ألإمامَة): ١-سەرۆكایەتی گشتیی ئاینیی بێت یان شارستانیی ٢-پێشەوایی ٣-پێشنوێژیی.
(ألأُمَّة (ج) أُمَم): را/ رێگە.
٤-(أَمَتْ- أُمُومَةً): بوو بە دایك
(تأَمَم واسْــتَأمَ- المَــرأةَ): ژنەكەی كــرد بە دایكی خۆی.
(ألأم (ج) أُمَّات وَأُمَّهات): دایك (بۆ مرۆڤ).
(أُمَّات): دایك (بۆ ئاژەڵ و گیانەوەرانیتر).
(لا أُمَّ لَكَ): هەی بێدایك (بۆتە شــەر لێدانەو شكاندنە. لەوانەیشە بۆ پێدا هەڵدان و باشیی بوترێت: الأم بنەرەت/ ریشــە/ ســەرچاوەی ئەوشتە.
(أُمُّ القُرى): شاری مەككە.
(أُمُّ الطَريق): بەشی هەرە زۆری رێگەكە.
(أُمُّ النُجــوم): رێــی كاكێشــان لەئاســماندا (كۆمەڵــە ئەســتێرەیەكن بەچــاو نابینرێن تەنهــا رووناكییەكیــان بلاودەبێتەوە و دیارە وادەزانرێت كە پەڵەیەكی سپییە).
(أُمُّ آلدماغ وأُمُّ الرأْس): پێستی دەوری مێشكی سەر.
(أُمُّ مَثْواك): ژنە خانە خوێكەت.
(أُمُّ عِرْيَط): دووپشك
(أُمُّ القِرى): ئاگر.
(أُمُّ أَربَع وأربَعِين): هەزارپێ.
(ألأُمِّيَة وَالأُمُومَة): دایكێتی.
٥-(ألأُمِّــيّ): نەخوێنــدەوار/ ئــەو كەســەی

کــه نەدەزانێــت بخوێنێتەوە و نــە دەزانێت بنووسێت.

(ألأَمِيَّة): نەخوێندەواریی.

(مكافَحَة الأُمِّيَّة): نەهێشتنی نەخوێندەواریی.

٦-(أَمَّمَ): خۆماڵییکرد کردی بە ماڵی میللەت (موڵکە تایبەتیەکان و کۆمپانیەکان و هەموو هۆی بەرهەمهێنانێك کرا بە هی میللەت.

(ألأُمَّــة (ج) أُمَم): ١-گەل و نەتەوە ٢-کۆمەڵی خەڵك ٣-بەرەی خەڵك/ نەوە ٤-نیشتمان.

(هُوَ مِن بَني أُمَّتي): ئەو هاونیشتمانمە.

(جَمعِيَّــةُ الأُمَم) و (الأُمَمُ المُتَّحِدَة): کۆمەڵی نەتەوەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان.

(ألتَّأميــم): کردنی موڵکــە تایبەتییەکان و کۆمپانیــەکان و هۆی بەرهەمهێنان بە موڵکی میللەت/ خۆماڵیکردن.

٧-(ألأَمَّة (ج) أُمَم): ١-دەم/ کات ٢-بەژن و بالا ٣-نەتەوە.

الملحق

ام: (ألإمامِيَّة): پێشەوایی/ ڕیبەرێتیی.

(ألإمامِيَّــة): دەســتە شــیعەیەکن دەڵێــن: ڕابەریی یەکێکە لە بنچینەکانی و دەستووری ئایــن و دیاریکردنێکــی ڕوون و ئاشــکرایە لەلایــەن پێغەمبــەرەوە بــۆ جێنیشــینی و ڕابەرێتی حەزرەتی عەلی و پاش خۆیشــی بۆ وەچەکانی.

أَمــا:١ پیتی ئاگــادار کردنەوەیــە بە زۆریی سوێندی بەدوادا دێت: سا.

(أَمــا واللهِ): ســاوەڵلا ٢-پیتــی خواســتنە/ داواکردنە: ئەی/ ئەرێ.

(أَما تَنْزِلُ بِنــا): ئەرێ لانادەیتە لامان. واتا: لابدەرە لامان.

٢-(أَمّا): ١-بەلام (ئامرازی مەرج و جەختە): (أَمّــا الذَّينَ آمَنوا فَيَعْلَمون أَنَّهُ الحَقُّ): بەلام ئەوانــەی کــە بڕوایانهێنــاوە ســوور دەزانن کــە ئــەوە هەقــە ورێــی ڕاســتە ٢-ئامرازی جیاکردنەوەیە بەلام/ کەچی:

(أَما الزَيدفَرَبِحَ): کەچــی زەید قازانجیکرد (پێویســتە وەلامــی مەرجەکــە (ف)ی پێوە بێت).

٣-(إِمّا: أَداة تَفصيل):ئامرازی جیاکردنەوەیە: یا، یان

(إِنا هَديناهُ الســبيل إِمّا شــاكِراً وَإِمّاكَفوراً): ئێمە ڕێگەمان پیشــانداون یان سوپاســگوزارن یان ســپڵە دەبن و کفری نیعمەت دەکەن. واتای تــری (إِمّا): بۆ گومــان و نادیــارو ڕێدان و سەرپشککردنە: یان/ یاخود/ یا.

(جــاءَ إِمّا زَيدُ وَإِما عمــرو): یان زەید هات یان عەمر.

(تَعَلَّمْ إِمّا الفِقْهَ وَإِمّا اللُغَةَ): یان شــەرع یان زمان بخوێنە.

امــبر: ١-(أَلأَمبــير) (ف): ئەمپێــر. یەکەی تەوژمی تەزووی کارەبا

(ألأمبير الساعي): ئەمپێری هاتوو. ئەو بڕە کارەبایەیە کە بەگەیەنەرێکدا لەماوەی کاتژمێرێکدا دەڕوات و بە تەوژمی یەك ئەمپێر کە یەکسانە بە (٣٦٠٠) کۆڵۆمب.

٢-(ألإمبريولوجيا) (طب) (يونانية) (علم الأجِنَّة): زانستیی کۆرپەلە/ کۆرپەلە زانیی.

امت: (أَمَتَ وَأَمَّتَ-ەُ أَمَتاً): هەڵیسەنگاندو خەملاندی(-ەُ): نیازی ئەومیبو، ڕوویتێکرد

(ألأَمت (ج) إمات وأُمُوت): ١-بێتوانایی/ بێهێزیی ٢-گومان ٣-بۆشایی ٤-بەرزایی و شوێنی بەرز.

امج: (أَمِجَ. أَمَجاً): زۆرگەرماو تینوییبوو.

(صَيفٌ أَمَّجٌ): هاوینێکی زۆر گەرم.

امد: ١-(أَمَّدَ): ئەوپەڕی شتەکەی دەرخست/ دیارییکرد.

(ألأُمَد (ج) آماد): ١-ئامانج و کۆتایی شت/ ئەوسەری شت ٢-کات و ماوە

(طالَ عَلَيهِمُ الأَمَدُ): دەمێکی زۆریان پێچوو.

(مُنذُ أَمَدٍ غيرَ بعيد): (ماوەیەکی/ دەمێکی) زۆر نییە.

٢-(أَمِدَ-عَلَيهِ أَمَداً): لێیتووڕەبو.

(ألأَمَد (ج) آماد): تووڕەبوون/ تووڕەیی.

٣-(أَمَدَ-السقاءَ): کوندەکەی چوڕ بڕکرد و هیچی تێدا نەهێشت.

(ألآمِد والآمِدَة): پاپۆڕی بارکراو.

امر: (أَمَرَ-ەُ. أَمْراً وَآمِرَةً وإمارَةً): فەرمانیدایە کە کارێك ئەنجام بدات یان شتێك دامەزرێنێت.

(آمِر): فەرماندەر.

(مَأْمُور): فەرمانپێدراو/ فەرمانبەر.

(أَمَرَهُ الشيءَ وبِالشيءِ): فەرمانی شتێکی پێدا. داوای ئەنجامدانی کارێکی لێکرد.

(أَمَرهُ أن يفعَلَ وبأن يفعل): فەرمانیدایە کە کارەکە بکات، فەرمانی ئەنجامدانی کارەکەی دایە.

(آمَرَ-ەُ إيماراً): فەرمانیدایە شتێك دروستبکات و دایمەزرێنێت یان کارێك ئەنجام بدات.

(ألأَمْر (ج) أوامِر): فەرمان/ دەستووردان. داوای کردنی کارێك.

(فِعلُ الأَمْر): کرداری داخوازیی.

(ألأَمَّار. (م) أَمَّارَة): ١: فرە فەرمان/ کەسێکە فەرمان (زۆربدات/ زۆر دەربکات)/ فرە داخوازیی :٢: هاندەری خراپەکردن/ لاسەری خراپەکاریی.

٢-(آمَرَ-ەُ في أمرٍ مُؤامَرةً): بۆ کارێك و لە کارێکدا ڕاوێژی پێکرد

(تَأَمَّرَ وائْتَمَرَ وَاسْتَأْمَرَ-ەُ): ڕاوێژی پێکرد.

إئْتَمَروا-بِفُلانٍ): پیلانیان لە فیسار گێڕا بیکوژن و یەك بەیەکیانگوت کە بیکوژن.

(إئْتَمَروا وتَآمَروا): تەگبیریانکردو ڕاوێژیانکرد/ پیلانیانگێڕا.

(ألإمَــر والإمَــرَة): كەســێكی راچــرووك و بوودەڵەو بێتەگبیر/ بیروخواست بودەڵە.

(مالَهُ إمَرٌ ولا إمَرَة): نەرای هەیەو نەبەكەڵكی راوێژپێكردن دێت.

(ألأمير (ج) أُمَراء): راوێژ پێكراو

(ألمُؤتَمَــر (ج) مُؤتَمَــرات): كۆنگــرە/ كۆڕ (ئەنجومەنێكــە بــۆ راوێــژ و تەگبــیر و را دەربڕین دەربارەی كارێك كە لایان گرنگبێت كۆدەبنەوە.)

(مُؤْتَمرٌ دَولي): كۆنگرەیەكی دەوڵەتی.

(مُؤْتَمرٌ ثَقافِيّ): كۆنگرەیەكی رۆشنبیریی.

(مُؤْتَمرٌ علمي): كۆنگرەیەكی زانستی.

(مُؤْتَمرٌ سياسي): كۆنگرەیەكی رامیاریی.

٣-(أمِــرَ وأمُرَ. أمْراً وإمْــرَةً وإمارَةً): بوو بە میر. میرێتیكرد.

(-عَلَيــهِ): بــوو بــە میریــی/ میرێتــی بە سەرەوەكرد/ بوو بە سەرپەرشتیارو گەورەی.

(أمَّــرَ-هُ): كــردی بــە میری میرنشــینەكەو بەرێوەبردنی پێسپارد.

(تَأمَّرَ-عَلَيــهِ): خــۆی بەســەردا ســەپاندو خستیە ژێر ركێفی خۆیەوە.

(إئتَمَــرَ- الأمْــرَ وبهِ): ملی بــۆ فەرمانەكە شــۆڕكرد/ پەیرەویــی فەرمانەكەیكــرد و جێبەجێیكرد.

(ألأمِــير (ج) أُمَــراء): ١-مــیر. ســەرداری نەتەوەیــەك/ میللەتێك گەرچی خانەدانیش نەبێــت ٢-بەخانەدانێــك دەڵێــن گەرچــی فەرمانداریش نەبێت.

(ألمــير= میر (عامیــە) أمــير المؤمِنين): بە خەلیفــە عومــەری كــوڕی خەتــاب و ئــەو خەلیفانە دەڵێن كە دوای ئەو هاتوون.

(أمير البَحر وأمِيرَ ألای): سالاری كەشتیگەل. یاسوپا سالاری گشتی

(ألأميرال): سالاری كەشتیگەلی جەنگ.

(ألأمــيرِيّ): مــیری. (المالُ الأمِــيرِيّ): باج و خەراج كە لە زەویوزار بۆ میریی دەسێنرێت/ دارای میریی

(ألطابع الأميرِيّ): پوولی میریی كە بە هەموو جــۆرە مامەڵەیــەك و پەیمــان و پســووڵەو شــتیترەوە دەلكێنرێــت كــە ئەویــش جۆرە باجێكە.

(ألإمــارَة): ١-پایەی ئەمیریی ٢-میرنشــینیی كە دەوڵەتێكی بچووكی ســەربەخۆیە میرێك بەرێوەیدەبات.

(المؤتَمِر): دیكتاتۆر. كەســێكە كە قســە هەر قسەی خۆیەتیو رادەبێ هەررای خۆیبێت.

٤-(أمِرَ-الشيءُ. أمَراً وأمَرَةً): شتەكە مشەبوو/ زۆربوو/ بەلێشاوبوو.

(-الرَجُلُ): ناژاڵی زۆر بوو.

(رجلٌ أمِرٌ): پیاوێكی خاوەن ناژاڵێكی زۆر.

(آمَرَ-هُ الله. إيماراً): خودا ســامان و ماڵیاتی زۆری دایــەو وەچەی زۆریشــی دایــە/ خودا

نگینییدایە.

٥-(ألإمْر): ١-شتی سەیرو سەرسورهێن ٢-شتی ناچیزەو نەشیاو.

(لَقَـد جئتَ شَـيئاً إمْراً): کارێکی زشـت و نادروست و نەشیاوتکرد.

(ألأمْر (ج) أمُور): کاروبار.

(ما أمْـرُ فُلان): فیسـار کاروبـاری چییە/ چییەتی.

الأمرُ: شت.

(لأمرٍ مـا کان کذا): لەبەر شـتێك، هۆیەك ئەوەبوو. ئەوە وابوو.

(أولُو الأمرِ): خاوەن دەسـەلاتان/ سەرۆکان و زانایان و کاربەدەستان.

(ألأمَـرَةُ (ج) أمَر): ١-بەیداخـی بچووك بۆ نیشـانەو بەردی نیشـانەی بیابان بۆ رانوماو رزگارکردنی رێبواران. ٢-گرد.

(ألأمارَة (ج) أمارات): نیشانە.

(ألأمِـير (ج) أمَـراء): هاوسـێ/ دراوسـێ/ هاوسایە.

(ألتأمُريّ وَالتأموريّ والتُومُريّ): مرۆڤ.

(ألتامُور): ١-قاپ/ دەفر ٢-دڵ ٣-وەزیری شا.

(التأمُـورَة): ١-خەڵوەتخانەی پارسـا ٢-لانەی شێر.

٦-(تَأمْـرَكَ- الرَجُلُ): بوو بـە ئەمەریکایی واتا وەك ئەمەریکاییەك رەفتاریکرد/ خوو و رەوشتی ئەوانی وەرگرت.

(مُتَأمْرِك): بە ئەمەریکاییبوو.

الملحق

أمر. (ألإسْـتِئمارَة أو الإسْتِمارَة- في الإدارة): لیسـتە نموونەییەکی چاپکـراو کە هەندێك زانیاریی پێویست و تایبەتی تێدایە.

(مَلأَ إسْتِمارَة): پرکردنەوەی لیستەیەك.

(ألمُؤامَرَة): پیلانگێـران/ پیلانێکی نهێنییە کـە دووکـەس یـا زیاتـر دژی یەکێـك یان دامەزراوێك، دەزگایەك دەیگێرن.

(کانَ لَـه ضِلْعٌ في المُؤامَـرَاةِ): لە پیلانەکەدا دەسـتی ئەویشـی یـان ئـەوی تێدابـوو، بەشداربوو.

(ألمُؤامَرَة- في القانون) پیلانگێران لە یاسادا. تاوانێکی رامیارییە کە دوویان چەند کەسێك دژی ئاسایشی دەوڵەت دەیکەن بۆ تێکدانی یان لایەنێك دەیکات بۆ هەڵگێرانەوەی رژێمەکە.

---

أمس: (أمْس): دوێنێ.

(ألأمْسُ (ج) آمُس و أمُوس وَآماس): رۆژێك لە رۆژانی پێشـوو. پێرێ بەسـرپێرێ. بەسر بەسرپێرێ... هتد.

(إمسِـيّ): دوێنێیی وپێرێیی (بە بێ پێوەرو دەستووره).

امع: (تَأمَعَ وآسْتَأمَعَ): کوێرانە شوێنکەوت.

(ألإمَّـع والإمَّعَـة): کوێرانە شـوێنکەوتووی هەموو رایەك.

(رَجُـلٌ إمَّـعٌ وإمَّعَةٌ (ج) إمَّعُـون): پیاوێکی

کوێرانــە شــوێنکەوتووی هەمــوو رایەکــە/ کەسێکە/ کوێرانە لەگەڵ هەموو رایەکە.
(وقيــلَ أَصلُهُ إنّي مَعَك): واتــا لە بنچینەدا دەڵێت من لەگەڵتدام.
امل:١-(أَمَــلَ-ه وأَمَّــلَ-ه. أَمَــلاً وَتَأْمِيلاً): بەهیوایکرد/ بەتەمایکرد/ ئومێدەواریکرد.
(أَلأَمَل وأَلأَمْل (ج) آمال): هیوا/ ئومێد.
(الإمْلَة): هیوا/ ئومێد.
(أَلأَمَلَة): پشــتگیران و وئەوانەی سەربەون و (هێوای/ ئومێدی) پێیانە.
(آمِــل): پیاوێــك كــە پشــتیوان و هیــوای یەکێکبێت.
(المأمَــل): هیوا/ ئومێد/ ئــەوەی کە پیاو بە تەمایەتی/ ئومێدەواریەتی.
٢-(تَأَمَّلَ- الأَمرَ وَفيه): ورد لە کارەکە راماو سەرنجیدایە.
(تَأَمَّلَ جَمالَ الطَّبيعَةِ): سەرنجی لە جوانیی سروشتدا و بیری لێکردنەوە.
(تَأَمَّل فِي حَقيقَةٍ أَومَسْأَلَةٍ): لە راستییەك یان کارێك و پرسە بابەتێك ورد بووەوەو تێیراماو بیری لێکردەوە.
(أَلتَّأَمُّــل آلباطِني): لەناخــی دەروون رامان، ورد بــیر لــە هەســت و هێنــان و بردنی ناو ناخ و دەروون کۆڵینەوەو راگرتنی نیشانەکانی بەســتنەوەیان و لەیــەك نزیککردنەوەیان بۆ زانینی یاســاو دەستووری ئەو هەست و هاتوو بردەیان.
٣-(الأَرميل): (ك) رەگەکەی ($C_5H_{11}$).
من: ١-(أَمِــنَ. أَمْنــاً وَأَمَناً وَأَمانــاً وَأَمَنَةً): دڵنیابوو/ دڵئاسوودەبوو.
(أَمِــنٌ وَأَمِــينٌ وَآمِــنٌ): دڵنیا/ دڵئاســوودە/ دڵئارام.
(أَمِــنَ الأَسَــدَ وَمِنهُ): لــە شــێرەکە دڵنیاو بێوەیبوو و بێترسبوو/ لە ئاسایشدا بوو.
(إسْــتَأْمَنَ-ه): داوای دڵنیایــی لێکرد/ داوای لێکرد بێوەییبکات.
(أَلأَمــان): ١-دڵنیایی/ دڵئارامیــی ٢-پەیمان/ بەڵێن و پاراستن و پەنادان و دەستەبەربوون.
(أَلأَمَنَة): دڵنیایی و ئاسوودەیی/ دڵسرەوتیی.
(أَلأَمون): وڵاخی هێمن و لەسەرخۆ.
(أَلمَأمَن): پەناگا/ ستارگە/ دڵئارامگە.
٢-(أَمَنَ-ه أَمْناً): لێیدڵنیابوو و بڕوای پێکرد خۆی پەنادایە/ پشتی پێبەست.
(آمِن): دڵنیا/ ئاسایشدار/ ئاسوودە.
(آمَنَ-بــه إيماناً): بڕوای (پێکــرد/ پێهێناو پشتی پێبەست).
(-لَهُ): ملکەچیبوو و خۆی دایە دەستی.
(أَلأَمانَة (ج) أَمانات): ئەو ئەرکانەی کە خودا بەسەربەندەکانیدا داوەو پێی سپاردوون.
(أَلأَمَنَة): خۆشبڕوا/ ساویلکە/ کەسێکە پشت بە هەموو کەسێك ببەستێت.
(أَلأُمَنَة): کەسێکە جێی بڕواو متمانە بێت.

(اَلأَمين (ج) أُمناء):١-سەر ڕاست ٢-دەستپاك و دڵپاك ٣-جێبڕوا/ پشتپێبەستراو ٤-دڵنیاو ئاسوودە.

(اَلمَأْمُون): جێبڕوا/ بڕواپێکراو/ پشتپێبەستراو.

(اَلمُؤْمِن): بڕوادار/ خاوەنبڕوا/ بڕواهێنەر بە نامەی خودا پێچەوانەکەی بێبڕوا/ کافر.

(اَلإيمان): بڕوای تەواو بە هەموو ئەوەی خودا بە پێغەمبەرانی فەرمووەو وەحی بۆ کردوون پێچەوانەی بڕوانەهێنان.

٢-(أَمُنَ- أَمانَةً):١-دەست و دڵ پاکبوو ٢-ڕازگربوو/ پەیمانپەروەربوو پێچەوانەی ناپاکبوو.

(أَمين): پاك و ڕازگر/ پەیمانپەروەر (ج) (أُمَناء)

(اِئتَمَنَ-هُ واسْتَأمَنَ-هُ): متمانەی پێکرد/ جێی بڕوابوو/ بەدەستپاك و دڵپاکی دانا.

(اَلأَمانَة (ج) أَمانات وأَمَنَة):١-سەرڕاستیی و دڵڕاستی/ پاکبوون ٢-سپاردە.

٤-(أَمَنَ-هُ. أَمْناً): متمانەی پێکرد/ پشتی پێبەست/ لێیدڵنیابوو.

(أَمَّنَ-هُ): خستیە ئاسایش و دڵنیاییەوە.

(أَمَّنَ على مالِهِ عند فُلان تَأْميناً): ماڵەکەی بە دەستەبەریی/ بە بیمە بەو سپارد.

(أَمَّنَ وائتَمَنَ. فُلاناً على كذا): شتەکەی خستە ملی ئەوەوەو ئەویکرد بە متمانەدار/ بە بیمە ڕاگری شتەکەی.

(إسْتَأْمَنَ-هُ على كذا): کردی بە دەستەبەری ئەو شتە/ کردیە بیمەی ئەوشتە.

(اَلأَمانَة) (ج) أَمانات: سپاردە.

٥-(أَمَّنَ: وتی: ئامین.

(آمين وأَمين): بەدەنگمەوە (وەرە/ بێ) یان با وابێت کە من دەمخوازم و نزاکەم وەربگرە.

٦-(أَمانيت) (ن): قارچکەمارانە کە جۆری هەیە زۆر ژەهرداره.

٧-(اَلأُمنِيَّة): ئاوات.

٨-(اَلأَمُونيا): نەوشادر.

٩-(اَلأَمُونيوم) (ك): ئامۆنیۆم. ڕەگێکی موجەبە یەکە هاوهێزییە لە سروشتدا بە تاکی نییە دەچێتە پێکهاتنی خوێکانی ئامۆنیۆمەوە وەکو سلفاتی ئامۆنیۆم. لە کشتیاریدا وەك پەین بەکاردێت.

أَلمُلحَق

امن: (الأَمن (مص) (أَمْن): ئاسایشبوون/ دڵنیابوون و دڵسرەوتن پاش ترس.

(نامَ في أَمْنٍ): بە دڵنارامی و دڵنیاییەوە نوست.

(اَلأَمْن): ئاسایش باری وڵات لەڕووی پاراستنی شیرازەو یاساو ڕاگرتنیانەوە.

(إخلالٌ بالأَمن): ئاسایش تێکدان و یاسا شکاندن.

(قوى الأَمن): هێزی پاراستنی ئاسایش.

(اَلإئتِمان): سپاردەکاریی و دەستەبەرکردنی

کەسێك لەشتێكدا. متمانە پێكردنی.
(إئتِمــان شـخص علــى بضاعَــه): متمانە پێكردنی كەسێك لە شتێكدا و بۆ شتێك.
(ألإئتِمــان): ئەومیە كە متمانە بە كەســێك بكرێت.
(ألإئتمــان- في القانون): متمانە لە یاســادا: ســپاردنی ماڵی گوێزراوە یان نەگوێزراوە بە كەســێك و لایــەك وامبێت یان ســپاردە یان بریكارییەك یان مۆڵەتدان/ رێدان یان بارمتە یان بۆ كردنی كارێك بە كرێ یان بێكرێ.
(ســوء الإئتِمان): بە ئــارمزوو ناپاكیكردن و دەستپیسیی لەسپاردەیەكدا لەو بڕواپێكردنەدا كە هۆی ئەو پێسپاردنە بووە.
(ألإئتِمان في الإقتصــاد. ألإئتِمان التجاری): بڕوا و وسپاردە (لە ئابووریدا/ لە بازرگانیدا): پێشینە پێدانی پارە بۆ هەڵسووڕاندنی و كەڵك لێومرگرتنی لەبەرهەمهێنان و وبەكاربردندا. ئەویــش لەســەر دوو مــەرج پێكدێت یەكەم بڕوا پێكردن و دووەم ماوەی دیاریكراوی ئەو بەكارهێنانە.
(ألتَأْمــین): دڵنیاكردن/ باری ئاســوودەیی و بڕواپێدان.
(تَأمین الخائِف): دڵنیاكردنی ترساو.
(ألتَّامین): بڕواكردن بە كەسێك و كردنی بە بیمە/ بەمتمانە كار بۆ سامان و ماڵی خۆ.
(تَأمین اُلقوت): بژێویی و پێبژی پەیداكردن و مسۆگەركردن.
(ألتّامین): وتنی ئامین.
(ألتّامین): متمانــە/ رێكەوتننامەی دڵنیایی و پاراســتن و قەرەبــووی هــەر زیانێكــە لەوكەســە یان لە ماڵەكەی بكەوێت بەرامبەر پارەیەك كە ناوەناوەو لەكاتی دیاریكراوا بەو كۆمپانیایە دەدرێت یان بەوكەسە دەدرێت كە دەستەبەری پاراستنەكە دەبێت.
(عَقدُ تَأْمین): گرێبەستی متمانە.
قسط التَأمین): ناوە پارەی متمانەكە.
(ألتَّامــین في الإدارَة): بــڕە پارەیەكــە كــە دەدرێت بۆ دەستەبەركردنی جێبەجێكردنی كارێــك یــان قەرەبووكردنی ئەو شــتەی كە دەستپێردرێت ئەگەر فەوتاو لەبرەچوو.
(تَأمــین العَــدّاد الكَهرُبائــي): دابینكردنی كارەبا پێو.
(تَأمین جهاز الهاتِــف): دابینكردنی ئامێری تەلەفۆن.

---

امه: ١-(أمِهَ-الشــيءَ أمْهاً وَأمَهاً): شــتەكەی (لەبیرچووەوە/ فەرامۆشكرد).
٢-(أمَهَ- إلَيهِ في أمرٍ أمْهاً): كارێكی پێسپارد.
٣-(تَأمَّــهَ- المَــرأةَ): ژنەكەیكــرد بــە دایكی خۆی.
(ألأُمْهَةُ= الأُمّ): دایك.
أما: ١-(أمــا وَأمَيَ وَأمــي-تِ الجاريَةُ أُمُوَّةً): كەنیزەكەكە/ كچەكە بوو بە كۆیلە.

(أَمّى-الجاريَـــةَ): كەنیزەکەکـەی کـرد بـە کۆیلە.

(تَأمى واستَأمى- الجاريَةَ): کەنیزەکەکەی بە کۆیلەیی ڕاگرت.

(ألأَمَــة (ج) إمـاء وأَمَـوات وآمْ): کارەکەری کۆیلە.

(أَمَــويّ): کۆیلــە زادە وەچــەی کارەکــەری کۆیلە.

(أُمِيَّة): کارەکەرە کۆیلەکە.

٢-(أَمـا. يَأْمُـو- السِـنَّوْرُ إماءً): پشـیلەکە میاواندی.

٣-(أُمَيَّة): هۆزێکی قورەیشە.

(أُمَـويّ وَأَمَـويّ): یەکێك لە هـۆزی بەرەی ئومەییە.

ان: (أَنْ): ئەگـەر ١-پیتێکە دەکەوێتە پێشـی ڕستەوە.

(أَن تَصُومُـوا خَيرٌ لَكُم): کە ڕۆژوو بگرن بۆ خۆتان باشە.

ب: (أَنْ): سـووککراوەی (أَنَّ): یەکـە بـۆ ساغبوونەوەو لێعایەنبوونە.

(أَعْلَـمُ أَنْ سـتَقَعُ الحَـربُ): لێـم عایەنە/ سـوور دەزانـم) کە جەنـگ بەرپـا دەبێت.

جــ: ڕوونکردنەوەیـەو لێکدەرەوەیە بەواتا (کە) دێت.

(فَأَوحَينا إليهِ أَن اصنَعِ الفُلكَ): خسـتمانە دڵییەوە کە کەشتیەك دروست بکە.

:هـ: بۆ جەختکردنە لە کارێکدا.

(لێرەدا(أَنْ) زیاد دەبێت.

(وَلَمَّا أَنْ جاءَ): کاتێك کە هات.

٢-(إن): حرف شرط يجزم مَفعولَين.

(إنْ تَضْرِب تُضْـرَب): پیتی مەرجە: ئەگەر دەست بوەشێنێت و لێبدەیت لێدە درێیت.

(إنْ: حَرف نَفي وَتدخل على الجمل الإسْميَّة وتَعمَــل عَمَلَ لَيــسَ عند بَعضِهــم): پیتی نەبوونە (نییە).

دەچێتە سـەر ڕسـتەی ناویی و کاری(لَيسَ) دەکات لە هەندێك ڕستەدا.

(إن أَحَدٌ خَيراً مِن أَحَدٍ إلا بالعافِيَة): کەس لە کەسیتر باشتر نییە لە تەندروستیدا نەبێت.

دەچێتە سەر ڕستەی کرداریی(إنْ أَدْري أَقَريبٌ أَمْ بَعيدٌ): نازانم ئایا دوورە یان نزیك.

(إن مُخفَفَــة مِــن (إنَّ) وتكـون زائِــدَة): سووککراوەی(إنَّ) یەو زیادیشە.

(ما إنْ زَيدٌ قائِمٌ): زەید بە پێوە نییە.

٣-(إنَّ حرف توكيد): پیتی جەختکردنە.

(إنَّ زَيداً قائِمٌ): بەڕاسـتی/ ڕاسـتە زەید بە پێوەیە/ وەستاوە.

(ب) (حــرف جـواب. كقولـه: «لَعَـنَ اللهُ ناقَةً حَمَلَتني إليـكَ فَأُجيبَ: إنَّ وَرآلبَها»): پیتـی وەڵامە بەواتـای: هەروەهـا. نەفرەت لــەو حوشــترەی کــە منی بـۆلای تـۆ هێنا. وەڵامیدرایەوە: هەروەها سوارەکەیشی.

٤-(أَنَّ: حرف توكيد ومصدر): پیتی جەخەو چاوگیشە.
(بَلَغَني أَنَّ زَيداً قامَ): پێیراگەیاندم کەزەید بە پێومیە، هەستاوە واتا وەستانی ئەوی پێراگەیاندم.
أَنَّ:١-(أَنَّ. أَنیناً وَأَنّاً وَأَنَاناً وَتَأْنَاناً): نرکاندی/ نکاندی/ ناڵاندی/ ئای و ئۆییکرد.
(الأَنِين): (ناڵین/ نکاندن/ نرکاندن)ی ئازار یان نەخۆشی.
(أَنِين الأَطفال): کوڕووزانەوەو نکەی منداڵ.
(أَنين الجِياع): ناڵاندنی برسی.
(الأَنَّان والأُنان والأُنَنَة): کەسێکە زۆر بەنرکەو ناڵەیە/ هەمیشە دەنکێنێت.
(الأَنَّة والأَنانَة): نرکەو ناڵە/ ئای و ئۆیکردن.
٢-(أَنَّ وتَأَنَّن-ه): ١-هەوڵی دڵراکێشان‌و قایلبوونیدا ٢-دڵی هێنایەوە جێ.
انا: (أَنا): من/ ئەمز.
(الأَنانة): من من کردن.
(الأَنانيّ): زۆر خۆپەرست.
(ليسَ لِلأَنانيِّ صاحِبٌ): خۆپەرست دۆستی نییە.
(الأَنانِيَّة): ١-خۆپەرستیی‌و خۆبەزلزانین‌و زۆر بە خۆنازین ٢-خۆ پەرستییەکی زۆرو بەتەنگ کەسەوە نەهاتن ٣-چەرداوە روویی و بێحەیایی.

٢-(أَناناس) (ن) (إسبانية): ئەنەناس. ڕووەکێکی گیاییە بەرێکی وەك سێو و بەری سنەوبەری هەیە تامخۆشە و بۆنخۆشە لە ئەمەرکاوە بڵاوبۆتەوە لە هەموو وڵاتە هێلکەمەرییەکاندا دەروێنرێ بەتایبەتی لە دورگەکانی هاوایدا.
انب: (أَنَّبَ-ه): سەرزەنشت و تەرزە شکێنیبکرد.
٢-(الأَنْبَج): (ن) درەختێکە لە کۆمەڵەی قەزوانە لە بنچینەدا لە هندستانبووە گەڵا گەورەو گوڵ سپییە بەرەکەی کە ئەنبەجەی پێدەڵێن یان مانجا. شێوەیەکی هێلکەیی هەیە ناوکێکی سەختی هەیەو دەورەکەی گۆشتینەو خۆشە.
٢-(الإنبيق (ج) أَنابيق) (ك) (فارسية): ئامێری دڵۆپاندن.
انت: ١-(أَنتَ): تۆ (بۆ نێری) گوێگر/ راناوە.
(أَنتِ): تۆ (بۆ مێ)ی گوێگر.
(أَنتُما): ئێوە (بۆ دوانی نێرو مێ)ی گوێگر.
(أَنْتُم): ئێوە (بۆ کۆی گوێگری نێر).
(أَنْتُنَّ): ئێوە (بۆ کۆی گوێگری مێ).
٢-أَنتروبولوجيا: زانستیی سروشتی مرۆڤ و باری ژیان گوزەرانی و هونەرەکانی و ئەو ئامێرو کەرەسەیەی لە ژیاندا بەکاری دەهێنێت و چۆن هاتۆتە دەستی.
٢-(أَنتولوجيا) (يونانِيَّة): کۆمەڵە

هەڵبژاردەی (شـــیعرە/ هۆزانە) یان دارشتنە یان مۆسیقایە.
٤-(اَلاُنیتموان) (ك): تەنێکی سادەی سپی زیوینــە و بلوورییــە لــە دارشــتنی پیتــە چاپیەکاندا بەکاردێت هێماکەی (sb)یە.
انــث. (اَنُــثَ- الحَدیــدُ اَنَثــاً): ئاســنەکە نەرمبوو.
(حَدیدٌ اَنیث): ئاسنینەرم/ نەرمە ئاسن.
(اَنُثَ-لَـهُ): بــۆی شــل و نەرمبــوو و خۆی بەدەستەوەدا.
(اَنیث): نەرم. خاو.
(سَیفٌ اَنیث): شمشێرێکی (نەبڕ/ بێبڕشت).
(مَکانٌ اَنیث): گۆشتە زەوی/ نەرمە زەوی کە رووەکی تێدا باش دەڕوێت و زو دەڕوێت.
٢-(اَنَّثُ-هُ): ١-کردی بە مێینە ٢-بەمێیی دانا ٣-کردی بە نێرەمووك.
(آنَثَ-تِ المَــرْأةُ إیناثاً): ژنەکــە مێینەیەکی بوو/ کچێکی بوو.
(مُؤنِث): ئافرەتی مێینەبوو.
(تَأَنَّثَ): بوو بە مێ، شل و نەرمبوو.
(-الرَجُــلُ): پیاوەکە بوو بە ژنانی. لە دەنگ و نەرمیی و شــلیی و قســەو رەفتارو لەنجەو لاریدا لە ئافرەت چوو.
(اَلاُنْثــی (ج) إنــاث وَإناثی و(جــج) اُنُث): ئافرەت/ ژن.
(اَلمُؤَنَّث): پیاوێکی رەفتارو لەش ژنانی.
(اَلمُئْناث): ئەو ژنەی ئەو مێینەی کە هەر کچ یــان مێی ببێت. هەروەها پیاوێك کە ژنەکەی هەرمێی ببێت وای پێدەڵێن.
(اَلمذکار): بە پێچەوانەوە بەوە دەڵێن کە هەر کوڕ/ نێرینەی ببێت و زۆری بێت.
انج: ١-(اَلاَنْجَر) (فارسیە): لەنگەری پاپۆڕ.
٢-(الإنجیــل (ج) أناجیــل): ئینجیل کتێبی شــوێنکەوتووەکانی حەزرەتــی عیســایە کە پیرۆزەکانی (مەتــیو مەرقۆزو لۆقاو یوحەنا یە لەســەر ژیانی حەزرەتی عیســا وتوویانەو فەرموودەکانیشــی کە بە وەحی بۆی هاتووە نووسیویانە، وشەکەش واتای مژدەیە چونکە ئینجیل مژدەی ڕزگاربوونی تیایە. (یونانیە) اَلملحق
انز: (اَلاَنْزیــم) (ك): مادەیەکــی ئەندامییە توانای توانەوەی هەیــەو یارمەتی کارلێکەرە کیمیاییەکان دەدات.

---

انــس: ١-(أنِسَ وَاَنُسَ وأنَسَ. اَنَســاً وَاَنَســةً وأنْســاً): ١-ڕاهــات، هۆگربوو، پێیخۆشــبوو. ٢-ماڵیبوو ٣-هاودەمییکرد.
(اَنَّــسَ. یُؤَنِّــسُ وآنَــسَ یُؤنِسُ-هُ. تَأْنیســاً وإیناســاً): ١-هۆگریکرد و لاواندی، ئارامیکرد ٢-ڕامیکــردو لەگەڵیــدا میهرەبانبوو/ رووی خۆشیدایە.
(تَأَنَّسَ): ١-ڕامبوو، ماڵیبوو/ هۆگرو ئارامبوو/ سرکیی نەما.

(إِسْـتَأْنَسَ): سـركيى نەمـاو مالّيبـوو/ هۆگربوو.
(اَلأُنْس والأُنْسَة): هاودەميى، پێکەوە ڕاهاتن پێکەوە هۆگربوون.
(اَلمُؤْنِسات: چەك.
٢-(أَنِسَ وَأَنُسَ وأَنَسَ-بِهِ وإِلَيه): هۆگربوو/ لەگەڵيـدا ڕاهـات و دڵـى بەدڵيــەوە نا/ دڵى پێيكرايەوە.
(آنَـسَ-هُ يُؤانِـسُ. مُؤانَسَـةً): لاوانـدى و سۆزيدايە/ لەگەڵيدا ڕاهات و دڵيخۆشكرد.
(تَأَنَّسَ-بە): لەگەڵيدا دڵئارامبوو/ لەگەڵيدا ڕاهات.
(إِسْـتَأنَسَ-بِهِ وَإِلَيـهِ): هاودەميـى ئـەوى پێخۆشـبوو/ هۆگـرى ئەوبـوو/ لەگەڵيـدا ڕاهات.
(اَلأَنَـس (ج) آنـاس): هاودەم ئـەوەى دڵت پێيبكرێتەوەو لەگەڵيدا كات بەسـەربەريت.
٢-حەشاماتێكى زۆر.
(اَلآنِسَـة (ج) أوانِس): ١-(دادە/ خاتو/ خا)ى بەسـۆز ٢-(كـچ/ كەنيشـك/ كيـژ/ دۆت)ى شوونەكردوو.
(اَلأَنُوس): مەشـرەبخۆش/ ڕووخۆش و قسە خۆش/ هاودەمخۆش.
(اَلأَنِيـس= المُؤانِـس): ١-هـاوڕاز و هـاودەم ٢- المَأنوس-بِـهِ: لەگەڵدا ڕاهاتـوو/ ئولفەت پێوەگرتوو.

(ما بِالدار أَنيسٌ): لە خانووەكەدا هاودەمێك نييە/ كەسێكى تێدا نييە.
٣-(أَنَسَ- الشيءَ): شتەكەى بەرچاو كەوت و زانى چييە.
(آنَسَ-هُ يُؤنِس إيناساً): ١-دى/ بەرچاويكەوت و ناسى و ئارامو سۆزيدايە/ لاواندى.
(-الصَوتَ): دەنگەكەى بيست هەستى پێكردو لاى خۆشبوو.
(-الشيءَ): شتەكەى دى/ بەرچاويكەوت.
(آنَسَ مِن جانِـبِ الطُورِ ناراً): لاى تووڕەوە ئاگرێكى هاتە بەرچاو.
(تَأَنَّسَ- السَّبعُ): دڕندەكە لە دوورەوە هەستى بە نێچيرەكەى كردو چاويكرد.
(إِسْتَأنَسَ-لَهُ): گويى بۆ هەڵخست و چاوى بۆ گێڕا/ گويى بۆ شلكرد.
(إِنسانُ العَين): ڕەشـێنە يان ئەوەى لە جێى ڕەشێنەى چاوە.
٤-(تَأَنَّسَ): بوو بە مرۆڤ.
(اَلإِنْس): مرۆڤ.
(إِنْسِيّ وأَنْسِيّ (ج) أُناس وَأَناسِيّ): مرۆڤ.
(إِنْسُكَ وابنُ إِنْسِـكَ): هاودەم و هاوپەيمان و پشتيوانت.
(اَلإِنسـان (ج) أَناسِـي وَأَناسِـيَةُ وآنـاس): ئادەميى/ مـرۆڤ (بە هەموو ڕەگەزى مرۆڤ دەوترێت بەنێرو مێيەوە).
(اَلإِنسانِيَّة): مرۆڤايەتى بەزۆريى بەنيشانەى

باشــی مــرۆڤ دەوترێــت وەك پیاوەتیــی و مەردایەتی و ڕەوشت و ڕەفتاری جوامێرانە.

٥-(اَلإنســان (ج) أناسِي وَأَناسِــيَةٌ وآناس): زەویی بەیار کــە هەر نەکێڵرابێت و کشــتی تێدا نەکرابێت.

(اَلأنیس) (ح): شــینە شــاهۆ کە دەنگی وەك دەنگی گایە.

٦-(إنْســولین) (ك): ئەنســۆلین دەرمانــی نەخۆشیی شەکرەیە.

٧-(اَلأنیســون) (ن) (یونانیــة): ڕووەکێکە بۆنخــۆش دەنکی بەرەکەی بۆ دروســتکردنی شیرینی و شەربەت بەکاردێت. ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن (یانسون).

الملحق

أنس: (اَلإنسانِي): مرۆڤانە.

(طَبیعَةٌ إنسانِیَّة): سروشتێکی مرۆڤانە.

(عَلاقاتٌ إنسانِیَّة): پەیوەندییە مرۆڤانەکان.

(رَجُلٌ إنســانِيّ): پیاوێکی مرۆڤدۆســت کە حەز لە چاکەو خۆشیی مرۆڤدەکات و کۆشش بۆ ئەوە دەکات.

(عَمــلٌ إنســانِي): کارێکــی مرۆڤانــە وەك هەتیوخانە دروستکردن. خۆ بەستنەوەیەکی سەرومڕ بە کەڵك و قازانجی مرۆڤەوە.

(اَلحَسَد حقیقَةٌ إنسانِیَّة): ئیرەیی نیشانەیەکی ڕاستە کە مرۆڤ هەیەتی و پێوەی لکاوە.

(اَلإنْســانِیَّات): ١-مرۆڤناســی بەتوێژینەوەی وێــژە زۆر کۆنەکانــی لاتینیــی و یۆنانیــی دەوترێت بۆ جیاکردنەوەی خواناسی و لەسەر خوداوەندەکان باســکردن ٢-ناوێکی گشــتییە بۆ توێژینــەوەی وێژەو فەلســەفەو هونەرو ئاینەکان و مێژوو هیتریش بۆ جیاکردنەوەی لە زانستی جۆریتر.

(اَلتَّأْنیس): ١-ماڵیکردن ٢-رامکردن/ ڕاهێنان کەویکــردن/ هۆگریکــردن. ٣-نزیکیــی و چونیەتیی نیشانەی/ سیفەتی مرۆڤ و کردار و ڕەفتاری لەگەڵ و لەچاو بوونەوەریتردا.

(اَلتَّأْنِیس- فِي التَصَوُّف): جەزبەگرتنی سۆفی و لە سۆفێتیدا. کێشبوونی مرید/ سوفی بۆلای شێخەکەی.

(اَلمَأْنُوس): پێڕاهاتــوو/ پێڕامبوو ئەوەی دڵ پێیئارامبێت.

(مَکانٌ مَأنووس): شوێنێك دڵ پێیڕاهاتبێت/ پێیخۆشبێت/ دڵ پێی وتیایدا بکرێتەوە.

(اَامَأنوس): شتی باو/ کە لای مرۆڤ نەناسو نەدیدە نەبێت/ ناشنابێت.

(صَوتٌ مَأْنوس): دەنگێکی پێناشناو شوناس.

(حَرَکَةٌ مَأْنووسە): بزوتنەوەیەکی (ئاسایی/ باو) کە دڵ پێی ڕاهاتبێت و هەڵیبگرێت/ ناچیزە نەبێت.

(اَلمَأنوس- عنــد العامَّة): لای ڕەشە خەڵکەکە ئەوەیە باو بێت ناچیزە نەبێت.

(کَلامٌ غَــیرَ مَأْنُوس): ئاخاوتنێك کە بە گوێ خۆشنەبێت یان نەبیسترابێت/ باو نەبێت.

انض: (أَنَـضَ- اللَّحْـمُ أَنيضاً): گۆشـتەکە بۆگەنیکرد/ بۆگەنبوو.

(آنَضَ-اللَّحْمَ إيناضاً): گۆشـتەکەی (نیمچە برژاوکرد/ باش نەبرژاند).

انف:١-(أَنِفَ-البَعيرُ أَنَفاً): حوشترەکە (لووتی ژانیکرد/ لووتی ئازاری پەیداکرد).

(أَنِف): حوشتری لووتبەژان/ لووتیەشاو.

(أَنَفَ-هُ أَنْفاً): کێشای بە لووتیدا.

(ألأَنْف (ع ا) (ج) آناف وَأُنُوف وَ آنُف): لووت/ کەپوو/ دەماخ.

(ماتَ حَتفَ أَنْفِهِ): مردنێکی ئاسایی مرد.

(ماتَ رَغـمَ أَنفِهِ): مردنێکی سەرشـۆڕانەو زەبوونانە مرد.

(حَمِيَ أَنْفُهُ): سەر بەرزبوو.

(أَنْفُ الجَبَل): لووتی شاخ/ ئەوەی لە شاخەکە دەردەچێت.

(الأنـف (مـو): هُوَ في العـود قطعَة رقيقة مِنَ العاج أو السـن توضـع في نهاية الرقبة مـن جهة المـلاوي وفي الكِمنجه قضيب من الخشـب مُثَبَّت فوقَ خط إتِّصال الصندوق تثبت فيه الملاوي): لووتەك لە عوودا پارچە عاجێکی تەنکە یـان پارچەدانێکە لە کۆتایی ملـی عودەکـەدا دەبێـت. لە کەمانچەیشـدا چێوێکی تەختەیە لەسەر هێڵی بەسنووقەکە گەیشـتووەو چەسـپکراوە کە مەلاوییەکەی پێوە چەسپکراوە.

(أَنْفُ العِجل): گوڵە ئاخ/ گوڵە ئاوات رووەکێکە بـۆ جوانیی دەروێنرێت. گوڵەکەی لەسـەری هەندێك گیانەوەر دەچێت. گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێت.

(أَنِفَ-مِـنَ العـارِ أَنَفاً): خـۆی لەنەنگیی و ئابروو چوون پاراسـت/ سەربەرز بوو حەزی لە داوێنپیسیی نەکرد.

(أَنُوف): رووسـوور/ سـەربەرز/ لەنەنگیی و ئابرووچوون خۆ پارێز.

(الأَنَفَـةُ): سـەربەرزیی و خـۆ دوور لـە نەنگییگرتن/ رووسووریی.

٢-(إئتَنَـفَ واستَأْنَفَ-الشـيءَ): سـەرلەنوێ دەسـتی بەشـتەکە کـردەوە/ لـە شـتەکە هەڵچووەوە.

(إسـتَأنَفَ- الدعـوى): هانایـبرد بـۆ تێهەڵچوونەوەی داواکە لەلایەن ئەنجوومەنی تێهەڵچوونەوەوە.

(محـام في الإسـتِئناف): پارێزەرێـك بـۆ تێهەڵچوونـەوەی داواکـە لـە ئەنجوومەنی تێهەڵچوونەوەدا.

(آنِفاً) (تۆزێك/ دەمێك) لەمەوپێش.

(ذكرتُهُ آنِفاً): تۆزێك لەمەوپێش باسمکرد.

(آنف الذكر): لەمەوپێش باسکراو.

(آنِفَـةُ الشَّـباب): تافـی لاویی/ سـەرەتای گەنجێتیی.

(مَضَـت آنِفَةُ الشَّـباب): ١-تافـی (لاوێتیی/

گەنجێتی) بەسەرچوو/ تێپەڕی.
(أَنْفُ- كُلِّ شيءٍ): سەرەتای هەموو شتێك.
(أَلأُنُفُ-مِنَ الرياض): مێرگ و مێرغوزارێکی خواکرد کە هێشتا دەستی بۆ نەبرابێت و لێینەلەوەڕابێت.
(غابة أُنُف): دارستانێکی نەڕژاکاوو دەستبۆ نەبراو.
(كأسٌ أُنُفٌ): پەرداخێك کەپێی نەخورابێتەوە.
(أَلْمُسْتَأنَفُ): شتێك یان کارێك کە تازە هاتبێتە کایەوە/ نوێبێت، تازە داهاتووبێت.
انق:١-(أَنِقَ. أَنَقاً): دڵخۆشبوو/ کەیفخۆشبوو.
٢-(أَنِقَ-الشيءَ. أَنَقاً): ١-شتەکەی بەدڵداچوو/ حەزی لەشتەکەکرد و لای پەسندبوو ٢-شتەکەی بەلاوە سەیر بوو/ سەیری لەشتەکە هات و لای لە شتیتر پەسندتر بوو.
(-الشيءُ): شتەکە جوان و چاك و سەرسوڕمێنبوو.
(أَنِقٌ وأَنيقٌ ومُؤنِقٌ): قەشەنگ، جوان و سەرسوڕمێن.
(رَوضَةٌ أَنيقٌ وَأَنيقَةٌ): باخچەیەکی جوان و قەشەنگ و ڕازاوە.
(أَنَّقَ-هُ): وای ڕازاندەوە کە سەر لێی سوڕبمێنێت و بیحەپەسێنێت/ خەڵك بەلایەوە سەیربێت.
(آنَقَ-هُ إيناقاً وَنيقاً): سەری لێسوڕماو پێیخۆشبوو (بەپێچەوانەی دەستوورە).
(تَأَنَّقَ): ١-شتی جوان و ناوێزەی خواست ٢ خۆی شۆخ و شەنگ و جوانکرد.
(-في الكَلام أَو العَمَلِ): قسەی ڕێکوپێکیرد یان کارامانە کارەکەیکرد.
(-المكانَ): شوێنەکەی بەدڵبوو/ لا دڵگیر و جوانبوو بەجێینەهێشت.
(الأَناقـه والإناقَـة): ١-جوانییەکی دڵفرێن و سەرسوڕمێن ٢-ڕێکپۆشیی/ جوانپۆشیی/ کەشخەیی.
(فيه أَناقَةٌ ولباقَة): جوان و ڕێکپۆش و بەزمانە.
٣-(أَلأَنُوق) (ح): شاهەڵۆ.
(هُوَ أَعَزُّ مِن بَيض الأَنوق): دەستگیربوونی لە هێلکەی شاهەڵۆ زەحمەترە. (چونکە شا هەڵۆ بە ماهیزەردەکانەوە هێلانە دەکات و دەست ناگاتە هێلکەکانی.
انم: (أَلأَنَام والآنَام): خەڵك/ کەس یا بەدیهاتوو.
انى: (أَنى. يَأْنى. أَنْياً وإِنىً وَأَناءً وَأَنَّى تَأْنِيَةً): نزیکبووەوە/ هاتە پێشەوەو ئامادەبوو.
(-النَباتُ): ڕووەکەکە پێگەیشت و کاتی هات.
(أَلأَنَـاءُ وَالأَنى والإنى): ١-(دەم/ کات)ی شت هاتن ٢-پێگەیشتن.
٢-(أَنى وَأَنِيَ. يَأْني أُنِياً وإِنيّ): دواکەوت.
(أَنِيّ): دواکەوتوو.
(آنى-فُلانـاً. إيناءً): فیساری دواخست و

خایاندی.

٣-(أَنى وَأَني. يأني أَنياً وإِنْيًّ): خاوەخاویکرد، شێنەییبوو/ خۆی دواخست.

آن: کەسێکی خاو/ هێواش/ لەسەرخۆ.

(تَأَنَّى واسْــتانى- الرَّجُلَ): پەلەی لەپیاوەکە نەکردو لەسەری وەستا.

(-في الأمر وبِهِ): وردو بەسەرنجەوەو لەسەر خۆ لــە کارەکەدابــوو/ هێمن و بەشــێنەیی کارەکەیکرد.

(الأنــاة): ١-لەســەر خۆیــی/ شــێنەیی/ پەلەنەکــردن/ هێمنیــی ٢-ســەنگینییو سەرمەندیی بەپشوو بوون/ بە تابوشت.

٤-(أَنــى- الرَّجُــلُ. أَنياً): بەزەیــی هاتەوە/ میهرەبانبوو.

آنٍ: شــێنەیی/ ســەرمەند بــە پشــوو و میهرەبان.

(رَجُلٌ آنٍ): پیاوێکی زۆر سەرمەندو بەپشوو/ هێمن و شێنەیی.

(ألأَنى (ج) آناء وَأَنِيّ): سەرمەندیی و هێمنیی.

٥-(ألأَنى (ج) آناء وَ أَنِيّ): هەمو رۆژەکە یان بەشێکی رۆژەکە.

(آناءُ اللّيلِ وأَطرافُ النَّهار): شەوو رۆژ.

(ألإناء (ج) آنِيَة وَ (جج) أَوانٍ): قاپ/ ئامان/ دەفر.

(أَنّى= أينَ): لەکوێ. (ناوەڵفرمانی شوێنییە).

(أَنّى تجْلِسْ أَجْلِسْ): لەکوێ دابنیشێت منیش لەوێ دادەنیشم.

(أَنّى= مِن أَينَ): لەکوێ.

(أَنّى لَكَ ذلك): ئەومت لەکوێبوو.

(أَنّى= متى): کەی (ناوەڵفرمانی کاتییە).

(أَنّى جِئتَ): کەی هاتیت؟

(أَنّى= كَيْفَ): چۆن؟ بۆ پرسیارە.

(أَنّى يَكون ذلك): ئەوە چۆن دەبێت.

انــو: (أَنوفليس أَو بَعوضَــة الأُجمِيَّة) (ح): مێشــوولەی ئەنۆفلیس = مێشوولەی لەرزوتا. جۆرە مێشوولەیەکە لە هەموو گێتیدا هەیە. لــە زەلکاوەکانــدا گــەرای هەڵدێت لــە ئاوە شیرینەکاندا گەورە دەبێت میکرۆبی لەرزوتا/ مەلاریــا هەڵدەگرێــت کــە بەیەکێکیەوەدا/ نووسا میکرۆبەکەی بۆ دەگوێزێتەوەو تووشی نەخۆشییەکەیدەکات.

اه: (أَهْ وَأَهٍ وَآه وَآهِ وَآهٍ وَآهــا): ای/ ئایــش/ ئۆی/ ئۆیش/ وەی/ وەیش.

(آهٍ مِــن هذا الأمــر): ئای/ ئایــش لەم کارە (هاوارمە لەدەســتی، پێوەی دەناڵێنم). ناوی کردارە بۆ ئازارو هاوارکردن لەتاو ئازار.

(أَهَّ وَتَهَّه. أَهّــاً وأَهَةً وَإِهَةً وأَهَّةً): لەتاو ئازار ئاهو ئۆهیکرد/ ئای و ئۆیکرد.

أهب: (أَهَبَ وَتَأَهَّبَ-لِلأَمرِ) بۆ کارەکە (خۆی گورجکردەوە/ ئامادەبوو)

(ألأُهْبَةُ: کەلوپەلی پێویست.

(أَخَــذ للسَّــفَرِ أُهْبَتَــهُ): بــۆ گوزارەکــەی/

سەفەرەکەی کەلوپەلی پێویستی ئامادەکرد.

(ألإهاب (ج) أُهُب وَ أَهَب وَآهِبَة): چەرم یان پێستەی خۆشەنەکراو.

اهل: ١-(أَهِلَ-بِهِ. أَهَلاً): هاودەمییکرد و دڵی پێکرایەوە.

(أَهِلَ- الْمَكانُ أَو البَلَدُ): شوێنەکە یان شارەکە ئاوەدانبوو خەڵکی شوێنەکەیان شارەکەی تێدابوو.

(آهِل وَمَأْهولٌ): ئاوا/ ئاوەدان و پر لە خەڵك.

(أَهَلَ- الرَجُلُ): أَهْلاً وَأُهُولاً): پیاوەکە خێزانی پێکەوە نا/ ژنی هێنا.

(أَهَلَ- اَمرَأَةً): ژنێکی کرد بە خێزانی خۆی/ ژنێکی مارەکردو هێنای.

(إمْرَأَةٌ مأْهُولَة): ژنی مێرد کردوو/ شووکردوو/ ژنی بە مێرد.

(آهَلَ-هُ. إيهالاً): ژنی بۆهێنا/ خێزانی بۆ پێکەوەنا.

(أَهَّلَ-بِهِ): گەرم پێشوازیی لێکردو بەخێرهاتنیکرد.

(تَأَهَّلَ واتَّهَل): خێزانی پێکەوەنا/ ژنی هێنا.

(ألأَهْل (ج) أَهْلُون وَأَهَالٍ وآهالُ وَأَهْلات وَأَهَلات): ١-خانەوادە/ فامیلیا ٢-خێل ٣-کەسوکار/ خوێش/ خزم.

(أَهْلُ الرَجُلِ): ژنی پیاوەکە.

(أَهْلُ الأمرِ): (گەورەی/ سەرداری) کاروبار/ سەرپەرشتیاری کاروبار.

(أَهْلُ المَذهَب): بروا پێهێنەرو شوێنکەوتووی رێرەوەکە.

(أَهْلُ الوَبَرِ): دەوارنشین/ کۆچەریی/ رەوەند.

(أَهْلُ المَدَرِ أَو الحَضَرِ): خەڵکی نیشتەنی/ خەڵکی شارو لادێ کە لە خانوودا دەژین.

(أَهلاً وسَهلاً): خۆش هاتیت وەبان چاو/ فەرتهاورد و ماڵ ماڵی خۆتە (هاتیتە لای کەسی خۆت و تووشی خۆشیبوویت).

(ألآهِل): پیاوی خاوەن ژنو منداڵ.

(-مِنَ الأَمْكِنَة): شوێنی ئاوەدان. خاوەنی هەبێت یان خاوەنەکەی تێدا بێت.

(ألأهِل والأهِليّ): ئاژەڵو زیندەوەری ماڵی، پێچەوانەی (حيوان بَرّي) ئاژەڵی کێوی.

٢-(آهَلَ-هُ وأَهَّلَ-هُ للأمر): بۆ کارەکەی لواندو شایستەی کرد.

(أَهلاً له): شایانی ئەوەیە بەکەڵکی ئەو کارە دێت/ شیاوی ئەوەیە.

(تَأَهَّلَ للأمر): بەکەڵکی ئەو کارە هات/ شایانی ئەوکارە بوو.

(إستَأهَلَ- الرَجُلَ): پیاوەکەی بە شایستەو شیاوی ئەوە زانی.

(-الشيءَ): شایستەی ئەو شتە بوو.

(الاهلِيّة): بە کەڵكو شیاوی هاتن، شایستەی لێهاتوویی.

(المؤهِّلات): تواناو لێهاتوویی و بەهرەی

سروشــتیو ئامادەیــی مــرۆڤ بــۆ كارێك/ لێهاتوویی.

الملحق:

اهــل: (الإهليلــج) (ن): دار هەلیله رەگەزە درەختێكە لە ولاتە گەرمەكاند دەروێت وەك هندستان. زۆر جۆری هەیە دارەكەی و بەرەكە بە كەلكە بۆ پێستە خۆشكردنیش بەكەلكە.

(أإهليلج (هـ) شــكل بيضي يقال له القطع الناقص وهوا لمحل الهندسي لنقطه تتحرك في مســتو بحيث يكون مجموع بعديها عن نقطتين ثابتتين فيه يساوى طولاً معلوماً): شــێوە هێلكەیی پێیدەوترێت برگەی ناتەواو. ئەمەیــش جێگــە ئەندازەیــی خاڵێكــە كە بەرێكییەك كە ســەرجەمی دوورییەكەی لە دووخاڵی جێگیرەوە یەكســانە بە درێژییەكی دیار درێژییەكی دیارە.

(ألإهليلجى: المنسوب إلى الإهليلج أى البيضي الشكل الشبيه بالقطع الناقص): هێلكەیی كە لە هێلكەوە واتا شــێوە هێلكەییەوە وەرگیراوە كە لە برگەی ناتەواو دەچێت.

(عَقدٌ إهليلجى): تاقی هێلكەیی.

(مدارُ إهليلجى): خولگەی هێلكەیی.

---

(الأهل والأهليّ): ئاژەڵ و زیندەوەری ماڵیی.

(حَيَوانٌ أهْلِيّ): زیندەوەری ماڵیی.

(حَيَوانٌ بَرِّيّ): زیندەوەری كێویی دەشتەكیی/ ماڵینەبوو.

او: (أَو): پیتــی پەیوەســتە بــۆ :١: گومانــە (شَك)

یا/ یان/ یاخود (بتنا يَوماً أَوْ يَومَين): رۆژێك یان دوو رۆژ ماینەوە.

٢-(ألإيهــام): بــۆ نادیار: نازانــم/ لێم روون نییە.

(نَحــنُ أَو أَنْتُم على حَــق): نازانم ئێمە یان ئێوە لەســەر هەقین و یــان ئێمە یاخود ئێوە كاممان راستین.

٣-(ألإباحَة): رێدان و بەربەرەلاكردن.

(جالِــس العُلَمــاءَ أَوالزُهــادَ): دەتوانیــت لەگــەڵ زانایان یان گۆشــەگیران بۆرێی خودا دابنیشیت.

٤-(التَخيير): سەرپشككردن و هەڵبژاردن.

(سِرراكِباً أَو ماشِــياً): سەرپشكبە بەسواریی برۆ یان بە پێ برۆ.

٥-(ألتَّقسيم): دابەشكردن.

(ألكَلِمَةُ إسْــمٌ أَوفِعلٌ أَوحرفٌ): وشە یان ناو یان كردار/ فرمان یان پیت دەبێت.

٦-(قد تَكونُ بمَعْنى إلى): دەشــێت بە واتای: (تا/ هەتا) بێت.

(لَألْزَمَنَّكَ أَو تُفيني حَقّي): بەگیرت دەهێنم و لێتنابمەوە هەتا مافەكەم نەدەیتەوە.

٧-(قد تكونُ أيضاً بمَعنى (إلاّ) في الاسْتِثناء): لەوانەیە بەواتای ئامرازی جیاكردنەوە بێت/ (یان)/ مەگەر.

(لَأَقْتُلَـنَ العَدُوَّ أَو يَخضَـعَ): دوژمن دهكوژم يان دهبێت سهرشـۆربكات و خۆی بهدهستهوه بـدات. لهگـهڵ دوژمنـدا هـهر دهجهنگم و دهيكوژم مهگهر سهرشۆر بكات.

آب: ١-(آبَ. أوباً وَمآباً): گهرايهوه/ هاتهوه.

(آئِب (ج) أوْب وَأُياب وَأُوّاب- مِنَ السَّفَر): له (گوزار/ سهفهر) گهرايهوه.

(آبَ-الى اللهِ): تۆبهيكـرد/ بۆرێـی خـودا گهرايهوهو پهشيمانبووهوه.

(آوَبَ-الركابُ مُؤَاوَبَةً): سوارهكان له رۆيشتندا پێشكهوتنيانكرد.

(أَوَّبَ وأَيَّبَ-عَنـهُ): لێیگهرايـهوه/ هاتـهوه دواوه.

(تَأَوَّبَ وتَأَيَّبَ وأئْتابَ): گهرايهوه.

(أَلأَوْب والأَوْبَة والإياب): گهرانهوه.

(مَشـى ذِهابـاً وإيابـاً): لـه هاتوچۆدابوو. دههاتو دهچوو.

(أَلأَوَّاب): تۆبهكار/ گهراوه/ پهشيمان.

(أَلمَـآب (ج) مَـآوِب): ١-شـوێنی لێگهرانهوه ٢-قۆناغ/ فرسهخ.

(بَينَهما ثلاث مَآوِب): نێوانيان سێ قۆناغه/ سێ رۆژه رۆيشتنه.

٢-(آبَتِ-الشَمسُ أَوباً وَمآباً): خۆرهكه ئاوابوو.

٣-(آبَ-الماءَ. أَوباً وَ مَآباً): بهشـهو چووه سهر ئاوهكه/ بۆ ئاوهكه چووو ئاوهكهيهێنا.

(تَأَوَّبَ وتَأَيَّبَ وأئْتاب- الماءَ): شهوچووه سهر ئاوهكه ئاوهكهی هێنا.

٤-(آبَ-إلَيه. أَوباً): شهو هاتهلای.

أَوَّبَ وآوَبَ-القَـومُ مُؤاوَبَةً): به درێژايی رۆژ رۆيشتن و بهشهو لاياندا و دانيشتن.

٥-(آبَ-هُ أَوبـاً): رووی كرده لای ئهو/ نيازی ئهوی ههبوو.

(ألأَوب): نياز و نهريت و رێگه و رێرهو قۆڵ.

(جـاؤا مِن كُلِّ أَوبٍ): لـه ههموو لايهكهوه/ قۆڵێكهوه/ رێگهيهكهوه هاتن.

(كُنـتُ على صَوبِ فُـلان وَ أَوبِهِ): لهسـهر رێگهو نهريتی ئهوبووم.

٦-(أَوِبَ. أَوباً): توورهبوو.

٧-(أُوبُـو بانَكس) (ن): درهختێكه گوڵزهرده كه جـۆره كهتيرهيهكـی لێدهردههێنرێت كه تێكهڵ بـه ههندێك ئامادهكـراوی رووهكيی دهكرێت كه له پزيشكيدا بهكاردههێنرێت.

اوت: ١-(أُوتوبـوس أَو أُتُوبَـس): پاسـی هاتوچۆ پێشـيدهڵێن (أُوتوكار) و (بُوسطة) و (باص).

٢-(أُتوسـتراد) (لاتينية): رێگهيهكی قيرتاو كراوی دهرهكيی پان و راست و درێژه. لهوانهيه لهملاولاكهيشـيهوه درهختيـش بروێنرێت و شۆستهيهكيشی بۆ پيادهرهو بۆ بكرێت.

٣-(أُتوقراطي: ستهمكار/ زۆردارو تاكدهسهڵات.

(حاكِمُ أُوتُوقراطي (يونانيه): ديكتاتۆر.

(ألأُتوقراطِيَّة= الحُكم المُطْلَق): تاك دهسـهڵاتيی

بەرێوەبردن.

(سـلطة اوتوقراطية): دیکتاتۆری/ دەســەڵاتی تاکەکەسی.

٤-(أُتوماتيك) (حى) (يونانِيَّة): خۆبزوێن/ ئۆتۆماتیــک/ هەرچی خۆبەخــۆی خۆی کار بکات و ببزوێت/ میکانیکی بێت.

(آلَــة أُوتوماتيكيَّة): ئامێرێکــی خۆبزوێن/ خۆکار.

(ألهاتِف الأُتوماتيكــي (يونانية): تەلەفۆنی خۆکار/ ئۆتۆماتیکی.

اوج: (ألأَوج:ترۆپك/ پۆپە/ لووتکە/ نەوپەڕی بەرزیی.

(أَوج المجد): پۆپەی شکۆیی/ سەروەریی.

(-فــك): دوورتریــن پنتــی نێــوان زەوی و مانگ.

(-مو): ئاوازێك لە ئاوازەکانی مۆسیقا.

آح: (ألآح): سپێنەی هێلکە.

آد: ١-(آدَ-هُ الحِمــلُ. أَوداً وَأُوُداً): بارەکە یان کۆڵەکەی پشــتی چەماندەوە/ نوشــتاندەوە/ کۆڵەکەی بۆ گرانبوو.

(-هُ الأَمْــرُ): کارەکــە شــەکەتیکرد و بــۆی گرانبوو.

(-آئِدٌ): شەکەت و ماندووکەر کاروباریگران.

(مَؤُود): شەکەت و ماندوو.

(تَأَوَّدَ-هُ الأمرُ): کارکە باری شــانی گرانکردو ماندوویکرد.

(ألأَوَد): ڕەنج و ماندوێتیی.

(قامَ بأَوِدِ عائلتِــهِ): بژێویی بۆ خێزانەکەی پەیداکــرد و ڕەنجــی بــۆ دان/ خێزانەکەی بەخێوکرد.

(ألمُوئِــد (ج) مَآرُد): وەیــی گران/ چورتومی قورس و سەخت/ نەهامەتیی.

(ألأَوْدَةُ):١: بار/ کۆڵ.

٢-(آدَو أَوَّدَ- العُــودَ أَوداً): توولەکــەی چەماندەوە/ نوشتاندەوە.

(أَوَدَ وتَأَوَّدَ أَوداً): چەمایەوە و نوشتایەوە.

(أَود (م) أَوداء): چەماوە/ نوشتاوە.

(إنْــآدَ إنْئِيــاداً): نوشــتایەوەو پێچپیخوارد/ خواربووەوە.

(ألأَوَد): کەچیی/ خواریی.

(قَــوَّمَ أَوَدَهُ): خوارییەکــەی/ کەچییەکــەی ڕاستکردەوە.

٣-(آدَ-الفَــئُ أَوداً): ســێبەرەکە (کشــایەوە/ گەڕایەوە).

(-العَشِيُّ): ئێوارەداهات.

اور:١-(ألأُوار (ج) أُوْر):١-گەرمیــی/ گەرمایی ٢-تینوێتیی ٣-دووکەڵ.

(ألآرَة): ئاگردان/ وەجاخ.

٢-(ألأُرانيــوم) (ك): یۆرانیــۆم تەنێکــی تیشکدەرە لە دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمیدا بەکاردێت.

٣-(الأَورْيُوميســين) (طب): ئۆرومایســین:

دەرمانێکە بۆ چارەکردنی هەندێك نەخۆشیی لەوانە زەحیری و نەخۆشییتر بەکاردێت.

اوز: (ألإوَزَة= الوَزَّةُ (ج) إوَزّ) (ح) (فارسية): قاز.

(ألمَأوَزَة): شوێنێکە قازی زۆر لێبێت و هەبێت. الملحق

اوز: (ألأَزون): جۆرە ئۆکسجینێکە ئۆکسێنەرێکی بەهێزە بۆ پاککردنەوەی ئاو بەکاردێت.

آس: (آسَ يـؤُوسُ أوسـاً وَإياسـاً): ١-دايـە ٢-قەرەبوویکرد/ لەبری دایە.

(إسْـتَآسَ-هُ): ١-داوای شـتیکرد ٢-کۆمەکـی لێخواسـت/ هانای بۆ بـردو داوای یارمەتیی لێکرد ٣-داوایکرد لەگەڵیدا بێت.

(ألأَوْس): بەخشش/ شتی بەخشراو.

٢-(ألآس) (ن): الرَّيحان): مورد.

(آسَـة): مۆردێك ڕووەکێکە هەمیشە سەوزە گوڵەکـەی سـپییە بەرەکەی وردەو خۆشـە سـپییە یـان ڕەشـە خەڵکەکـە پێیدەڵێـن (الريحـان) خەڵکە ڕەشـۆکەکە بەبەرەکەی دەڵێن (الحنبلاس) (حب الآس).

(ألآس البّري): موردی دەشتەکی کە خەڵکەکە پێیدەڵێن (شرَّابة الراعي): ئەم ڕووەکە لەلای یۆنانییەکان نیشانەی سەرکەوتنبوو.

٣-(ألأَوس): گورگ.

٤-(الأُسْمِيوم) (ك): کانزایەکی سپیی سەختە کریستاڵییە قورسترین تەنی ناسراوە تەنێکی سادەیە هێماکەی (O5).

آف: (آفَ-هُ أوفـاً): ١-زیانـی پێگەیانـد ٢-گەنیکرد/ خراپیکرد.

(آفَـت- البلادُ. أوفاً وَآفَـةً وأُووُفاً): وڵاتەکە دەردی تێدا بڵاوبووەوە/ دەردی تێکەوت.

(ألآفَة (ج) آفات): ١-دەردو پەتا ٢-تێکچوونی لەش/ سەقەتیی و ناتەواویی و نەخۆشیی.

آق: (آقَ-عليـه. أوقـاً): بـە دوومیـی و چارەڕەشیی بۆ هێناو گرفتاریکرد.

(أوَّقَ-هُ): ١-تووشی (نا هەمواریی/ دردیسەریی و زەحمەتیکرد) ٢-خواردنەکەی کەمکردەوە.

(ألأَوق): ١-قورسـیی/ باری گران/ سـەختیی ٢-بەدوومیـی/ چارەڕەشـیی/ بەدبەختیـی، نەهامەتیی.

(ألقى عَلَيَّ أوقَهُ): قورسایی خۆی و بەدوومی خۆیی بەسەرمدا دا.

(ألأَوق): بەدووم/ چارەڕەش.

(به أَوقٌ): بەدوومە/ چارەڕەشە.

٢-(آقَ-عَلَيـهِ. أوقـاً): ١-بەلای ئـەودا لایدا ٢-بەسەریدا ڕوانی/ ڕووی کردە ئەو.

(تَأوَّقَ): ڕێلێگیرا/ قۆرت هاتە ڕێی.

٣-(ألأوقِيَّـة (ج) أَواقي وأَواق): (١/١٢) رتل و (١/٦) ی هۆقەیەك.

٤-(ألأَقيانُـوس) (يونانيـة): ئۆقیانـووس/ شادەریا.

اوك: (أُكاليبتُـوس) (ن): درەختێکـی چرە

پێشــیدەوترێت (کینا). هەیانە بەرزییەکەی دەگاتە ســەد مەتر. زۆر زوو گــەورە دەبێت و دەروێــت. لەبــەر ئەوە لەمبــەرو لەوبەری شــەقامەکاندا دەروێنرێــت هەروەهــا لــەو زەویانــەدا کە ئاوەزێ بێــت و تەڕایی هەبێت دەروێنرێــت بــۆ وشــککردنەوەی زەویەکــە بەکاردێت.

٢-(ألأُكسيجين) (ك): تەماشای (ألأكسجين) بکە.

(أُوكسيد) (ك): ژەنگ/ ئۆکسید.

ال: (الَ: إليــهِ. أولاً وَ مَــآلاً): ١-بــۆلای ئــەو گەرایەوە. ٢-بەهۆی ئەوەوە بوو.

(أَوَّلَ-هُ إليه): بۆ ئەویگێڕایەوە/ دایە پاڵ ئەو و ئەویکرد بەهۆ.

(أَلمآل): ١-ئەنجام/ ئاکام/ مایە ٢-سەرچاوە.

٢-(أَوَّلَ-الكلامَ): ئاخاوتنەکــەی لێکدایەوەو هەڵیسەنگاند.

(-الرُؤيا): واتای خەونەکەی لێکدایەوە.

(تأْويلُ الرُؤْيا): لێکدانەوەی خەون.

(تَــأَوَّلَ- الــكَلام): قســەکەی لێکدایــەوەو هەڵیسەنگاند/ بەدوای واتاکەیدا گەڕا.

(-فيه الخَــيرَ): چاکــەی لــە ئاخاوتنەکەدا (بینی/ دی)/ چاکەی لێچاوەڕێکرد.

(مَآلُ الكلام): پوختەی واتای قسەکە/ کورۆك و واتای ئاخاوتنەکە (أَلمآل): ئەنجام/ پوختەو کورۆك.

(ألآل) (ف): تراویلکە یان ئەوەی لەنێوەڕۆدا لەنێــوان زەوی و ئاســماندا وەك ئــاو دێتــە بەرچاو.

٣-(آلَ-الُرَّعِيَّة. إيالاً وَأَوْلاً): میللەتەکەی باش بەڕێوەبرد و میهرەبانانە کاری سازکردن.

(-علــى القَــوم. أَوْلاً وَإِيالاً وَإِيالَــةً): بوو بە گەورەو کاربەدەستی میللەت.

(إئتالَ –المالَ): داراکەی باش هەڵســووڕاندو سەرپەرشتیکرد و خەملاندی.

(آلُ- الرَجُلِ): بنەماڵەی پیاوەکە تەنها بەهی وەجاخزادەو ناودار دەوترێت.

(آلُ الجَبَلِ): دامێنی شاخ/ چیا.

(ألإيالَــة (ج) إيالات): ١-ڕامیاری ٢-بەشــێکی ســنووورداری وڵات کــە لەژێــر دەســەڵاتی سەردارێکدا دەبێت.

٤-(ألآلَــة (ج) آل وآلات): ١-ئامێر ٢-ڕەوش و تەنگانەو توندو تیژیی.

(ألآلَةُ الحَدباء): دارە مەیت.

(ألآلاتِــيُ): ١-مۆســیقاژەن/ ســازژەندە ٢-ئامێرگێر/ ئامێر ساز.

اوَل: ١-(ألأوَّل (ج) أوائِــل وَ أَوالٍ وأَوَّلُون (م) أوَلى (ج) أُوَل وَأُولَيــات): ١-یەکەم/ یەکەمین ٢-سەرەتا ٣-پێشین.

(لَقَيتُــهُ عامــاً أَوَّل): ســاڵی یەکــەم دیــم/ یەکەمساڵ دیم.

(ما رأيتُ لَهُ أَوَّلاولا آخِراً): نە سەرەتایم دیت

و نه كۆتایی.

(لَقِيتُـهُ أَوَّلَ ذي يَدَيـن):سـپێدەی بەیان پێگەیشتم.

(أَعْمَلُ كـذا أَوَّلَ ذي يَدين):لەپێش هەموو شتێكدا ئەوە دەكەم/ ئەو كارە دەكەم.

(أَوَّلِيَّة) (هــ): (هي دعوى واضحة لاتحتاج إلى برهـان كقولنا «ألـكُل أكبر من الجزء»: والأَوَّليـات مشـتركه بين كل العلـوم التي تدرس فيها المقادير يقال لها أيضاً (بديهية): بنكەیی/ سـەرەتایی/ بەڵگە نەویست. دیارە پێویستی بە سەلماندن، نییە وەك بڵێیت گشت گەورەتــرە لەبــەش. سـەرەتاكانی لە هەموو ئەو زانسـتانەی كە بڕیان تێدایە هاوبەشـن. هەروەها پێشیدەوترێت بەڵگە نەویست.

٢-(أَولاءِ وأُولى):ئامـرازی ئاماژەیــە بۆ كۆی نێـرو مێی نزیـك: ئەوانە/ ئـەوان/ (هـ) ی ورپاكردنەوەی دەچێتە سەر دەبێتە:

(هـؤُلاءِ):ئەوانــە/ ئــەوان/ (ك)ی گوێگری دەچێتە سەر دەبێتە.

(أُولئكَ):ئەوانە.

(أُولاءِ وأُولى= أَلَّذين):ئەوانەی كە.

٣-(أُولُــو= ذوو):(بۆكۆیــە بــۆ نێــر) واتا: خاوەنانی ئەو شتە.

(ذو)(بۆ تاكە بۆ نێر) واتا: خاوەنی ئەوشتە مێیەكەی.

أُولات:خاوەنانی ئەوشتە.

تاكەكەی (ذات) (تاكـەو واتای خاوەنی ئەو شتە بۆ مێ).

(جاءَنى أُولو العِلم):خاوەن زانستەكان هاتن «نێرەكان».

(وَأولات الفَضِــل):ئافرەتە خاوەن چاكەكان هاتن.

الملحَق

اول: (التَّأْويــل):لێكدانــەوەی ئاخاوتــن و هەڵسەنگاندنی.

(تَأْويــلُ نَــصّ): لێكدانــەوەی دەقێــك/ بەرچەیەك.

(تَأْويــل الرُؤيــا):لێكدانــەوەی خــەون و كورۆكی.

(أَلتَّأْويــل في علــمُ الــكَلام):لێكدانــەوەی بەرچەیەكی ئاینیی بــە پێی ناوەرۆكەكەی نەك وشە دیارەكانی.

(تَأْويــلُ القُــرآنِ والحَديــثِ):لێكدانەوەی واتای قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بەپێی ناوەرۆكیان.

(أَلأيلولَة) (مص):گەڕانەوە.

(أَلأيلولَة الى الجَبَل):بۆ شاخ چوونەوە.

(أَيلولَــةُ حَــقٍ أومالٍ مِن شَــخصٍ إلى آخر): گوێزانــەوەی مافێك/ هەقێك یــان دارایەك، پارەیەك لە یەكێكەوە بۆ یەكێكیتر.

(أَيلُولَــة المـيراثِ): گەیشــتنی مــیرات و گوێزانەوەی بۆ میراتگر.

---

آم: ١-(آمَ. أَوْماً):زۆر تینوبوو.

(أَوَّم-هُ): تينوويكرد.

(ألأوَام): تينوێتيی.

٢-(آمَ-النَحْــلَ وَعَلَيها أوماً وَإِياماً وَأُياماً): هەنگەكەی بەدووكەڵ ڤانگدا تا بێتە دەرەوەو هەنگوینەكەی دەربهێنێت.

(ألأوام): سەرەگێژێ.

(ألإيام (ج) أُيم): دووكەڵ.

٣-(أُمْنيبُس)= (لاتينية): پاس.

(سيارة الوَقّافَة)= (السَّيارَة العامَّة)= (سيارة الركاب): پاسی گشتيی هاتوچۆ.

آن: ١-(آنَ-على نَفسِــهِ) أوناً): دڵی بە خۆی سووتا/ بەزەيی بە خۆيدا هاتەوە.

(ألأون) ١-دڵپێسووتان ٢-هێمنيی/ لەسەرخۆيی ٣-دڵئاسوودەيی و دڵنيايی.

٢-(أَوَنَ وَتَـــأَوَّنَ- الرَجُــلُ): شـــينەييكرد/ لەسەرخۆبوو.

(ألأون) بەشێنەيی ڕۆيشتن/ لەسەرخۆ ڕۆيشتن.

(ألآن والأوان (ج) آوِنَة) ئێســـتا/ ئەم حەلە/ ئەم دەمە/ ئەم كاتە/ هەنووكە.

(آناءُ اللَّيل) بەدرێژايی شـــەو/ دەمانی شەو/ كاتەكانی شەو.

الملحق

اون: (ألآنِيّ): هەر ئێستا/ ئێستا/ هەنووكە.

(حُــدوثٌ آنِي) ڤەوماوێكی دەســـتبەجێيی/ لەپڕ ٢-هەنووكەيی/ ئێستەيی.

(مَوضُــوع آنِــي): بابەتێكـــی هەنووكەيی/ ئێستەيی.

(ألأُونســـكو): يۆنيســـكۆ. ڕێخراوێكە سەر بە نەتەوە يەكگرتووەكانە ساڵی ١٩٤٦ دامەزراوەو بنكەكـــەی لـــە پاريســـە ئامانجـــی هاندانـــی ميللەتانـــە لەبـــواری پـــەروەردەو زانســـت و ڕۆشـــنبيريدا وەك فێركردنـــی ســـەرەتايی و فێركردنـــی زۆرەملێيی/ خۆرايـــی. بەرگرتن لـــە گرژيـــی ڕەگەزيـــی و نەهێلانـــی ئازاديی ڕاگەياندن لەناو يەكدا. مەڵبەندەكەيشيان لە خۆرهەلاتی ناوەراستدا لە بێرووتە.

---

آه: (آهَ وأوَّهَ وَتَـــأَوَّهَ أَوْهــاً): لەتاو ئازار ئای و ئۆيكرد/ ناڵاندی/ نركاندی.

(قالَ: آه أوآهاً أو أوَّه أوأوَّه): وتی: ئای/ ئايش/ ئۆی/ وايش/ وەيش/ ئاخ.

(ألأوَّاه): ڤرە نركەو ناڵە/ كەسێكە ئای و ئۆی لە تاو ئازارو ژان زۆربكات/ دەمبەهاوارە.

(ألآهَة): ١-ئـــاخ و ئۆڤكردن/ ئای و ئۆيكردن/ ناڵانـــدن/ نركانـــدن/ ئايـــش و وەيشـــكردن ٢-سووریژە.

١-(أوی- لَهُ. أوِيَةً وإيَّةً ومَأوِيَةً ومَأواةً): دڵی بۆی نەرمبوو/ سۆزی بۆی جوولا.

(إئتوي إتَّوی): دڵی بـــۆی نەرمبوو/ بەزەيی پێداهاتەوە/ سۆزی بۆ جولا.

٢-(أوی- البَيـــتَ. أويـــاً وَإِواءً): خۆی كوتايە ماڵەوە / چووە خانوەكەوە.

(آوی-هُ وَأَوی-هُ البَيتَ وإلی البَيتِ): داڵدەيدا

و بردیه ماڵەوە.

(إیواء): داڵدەدان.

(تَآوَت وتَأوَّتِ الطیورُ): مەلەکان چوونە پاڵ یەك و کۆبوونەوە.

(اَلمَأوى والمَأواة): نـــەوا/ خانە/ پەناگا/ لانە/ هەوار/ ئەوشـــوێنەی تێیــدا دەحەوێیتەوە و وپەنای بۆ دەبەیت/ داڵدە.

٢-(اَلآيَة (ج) آيٌ وآيات): ١-نیشانە.

٢-(-مِـــنَ الكِتاب): رِســـتەیەکی کتێبەکە کە جیاکرابێتەوە بەنیشانەیەکی گفتی ٢-پەند.

(آيَةُ الرَجُلِ): پیاوەکە خۆی.

(خـــرَج القَـــومُ بآيَتِهم): خوێشـــگەل پاکیان هاتنـــە دەرەوە هیچیـــان لـــەدوای خۆیـــان بەجێنەهێشت.

٤-(إبنُ آوى (ج) بَنات آوى) (ح): چەقەڵ رِەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن (الواوي) یان (أبي زهرَة).

اي: (أيْ: حرف نداء): پیتی بانگکردنە، هۆ/ ئەریَ.

(أيْ زَیْد): ئەریَ زەید

٢-(حرف تَفسـیر): پیتی لێکدانەوەیە، واتا (أرَأیتَ غَضَنْفَراً أي أسَداً).

غَضَنفریکت دیوە واتا شێرێکت دیوە.

٢-(أي): حـــرف جواب بِمَعنـــى نَعَم): پیتی وەرامە و وبەواتای: (بەڵێ) یە.

(ولایَقع إلاّ قَبلَ القَسَم): هەمیشە دەبێت لە پێش سوێندەوە بێت.

(إي واللهِ): بەڵێ بەخودا.

٣-(أي تکون شـــرطیة): کام بۆ مەرجەو بە چەند واتایەك دێت.

(أیاً تَضربْ أضْرِب): تۆ لە کێ بدەیت منیش لێیدەدەم.

٢-إستفهام: بۆ پرسیارە. (کام. کێ. چ).

(أیُّکم أتی؟): کێتان هات.

٣-ناوی گەیەنەرە: (ئەوەیکە/ هەرکام).

(سَـــلِّمْ علـــى أیُّهُم أفضـــل): هەرکامیان زۆر باشبوون سڵاو لەوەیان بکە.

٤-(دالَـــة علـــى معنى الكمـــال فَتَكونُ صفة للنكـــرة): نیشـــانەیە و ئاماژەیـــە بۆ تەواوی ئەوەو بۆ نەناسراوێك دەبێت.

(زَید رَجُلٌ أيُّ رَجُلٍ): زەید پیاوێکە بەڵام چ پیاوێك واتا پیاوێکی زۆر تەواوە.

٥- (صلـــە لِنـــداءِ مـــا فیـــه (أل) ملحقـــة بهـــاء التَنبیـــه): بـــۆ بانگکراوێـــك کە های وریاکردنـــەوەی خرابێتە ســـەر: (ئەریَ هۆ/ ئەریَ هەی).

(یاأیها الرَجُل): ئەریَ هۆ پیاوەکە.

(یا أیتها المَرأة): ئەریَ هۆ ژنەکە.

(یا أیها الفاضِلُ): ئەریَ هۆ پیاوچاکەکە.

(أیّا): راناوێکی جیایە هەموو راناوە (مەنسوبە) پیتـــەکان بۆ جیا کردنەوەی خاوەن رِاناوەکان ئەم رِاناوەی دەخرێتە سەر وەك:

(إیّاكَ). (إیّاكِ): بۆ تاکی نێرومێ گوێگر.

(إيَّاكما): بۆ دوانەی نێرومێی گوێگر.

(إيّاكم): بۆ كۆی نێری گوێگر.

(إيَّاكُنَّ): بۆ كۆی مێی گوێگر.

(إيايَ): بۆ تاكی قسەكەر.

(إيانا): بۆ كۆی قسەكەر.

(إياهُ): بۆ تاكی نادیاری نێر.

(إياها): بۆ تاكی نادیاری مێ.

(إياهُمـــا): بۆ جووتی/ دوانـــەی نادیاری نێر یان مێ.

(إياهُم): بۆكۆی نادیاری نێر.

(إياهُنَّ): بۆ كۆی نادیاری مێ.

٢-(أيـــا): هۆ پیتـــی بانگكردنـــی دووره: هۆ. دەشـــێت (أ) هەمزەكـــەی بكرێـــت بـــە (ه) و دەوترێت (هَيا) (أيا قاطع النهر): هۆ ئەوەی كە لە رووبارەكە دەپەڕیتەوە.

٣-(أيّار) (ســـريانية)= (مايو): مانگی گوڵان كە سیویەك ڕۆژەو پێنجەمین مانگی ساڵی خۆرییە.

ایـــب: (ایبیـــكا) (ن) (طـــب): دەرمانێكـــە بۆ پێرشانەوەبەكاردێت لەرەگی دارێك دەردەهێنرێت كە لە ئەمەریكای باشووردا هەیە.

آد: ١-(آدَ. يَئيدُ. أيْـــداً وَآداً): توندو بەهێزو قایمبوو/ پتەوبوو/ رەقبوو.

(أيَّدَ-هُ وَآيَدَ-هُ تَأييداً وَمُؤايَدَةً): ١-بەهێزیكرد ٢-پشـــتگیریكرد/ كۆمەكیكـــرد/ یاریدەیـــدا/ لایەنیگر.

(هُوَ مُؤَيِّدٌ وَمُؤْيِدٌ): ١-لایەنگیرە/ پشـــتگیرە/ كۆمەككەر ٢-چەسپێنەرە.

(مُؤَيَّد ومُؤْيَد): ١-پشتگیركراوو لایەنگیركراو/ بەهێزكراو ٢-چەسپێنراو.

(تَأَيَّدَ): بەهێز بوو/ لایەنگیرو پشتگیربوو.

(ألآد والأَيْد): هێز/ توانا.

(ألإياد): ئەوەی شـــتەكەی پێبەهێزو قایم و چەسپدەكرێت.

(إيادُ الجَيش): هەردوو باڵی/ لای ســـوپا باڵی لای ڕاست و لای چەپی سوپاكە.

(ألإياد): كێوی سەخت و قایم.

(ألأَيِّد): قایم/ پتەو/ بەهێز.

٢-(ألإياد): ١-داڵدە/ پەنا/ پاڵپشت ٢-هەوا.

(ألمُويـــد (ج) مَآودَ وَمَوائِد): ١-وەی/ چورتوم ٢-كۆســـتكەوتن/ لێقەومانی سەخت و گران/ بەسەرهاتی قورس.

٢-(إيدیُولوجیـــا) (یونانیـــة): ئایدۆلۆجیا: هونەری بۆچـــوون و هێنانە بەرچاوو لەهزر كۆڵینەوە.

٢-(ڕێرەوێكـــە تەنهـــا پشـــت بەبـــیری ڕووت دەبەستێت بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی كە لە پشت سروشتەوە هەیە.

ایس: (أيِسَ. يَيْأَسُ-مِنهُ إياساً): لێیناهومێد بوو/ هێوای لێبڕی.

(آئِـــس): نائومێـــد/ بێهومێـــد/ هیوابـــڕاو/ بێهیوا.

أَيَّـــسَ-هُ وَآيَـــسَ-هُ إيئاســـاً): نائومێدیكرد/

هیوابڕی/ بێئومێدیکرد.
(ألآئسةَ): ئافرەتێك کە تەمەنی پەنجا ساڵ و بەرەو ژوورتر بێت.
آضَ: (آضَ. یَئیضُ. أیضاً): ١-بوو/ بووبەوە/ بەوەگورا.
(آضَ سَوادُ شَـعْرِه بَیاضاً): ڕەشی قژی (بوو بە سپی/ گورا بەسپی) ٢-گەڕایەوە.
(أیْضاً): دیسان/ دیسانەوە.
(فَعَلَـهُ أیضـاً): کارەکەی دیسـان کـردەوە/ دووبارەی کردەوە.
ایق: (ألأیقونَة) (یونانیة)= ألنَصَمَة): وێنەو پەیکەری حەزرەتی عیسا.
ایك: (أیكَ واسْتَأیَكَ- الشَّجَرُ. أیْكاً): درەختەکە چڕو زەبەنگبوو. وەك دەوەنی لێهات.
(ألأیك) (ن): درەختێکی زۆری چڕو بەیەکدا چوو/ جەنگەڵ/ بێشەلان.
(أیكَةُ): دەوەنێك.
ایـل: ١-(إیـل) (عبرانیـة) الله تعـالی): بەجوولەکانەیی ناوی خـودای بەرزو مەزنە واتا خودای بەتواناو لێهاتوو.
٢-(إیلَنطُـس) (ن): درەختـی گـەردوون. درەختێکە خێرا باڵا دەکات لەوانەیە تابیست مەتر بەرزبێتـەوە بۆ جوانیـی دەروێنرێت گەڵاکانــی پانە بەلام گوڵەکەی بۆگەنە/ بۆنی ناخۆشە.
٣-(ألأیِّل والأیَّل وَالأُیَّل (ج) أیائِل): گاکێوی/ فیلەگێژە/ شـوور خەرگۆلـك. گیانەوەرێکی سـمدارە نێرەکـەی شـاخی هەیـە کـە لکی لێدەبێتـەوەو بۆش نییە بەلام مێکانی کۆڵن/ بێشاخن.
٤-(أیلول) (سـریانیة): ڕەزبـەر. مانگی نۆ هەمینی سـاڵی خۆرییە سـی ڕۆژەو پێیشـی دەڵێن (سبتَمْبَر).
آم: ١-(آمَ. یَئیمُ- الرَجُلُ مِن زَوجَتِهِ أو اُلمَرأةُ مِن زَوجِها أیْمَةً وَأیوماً وَأیْماً): پیاوەکە بێوە پیاو بوو یان ژنەکە بوو بە بێوەژن.
(أیِّـم (ج) أیائِـم وَأیامی وَأیِّمـون وَأیِّمون وَأیِّمات): ١-بێوە پیاو و بێوەژن ٢-بێهاوسەر.
(أیَّمَ-هُ): کردی بە بێوە/ بێهاوسەریکرد.
(تَأیَّمَ): بەرەبەینی ماوەیەك مایەوە.
(المُؤَیْمَة- مِنَ النسـاء): ئافرەتی ساماندراری بێهاوسەر.
(مَأْیَمَة): بێوەژنکردوو.
(ألحَربُ مأیَمةُ مَیْتَمَة): جەنگ بێوەژنکردوو و هەتیـو کەرە/ ژن بێوەژنـەدەکات و منداڵ هەتیو دەکات.
٢-(ألأَیْم (ج) أُیوم): ١-مار ٢-نێرەمار.
(أیْمُ اللهِ): سوێند بەخودا.
(ألآمَة): خەوش و کەمووکووریی و تەریکیی.
آن: (آنَ یَئینُ. أیناً): کاتی هاتووە.
(آن لَكَ أن تَفعَلَ كذا): کاتی ئەوە هاتووە کە ئەوە ئەنجامبدەیت.

(اَلأَيــــن): ١-دەم/ كات/ حـــەل ٢-ماندوێتیی و شەكەتیی.
(اَلآن والأَوان: (ج) آونَة): ئێستاكە/ هەنووكە/ هەر ئێستا.
٢-(أَيَّـــان): ١-ئامرازی مەرجە بـــۆ ئاوەڵكاری كاتی.
(أَيَانَ تَضـــرِب أَضْرِب): هەر كاتێك دەســـت بوەشێنیت منیش دەست دەوەشێنم.
٢-ئامـــرازە بۆ پرســـیاری كات ، كـــەی. (أيانَ تَرجَع): كەی دەگەڕێیتەوە پرسیاری كاتە.
٣-(أَينَ): ئامرازی پرسیاری شوێنە ئاوەڵكاری شوێنە.
(أَين): كوا؟ لەكوێ؟ (أَين يوسف)؟ یوسف لە كوێیە؟ یوسف كوا؟.
(أَينَ وأَينَما): بۆ مەرجیشە لەكوێدا.
(أَينَ وأَينَما تَقِفْ أَقِف): لەكوێدا بوەســـتیت دەوەستم.
إِيە: (إِيـــهِ): ناوی فرمانە بۆ زۆرتر لەســـەر ئاخاوتنەكە یان كردارەكە ڕۆیشتن.
أَيـــو: ١-(إِيـــون) (ك): گەردیلە یـــان كۆمەڵە گەردیلەیەكـــە بارگـــەی كارەبـــای لەســـەرە. ئەگەر بارگە كارەباییەكانی لە گەردیلەیەكدا كەمیكرد گەردیلەكە هەڵگری بارگەی موجەب دەبێت خۆ ئەگەر زۆریكرد گەردیلەكە هەڵگری بارگەی سالب دەبێت بەوە دەڵێن لەتبوون.
٢-(اَلإِيـــوان (ج) إِيوانات وَ أَواوين (ف. ب)): ١-هەیوان شـــوێنێكە سێ دیواری بە دەوردایەو لایەكی بەرەڵایە ٢-كۆشك.
إِيوان كِســـری: هەیوانی كیســـرا یان كۆشكی كیسرا.
٣-(أَيا وأَياءُ وَأَياةُ وإِياةُ-الشَـــمسِ): ڕووناكی/ ڕۆشنایی و جوانیی خۆر.
(-النَّباتِ): جوانیی و ڕەونەوقی. ڕووەك.
(إِيـــاةُ الشَـــمسِ): خەرمانەی خـــۆر كە وەك خەرمانەی مانگە.

| ا | ب | ت | ث | ج | ح | خ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٧ | ١١٠ | ٢٢٩ | ٢٦٠ | ٢٨٩ | ٤١٠ | ٥٩٨ |

# ب

ب: (الباء): بێ. دووەمـــین پیتی ئەلفو بێی عەرەبییە لە پیتــە لێوەکانە، لە ژمێرە کۆی پیتەکاندا (دوو)ە.

٢-پیتی (جَر)ە. واتاکانی لە ڕستەدا:

١-(اَلاِلْصاق): پێوەلکاندن.

(«أَمْسَكْتُ بالغُلام»): مێردمنداڵەکەم گرت.

٢-(الإســتِعانَة): (بــە) بەهۆکــردن یــان یارمەتیدان.

(«كتبــتُ بالقَلَــم») بــە پێنووســەکە/ بە قەڵەمەکە نووسیم.

٣-(المُصاحَبة): (بە) لەگەڵدابوون.

(«إذهَب بِسَلام») بە خۆشیی بڕۆیت.

٤-(الظرفية): (بــە) تێدابوون. ئاوەڵفرمانی کاتیی.

(« ») بە شەو ڕۆیشت.

٥-(البَدَل): لە بری/ گۆڕینەوە (بە).

(«باعَ الكُفرَ بالإيمان») خوداناسیی بە کفر گۆڕییەوە.

٦-(التَعديَة): پێویستبوونی فرمانی تێپەڕ بە تەواوکەرێك کە کارلێکراوە.

(«ذَهَبــتُ بــِهِ الى البَيــتِ»): بردمــەوە بۆماڵەوە.

٧-(القَسَمْ): (بە) بۆ سوێند.

(«بالله») بە خودا.

٨-(اَلسَّــببية) بە (هۆکاریی): («كَفَيتُ بِزَيدٍ الأهوالَ») بە هۆی زەیدەوە گرفتاری چورتوم بووم.

٩-(التوكيد وَ هيَ الزّئدة): جەختکردن. (ب) ئەو (ب)یەیە کە لە ڕتسەدا واتای نییە.

نَحوَ: وەك: (بَحَسْبِكَ دِرهَم) درهەمێكت بەسە. (کە خۆی (حَسْــبُكَ دِرهَــمْ) وَ («فَمارَجَعتَ بِنحائِب»): بە نائومێدیی نەگەڕایتەوە وە. وَ («خَرجتُ فَإذا بِزَيدٍ فِي الطَّرِيقِ»): چوومە دەرەوەو لــە ناکاو زەیدم لە ڕێگا دی. و («فَما رَجَعتُ بِخائِب»): بە نائومێدیی نەگەڕامەوە

بـــ واتاكانى: بـــه – به هۆى- بـــۆ (وقد تأتى بمَعْنى: عَن وعلى والى): جارى وا هەيە (بِ) به واتاى (له -لەسەر-بۆ) دێت.

بأبـــا: (بأْبــأَ-هُ وَ بـــهِ): (قالَ لَـــهُ بِأبى أنتَ وأُمّـــي): پێى وت دايكـــم و باوكم به قوربانت بێت (-الوَلدُ): كورەكە وتى بابە/ كورەكە بابە بابەى كرد. (البؤْبؤ): ١-نەژادر/ رەچەڵەك ٢-ناوەندى شت ٣-بيلبيلەى چاو ٤-زانا ٥-گەورەى ناسك و رێك و پێك و دانا.

٢-(البابا (ج) بابَوات): پاپا (بابَويّ): پاپايى/ ئەو عيساييە يە كە سەر به پاپا بێت (بابَويّ): (لاتينية). گەورەى كڵێســەى كاسۆليكيەكانە كە جێنشـــينى پەتروسى پيرۆزە (بابا): (بابە (بە زمانى منداڵان كە بانگى باوكيان دەكەن.

بـــاب: ١-(بابِـــل): شـــارى بابل كە لـــە خاكى شەنعاردايە وەچەى نوح بورجى بابليان تێدا دروستكرد.

(ألبابلِيّ): ئەفسوونباز/ جادووگەر.

عُيونٌ بابلِيَّة: چاوى ئەفســووناوى. واتا زۆر جوان كە پياو گرفتار بكات.

٢-(البابوج (ج) بَوابيـج) (فارسية): پاپووج. جۆرە پێڵاوێكە.

٣-(ألبابُور (فرنسـيـة)= الباخِـــرَة): پاپۆر/ گەميە/ كەشتى كە بە هێزى هەڵم دەروات.

٤-البابُونَـج والبابُونِـج) (فارسية) (ن): گوڵە فەقــێ/ بەيبـــون. رووەكێكـــە زەرد گوڵە، بۆ پزيشكيى بەكاردێت.

بـــأت: (بَاتُولُوجيـــا) (طـــب) (يونانيـــة): بەشێكە لە زانستيى پزيشكيى باسى چۆنيەتى دياريكردنى نەخۆشى و نيشانەكانى و هۆكانى تێدا دەكرێت.

٢-(باتيســـتا): (فرنســـية): چنراوێكـــى تەنكـــى كەتانە.

بأج: (بأَجَ و بَأَج. بَأْجاً): هاواريكرد.

(البَـــأْج): ١-مەرانـــە/ باجـــى مـــەر. ٢-جۆرو شێواز.

(«النّاسُ بَـــأْجٌ واحِدٌ»): خەڵكى هەموو يەك شتن/ يەكجۆرن.

بـــاد: (البادِ زَهر) (فارســـية): لـــووى خڕو هێلكەييە لە زينـــدەوەردا، زوو وايان دەزانى كـــە دژى زەهـــرەو لـــە لەشـــدايەو گەلێـــك تايبەتمەنديان باس كردبوو كە هەڵە بوون.

٢-(البادِنجان و البادِنجان) (ن) (فارســـية): باينجان، بەرى باينجان كە لێدەنرێت.

بأر: ١-(بَأَرَ وابْتَأرَ. بَأْراً): هەڵيكەند.

(أبْأرَ-هُ): چاڵاوێكى/ بيرێكى بۆ لێدا.

(ألبِئْرُ (ج) آبَار وَأبْـــآر وبِئَار وأبْؤُر) چاڵاو/ بير. (وشەكە مێيە).

(ألبِئْر الإرْتوازِيَّة): چاڵاوێكى قووڵە، بە هۆى پاڵەپەستۆى ناو زەوييەوە ناوەكەى خۆبەخۆى خۆى دەردەپەڕێتە دەرەوە.

(البُؤْرَة): چاڵ.

٢-(بَأَر وابْتَأَرَ- الشَّيءَ بَأْراً): شتەكەی شاردەوە/ شتەكەی عەمار كرد/ لە گەنجینەی نا.
(-الخَيرَ): بە نهێنی چاكەو خێری كرد.
(ألبُؤْرَةُ والبئْرَةُ وَالبَئيرَةُ): ئازووخە.
٣-(ألبُــؤْرَةُ): ١-ئاگــردان ٢-تیشــكۆ كــە هی هاوێنەیەكی سووتێنەرە.
٤-(ألبَارامون والبَيَرمون): (یونانیة): لەلای دیانەكان ڕۆژێكی پێش جەژنیانە.
٥-(ألبَارة (ج) بارات) (تركیة): پارە، چلیەكی قرشێكی توركییە.
٦-(البَارَ قِليط): وشــەیەكی یۆنانییە لە لای دینەكان بە گیانی پیرۆز دەڵێن: كەسی سێهەم لە ســێ كەســە پیرۆزەكە. واتا: هاوار لێكراو/ پەناپێبراو/ هانابۆبراو.
٧-(ألبَــارْ نامَج والبَرنامَــج (ج) بَرامِج): ١- بەرنامە ٢-كاغەزی كۆی ژمێرمیەك ٣-پێرستی نووســینگەكان ٤-تۆماركراوێك قســەكەرەكە ناوی گێرەرەوەكانو ســەرچاوەی كتێبەكانی تێدا نووسیوە.
٨-(البــارود) (ك): مادەیەكە لــە خوییەكی تایبەتیو گۆگردو خەڵووز دروستدەكرێت بۆ گوللە دەرپەڕاندن (تركیە).
(البَــارودَةُ (ج) بَواریــد): تفەنگ/ چەكێكە گوللە یان ساچمەی پێ دەردەپەڕێنرێت.
٩-(بــارون): (فرنســیة) نازناوێكە شــا لە ئەوروپــادا بە پیــاوە هەڵكەوتووەكانی وڵاتی دەداو زەویو زاریشی بۆ خۆیان دادەنێ.
١٠-(الباریوم) (ك): كانزای باریۆم، هێماكەی (Ba)یــە تەنێكی ســادەیە. كانزایەكی ســپی زیوینیو تــەرە. خوێكانی بۆ دروســتكردنی شووشەو فیشەكە شێتە بەكاردەهێنن.
الملحق:
بــار: مەیخانــە كــە مەیــی تێدا دەفرۆشــن، مەیخۆرەكان بە پێوە یان بە دانیشتنەوە لەسەر كورسیی بەرز بەرامبەر مێزێكی بەرز دەبن.
(تناول مشــروباً في بار): لــە مەیخانەكەیدا مەیی خواردەوە.
(مقعد بار): كورسیی مەیخانە.

---

بأز: ١-(ألبَأز (ج) بئزان وبُؤُوز وأبْؤُز والبَاز والبَــازي (ج) أبْواز وبَواز وبیــزَان و بُزاة) (ح): بــاز، باڵندەیەكــی گۆشــتخۆرە، ڕاوی پێدەكەن، جۆری زۆرە.
(ألبازار (ج) بَزادِرَة) (فارسیة): بازەوان یان هەڵگری باڵندەی ڕاوكەری تر).
٢-(ألبازر): (فارســیة): بــازار. (ألبازركان (فارسیة) = ألسُوقيّ): بازركان/ كوتاڵفرۆش.
٣-(البازَهْر = البادِ زهــر: الباص): پاس بۆ گوێزانەوەی خەڵك.
بأس: (بَؤُسَ. بَأساً): ئازا، بوێرو بە توانا بوو/ جەربەزە بوو.
(بَئِــس وَبَئِس): نەبەردو بــە زەبرو زەنگ/ ئازا.

(أَلْبَأْس):١- نەبەردیی ٢-هێزو توانا.

(أَلبَأْساء): جەنگ.

٢-(بَئِسَ. بُؤْساً وبئیساً و بُؤوساً وبُؤْسى): زۆر (نەدار/ هەژارو داماو) بوو.

(بائِس (ج) بُؤس):١-نەبوو/ هەژار/ داماو. ٢-پەککەوتە.

(بِئْسَ)/: بەد. فرمانی ڕابوردووی وەستاوە بۆ خراپ دانانە/ زەمە. پێچەوانەی (نِعمَ)یە ("بئْسَ المَصیرُ مَصیرُ الأَشرار) خراپترین چارەنووس هی بەدەکانە، ئەمە لە («بِئْسَ الرَجُلُ»)وەرگیراوە کە واتا تووشی هەژاریی و داماویی و نەهامەتی بووە.

(أَبْأَسَ):تووشی نەهامەتیی و ڕۆژە ڕەش و داماویی بووە/ (-هُ):تووشی وەیی گران و نەهامەتیی و هەژاری کرد.

(تَباءَسَ):خۆی بە هەژارو داماو پیشاندا.

(إبتَأَسَ):دڵتەنگ و خەفەتبار بوو.

(«لا تَبْتَئِس بِما کانوا یَعْمَلون»):لە کارو کردەوەیان دڵگیر مەبەو گلەیی مەکە.

(أَلْبَأْس):١-ترس.

(«لابَأسَ بِهِ»): ترست لێی نەبێت/ قەیدناکات و زیانی نییە.

(«لابَأسَ عَلَیكَ»):مەترسەو ترسی نییە بۆت.

(«لابَأسَ فیهِ»):دەشێت و گیروگرفتی تێدا نییە.

(«لابَأسَ أَن تَعرِفوا»):گران نییە بیزانن، یان بێتەوە بیرتان.

(أَلبَأس:ئازار/ ژان.

(البُؤْس (ج) أَبْؤُس وَالبَأساء والبُؤْسی): ١-تەنگانەو کلۆلیی ٢-هەژاری ٣-داماویی.

(بنات بِئس): وەیی گران/ چورتوم.

(بِئْس. وبَئِسُ العَذاب):ئازار/ ئەشکەنجەی (سەخت/ تیژ).

٢-(الباسلیق): (یونانیة):ڕەگێکە لە باسکدا، پێی دەڵێن ڕەگی لەش.

باش: ١-(باش): (ترکیة) سەرۆك/ سەر.

(باش کاتب): سەرنووسەر.

(باشا):شا/ پاشا. نازناوێکی تورکییە بە ئەفسەرە گەورەکان و کارمەندە گەورەکان لە وڵاتی سەر بە عوسمانیدا دەدرا.

٢-(الباشَق) (ح):باشۆکە/ واشە. بچووکترین باڵندەی گۆشتخۆرو ڕاوکەرە.

باص: الباص:پاس کە بۆ هاتوچۆی خەڵك بەکاردێت.

---

باط: (تَباًط):١-ڕاکشاو دڵناسوودە ئێوارێ بەسەر برد ٢-دڵنیابوو.

(-عَنهُ):حەزی لێنەکرد، وازی لێهێنا/ نەیویست.

باق: (بَأَقَه وانْبَأقَ- عَلَیهِ الوَیلُ بُؤُوقاً): وەیی گران لە ناکاودا بەسەریدا دا.

(أَلباقَةُ):دەسك/ چەپك (چەپکەگوڵ).

بـــأل: ١-(بَــؤُلَ- بُؤُولَةً وبَآلَــةً): لاوازو زەرد بوو.

(بَئِل): لاوازو زەردهەڵگەراو.

٢-(البال) (ح): جــۆرە نەهەنگێكە پەرەكەی سەرپشتی نییەو، دانی نییە. لە جێی دانەكە مادەیەكــی رەقە وەك كركرەی ســەخت پێی دەڵێن "باڵین" درێژییەكەیشی ٢٥ مەتر پترە.

(ألبَالــة) (ت) (ایطالیــة): بــە عەرەبــی پێیدەڵێــن «ألإبَّالَة»: بەســتەك. كووتاڵێكی زۆری پێچراوەو شەتەكدراوە.

٣-(بالَطــو (ج) بالطــات): (هولانــدي) المِعْطَف): پاڵتۆ/ قاپووت.

٤-(البالــو) (ایطالیــة): ســەماگا یــان ئاهەنگی سەماكردن.

٥-(بالیونتولوجیــا): زانســتیی ئــەو زیندەوەرانــەی كــە بــوون بــە بــەردو لــە تاوێرەكاندا ماونەتەوەو هی ملیونەها ساڵە.

٦-(البالون ١-فرنســیة): = المِنطَــاد): باڵۆن ٢-تۆپی یاریی.

بـــأم: (ألبامیــا) (ن): بامــێ. لــە بنەچەی تۆڵەكەیــە، گوڵــی زەردە، لــە هندســتانەوە هاتــووە، بەرەكەی لینجە، لە ناوچەی دەریای سپی ناوەراستدا دەچێنرێت. دەكوڵێنرێت.

(بـــأن): ١-(البان) (ن): بێن/ تۆری نەســپ. درەختێكە گەڵا ردێژو ناوێتەیە، گوڵ سپییە شلە رۆنێكی تایبەتی لێدەگیرێت.

٢-(بانْطلون (ج) بانطلونات= سَــراویل): ١- پانتۆڵ/ شــەرواڵ جۆرە جلێكی پیاوانەیە لە كەمەرەوە بــۆ خوارەوەیە. ٢-جــۆرە جلێكی ژنانە لە كەمەرەوە تــا ئەژنۆیە. ناوەكەی لە نــاوی ئەكتەرێكی ئیتالییــەوە وەرگیراوە كە ناوی بانتلۆن بووە، لە شــانۆگەریدا لە بەری دەكرد.

بَأَهَ. بَأْهاً: پێیزانی/ هەستپێكرد.

باَه: مــا (بَأَهَ. لِلأَمْرِ أَو بالأَمرِ") بە كارەكەی نەزانی/ هەســتی بــە كارەكە نەكــرد/ بیری نەكەوتەوە.

بَأو: (ألبــاوْ باب) (ن): باوبــاب. درەختێكی مەزنە لــە ئەفەریقای هێڵكە مــەرەدا هەیە، تــیرەی قەدەكەی هەشــت مەتــرە دەبێت، لە وڵاتە گەرمەكاندا دەروێت، چێوەی قەدەكەی ٢٤ مەتر دەبێت.

بَأی: ١-بَأَي- عَلَيهِمْ. بَأْواً): شانازیی بە سەردا كردن/ فیزی بەســەردا لێدان/ خۆی بەسەردا بادان.

٢-(بايْ): وشەیەكی توركییە واتا دەوڵەمەند یان خاوەن خانووەكە، لە ناوەراســتی ئاسایدا بۆ گەورەو سەردار بەكاردێت (واتا نازناوە).

بَبَ: (ألبَبَ): چۆنیەتی/ رێگا.

بَبر: (ألبَبْر والبَبر (ج) بُبُور) (ح): بەور. جۆرە پڵنگێكــە. جــۆرە درندەیەكی هندســتانە، ژێر سكو ئەملاولای سپییە لەشی میلی رەشدارە.

ببغ: (أَلبَبَّغاء والبَبْغاء والبَبَغاء (ج) بَبْغاوات) (ح) تووتــی. باڵندەیەکە قسـە وەردەگرێت و دەیڵێتەوە (بە نێرو مێی دەوترێت).

أَلببغائِیَّـة: ئەوەیـە مـرۆڤ قسـەیەك كە تێینەگـات بــە بێئــەوەی بـیری لێبكاتەوە بیڵێتەوە.

بــت: ١-(بَتَّ وأَبَــتَّ-هُ. بَتّاً وإِبْتاتــاً): بڕی. بڕاندیەوە.

-الأمرَ: كارەكەی بەئەنجام گەیاند.

(بَتَّتَ-ه): پارچەپارچەیكرد.

(-الوَعْدَ): جەختی لەسەر بردنە سەریكرد.

(تَبَتَّتَ): پارچەپارچە بوو.

(إِنْبَتَّ): پچڕا.

(أَلبات): بڕاوە/ كۆتایی پێهێنراو.

(بَيــعُ بــات): فرۆشــتنێكی (یەكجارەكــی/ بێپاشگەزیی).

(البَتَّةَ): بڕابڕ- بڕیارێكی كۆتایی.

(بَتَّــةً وبَتاتاً) : بەیەكجارەكــی/ بێگەڕانەوەو پاشگەزبوونەوە ٢-هەرگیز/ (لا أفْعَله البتَّةَ): هەرگیــز/ بڕابــڕ ئــەوە ناكەم، ئــەو كارە ناكەم.

٢-(بَتَّ وَأَبَتَّ- الرَجُلَ. بَتّاً وأبْتاتاً): پیاوەكەی ماندوو كرد.

٢-(بَتَّــتَ-هُ): ١-خواردنــی دایــەو كەلوپەلی دایە.

(تَبَتَّتَ): خواردنەكە یان كەلوپەل و شتەكەی وەرگرت.

(أَلبَتَات (ج) أَبتَّة): ١-خۆراك/ توێشــوو). ٢-نامێر/ ٣-كەلوپەلی پێویستی ماڵ.

(«هُوَ علــى بَتــاتِ أَمرٍ»): «ئــەو خەریكی كارێكە»

٤-(أَلباتّ): لاواز/ بێهێز.

أَلبَتّ (ج) بُتُوت: بەرگێكی ئەستوور.

١-(البَتّــات والبَتّــيّ): ١-دروســتكەری بەرگــە ئەستوورەكە. ٢-فرۆشیاری بەرگە ئەستوورەكە.

(أَلْبَتِّيَّــةَ (ج) بَتَاتِــيّ): پیپێكــی گــەورەی دارین.

بتر. (بَتَرَ- هُ. بَتراً): قرتاندی.

(بَتِرَ وانْبَتَرَ) بَتَراً: قرتا/ پچڕا.

(أَبْتَرَ- هُ اللهُ): خــودا كۆڵیكرد یان كوڵیكرد/ كلك قرتاویكرد..

(أَلباتِــر والبَتَــار والبَتّــار (ج) بَواتِيــر): شمشێری (تیژی بڕەر/ بڕندە).

(الأَبْتَــر (م) بَتْراء): ١-كوڵ/ كلكبڕاو ٢-بڕاو/ قرتــاو –(مِنَ الحَيّات): ١مــاری كوڵەوەیباب یان ماری وەزنــدەدار. ٢مرۆڤی وەجاخ كوێر/ بێوەچە.

(ألأَبْتَران): كۆیلەو كەری ماڵیی یان كێویی.

(أَلبَتْراء – مِنَ الخُطَب): وتارێك كە سوپاسی خودای تێدا نەبێت.

٢-(البِتْــرُول) (لاتينيــة) = أَلنِّفط: نەوت. ڕۆنێكی كانزاییە، دەسووتێت، لە ژێرزەمینەوە

دەردەهێنرێت بۆ رووناکیی و گەرمیی و چەورکردنی مەکینە بەکاردێت.

بتع: (بَتِعَ. بَتَعاً):ملی یان جومگەکانی پتەوو بەهێز بوون.

(أبتَع (م) بَتْعاء:لەش و مل قایم و جومگە تۆکمە.

(ألأبْتَع (م) بَتْعاء (ج) بُتْع:تێکسمراو.

(«جاؤوا كُلُّهم أبتَعون»)هەموو پێکەوە هاتن بە هێزو تێکسمراو.

بتك: (بَتَكَ وَبتَّكَ- هُ بَتكاً):لەتیکرد.

(تَبَتَّك و انْبَتَك):بررا/ لەتبوو.

(البَتْكَةُ (ج) بِتَك):پارچەیەك لە شتە براوەکە یان بەشێکی/ کوتێکی.

(البَاتِك والبَتُوك):لەتکەر/ برەر: ٢شمشێر.

بتل: ١-(بَتَلَ وبَتَّلَ- الشيءَ. بَتلاً):شتەکەی لەت لەت کردو لێکی جیاکردنەوە.

(إنْبَتَلَ):پچرا- لەتبوو/ بررا.

(عَطاءٌ بَتْلٌ):بەخشینێکی بێوێنە یان بەخشینێکی براو/ وەستاو.

(ألبَتيلة والبَتلاء)(ز) بێچووڵەی دارخورما کە سەربەخۆ بژی و پێویستی بە دایکی نەبێت.

(ألمُبتِل) (ز)دار خورمایەك کە بێچووڵەکەی لێکرابێتەوەو بە تەنها سەربەخۆ بژی.

٢-(بَتَّلَ وتَبَتَّلَ):١بۆ خوداپەرستیی خۆی لە جیهان بری ٢خۆی ڕەبەن کرد.

(ألبَتول):١حەزرەتی مریەمی کچ ٢-کەسێکە کە ڕەبەن یان کچبێت.

(ألبَتيل (ج) بُتُل = ألبَتول):کەسێکە کە ڕەبەن بێت یان هەر کچ بێت.

(البُتيلَة = ألبَتُول):کچی شوونەکردوو.

(ألبُتولَة والبُتولِيَّة):ڕەبەنیی یان بە کچێنی مانەوە/ هاوسەر نەگرتن.

٣-(ألبَتيل (ج) بُتُل):(ناوەڕۆگەی/ شیوی) دامێنی دۆڵ.

(«خَضْرُ بَتيل»):(ناوقەدی/ کەمەری) باریك.

٤-(البَتُولا) (ن):تێروو. درەختێکی چرە. تەختەکەی بەنرخە، لە ڕوسیادا زۆر دەروێنرێت و مازووی لێدەگیرێت.

بث: ١-(بَثَّ وبَثَّثَ الخَبَرَ. بَثّاً) هەواڵەکەی (بڵاوکردەوە/ جاردا/ پەخشی کرد).

(بَثَّ و باثَّ وَأبَثَّ- فُلاناً الخَبَرَ):هەواڵەکەی بە فیسار کەس گەیاندو لێی ئاگادار کردەوە.

(تَباثَّ- القَومُ الأسرارَ): خوێشگەل نهێنیەکانیان بۆ یەکتر ئاشکرا کرد.

(إنْبَثَّ):بڵاوبووەوە/ پەخشبوو.

(إستَبَثَّه- الخَبَرَ):داوای لێکرد هەواڵەکەی بۆ بڵاوبکاتەوە.

٢-(بَثَّ وبَثَّثَ- الشيءَ. بَثّاً)شتەکەی جیاو بڵاوکردەوە (إنْبَثَّ): جیاجیا بووەوە/ بڵاوبووەوە.

(ألْبَثّ):پەراگەندەو بڵاو/ پەرت پەرت.

٣-(بَــثَّ و بَثَّــثَ- الغُبــارَ. بَثّــاً): تۆزەکەی وروژاندو هەستاندو.
(إنْبَــثَّ): ورووژاو هەســتاو بلاوبــووەوە/ پەرشبوو.
٤-(ألبَثّ) ١-گرانترین (پــەژارە/ خەم) ٢-بار/ رەوش.
٥-(بَثبَثَ-الخَبَرَ): هەواڵەکەی (بلاوکردەوە/ پەخشــکرد/ جــاڕدا) (الغُبــارَ): تۆزەکــەی وروژاندو هەستاند.
بثر: ١-(بَثَرَ وبَثِرَ وبَثُرَ وتَبَثَّرَ وَجْهُهُ. بَثْراً وبَثَراً وبُثُــوراً): ڕووی زیپکەی وردی دەردا/ عازەبەی دەردا.
(ألبَثْــرُ (ج) بُثُــور): زیپکــەی دەموچــاو/ عازەبە.
(بَثْرَةٌ): زیپکەیەك/ دەنکە عازەبەیەك.
(بَثِر وبَثير): دەموچاو زیپکاوی
(ألبَثْــر (ج) بُثور الواحِــدَةُ بَثيرَة): زیپکە/ عازەبە.
٢-(الباثِر) (فا): بە ئیرە/ حەسوود.
(المَبثُور): بەر ئێرە پێکەوتوو/ حەســوودیی پێبراو.
٣-(البَاثر) (فا): کانیاو/ کانی.
(ألبَثير): زۆر/ فرە.
(«کثيرٌ بَثيرٌ»): زۆر زۆر/ زۆرو زەبەندە.
(ألبَمْثور): زۆر دەوڵەمەند/ دارای قورس.
بثع: (بَثِعَ- تِ الشَّفَةُ): لێوەکە پڕ خوێن بوو سوور هەڵگەرا.
(أبْثَع (م)): لێو پڕ خوێن‌و سوور هەڵگەراو.
(بثق): ١-بَثَقَ وَبَثَّقَ- النَهْرَ (بثْقاً وتَبْثاقاً): بەســتی ڕووبارەکەی شــکاند بۆ ئەوەی ئاوی لێبڕوات.
(ألبَثْق والبِثْق (ج) بُثُوق): شوێنی شکاندنی بەستی ڕووبارەکە.
٢-(بَثَقَ و بَثَّقَ- السَّيْلُ المَوضِعَ. بَثْقاً وتَبْثاقاً): لێشاوەکە شوێنەکەی هەڵدڕیو دادڕی.
(إنْبَثَقَ- الماءُ): ئاوەکە سەری کردو دەرپەڕیو بلاوبووەوە(الكَلامُ): بێئاگایانە قسەکە لە دەم دەرپەڕی. (وعند النَصــارى: الروحُ القدس ينبَثِــقُ مِنَ ألأب ولإبن): لای دیانەکان گیانی پیرۆز لە خوداو عیساوە دەردەکەوێت.
الملحق:
(ألبَث): بلاوکردنەوە بە ڕادیۆو تەلەفزیۆن.

بجّ ١-(بَجَّ.ە. بَجّاً): شــەقی پێبرد/ قڵیشاندی (ەُ بالرمح): نێزەکەی پێدا کرد.
(إنْبَجَّ): شەقی برد/ تلیشی تێبوو/ قڵیشا.
٢-(بَجَّ- الكَلأُ الناقَةَ بَجّاً): گیاکە حوشترەکەی درانــد، واتا زۆر قەڵەوی کــردو کەلەکەکانی دەرپەڕاند. (ألأَبَجّ (م) بَجّاء): چاو مەســت/ درزی چــاو گەورە.(عَينٌ بَجّاء): چاو مەســت/ چاو گەورە گەورە.
٣-(ألبُجّ (ح): جووچکی پەلەور.
٤-(بَجْبَــجَ- الصَبِــيَّ): منداڵەکــەی لاواند/

گۆرانـــی بــۆ وتـو یــاری لەگەڵــدا کـــردو خڵافاندی.

(تَبَجبَجَ- اللَّحْمُ):گۆشتەکە نیشتە سەریەك و داکەوت.

(اَلبَجْبــاجُ):قەڵەوێکی (بە گۆشـــت/ چەوری هەڵاوساو).

(رَمْلٌ بَجْباجٌ):لمێکی زۆری کەڵەکە بوو.

بجـــح: (بَجَحَ- بِهِ):دڵی پێخـــۆش بوو/ دڵی پێکرایەوە.

(تَبَجَّحَ= تَباتَحَ):شـــانازی کـــردو بە فیزەوە خۆی هەڵکێشا.

(- فِي الغِنى):دەوڵەمەندتر بوو.

(تَباجَحَ):شانازی کردو خۆی هەڵکێشاو خۆی بەزل گرت.

(«النِّســاءُ يَتَباجَحْنَ فيمــا بَيْنَهُنَّ»):ژنان لەناو خۆیاندا بە فیزەوە خۆیان بەسەر یەکدا بادەدەن و شانازی دەکەن.

(البَجّاح):زۆر بە فیزو خۆهەڵکێش.

بجــد: (بَجَدَ وبَجَّــدَ- بِالمَكانِ. بُجــوداً):لە شوێنەکەدا نیشتەجێ بوو.

(اَلبَجْــدُ- مِــنَ النــاسِ):کۆمەڵــە خەڵکێك

(البُجْــدُ- مِــنَ الخَيــلِ):رەوە ئەســـپێك کە سەدیان پتر بن.

(بُجْــدَةُ الأَمرِ وَ بَجْدَتُه وبُجُدَتُهُ):راســـتی و دروستیی و ناواخنی کارەکە.

(«عِندَهُ بُجْدَةُ الأَمْرِ وَهُوَ ابنُ بُجْدَةِ الأَمْرِ»): لە کارەکەدا کوڵاوە، ئاگای لە هەموو حەیسەو بەیســـەیەکی هەیـــەو راســـتیەکەی دەزانێت

(أَلبِجاد (ج) بُجُد):بەرگێکی میلدار.

بجـــر: ١-(بَجِرَ- الرَجُـــلُ. بَجَـــراً)پیاوەکە ورگی لێهات هێندە ئاوو شیری خواردەوە هەر تینوێتی نەشکا.

(بَجِرٌ وأَبْجَر):ورگ لێهاتووی ئاوو شیری زۆر خواردوو تینوێتی نەشکاو.

(بَجِـــرَ- الرَجُلُ):ناوکـــی پیاوەکە دەرپەری و بنی ناوکی ئەستوور بوو.

(الباجِـــر (ج) بَجِرَة) (قـــا):ورگ لێهاتوو/ ورگ هەڵاوساو.

(أَلبُجْرَةُ (ج) بُجَر):ناووك.

٢-(تَبَجَّرَ- النَّبيذَ):زۆر ســـەری کردە ســـەر مەیخواردنەوە.

٣-(أَلبُجْـــر (ج) أَباجِـــر وأَباجِـــير والبُجْرِيّ (ج) بَجـــارِيّ)١خراپە ٢لێقەومانی ســـەخت ٣جورتوم.

(«لَقَيْـــتُ مِنهُ البَجـــارِيَّ»):بە دەســـتیەوە تووشی وەی و چوترومی سەخت بووم.

(البُجْـــرَةُ (ج) بُجَـــر): خـــەوش/ لەکـــە/ کەموکوریی.

(«ذَکَـــرَ عُجْـــرَهُ وبُجْرَهُ»):خەوشـــی دیارو نادیاری دەرخست.

(أَلبُجْرَة):روو.

بجـــس: ١-(بَجَـــسَ وبَجَّـــسَ الماءَ. بَجْســـاً):

ئاوەکەی تەقاند.

(إِنْبَجَسَ وتَبَجَّسَ الماءُ):ئاوەکە تەقیی‌و فیچقەی کردە دەرەوە.

(البَجْس والبَجيس= المُنْبَجس):ئاوی تەقیوو دەرپەریو.

(«عَينٌ بَجيس»):کانییەکی تەقیوو فرە ئاو.

(«مـاءٌ بَجيـس»):ئاوێکی زۆری لەبەر رۆیشتوو.

(«سَحائِبُ بُجَّس»)هەورێکی باراان داکردوو/ باراناوی.

(باجِس (ج) بُجَّس):هەوری باران داکردو.

٢-(بَجَسَ وبَجَّسَ- الجُرْحَ. بَجْساً)برینەکەی هەڵدڕی‌و تەقاند.

بَجع: (بَجَعَ- هُ. بَجْعاً):بە شمشێر لەتیکرد. بری.

(أَلْبَجَعَ) (ح):سەقاقوش. باڵندەیەکی دەنووك پان‌و درێژە، کیسەیەك بە بن دەنووکیەوەیە.

(أَلبَجْعَة):سەقاقوشێك.

بجل: ١-(بَجَلَ وبَجِلَ. بَجْلاً وبُجُولاً): شادمانبوو/ دڵخۆشبوو/ دڵیکرایەوە.

٢-(بَجَلَ وبَجِلَ. بِجْلاً):خۆشحاڵ‌و خۆشگوزەران بوو.

(باجل):خۆشحاڵ‌و دڵخۆش/ بارلەبار.

٣-(بَجُلَ. بَجالَةً وبُجُولاً):بەرێزو شکۆدارو پایەبەرز بوو.

(بَجيل):شکۆدار/ پایەدار/ مەزن.

(بَجَّلَ-هُ):بە گەورەیگرت/ مەزنیکرد.

٤-(أَبْجَلَ- هُ الشيءُ) شتەکەی بەس بوو/ شتەکە بەشی کرد.

(بَجْل):بەسبوون.

(«بَجْلُكَ»):بەستە/ بەشت دەکات.

٥-(بَجَلْ= نَعَم):بەڵێ.

(ألأَبْجَل (ج) أَباجِل) (ع ا):دەمارێکی ئەستوورە لە پێ یان لە دەستدایە.

بَجَم: (بَجَمَ. بَجماً وبُجُوماً)١-لە تۆقیندا یان لە بێتوانایدا زمانی بەسترا، کپ بوو/ چوو ٢-کرژو سست بوو، چاوی ئەبڵەقبوو.

(بَجَّمَ):سست بوو. ئەبڵەقبوو.

بحّ: ١-(بَحَّ: بَحّاً وبَحَحاً وَبُحُوحاً وبَحاحاً وبُحُوحَةً وَبَحاحَةً):دەنگی گر بوو (بە نەخۆشیی یان هاوارو گۆرانیی یان لە زگماکییەوە وابوو).

(أَبَحّ (م) بَحّاء وبَحَّة (ج) بُحّ):دەنگگر.

(أَبَحَّهُ و بَحَّحَهُ):دەنگی گر کرد.

(البُحَّةُ):دەنگگریی/ دەنگقەبەیی.

٢-(بَحبَحَ وتَبَحبَحَ):جێی خۆی کردەوەو پایەی خۆی بەرزکردەوەو ژیانی خۆش بوو.

(- تِ العَرَبُ في لُغاتِها):عەرەب زمانەکەی خۆی فراوانکرد.

(- تَبَحبَحَ- الدارُ):چووە ناو خانووەکەوە.

(بَحبوحَة الدار):ناوەندی خانووەکە.

(- العَيشِ): تێروتەسەلیی‌و ئاسانیی‌و

ناسوودەیی ژیان.

بحـــث: ١-(بَحُـــثَ. بُحُوثَةً): ســـاغو پوختە/ پەتیبوو.

(باحَـــتَ- هُ الـــودَّ): (خۆشەویســـتیی/ دۆستایەتی) ساغی لەگەڵدا بەست.

(البَحْت): ساغو پوختە/ پەتی.

(«شَرابُ بَحْت»): شـــەرابی ساغو ڕووت (کە هیچی تێکەڵ نەکرابێت).

(مِســـكُ بَحْت): بۆنێکی خۆشی ساغو پوختەو ڕووت.

(عَرَبِيُّ بَحْت): عەرەبێکی ڕەسەن تەواو.

(البَحْت (م) بَحْتَة): بۆ تاكو جووتو کۆ دەکرێتو دەشتوانیت، دەبێتو دەشـــکرێت، جووتو کۆیشی بکەیت.

٢-(باحَـــتَ – فُلانـــاً): دڵی خـــۆی بۆ یەکالا کردەوە. ئاگاداری کارەکەی کرد.

٣-(أَلبُحْتُر وَالبُحْتُـــرِيُّ): کورت/ کورتەبنە/ خرپن لە خوداییەوە.

بحث: ١-(بَحَثَ- فِي الأَرضِ. بَحْثاً): زەوییەکەی هەڵکۆڵیو پیایدا گەڕاو پشکنی.

("کالبَاحِثِ عَن حَتْفِهِ بِظِلْفِهِ"): وەك یەکێك بە دەستی خۆی بۆ مەرگی خۆی بگەڕێت.

(أَلبَحْث (ج) أَبحاث) (مـــص): ١-لەژێر گڵدا بۆ شت گەڕان. ٢-لە کانزاکاندا بۆ زێڕو شت گەڕان.

(أَلمَبْحَـــث (ج) مَباحِـــث): ١-بۆ شـــت گەڕانو پشکنین. ٢-پشکنگا.

(«مَباحِثُ البَقَر»): شوێنی نادیار یان بیابانی چۆڵو وشك.

٢-(بَحَثَ- هُ): خوازیاری بوو.

(- عَنهُ): بۆی گەڕا/ بۆی پشکنی.

(تَبَحَّثَ وابْتَحَثَ واسْتَنبَحثَ- عَنهُ): هەواڵی پرســـی/ بەدوایـــدا گـــەڕا/ بـــۆی ئەملاولای پشکنی.

(أَلبَحث: (ج) أَبحاث): ١-پشـــکنین ٢-گەڕان بۆ شت لەژێر خاکدا ٣-ساغکردنەوەو لێکۆڵینەوە ٤-خوازیاریی زانستو زانیاریو وێژە.

(البَحَاث): توێژەرەوە/ لێکۆڵەرەوە/ کەسێکە زۆر لێبکۆڵێتەوەو بپشکنێت.

(المَبْحَثَـــة): ١-لێکۆڵینـــەوەو گـــەڕان بە دوای زانستیو زانیاریدا ٢-ساغکردنەوە.

(البَحيث): نهێنی.

٣-(بَاحَثَـــهُ): گفتوگۆی لەگەڵـــدا کردو ڕایان گۆڕییەوەو شەرە بەڵگەی لەگەڵدا کرد.

(تَباحَثـــوا): پێکەوە گفتوگۆیـــان کردو ڕایان گۆڕییەوە.

٤-(بَحْثَرَ- الشيءَ بَحْثَرَةً): ١-شتەکەی پەرشو بڵاو کردەوە ٢-شتەکەی خستەڕوو و دەرخست ٣-جیای کردەوە.

(تَبَحْثَـــرَ): پەرشو بڵاو بووەوەو کەوتەڕوو/ جیابووەوە.

الملحق:

(بحث): البَحَّاثَة): زانایەك کە هەر خەریکی

لێکۆڵینـــەوەو وردبوونەوەو دۆزینەوە بێت لە بواری زانستو زانیاریدا.

بحر: ١-بَحِرَ. بَحَراً: حەپەساو/ سەرسامبوو/ لە ترساندا زەندەقی چوو.

(اَلبَاحِر: سەرسامو ئەبلەقبووی ترس.

٢-(بَحِرَ. بَحَراً): زۆر تینـــوی بوو تینوێتیی نەدەشکا.

(بَحِرٌ): کەسێکە زۆر تینوی بێتو تینوێتیی نەشکێت.

٣-(بَحَـــرَ- الأَرضَ. بَحْـــراً): زەویەکـــەی هەڵدری.

(-النَاقَـــةَ): گوێـــی مێحوشـــترەکەی لە باری درێژیی هەڵدری.

(النَاقَةُ البَحِيرَةُ (ج) بَحَائِروبُحُر): مێحوشترى گوێ هەڵدراو.

٤-(أَبْحَرَ- المَاءُ): ئاوەکە سوێر بوو.

(- الرَجُــلُ المَــاءَ): پیاوەکە ئاوەکەی ســوێر چەشت/ بە سوێری زانی

(- تِ الأَرْضُ): لــە زەویەکــەدا ئاوێکــی زۆر کۆبووەوەو کەڵکێکی زۆری بەخشی.

(اَلبَحْـــر (ج) أَبْحُر وبُحُور وَبِحار): ١-ســوێراو ٢-دەریا.

أُبَيحِر: ١-سوێراوگە ٢-دەریاچە.

٥-(أَبْحَرَ): ســواری دەریا بوو/ بە دەریادا گوزاری کرد.

(تَبَحَّرَ- فِي العِلْمِ): لە زانستدا قووڵ بووەوە/ زۆری خوێند.

(- فِي المالِ): خۆی زۆر دەوڵەمەند کرد/ زۆر دارا بوو.

(إِســـتَبْحَرَ- فِي العِلمِ أَو المالِ): لە زانستدا یان ساماندا دەست باڵاو بەربڵاو بوو.

(- الشَـــاعِرُ أَو الخَطِيـــبُ): هۆزانڤانەکەیان وتاربێژەکە زمانپاراوو بەدەسەڵات بوو.

(اَلبَحْر (ج) أَبْحُر وبُحُور و بِحار): دەریا.

أُبَيْحِر: دەریاچە.

بحر: (البَحرِيَّة): هێزی دەریایی کیشوەر کە سەربازو پاپۆری جەنگو ژێردەریاییو فڕۆکە هەڵگرو شتی تری سەربازییە.

(وزارة البحرية): وەزارەتی دەریایی.

(بَحرِيَّة تجارِيَّـــة): گەلە گەمیـــی بازرگانی (کۆمەڵـــە پاپۆرێکە بـــە پاپۆڕەوانەکانیەوە/ دەریاوانەکانیـــەوە. کـــە کەلوپـــولو گـــوزار کاروانەکان دەگوێزنەوە.

(اَلْبَحْرُ المحِيط): ١-ئۆقیانووس/ شـــادەریاکان کـــە دەوری کیشـــوەرەکانیان داوە. ٢-هەمـــوو رووبارێکی مەزن وەك نیل.

(اَلبَحْـــر (ج) بُحُـــور مِـــنَ المَجـــاز): پیـــاوی بەخشـــندەی زۆر میهرەبـــان/ خێرخواز (بۆ خوازەوای پێدەڵێن).

(البَحريّ): دەریایی.

(البَحّار): دەریاوان (ج) بَحّارَة

اَلبَحْرَةُ (ج) بِحَـــار وَبُحْر): ١-زەلکاوو گۆماو.

٢-نەستێل/ ناوێکی زۆری کۆومبوو.
(ألبُحَيْرَة) دەریاچە.
٦-(البَحـــر (ج) بُحُـــور (في اصطـــلاح العروضيين): کێشی شیعر/ کێشی هەڵبەست. هۆزان.
(البُحْرَةُ (ج) بِحَار وبُحْر):١-نزمە ولاتو شار ٢-باخێکی زۆر فراوان.
(ألباحِر)١-گەوج و دەبەنگ. ٢-خۆتێهەڵقورتێن. لاپرەسەنگ.
(ألباحـــور والباحـــوراء): قرچـــەی گەرمای مانگی گەلاوێژ/ مانگی میوەگەنان.
(ألبُحْـــران): ١-لێکۆڕینی نەخۆشـــیی خراپ. (نەخۆشـــییەکە لێـــی گۆریـــوە). ٢-(طـــب): ورێنەکردنو تێکچوون، بێئاگایی نەخۆش لە سەختیی نەخۆشیەکەی.
(ألبَحْرَين): ولاتی بەحرەین.
(بَحْرانيّ): خەڵکی بەحرەین.
(دَوار البَحر): سەرەگێژەی ناودەریا.
الملحق:
بحر: (ألبَحريَّة): هێـــزی دەریایی دەوڵەتێك کە پیاوانـــی جەنگـــاوەرو پاپـــۆڕی جەنگو ژێردەریـــاو فڕۆکە هەڵگرو گەلێك شـــتی تر دەگرێتەوە.

---

بخ: ١-(بَخَّ- في النَّوم).
بَخّاً:١:لە نوستندا پرخە پرخی کرد/ پرخەی هـــات ٢-رقەکـــەی دامـــردەوە/ تووڕەییەکەی نیشتەوە.
(بَـــخْ): (ناوی کرداره). بۆ لاســـەیربوونو بۆ لاباش بوون یان بۆ هەڵنانو شانازیی.
ئیف ٢-ئافەرین ٣بەه بەه کە باشە.
(بَخٍ بَخٍ): ئیف ئیف/ بەه بەه/ هەی ئافەرین هەی دەست خۆش/ ئای کە باشە.
٢- (بَخبَـــخَ- في النَّوم): لـــە خەوتندا پرخە پرخیکرد/ پرخەیهات
(البُعـــيْرُ): حوشـــترەکە وروژاو بۆرانـــدی لە دەمیەوە شتێکی دەرهێنا کە وەك سی وابوو.
(بَخبَخَ- الرَّجُلَ): ئافەرینی پیاوەکەیکرد.
(تَبَخْبَخَ- الحَرُّ): گەرماکە نیشتەوە/ هێواش بووەوە.
بخـــت: ١(بَخَـــتَ- هُ. بَخْتاً): لێیـــدا/ پیایدا کێشا.
بُخِتَ- الرَّجُـــلُ: (زراوی چـــوو/ تۆقی/ زۆر ترسا.
(بَخَّتَه): پیادا هەڵشاخاو شکاندی.
(البَخت (فارسية): بەخت/ شانس.
(ألبَخيـــت وَالمَبْخُوت): بەختدار. شانســـدار/ بەشانس.
٢-(بَخْتَرَ وتَبَخْتَرَ. بَخْتَرَةَ):١-باش رۆیشـــت ٢-بە گەنجەفەو فیزو خۆبادانەوە رۆیشت.
(ألبختِير):١-شۆخو شەنگ. ٢-بە کەشو فشو لەخۆبایی/ بەدەعیەو فیز.
(ألبَخْتَرِيَّـــة والتَّبَخْتَرِيَّـــة): بـــە فیـــزو بە

خۆنازینەوە ڕۆیشتن.
(«فُلانٌ يَمشــي البَختَرِيَّة»):فیسارکەس بە فیزو بەخۆنازین‌و خۆبادانەوە دەڕوات.
بخــر: ١-(بَخِــرَ- الفَمُ. بَخَــراً):دەمەکە بۆ گەنیکرد/ بۆگەنبوو.
(فَمٌ أَبْخَر):دەمی بۆگەن.
٢-(بَخَــرَ-ت القِدرُ). (بَخــراً):مەنجەڵەکە هەڵمیی کرد. هەڵمی لێهەستا.
(بَخَّرَ):هەڵمی کرد، هەڵمی هەستاند.
(تَبَخَّرَ الماءُ):ئاوەکە بوو بە هەڵم.
(اَلبُخــار (ج) أَبْخِرَة):هەڵــم/ ئەوەی کە لە شــلەی گەرمکراوەوە بە شــێوەی گــاز بەرز دەبێتەوە).
(اَلباخِرَة):پاپۆڕی هەڵمی.
٣-(بَخَّــرَ-هُ وَعَلَيــهِ):دووکەڵــی بوغــوردی بەســەرداکرد- بە بوغــوردو داری عوود بۆنی خۆشیدا.
(تَبَخَّــرَ):دووکەڵی بوغوردی بەردایە خۆی/ بە بۆنی خۆشــی بوغــوردو داری عوود خۆی بۆنخۆش کرد.
(اَلبَخُــور (ج) أَبْخِرَة وَ بَخُــورات):بوغورد کە مادەیەکــی کەتیرەییــە کە ســووتێنرا بۆنێکی خۆش دەداتەوە.
(بَخُّور مريــم وبَخّور الأَكــراد وبخور البَرِّ وبُخُور السُّودان وبخور البَرْبَر) (ن)ئەمانە هەموویــان گیای تەمەنــدارن گەڵاکانی وەك

چەپکێــك لــە زەویــدا کۆدەبنەوە، لاســکی درێــژو خواریــان لێــوە دەردەچێــت، گــوڵ لــە تەنیشــتەکانیەوە دەگرێت، بــۆ جوانیی دەروێنرێت.
(المِبْخَرَة):بۆغورددان.
الملحق:
بخر: (التَّبخير):بەهەڵمکردن.
(تَبْخيرُ الماءِ):بە هەڵمکردنی ئاو.
(اَلتَدخــين بالبُخُور):بوغورد. ســوتاندن‌و بڵاوکردنــەوەی بۆنی خۆش بە ســووتاندنی بوغوردو داری عود.
(اَلتَبخير):ڕێگەیەکەیان کردەیەکە بۆ گۆڕینی شتی شل بە هەڵم‌و بە کوڵاندن.
(اَلتَبَخُّــر):١-کردنی بوغورد بە دووکەڵ ٢-بە ســوتاندنی بوغوردو داری عــود بۆنی خۆش بڵاوکردنەوە. ٣-گۆڕینی شلەمەنی بە هەڵم بە گەرمکردنێکی هێواش نەگاتە پلەی کوڵاندن.

---

بخز: (بَخَزَ- عَينَهُ. بَخْزاً):چاوی دەرپۆقاند/ دەرهێنا.
بَخــس: ١-(بَخَسَ-هُ بَخْســاً):١-کەمبایەخی کرد ٢-کەمیکرد.
(«لاتَبْخَــس أَخــاكَ حَقَّهُ»):مــافی براکەت کەم مەکەرەوە. ٢-زۆرداریــی بەرامبەر کرد/ ستەمی لێکرد.
(تَباخَسَ القَومُ):١-خوێشــگەل مافی یەکتریان خوارد ٢-زۆریــان لە یەکتری کرد ٣-لە کڕین‌و

فرۆشتندا فێڵو دەغەڵییان لەگەڵ یەك كرد.
(اَلْبَخْس) (مص): ١-كەمكردوو ٢-هەرزان
(«شَرُوهُ بِثَمَنٍ بَخس») : بەنرخێكی هەرزان كرییان/ بەنرخێكی وەك بەلاش كرییان.
٢-(بَخَسَ- عَيْنَهُ): چاوی دەرهێنا.
٣-(البَخــس): زەویی دێـــم/ دێمەرۆك كە بە باراناو رووەك تیایدا دەروێت.
(البَخسِيّ- مِنَ الزرع)/ (ز): كشتوكاڵی دێم.
(ألأياخِس (ع ا): پەنجەكانو بنی پەنجەكانو دەمارەكانی.
بخش: ١-(بَخَشَ- الشَّيءَ. بَخشاً): (عاميه): شتەكەی كونكرد.
(ألبُخش) (عامِيه): كون.
٢-(بَخشَشَ) (عاميه): بەخشی.
(البَخشــيش) (فارسية): بەخشیش- خەڵات- بەرتیل (عامية ).
بخص: (بَخَــصَ- عَينَــهُ. بَخْصــاً): چاوی دەرهێنا.
(- الرَّجُلُ): لە ســەروو چاویـــەوە یان لەژێر چاویدا گوشـــتێكی دیارو دەرپەڕیو پەیدابوو یان هەبوو.
(أبخَص (م) بَخصَاء (ج) بُخص): كەسێكە كە زیادە گوشـــتێكی دەرپەڕیو لەژێر چاویدا یان لە سەروو چاویەوە پەیدابوو بێت.
(تَبَخَّصَ): ١-چاوی تێبڕیو لێینەترووكاند ٢-پێڵووی هەڵگەڕایەوە.

(البَخــص): ١-گۆشـــتێكە لەژێـــر پێڵـــووی خوارەوەدا دەردەكەوێت كــە تیژ چاو ببڕێتە شـــتێكو بە لایەوە شـــتێكی بـــاش یان خراپ بێتو سەیربێت.
بَخصَة: ١-دانەیەكی ئەو گۆشـــتەیە ٢-گۆشتی پێ ٣- (اع) گۆشتی بنی پەنجەكانی دەست.
(مَبْخُو. ص القَدَمين): پێ كە گۆشـــتی كەم بێت.
بخع: (بَخَعَ- نَفسَــهُ. بَخْعاً): خۆی پەرێشان كــردو بــە خەفــەتو داخ یــان بــە قــینو دەمارگیریی خەریك بوو خۆی بفەوتێنێت.
(- الأرضَ بالزِّراعَةِ): زەویەكەی بە كشتوكاڵ پەككخست، پشوی نەدا تا ساڵێكیش.
(- بِالشّــاة): مەڕەكــەی ســەربڕی، ملــی لێكردەوە.
(- لَــهُ نُصْحَــهُ): ئەوپــەڕی ئامۆژگاریــی دۆستانەو دڵسۆزانەیكرد.
(- هُ): (عامية): دەستی بە روویەوە ناو ڕ.وی شكاند یان تەریقیكردەوە.
(بَخِعَ- بِالحَــقِّ. بُخُوعاً وبَخاعَــةً): پێی لە مافەكە، لە ڕاستییەكە ناو ملی بۆ شۆڕ كرد.
(بَخَّــعَ- هُ): (عاميــة): تــەرزە شــكێنێك/ سەرزەنشتێكی زۆریكرد.
بخق: (بَخَقَ وأبْخَقَ- عَيْنَهُ. بَخْقاً): ١-چاوێكی كوێركرد ٢-چاوی دەرهێنا.
(رَجُــلُ أبْخَق وباخِق وبَخيــق. ومَبْخُوق):

پیاوی یەکچاو: چاوێکی کوێر بێت/ تاکچاوبێت.

(عَينُ بَخقاء وباخِقَة وبَخيق وبَخيقة ومَبخُوق):چاوێکی دەرهاتوو کوێر بوو/ تاکچاویی.

(بَخِقَت- عَينُهُ. بَخَقاً)نچاوی تەواوو ناشیرین کوێر بوو.

بخل: (بَخِلَ وبَخُلَ. بَخَلاً وبُخْلاً)نچرووکبوو/ ڕژدبوو/ پیسکەبوو.

(بَخيل (ج) بُخَلاء):ڕژد/ چرووک/ ڕەزیل/ پیسکە.

(بَخِلَ وبَخُلَ- عليه وعَنهُ):چرووکیی دەرباره کرد، شتەکەی لێوەشاندو نەیدایه.

(باخِل (ج) بُخّل): ڕژد/ دەسقوچاو/ شتوەشین.

(بَخّلَهُ):به چرووکی دانا/ به ڕژدی زانی.

(أبْخَلَ- هُ):به ڕەزیلو چرووکی هاته بەرچاو.

اَلبُخْل والبُخُل والبَخَل والبَخْل والبُخُول): چرووکیی/ ڕژدیی/ ڕەزیلی/ بەرچاو تەنگیی.

(البَخَال والبَخّال والمُبَخّل والبَخَل):زۆر (چرووک/ ڕژد).

(المَبخَلَة):(هۆکار/ مایە)ی چرووکیی.

(«الوَلَدُ مَبخَلَةٌ مَبْجَبَنَةٌ»):منداڵ مایەی ڕژدیی و زۆر ترسنۆکییه.

بَدّ: ١-(بَدَّ- رِجليهِ. بَدّاً):هەردوو قاچی بلاوکردەوه.

(- الرَجُلَ عَنِ الشيء):پیاوەکەی له شتەکه دورخستەوەو نەیهێشت دەستی بیگاتێ.

(بَدَّ. بَدَداً):له بەر قەڵەویی ڕانەکانی له یەك دوورکەوتنەوه.

بَدَّدَ- الشيءَ):شتەکەی پەرش و بلاوکردەوه.

تَبَدَّدَ:بلاوبووەوه.

(أباديد تَباديد = تَبَدَّدوا)پەرش و بلاو بوونەوه.

(«ذَهَبُوا أباديدَ تَباديدَ»):هەریەکه به لایەکدا پەراگندەو پەرش و بلاو بوونەوه.

(«طِيْرُ أباديدُ وتَباديدُ»):باڵندەی نەملاولاو پەراگەندە.

(الأبَد (م) بَدّاء):١-کەسێکه دەستی یان ڕانی له ڕێکی یەك نەبن و له یەك دوور بن. ٢- چەتەوڵێك چوارپەلی بلاوبن.

٢-(بَدَّدَ الرَجُلُ):پیاوەکه ماندوو بوو.

٣-(بادَّ- القَومُ في السَفَرِ):خوێشگەل له گوزارەکەدا پێکەوه بۆ بژێوییان کۆمەکییان کرد.

(أبَدَّ-الشيءَ بَيْنَهُم):شتەکەی لێ بەشکردن و هەریەکه بەشی خۆی دانێ.

(تَبَدَّدَ- القَومُ- الشيءَ):خوێشگەل شتەکەیان لەناو خۆیاندا بەش بەشکرد.

(اَلبُدُّ وَالبُدَّةُ والبُدادُ):بەش/ بەرکەوت.

٤-(بادَّ- هُ مُبَادَّةً وبِداداً): بە گۆڕینەوە شتی پێفرۆشت.

أَلبُدُّ: برریتی/ قەرمبوو.

٥-(أَبَدَّ- يَدَهُ): دەستی خۆی بۆ زەوی درێژکرد.

٦-(تَبادَّ- القَومُ): ١-خوێشگەل شەرە شیریانکردو هەریەکە هاوکووفی بۆ خۆی هەڵبژارد. ٢-دوو دوو رۆیشتن و هەریەکە هاوکووفی خۆی هەڵبژاردبوو.

(أَلبِدّ والبَدِيد): هاوچوون. هاوتا/ هاووێنە/ هاوکووف.

(«هذا (بِدُّهُ وبَدِيدُهُ»): ئەمە وەك ئەوەو هاوتای ئەوە/ لە وێنەی ئەوە/ هاوکووفیەتی.

أَلبَداد: ١-بەرەنگاربوونی دوژمن. جەنگ شەرەشمشێر ٢-هاوکووف.

لَقُو بَدادَهُم: بە هاوکوفەکانی خۆیان گەیشتن.

(«بَدادِ أو بَدادِ بَدادِ»): با هەر پیاوەی هاوکوفی خۆی هەڵبژێرێت.

(«جاءَتِ الخَيْلُ بَدادِ»): ئەسپسوارەکان (تاکە تاکە/ بە جیاجیا) هاتن.

٧-(إبتَدَّ- الرَجُلانِ فُلاناً بِالضَّرب): دوو پیاوەکە لە هەردوو لاوە کەوتنە لێدانی فیسار.

٨-(إستَبَدَّ- بِكَذا): بە زۆرو بە تەنها چنگی بۆ خۆی بە شتەکەدا گرت.

(- الأَمرُ بِفُلان): جڵەوی کارەکەی لە دەست دەرچوو و دەرفەتی نەهات.

(المُستَبِدّ) ١- کەسێکە کە کارێکی گرتە دەست وازی لێنەهێنێت تا تەواوی نەکات ٢-زۆردار ٣-چنگ لێگیرکەر/ بە چنگ.

٩-(البَدَد والبِدَّة): ١-وزە ٢-پێداویستی.

(البُدُّ): ١-چارەرێ/ چارەهەڵاتن. ٢-دەرفەت.

«لابُدَّ مِن هذا»: چارەرێ هەر ئەوەیە. هەر دەبێت ئەوە بێت/ چار هەر ئەوەیە.

بدأ: ١- (بَدَأَ وابْتَدَأَ أوتَبَدَّأَ الشيءَ وَبِهِ. بَدْأً): پێشەکیی دەستی بەو شتە کرد. کردنی شتەکەی پێشخستن.

(- بِفُلان): ١- لە فیسارەوە دەستی پێکرد/ ئەوی پێشخست.

(- الشيءَ): شتەکەی سازدا/ شتەکەی دروستکرد.

بَدَّأَهُ: ١-وای لێکرد دەست پێبکات. ٢-پێشیخستو لە هیتری بە باشتر دانا.

(أَلبَدء (ج) أَبْداء وبُدُوء والبَدْأَةُ والبَداءَةُ والبَديئَة): ١-سەرەتا ٢-یەکەمین ٣-سەرەتای پەیدابوون.

(أَفْعَلُهُ بَدْأً وبَدْءَ بَدءٍ وأَوَّلَ بَدْءٍ وبادِئَ بَدْءٍ وبَدْأَةَ ذي بَدْءٍ): لە پێش هەموو شتێکدا دەست بەوە دەکەم.

(أَلبَدْأَةُ): دەستپێکردنی گوزارەکە بۆ شوێنێك.

(«إكتَرَيتُ الفَرَسَ لِلبَدأةِ والرَّجْعَةِ»): ئەسپەکەم بۆ هەردوو سەری گوزارەکە بەکرێگرت بۆ رۆیشتن‌و هاتنەوە.

(أَلمَبْدَأ (ج) مَبادِيء): ١-سەرچاوە ٢-هۆ/ بنەما ٣-بنەرەت ٤-رێبیر.

(المُبْتَدَأ): ١-پاڵدراو ٢-سەرەتا ٣-یەکەمین.

(اللهُ باريءُ العالم) اللهُ: سەرەتای رستەکەیەو بەوە دەست بە رستەکە کراوەو (الله) پاڵدراوە.

(ألإبتِدائيّ): سەرەتایی.

(«المَحْكَمَة الإبتِدائِيَّة»): دادگای سەرەتایی کە تەماشای کێشە شارستانییەکان یان تاوانە بچووکەکان دەکات کە هی دادگاکانیتر نییە.

(«التَّعليمُ الإبتِدائي»): خوێندنی سەرەتایی.

(«الشهادة الإبْتِدائية»): بڕوانامەی خوێندنی سەرەتایی.

٢-(بَدَأَ وأَبْدَأَ اللهُ الخَلْقَ): لە نەبوو خودا بوونەوەری هێنایە دی.

(بادِيء ومُبْدِيء): دروستکەرو دەستپێشخەرو بەدیهێنی هەموو شتێکە.

٣-(أَبْدَأَ – الرَّجُلُ): پیاوەکەو شتی جوان‌و ناوێزەی داهێنا کە کەس نەیکردبێت.

(«فُلانٌ ما يُبدِيءُ ومايُعيد»): فیسار نە بە خراپەو نە بە چاکە نادوێت.

الملحق:

بدأ: (البدائِيّ): ١-سەرەتایی ٢-کارسروشتیی.

(عادات بدائِيَّة): نەریتی دواکەوتووانەو سەرەتایی مرۆڤ.

(مُجْتَمَعٌ بدائِي): کۆمەڵگایەکی سەرەتایی‌و دواکەوتوو.

(البدائِيَّة): ١-قۆناغی یەکەمی کارسروشتیی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤ ٢-نیشانەو خەسڵەتی مرۆڤ‌و کۆمەڵگا لەو قۆناغە سەرەتاییەدا.

---

بدح: (بَدَحَ- هُ بالعَصا. بَدْحاً): بە داردەستەکە لێیدا.

(بَدَحَ- بالسِرِّ): نهێنیەکەی (درکاند/ ئاشکرا کرد).

(تَبادَحوا- بالشيءِ): شتیان گرتەیەك.

ألبَدْح (ج) بُدوح وَبداح والبَداح (ج) بُدُح والبُدْحَة: زەوییەکی بەرفراوان.

بدخ: (بَدَخ) وبَدُخ. بَدَخاً وبَداخَةً): پایەمەزن‌و گرنگ بوو.

(بَديخ (ج) بُدَخاء): کەسێکی پایەمەزن‌و بەرز و گرنگ.

(تَبَدَّخَ- عَلَيهِ): گەورەیی خۆی بەسەردانواند.

بدر: ١-(بَدَرَ- الى الشيءِ بُدُوراً): دەستپێشکەری شتەکەیکردو پەلەیکرد.

(- هُ إلى الشيءِ): پێش ئەو شتەکەی ئەنجامدا/ پێشدەستیی کرد.

(بادَرَ- الى الشيءِ مُبادَرَةً وبِداراً): زوو بۆ شتەکە چوو، پەلەی تێدا کرد.

(- الشيءَ): زووتر (شتەكەى ئەنجامدا/ بۆى چوو/ دەستپێشكەريكرد).

(- فُلاناً الشيءَ وإليهِ): بۆ شتەكە پێش فيسار كەوت/ زووترو پێش ئەو گەيشتە شتەكە.

(تَبادَرَ- القَومُ): خوێشـگەل تاوياندايە خۆ/ پەلەيانكرد.

(إبْتَدَرَ- القَومُ أمراً): خوێشـگەل پێشـبركێى گەيشتنى ئەو كارەيان بوو كێيان زوو بيگاتێ.

(بَدار): خێراكە/ گورجبە/ پەلەبكە.

(ألبادِر (ج) بَوادِر): پێشكەوتوو و پەلەكەر/ زوو دەستپێكەر.

(ألبادِرَةُ (ج) بَوادِر):١-سـەرەتاى دەركەوتنى توندوتيژيى. ٢-ئەوەى كە لە كاتى تووڕەبووندا لـە مـرۆڤ دەردەكـەوێ ٣-تووڕەبوونێكـى كوتووپڕ.

(«بدرت منه بـوادر الغَضَب»): نيشـانەى تووڕەبوونى لێدەركەوت.

(ألبَدَرى): پێشبركێ.

(المُبـادَرَة) (مـص): دەستپێشـخەريى لـە پێشنيازێكدا يان پێشدەستى لە كارێكدا.

(المُبـادَرة في الحربُ): (ا ع):زوو دەستوەشـاندن لە جەنگدا.

٢-(أبدَرَ):١-مانگى چـواردەى لێهەڵهات. ٢-لە شەوى چواردەى مانگدا ڕۆيشت.

(ألبَـدر (ج) بُـدُور):مانگـى پـڕ/ مانگـى چواردە.

(ليلة البَدْر):شەوى چواردەى مانگ.

٣-(البَـدْرَةُ (ج) بِـدَر وبُـدور):١-دە هەزار درهەم ٢-( مِن المال):سامانێكى يان داراييەكى بێشومار.

(«فُـلان يَهَـبُ البُـدورَ»): فيسـار ماڵێكى بێشـومار دەبەخشـێت يان دە هەزار درهەم دەبەخشـێت. ٣-ئـەو توورەكەيـەى ئەو پارە زۆرەى تێدەكرێت دەيبەخشێت.

ألبَدْرِيّ:بارانى پەلە. پايزە باران.

(«جِئتُ بَدْري») (عامية):زوو هاتم.

(ألبَادِرَةُ (ج) بَوادِر):سەرى تير.

(«أصابَتْهُ بادِرةُ السَّـهم»):سـەرى تيرەكەى بەركەوت. ٢-(ا ع): گۆشـتى نێوان سەرشان و مل.

(ألبَيدَر (ج) بَيادِر):(ز) خەرمان: جۆخين.

بدع: ١(بَدَعَ- الشيءَ. بَدْعاً):شتەكەى داهێنا كـە لەوەپێـش نەبـووە (- ه):يەكەم كەس دايمەزراندو دەستى پێكرد/ دايهێنا.

(بَدُعَ. بَدْعاً وبَداعَةً وبُداعاً)شتێكى ناوێزە/ بێوێنەو تازە بوو.

(أبْدَعَ وابتَدَعَ- الشـيءَ):١-شـتەكەى چاك و كارامانە ئەنجامدا ٢-شتەكەى داهێنا.

(تَبَدَّعَ):بالا داهێنەر بوو- جوان. سـازاندى و دروستيكرد.

(إستَبْدَعَ- الشيءَ):شتەكەى بە ناوێزەو ناياب دانا.

(اَلبـــدْع. (ج) اَبْـــداع وبُـــدُع): شـــتی (تازه داهێنراو/ تازه دەست).
(«فُلان بِدعٌ فِي الأمرِ»): فیســـار یەکەم کەس بوو کارەکەی کرد.
اَلبـــدْعُ (مِنَ الرِّجـــال): پیاوی ناشـــیو کەم ئاوەز/ هەڵمەتە کاسە.
(البِدْعَةُ (ج) بِدَع): تازە، داهێنراو/ تازەباو.
(اَلبَدِيعُ مَن الأســـماءِ الحُســـنى): یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خودا.
(«أللهُ بَديـــعُ السَّـــماواتِ والأرض»): خـــودا دروستکەرو داهێنەری زەوی‌و ئاسمانەکانە.
(اَلبَدِيع): ١-داهێنراو. ٢-داهێنەر.
(الإبْـــداع والإبتِـــدَاع: عِنْـــدَ الحُكَماء): لای داناکان داهێنانێکە کە لەوەپێش نەبووبێت.
٢-بَدَّعَ- هُ): بە شـــتێکی تازەباو تازە داهاتووی دانا.
(اَبْـــدَعَ وابتَدَعَ الرَّجُلُ): شـــتی تـــازەی وای داهێنا کە پێچەوانەی بڕواو ئاین بێت.
(اَلبِدْعَة (ج) بِـــدَع): بڕوایەك تازە بێت کە پێچەوانەی ڕێڕەوی ئاین بێت.
(اَلمُبتَدِعُـــون): داهێنەران: ئەوانـــەی بڕوای تازەی پێچەوانەی ئاین دادەهێنن.
٣-(اَبْدَعَ): چاك کارەکـــەی ئەنجامدا: چاك‌و نایاب دروستیکرد.
(عِلمُ البَدِيع): زانستیی جوانبێژیی.
٤-إستَبدَعَ- الشيءَ: شتەکەی سەیر لێهات. بە شـــتێ‌ی ســـەیری دانا/ بە لایەوە سەیر بوو/ بەناوێزەیدانا.
(اَلبِدع): سەیر لێهاتن/ سەیر.
«لابِدَعَ مِن ذلك»: ئەوە سەیر نییە.
٥-(اَبْدَعَ- بِهِ): بە تەنگیەوە نەهات‌و پشتیی تێکرد.
(اَلبَدِيع): ١-قەڵەو ٢-کوندەی تازە.
الملحق:
بدع: (الإبْداعِية: أو الإبتِداعِيَّة = الرومانطيقيَّة): ڕێڕەوێکـــی وێژەییە هەســـت‌و ئەندێشـــە تیایدا بەسەر ئاوەزدا باڵایەو تاکەکەسیی دەنوێنێت.
(اَلبَدِيعِيَّـــات): بـــەو هەڵبەســـتانە دەڵێن کە دەربـــارەی زانســـتیی جوانکاریـــی وێژەییە. بەناوبانگترینیان.
(بَديعِيَّة صَفيّ الدّين الحِلّي وبَديعِيَّة عائِشَة البَاعونِيَّة الدِمَشقِيَّة): و (بدِيعِيَّة ابن حُجَّة الحَمَوِيّ)

---

بـــدغ: (بَـــدِغ. بَدَغـــا): لەســـەر ســـك خۆی خشاند.
(- بالشَّـــرِّ أو بالأقـــدارِ): بـــە خراپە یان بە پیسیی لەکەدار بوو.
(بَدَغَ- الجَـــوزَ أو اللَّوزَ. بَدْغاً): گوێزەکە یان بادامەکەی شکاند.
بدل: ١- (بَدَلَ- الشـــيءَ. بَدْلاً): ١-شـــتەکەی گۆڕی ٢-شتەکەی ئاڵوگۆڕ کرد.
(اَبْـــدَلَ- الشـــيءُ مِنـــهُ): شـــتەکەی لە بری

شتەکەیتر لێومرگرت.
(بَدَّلَ- هُ): ١ـگۆڕییەوە. ٢ـگۆڕی.
(- الشـيءَ مِنهُ): شـتەکەی لە بری شتێکیتر لێومرگرت یان لە جیاتی لێومرگرت.
(- الشيءَ شَـيئاً آخَرَ): شتەکەی بە شتێکیتر گۆڕییەوە.
(«بَدَّلَ اللهُ الخَوفَ أمناً»): خودا ترسەکەی بە دڵنیابوون گۆڕیو ومرگێڕا.
(بـادلَ- هُ بِكَذا): ئەوەی بە شـتێکیتر وەك خۆی گۆڕییەوە.
(تَبَدَّلا وتُبـادُلا ثَوبَيهما): جلەکانیان لەگەڵ یەك گۆڕییەوە.
(تَبَدَّلَ): گۆڕرا/ گۆڕانی بەسەردا هات.
(- هُ بِكَذا): ئەوەی بەوەی گۆڕییەوە.
(«تَبَدَّلَـتِ الدارُ بِأُنْسِـها وَحْشـاً»): خانووە ئاواکە چۆڵ بوو.
(إسْـتَبدَلَ- هُ بِكَذا): ئەوەی بەوە گۆڕییەوە: لە بری ئەوە ئەوەی ومرگرت یان هەڵگرت.
أَلمُبادَلَة: ئاڵوگۆڕکردن.
(ألبِدْل وَالبَدَل والبَديل (ج) أبْدال وبُدَلاء): ١ـبـری/ بریتـی/ لـە جیاتی/ قەرەبـوو. ٢ـ جێنشین/ جێگر.
(ألأبْـدال)/: وەکـو دەڵێن: مرۆڤـی چاك لە جیهان نابڕێت، ئەگەر پیاوچاکێك مرد، خودا بە یەکێکیتر جێی پڕدەکاتەوە.
٢-(بَـدِلَ. بَـدَلاً): جومگـەی یـان ئێسـکی ژانیکرد/ یەشا.
(ألبَدَل): (طب): ئازاری جومگەکانو دەسـت یان ژانی ئێسقان.
(«رُبَّ بَدَلٍ شَرٌّ مِن بَدَلٍ»): لەوانەیە ئازاری فرزمندیك لە ئازاری جومگەو ئێسقان زۆرتر بێت.
٣-(ألبـدْل والبَـدَل والبَديـل (ج) أبْـدال وبَدَلاء): ١ـجوامێر ٢ـخانەدان.
رَجُلٌ بَـدلٌ وبَـدَلٌ: پیاوێکـی جوامێر یان خانەدان.
(البَدكَةُ): کۆمەڵە شـتێکی پێکەوە گونجاوەو بە یەکەوە بەکاردێن بە تایبەتی لە پۆشاکدا. وەك جلی کار.
(ألبَدَّال): خۆراکفرۆش.
ألبَقّال): (عامية): خۆراکفرۆش/ بەقاڵ.
بـدن: ١- (بَدَنَ وبَدُنَ. بَدَنـاً وبُدْناً دبُدْونَ بَدانَةً وبَداناً): قەڵەوو گۆشتن بوو/ تەنگەورە بوو.
(بـادِن (م) بادِن وبادِنَـة (ج) بُدَّن. وبَدِين (ج) بُدْن): قەڵەو/ خرت/ گۆشتن.
(ألبَدَن (ج) أبدان): بەدەن/ لەش/ جەسـتە/ تەنی مرۆڤ.
(ألبَدَنَةُ): مێحوشـتر یان مانگای دابەسـتەو قەڵەوکراو.
(ألمِبْـدان والمَبَدَّن): قەڵەوو گۆشـتنو کەتە. تێکسمراو.

٢-(بَدَّنَ): تەمەنگەورە بوو.
٣-(بَــدَّنَ- هُ): زرێیەکــی کورتــی لەبەر ئەو کرد.
ألبَدَن (ج) بُدُون): زرێی کورت.
(ألبَدَنَةُ): کراسی ژنانەی بێبزمە.
بده:١-(بَــدَهَ وَبادَهَ- الرَجُــل. بَدْهاً): بێئاگا گیریکرد/ ناکاوگیریکرد.
(بادِه (م) بادِهَة) (ج) بَوادِه) (ف): بێئاگاگیر. لەناکاودا گیر.
(البُداهَة والبَداهَة): یەکســەر/ لەناکاودا؛ لە پرێکدا/ ڕاستەوخۆ بێئاگایی. سەرەتای شت.
(البَديهَــة (ج) بَدائِــه): لەپــڕ/ لەنــاکاو/ یەکسەر/ ڕاستەوڕاست.
(المِبْــدَه): ١- نــاکاو کــردە: لەپــڕ شــتێك بکات. ٢-کەســێکە کە یەکسەر شــتێك بڵێت، بێبیرکردنــەوەو خۆئامادەکــردن بــۆ بێت/ یەکسەر بۆهاتوو.
٢-(تَبادَهــوا الشِّــعرَ أو أز الخُطــبَ): هۆزانڤانو وتاربێژەکان بە بۆهاتنی یەکسەر پێشبرکێیانکرد.
(إبْتَدَهَ الخُطبَةَ): وتارەکەی یەکسەر بۆهاتو دای.
(مُبْتَدِه ومِبدَه): یەکسەر بۆهاتوو.
بَديهاً وعلى البَديهِ): بە بۆهاتنی یەکسەریو بێ خۆئامادەکردنو وەستان.
(ألبَديهَة (ج) بَدائِه): یەکســەریی بۆهاتنو بێبیرکردنەوە.
(«أجــابُ علــى البَديهَــةِ»): یەکســەرو بێبیرکردنەوە بۆ هاتو وەڵامیدایەوە.
(«هذا مَعلــومٌ في بَدائِهِ العَقول»): ئەمە بێ بیرکردنەوە، یەکسەر تێیدەگەنو دەزانرێت.
(«لِفُلان بَدائِه في الكَلام»): فیســار کەس لە ئاخاوتنندا وتەی جوانو سەیری بۆ دێت).
(«فلانٌ ذو بَديهَة»): فیســار یەکسەر لە شت دەگات.
(ألْبَديهــيّ) ١-ڕوونو ئاشــکرا ٢-یەکســەریی ٣-بەڵگەنەویست.
ألمِبــدَه: کەســێکە بێبیرکردنــەوە. یەکســەر بۆیبێت بزانێت یان ئەنجامێك بدات.
٢-(البُداهَــة والبَداهَة): ســەرەتایی هەموو شتێك.
(«لحِقَــهُ في بَداهَــةِ جَريِه»): هــەر لەگەڵ کەوتەڕێ یەکســەر پێیگەیشــت/ ســەرەتای ڕۆیشتنەکەی بوو ئەو گرتیەوە.
(ألبَديهي): بەڵگەنەویست – ئەوەی پێویستە لە ڕووی ئاوەزەوە.
(ألبَديهيّــات- عِنْــدَ العُلَمــاء): لای زاناکان ئەوەیە ســەرەتای هەموو زانســتو زانیاریی بێت کە سەلمێنرابێتو بیرکردنەوەی نەوێت.
بــدا: ١-(بَدا. بُــدُوّاً وبَداءً وبَــدْواً وبَداءَةً): دەرکەوت/ ئاشکرابوو.
(بــادٍ (ج) بــادُون وَبَدىً وبُدّى): ئاشــکرا/ دەرکەوتوو.
(بــادَى- هُ): بــۆی ڕوونو ئاشــکرا کــرد –

دەربخست.
(- ە بِالعَـــداوَةِ): دوژمنایەتییەکەی خۆی بۆ دەربڕی‌و ئاشکرایکرد.
(أَبْدی – الأَمْرَ): کارەکەی دیارکردو دەرخست.
(تَبَدَّی): دیاربوو/ دەرکەوت/ ئاشکرابوو.
(تَبـادی – القَـومُ بِالعَـداوَةِ): خوێشـکەل دوژمنایەتییـان بـۆ یەکـتری بـە ئاشـکرا دەربڕی.
(بَداوَةُ الأَمْرِ): سەرەتای دەرکەوتنی کار.
٢- (بَدا- لَهُ فِي أَمرٍ بُدُوًّا وَبِداءً وَبَدْوًا وبَداءَةً): لە کارەکەدا بیرێکی بە مێشکدا هات.
(البَـداءَة (ج) بَـدَوات): رایـەك کـە بێت‌و دەربڕرێت.
(أَلبَدَوات): رای جیاجیا.
٣- (بَدا وَتَبَدَّی. بَداوَةً وَ بِداوَةً): ١-روویکردە بیابان ٢-بیابانشین بوو.
(بَدَوِيّ): بیابانشین.
(تَبادی): لاسایی بیابانشینی کردەوە.
(أَلبَدو): عەرەبی بیابانشـین کە کۆچەرین کە بە چەندەها خێڵ بەشدەکرێن.
(بَدَوِيّ وبَـدْوِيّ (م) بَدَوِیَّــە. وبَدْوِیَّة (ج) بَداوِيّ): بیابانشـینی خێڵەکی‌و کۆچەریی/ بیابانیی.
(أَلبادِیَةُ والبَداوَةُ (ج) بادِیات وبَوادٍ): بیابان-دەشت‌و چۆڵەوانیی/ سارا.
٤- (بادا- ە): بەرەنگاریبوو، شـەری لەگەڵدا کرد.
٥-(أَبدی فِي كَلامِهِ): زمانپیسی‌و زماندرێژیی کرد.
(«أَبْدَیتَ فِي مَنطِقِكَ»): قسـەی نارەواتکرد، لە گوفتارەکەتدا سنوورت بەزاند.
(«أَلسُلطانُ ذُو عَدَوانٍ وذو بَدَوانٍ»): سوڵتان دەستدرێژکاری سەر خەڵکەو زۆردارە.
٦-(أَلبَدوَةُ): تەنشتی دۆڵ/ کەناری دۆڵ.
(أَلبَداة (ج) بَدَوات): ١-دومەڵان ٢-خاك/ گڵ/ خۆڵ.
بـذّ: ١- (بَذَّ. بَذَذاً وبَذاذاً وبَـذاذَةً وبُذوذَةً) ١-بـاری گران‌و ناگـوزەران بـوو. ٢-قەلافەتی پەرپووت‌و رەجاڵ بوو.
(بَـذّ وبــاذّ (م) بَذّ وبَذَّة وباذّ): ١-کەسـێکی بارگـران‌و ناگـوزەران. ٢-کەسـێکی بەرگ‌و قەلافەت پەرپووت‌و رەجاڵ.
(«فُـلانٌ بَـذُّ الهَیئَـةِ»): فیسـار قەلافەت پەرپووت‌و رەجاڵە.
(«بَذُّ البَخْتِ»): بەدبەخت/ چارەرەش.
٢-(بَذَّ- ەُ): بەزاندی/ بەسەریدا زاڵ بوو.
(باذَّ- ەُ): پێشبڕکێی لەگەڵدا کردو شانازییان بەسەریەکدا کرد.
(أَلبذّ والبَذیذ): نموونە.
("رَجُلٌ فَذٌّ بَذٌّ): پیاوێکە شاپیاوو نموونەیە/ تاکە پیاوە/ ئای چ پیاوێکە!
٣-(إبتَـذَّ- مِنــهُ حَقَّــهُ): مافەکــەی خۆی

لێسەندەوە.

بذأ: ١- (بَــذَأَ وَ بَذِئَ وبَذُؤَ. بَــذاءً وبَذاءَةً): کردارو گوفتاری ناشیرینی نواندو جنێوی دا. ٢-بێئابڕوویی کرد/ بەدگۆییکرد.

(بَــذِيء): زمانپیــس‌و بەدرەفتــارو بەدگۆو داوێنپیس.

(«أرضٌ بَذِيئَــةٌ»): زەوییەکــی بێکەڵــك کە رووتەن بێت.

(أَبْذَأ): زمانپسی نواندو بێئابڕوویی کرد.

(باذَأَ- هُ): قسەی بیرعەت‌و ناشیرینیان بە یەك وت‌و رەفتاری ناشیرینیان لەگەڵ یەککرد.

البَذاءَة: دەمپســی/ قسەی سووك‌و ناشیرین‌و بیرعەت‌و بێئابڕوویی.

٢-(بَــذَأَ- الشــيءَ. بَــذْأً): رقــی لە شــتەکە بووەوە.

(بَذَأَ- الشَّخصَ و عَلى الشَّخصِ): ١-کەسەکەی سووك‌و ڕسواکرد. ٢-سووك هاتە بەرچاوی. ٣-بە خراپە ناویبردو شکاندی.

(باذَأَ- هُ): دوژمنایەتیی لەگەڵدا کرد/ شەڕیان بە یەکتری فرۆشت.

بــذح: (بَــذَحَ – هُ. بَذْحــاً): هەڵیــدڕی/ هەڵیقڵیشاند.

(- الجلدَ عَنِ العِرقِ): پێستەکەی لە دەمارەکە کردەوە/ پێستەکەی گورووو.

(تَبَذَّحَ – السَّحابُ): هەورەکە باراندی.

(ألبَذح (ج) بُذوح): قڵیش/ درز.

(«فِي رِجلِهِ بُذُوح»): پێی قڵیش قڵیشە.

أَلْبِذْح: بڕینی دەست/ بڕین لە دەستدا.

بذخ: (بَــذِخَ وبَــذَخَ وبَذُخَ وتَبَــذَّخَ. بَذَخاً وبَذْخــاً وبَذَاخَةً): ١- بەرزبــووەوە. ٢-فیزی نواند. ٣-مەزن‌و پایە بڵند بوو.

(بــاذِخ (ج) بُــواذِخ وبَذيــخ (ج) بُذَخاء): ١-پایەبڵند ٢-مەزن ٣-بەفیز/ لووتبەرز.

(«شَرَفٌ باذِخ»): خانەدانییەکی باڵا.

(«جبالٌ بَواذِخ»): شــاخانی قووچ‌و لووت لە ئاسمان.

(بــاذَخَ- هُ): شــانازییان بەســەریەکدا کرد/ خۆیان بەسەریەکدا بادا.

(ألبَذَّاخ): بە فیــزو دەعیە/ لوتبەرد/ تڕزل/ فیزن.

(بَــذْخ): تێــرو تەســەلیی‌و دەســتبڵاویی لەسەری.

(بَــذر: ١- (بَــذَرَ- الحَــبَّ) (ز): تۆومکــەی وەشاند.

(- تِ الأَرضُ): زەوییەکــە تۆومکەی دەرکردو تیایدا ڕووا.

(البَــذْر (ج) بُذُور وبِــذار) (ز): ١-تۆو/ تۆم. ٢-توخم.

(«إِنَّهُ بَــذْرُ ســوءٍ»): توخمێکی ناجســنە/ نارەسەنە.

٢-(بَذَرَ- المالَ. بَذراً): پارەکەی/ سامانەکەی تەخشــان‌و پەخشــانکردو بەفیڕۆیــدا/

دەستبلاوانە لەناویبرد.

(بَذِرَ وَتَبذارُ وتِبذارَةُ): دەستبلاو/ ماڵ بە فیڕۆدەر.

(تَبَذَّرَ وانبَذَرَ): ١-پــەرش‌و بلاوبووەوە ٢-بە فیڕۆ ڕۆیشت/ لەناوچوو.

(بَذُرَ وبَذَرَ): پەرش‌و بلاو بوو.

(«ذَهَبوا شَذَرَ بَذَر وشِذَر بِذَر»): بە هەموو لایەکدا پەرش‌و بلاو بوونەوە.

(ألبَذِر والبَيْذار والبَيْــذَرَةُ والتِبْذار): داراو ماڵ بە فیڕۆدەر/ دەستبلاوو ماڵ لەناوبەر.

٣-بَــذَرَ- العِلْمَ. بَذراً: زانســتی بلاوکردەوەو تۆوی زانستیی وەشاند.

البَذرُ والبَيْذار والبَيْذارة والتِبْذار): زۆربلێی گاڵتەباز.

(ألبَــذُور والبَذيــر (ج) بُــذُر): ١-دووزمان ٢-تێنەوەســتاوو کەســێك کــە نهێنیی خۆی نەپۆشێت.

٤-(تَبَــذَّرَ- المــاءُ): ئاوەکــە (گەڕاوەتــەوە/ بۆگەنیکردووە).

٥-(بَذرَقَ): ئێشکیگرت.

(- المالَ): داراکەی بێدەربەســانە بەختکردو لەناویبرد/ دەستبلاویی تێداکرد.

(مُبَذْرِق): ئێشکگرو پاسەوان‌و دیدەوان.

الملحق:

(ألبُذَيرَة): ئەندامــی مێینەیە لە هێلکەدانی گوڵــدا دەبێتە تــۆو پاش گرتنی تــۆوی نێر هەڵیدەپێچێت.

بذع: ١- (بَذَعَ- هُ. بَذْعاً): تۆقاندی.

(أبْذَعَ- هُ): تۆقاندی.

٢-(بَذَعَ- الإناءُ): قاپەکە دەڵاندی/ تکاندی.

(ألبَذْع): ئەو ئاوەی کە قاپەکەی تکاندوویەتی/ دەڵاندوویەتی.

(بذق: ألباذَق والبَأذِق) (فارســیه): باسووق (ئاوی ترێ دەکوڵێنرێت تا خەست دەبێتەوەو پاشان دەبێتە باسووق).

بذل: ١- (بَذَلَ- الشيءَ. بَذْلاً): شتەکەی (دا/ بەخشی).

(«بَذَلَ نَفسَــهُ دون أو عَن فلان»): خۆی بە قوربانی ئەو کەســە کرد/ خۆی لــە پێناوی ئەودا بەختکرد.

(بــاذِل وبَــذُول): ١-بەختــکار ٢-بەخشــندە ٣-بەقوربانبوو.

(مَبذُول): بەختبوو/ بەختکراو/ بەخشراو.

(بَــذَلَ جُهْــدَهُ): ئەوپــەری ڕەنجیداو خۆی ڕەتاند.

(ألبَذل): ١-بەخشین ٢-ڕەنجدان. ٣-جوامێریی.

(«رَجُــلٌ بَــذْلٌ»): پیاوێکــی جوامێــرە/ بەخشندەیە.

(ألبَذَّل وألمِبْذال): زۆر دڵفراوان‌و بەخشندە/ خۆبەخش.

٢-(بَــذَلَ وابتَــذَلَ- الثَّوبَ): کاتــی کار یان هەموو ڕۆژێك بەرگی کارکردنی لەبەرکرد.

(إبْتَذَلَ): جلی کاری لەبەرکرد.

(اَلْبِذْلَــةُ مِنَ الثِّيابِ): ئــەو بەرگەی هەموو ڕۆژێــك لەبــەر دەكرێــت. بۆ كاریــش و بۆ ماڵیش.

(اَلمِبْــذَل والمِبْذَلَــةُ (ج) مَبــاذِل): بەرگــی هەمیشەیی – جلی كۆنی دڕاو.

(«جــاءَ فُــلانٌ في مَباذِلِهِ»): فیســار بە جلە شڕەكانیەوە هات.

(مُبْتَذَل): سوواو/ زۆر بەكارهێنراو.

(«كَلامٌ مُبتَذَل»): قسەی بێسەروبەر/ قسەی هەرچیو پەرچی.

(«سَـيفٌ صَدْقُ المُبتَذَلِ»): شمشـێری تیژو بڕەر.

٣-(تَبَذَّلَ وابْتَذَلَ): شەرمو شكۆی لێهەڵگیراو لانەما.

بذم: بَذُومَ. بَذامَةً): لەسەر ڕای خۆی (سوور / هەتەر) بوو. بڕیاری لەسەردا.

(بَذِیم): خاوەن ڕاو هەڵوێست/ كارتوندگر.

(اَلبُذْم): ١-كار توندگرتن. ٢-وزەو توانا ٣-ڕای (دروست/ بەجێو چاك) ٤-مەردایەتی.

(اَلمِبذَم): مێحوشتری بەهێزو قایم.

بذا: (بَذا وأَبْذی- عَلَیهِ: بَذْواً وإبْذاءً): قسەی (سووك/ بێئابڕوانەو ناشیرینی) پێبووت.

(بَذُوَ. بَذاءً وَبَذاءَةً): قسەی بێئابڕوییكرد.

(بَــذِيٌّ (ج) أَبْذِیــاء (م) بَذِیَّة): دەمپیــس. بێئابڕوو.

(اَلبَــذاءُ): قســەی (ناشــیرین/ بیرعــەتو بێئابڕووانە.

بــرَ: ١- (بَرَّ- خالِقَهُ. بِرّاً وبَــرَرَةً وبُرُوراً): ملكەچیی پەروەردگاریكرد.

(بَرَّ- والِــدَهُ. بِرّاً ومَبَرَّةً): ١-ملكەچیی باوكی كــرد ٢-لە خۆشەویســتییەوە ڕەفتاری جوانی بەرامبەر بوو.

(بَــرٌّ (ج) أَبْرار وبــارّ (ج) بَــرَرَة): ڕەفتار (چاك و جوانو زمانشیرین) پێزانو ملكەچ.

(تَبَرَّرَ): ملكەچی خوداو دایكو باوك بوو.

(- هُ): بە گوێیكردو ملكەچیبوو.

(اَلبِــرّ (ج) بُــرُور): بە ئەمــەكو ملكەچی خوداو دایكو باوك.

(اَلبِرّ): ملكەچیی/ بەگوێكردن.

٢-(بَرَّ- فِي قَولِهِ. بَرّاً و بِرّاً و بَرارَةً و بُرُوراً): ڕاستگۆ بوو.

(- تِ الیَمینُ): سوێندەكە ڕاست خورا/ ڕاست بوو.

(أَبَرَّ- الیَمینَ): سوێندەكەی ڕاست بردە سەر.

(اَلْبَرّ): ١-ڕاستگۆ ٢-یەكێكە لە ناوە پیرۆزەكانی خودا.

(اَلبِرّ): ١-ڕاستگۆیی ٢-چاكیی.

(اَلبَــرُّ والبارُّ (ج) أَبْرار و بــرَرَة): ١-مرۆڤی چاك ٢-خێرەوەمەنــد/ خێرخواز ٣-گوێدێر ٤-زۆر بەخشندە ٥-ڕاستگۆ.

(أَبَرّ): چاكترین ١-ڕاستگۆترین ٣-بە ئەمەكترین ٤-خێرخوازترین.

(«أَصْلَحُ العُــرُبِ أَبَرُّهُــم»): زمانپاراوترین عــەرەب ئەوەیە کە لــە دوورتریــن بیاباندا بێت.

(اَلْمَبْــرُور- مِنَ الأفعال): کاری پیرۆز/ (کاری پوختو دروستو پاكو بێمەراییو خەوشو درۆ).

٣-(بَــرَّ – اللهُ الصَّــلاةَ): خــودا نوێژەکــەی وەرگرتو دروست بوو.

( - تِ الصَّلاةُ): نوێژەکە دروست بوو/ خودا وەریگرت.

(أَبَــرَّ- اللهُ حُجَّتَــهُ): خــودا بیانووەکــەی لێوەرگرت.

٤-(بَــرَّ. بِرًّا): خێــرو چاکەکــەی فراوانترو پترکرد.

(بــارَّ- هُ): ١-چاکەی لەگەڵدا کرد ٢-دەســتی سۆزی بەسەردا هێناو لاواندی.

(بَــرَّرَ- هُ): ١-بە چاکی دانــا/ بەخێرخوازی لە قەڵەمدا ٢-چاکیکردو خســتیە ســەر رێی راست.

(تَبَرَّرَ): ١-ویســتی پیاوچاکیی خۆی بنوێنێت ٢-بوو بە پیاوچاك.

(تَبارَّ- القَومُ): خوێشــگەل (چاکە/ فەریان) بەرامبەر یەککرد.

(ألبِرّ): ١-چاکە ٢-بەخشین ٣-سۆزو بەزەیی.

(ألبُرّى): قسەی باش خێرو چاکەیە.

(اَلْمَبَــرَّةُ (ج) مَبَارُ وَمَبَرَّات): ١-بەخشــین ٢-مایەی فەرو چاکە.

٥-(أَبَرَّ- عَلَيهِ): شکستی پێهێناو بەسەریدا زاڵ بوو.

٦-(أَبَرَّ): بە وشکانیدا گوزاریکرد/ سەفەریکرد.

(إبتَرَّ): خۆی لــە هاورێکانی پچڕیو تەریك بوو/ گۆشەگیر بوو.

(ألبَرّ (ج) بُرُور): ١-وشکانی ٢-دەرەوەی ماڵ.

(«جَلَســتُ بَــرًّا»): لــە دەرەوەی ماڵــەوە دانیشتم.

(«خَرَجَ بَرًّا»): چووە دەشتو دەر.

(«أُرِيدُ جَــوًّا و يُرِيــدُ بَرًّا»): مــن نهێنیم گەرەکە ئەو ئاشکرای دەوێت.

(ألبَرِّيُّ): ١-وشــکانی (پێچەوانــەی دەریایی) ٢-(ح): کێویی یان دەشــتەکی (بۆ زیندەوەر) پێچەوانەی زیندەوەری ماڵییە.

(ألبَرِّي) (ن): ڕووەکی دەشتەکی یان کێویی.

(البَرِّيَّة (ج) بَرارِي): دەشتو بیابان.

(ألبَرِّيْــت (ج) بَراريــت): ١-دەشــت ٢-دەرو بیابان.

(ألبَرَّانيّ): ١-دەرەکی ٢- سەرەوەیی/ دەرەوەیی (پێچەوانەی ناوەوەیی).

(«مَــن أَصْلَــحَ جَوَّانِيَّــهُ أَصْلَــحَ بَرَّانِيَّهُ»): هەرکەســێك دەروونو نــاوەوەی چاك بکات خودا ژیانی دەرەوەی بۆ چاك دەکات.

(ألْبَرمائِيّ): ئاوو خاکیــی. (زیندەوەری دوو ژیانیی کە لە ئاوو خاکدا دەتوانێت بژی).

٧-(اَلبُــرُّ (ج) أبرار وبَــرَرَة (ن): گەنم. كە گرنگترین رووەكی خۆراكییە.
(اَلبُرَّة): دەنكە گەنمێك.
بــرأَ: (بَــرَا- هُ. بَــرْءً و بُــرُوءً): لــە نەبوو دروستیكرد/ بەدیهێنا.
(البارئ): پەروەردگار/ بەدیهێنەر.
(اَلبَریَّــه (ج) بَرایــا): ١-بوونەوەر ٢-مرۆڤ/ خەڵك.
٢-(بَرئَ وبَرَأَ وبَرُؤَ- مِنَ المَرَض. بَرْءٌ و بُرْءٌ و بُرؤٌ): لە نەخۆشییەكە چاك بووەوە.
(أَبْرَأَ- المَريضَ): نەخۆشەكەی خۆشكردەوە/ چاككردەوە.
(اَلبارئ): نەخۆشی روو لە چاكبوونەوە.
٣-(بَرِئَ- مِنَ العَیْبِ أو الدَّینِ. بُرؤً و بَراءً و بُراءَةً): لە خەوش‌و ناتەواویی یان لە وام پاك بووەوەو رزگاری بوو.
(بَــرَّأَهُ. تَبْرِئَةً): ١-ســەرفرازیكرد ٢-لە گوناح پاكیكردەوە.
(بَرَّأَهُ مِنَ التُّهْمَةِ): گومانبارییەكەی لەســەر لابرد.
(أَبْرَأَ- هُ مِنَ الدَّینِ): وامەكەی لەسەر لابرد/ بەخشی/ لە قەرز پاكیكردەوە.
(تَبَرَّأَ مِنَ الذَّنْبِ): لە گوناه پاكبووەوە.
(إسْــتَبْرَأَ): لــە وام‌و گونــاه پاكبوونــەوەی خواست‌و ویست.
(البَرئ والبَــرِيّ (ج) بَرِیئون وَ بُرَآء وبِراء وَأَبْــراء وأَبْرِیــاء (م) بَرِیئَــة وَ بَریَّــة (ج) بَرِیئــات وَ بَرِیَّات وبَرایا): ١-پاك‌و بێخەوش ٢-پاكگومان ٣-پاكگوناە/ بێتاوان ٤-لە نەخۆشی رزگاربوو.
أَلبَراءُ = بَرِئ: پاك‌و بێتاوان‌و بێگوناە.
(«أَنا بَراءٌ مِنهُ»): من لێی بێسووچ‌و گوناهم/ من لەوە دوورم.
(بُــراء): (چاوگە نە بە جووت دەكرێت نە بە كۆ دەكرێت‌و نە بە مێ دەكرێت)
(اَلبَــراءَةُ (ج) بَــراءات): ١-پاكبوونــەوە/ بێگوناهبوون ٢-پاكنامەی وام ٣-رێپێدانی هەر شتێك كە پێویستی بە پاكنامە بێت.
اَلبَــراءَة الســلطانیة: لــە لایەن ســوڵتانەوە رێپێدانێك بوو بەو كەسانە دەدرا كە نوێنەری كیشوەرەكانیان بوون لە كیشوەری عوسمانیدا تا كاربكەن.
(اَلبَراءَة): بروانامەی داهێنان.
٤-(بارَأَ- شَریكَهُ): لە هاوبەشەكەی جیابووەوەو بەجێیهێشت.
(تَبــارَأَ- الزَوجــانِ): دوو هاوســەرەكە دەستبەرداری یەكبوون‌و لە یەك جیابوونەوە.
٥-(أَبْرَأَ — الرَجُلُ): پیاوەكە چووە یەكەمین شەوی مانگەكەوە.
(البَراء): یەكەمین شەوی مانگ.
(اِبنُ البَراء): دووا شەوی مانگ.
٦-(البَراءَة (ج) بَرءات): بلاوكراوە.

(أَلبَــراءَة البابَويَّــة): بلاوكراوەیــه كه پاپا فەرمانه كلێسەییەكانی تێدا تۆمار دەكات و بە لاتینی پێیدەڵێن (بوڵە).

(البُرْأَة (ج) بُراء): بنە/ كۆڵیت/ حەشــارگە كەراوكەر بۆ خۆشاردنەوە دروستیدەكات.

برأل): (بَــرْأَلَ و تَبَرْأَلَ وابْــرَأَلَّ- الطائِرُ): باڵندەكە خۆی بۆ شەرگیفكردەوە. پەڕی ملی فشكردەوە.

(أَلبُرائِل والبُرائِلى): پەڕی ملی باڵندە.

(«بُرائِلُ الأَرض»): گژوگیای زەوی.

برب: ١- (أَلبَرْبَــخ (ج) بَرابِخ): گونجی ئاو (كە ســوور دەكرایــەوەو دەدرایە دەم یەك بۆ ناوەڕۆو شتیتر).

٢-(بَرْبَــرَ): چەنەچەنێكــی زۆرو بێكەڵكی كرد. كەوتە هات و هاوارو تورەبوون.

(بَرْبــار): چەنەچەنكــەرو هاتوهاواركــەری دەماریگر.

(بَرْبَرَ- المَعزُ): بزنەكە باراندی.

(تَبَرْبَر): چووە پاڵ بەربەری و كێویلە بوو.

(أَلبَرْبَــرِيُّ (ج) بَرابِر وبَرابِرَة): ١-نەتەوەی بەربەر كە لە ژوورووی ئەفەریقادا، لە مەغریب نیشتەجێن ٢-لە میسرداو لەوانەیە لە شوێنی تریشدا بە قولەرەش و حەبەشییەكانیش بڵێن ٣-درندەو كێویلەو بەرەڵا (بەخوازمیە).

(البَربَريّ): بەربەرییەك.

٣-(بَربريس) (ن): زریشــك دەوەنێكی چڕی دڕكاوییە بەرەكەی هێلكەییە، بۆ مەبەســتی جوانیــی و پزیشــكیی بەكاردەهێنرێــت، لە ئەورووپاو ئاسیاو ئەمەریكای خوارووا زۆرەو بلاوە، گوڵی زۆر دەگرێت.

٤-(بَربَــصَ – الأَرضَ): ئــاوی كــردە ســەر زەوییەكە تا باش بێت و بەرهەمی چاك بدات.

٥-(البَرْبَــط) (مــو): ١-عــوود ٢-گوڵــدان (فارسیە).

برت: ١- (بَرِتَ. بَرَتاً): سەرسام بو.

(بَرَت الشئَ. بَرْتاً): شتەكەی بڕی.

(أَلبُرْت والبِرْت والبِرِّيْت (ج) أَبْرات): رابەری شارەزا/ رێپیشاندەرێكی كارامەو بەلەد.

(أَلبُرْت والمِبْرا): شەكری سپی.

٢-(أَلبَريت (ج) بَراريت: دەشت و دەر.

٣-(البُرْتُقال والبُرتُقان) (ن): پرتەقاڵ.

(بُرتُقالَــة بُرتُقانَــة): (یــەك پرتەقــاڵ/ پرتەقاڵێك. درەختی پرتەقاڵ كە لە چینەوە هاتووە خۆشــترین بــەر دەگرێت و زۆر بلاوە، كــە شــەربەت و كوهولی لێدەگیرێــت. لەوانە (كوراســاو) لە ناوچــە گەرمەكانــی دەریای ناوەڕاستدا دەروێنرێت.

الملحق:

برت: أَلبُرتُقالِيّ: رەنگی پرتەقاڵی.

نَسيجُ بُرتُقالِيّ: چنراوی رەنگ پرتەقاڵی.

بــرث: (أَلبُرْثُــن (ج) بَراثِن- مِنَ السَّــباع والطّير): چنگی درندەو باڵندە.

بــرج: ١-(بَــرِجَ- بَرَجــاً): بــۆ خــواردنو خواردنەوە ورگی لێبەرەڵاكرد/ ورگدراو بوو.
٢-(بَــرِجَ- ت عَينُــهُ): ١-چــاوی بەڵەك بوو ٢-چاوی جوانو مەست بوو.
(أَبْرَج): چاومەست
(عَــينٌ بَرجــاء (ج) بُرْج): چــاوی بەڵەكو مەست.
(أَلبَرَج (ج) أَبْراج): جوان.
٣- (بَــرَجَ- الشَّــيْ): شــتەكە دەركــەوتو بەرزبووەوە.
(بَــرَّجَ وأَبْــرَج): بورجێكــی دروســتكردو هەستاند.
(تَبَرَّجَ- تِ المَرْأَةُ): ژنەكە ئارایشتیكردو خۆی بۆ پیاوی بێگانە ڕازاندەوەو جوانكرد.
(أَلبَرَج (ج) أَبْراج): دیارو ڕوونو دەركەوتوو.
(أَلبُرْج (ج) بُروج وَأَبْــراج وَأَبرِجَة): ١-قەڵا ٢-كۆشك ٣-خانەیەكی/ بینایەكی بەرزە، شێوە خڕ یان شێوە چوارگۆشە لە شوێنێكی تەنیادا یان بەشێك بێت لە بینایەكی گەورە ٤- (فك) یەكێــك لە كۆنگرەكانی ئاســمان كــە دوازدە كۆنگرەن.
(بُرج الحَمَل أَو الكَبش): كۆنگرەی بەران.
(بُرْجُ الثَّور): كۆنگرەی گا.
(بُــرجُ الجَوزاء): كۆنگــرەی: جووتە ئایدەی چەرخ.
(بُرجُ السَرَطان): كۆنگرەی قرژاڵ.
(بُرجُ الأَسَد أو اللَّيث): كۆنگرەی شێر.
(بُــرجُ السُــنبُلَة أَو العَــذراء): كۆنگــرەی گوڵەگەنم.
(بُرجُ الميزان): كۆنگرەی ترازوو.
(بُرجُ العَقْرَب): كۆنگرەی دووپشك.
(بُرجُ القَوسُ أو الرمي): كۆنگرەی كەوانە.
(بُرجُ الجَدی أَو التَیس): كۆنگرەی سابرێن.
(بُرجُ الدَلو أو الســاقِي أو ســاكِبُ الماء): كۆنگرەی دۆلكە.
(بُرجُ الحوُت أَو السَمَكَة): كۆنگرەی نەهەنگ.
(فَلَكُ البُروج) (فك): گەردوونی كۆنگرەكان. بازنەیەكە خۆر لە ئاسماندا و لە كاتی گەڕانیداو لە ســاڵێكدا وێنــەی دەكێشــێت، بازنەكە بە دوازدە بەشــەوە دەكرێــت هەرمیكەی (٣٠)ی پلەكە، ئەمڕۆ بێپێویســت ناونــراوە بازنەی خۆرگێران.
٤-(أَلبارِجُ): پاپۆڕەوانی كارامە.
(أَلبارِجَة (ج) بَوارِج): شاپاپۆڕی جەنگ.
(سَفینَةٌ بارِجَة): پاپۆڕە جەنگی سەر بەرەڵا.
(«مافُلانٌ إلاَّ بارِجَةٌ قَد جُمِعَ فیه كُلَّ الشَرِّ»): فیسار مرۆڤێكی بەدو شەڕانیو زۆر خراپە.
(تَباریجُ النَّباتِ): گوڵەكانی ڕووەك.
(أَلإبریــج): جۆرە مەســینەیەكە بۆ ژەندنی ماستو كەرە لێوەرگرتنی.
٥-(أَلبِرجاس) (ع): كورتان.
٦- (أَلبُرجُد): پۆشاكێكی ئەستووری میلدار.

٧-(أَلبُرْجُمَــةُ (ج) بَراجم) (ا ع): جومگەی پەنجەکان یان ئێسکە وردەکانی دەستو پێ.
(أَلبَراجم): بەرەیەکی خێڵی تەمیمی عەرەبن.
(«إنَّ الشَّــقِي وافِــدُ البَراجِــم»): کوڵۆڵــی هاتــووی بەراجیمــە (دەڵێن عەمــروی کوری هینــد نەوەدو نۆ کەســی لە خێڵــی بەراجیم سووتاندووەو سوێندیشی خواردووە کە دەبێت سەدیان لێبکوژێت. پیاوێکی بەراجیمی بەویدا تێدەپەرێت بۆنی گۆشتە سووتاوەکە دەکات وا دەزانێت میوانداریی کراوە کە عەمرو دەیبینێت لێدەپرسی تۆ لە چ بەرەیەکیت ئەویش دەڵێت بەراجیمیم. دەیکوژێتو بەوە ســەدەکە تەواو دەکات، ئەمە بە یەکێك دەوترێت کە بۆ تەماع خۆی بە فەوتانن بدات.
٨-(أَلبرجيس): (فك) فارسيە.
= أَلمُشتري): ئەستێرەی پەرچیس
(أَبــو بُرجيس (ن): درەختێکە چرو درکاوی گوڵەکەی ئاڵرەنگە.
الملحق:
أَلبَرْجَل: ١-البركال = پەرگال

---

برح: (بَرِحَ- المَكانَ وَمِنــهُ بَراحاً و بَرحاً): شوێنەکەی جێهێشت. لە شوێنەکە لاچوو
(مابَرِحَ): هێشتا.
(«بَرِحَ الخَفاءُ»): نهێنیەکە پەردەی لەســەر لاچوو/ کارەکە ئاشکرابوو.
(أَبْــرَحَ- هُ): لــە شــوێنەکەی خــۆی لایبردو دەریپەراند.
(بــارَحَ- المَــكان): جێگەکەی بەجێهێشــتو دوورکەوتەوە.
(بَراح): خۆر.
(أَلبَارح والبارِحَة): دوێشەو.
(أَلبارِحَةُ الأُلى): پێرێشەو.
(هٰذِهِ فِعلَــةُ بارِحَة): ئەمــە کارێکە بێنیاز روویداوەو لە دڵەوە نەبووە.
٢-(بَــرِحَ- الرَجُــلُ. بَرْحَــاً): تــوورە بوو/ رقیهەستا.
٣-(بَرِحَ- الصَّيــدُ: بُرُوحاً): نێچیرەکە بەلای راستی راوکەرەکەدا تێپەری.
(بارِحٌ و بَرُوحٌ و بَريحٌ): نێچیرەکە کە بەلای راستی راوکەردا تێپەرێت.
٤-(بَــرَّحَ- بِــهِ الأَمــرُ): کارەکە شــەکەتو شپرزەیکردو ئازارێکی زۆری پێگەیاند.
(- اللهُ عَنــكَ): خــودا بارت ســووك بکاتو ستارەی دڵت بدات.
(أَبْرَحُ): بۆ لە پشتگرتنە.
(«هــذا أَبرَحُ عَلَيَّ مِــن ذاك»): ئەمەم لەوە لەلا (سەختترە/ زەحمەتترە).
(«قَتَلوهُم أَبْرَحَ قَتْلٍ»): پیســترین کوشــتن کوشتیانن.
(أَلبَرْح (ج) أَبْــراح وَالتَبْريــح والبُرَحَاء): ١-گرفتاریی ســەخت ٢-ئازار ٣-خراپە/ شەرو تووشیی.

(ألتَبارِيحْ): سەختیی ڕەنجی نان پەیداکردن.
(تَبارِيحُ الشَّوقِ): گڕو سوێی تاسەو حەز.
٥-(أَبْــرَحَ- هُ): بــە گەورەیگرتو ســەری لێ سوڕما. (بۆ سەرسوڕمان دێت).
(«ماأَبْــرَحَ هذا الأَمرَ»): ئای ئەمە چ کارێکی سەیرو سەمەرەیە.
(أَلبَرح): کاری سەیرو سەرسوڕمێن/ سەمەرە.
(«أَمــرٌ بَــرحٌ»): کارێکــە (ســەرت لێــی سوڕدەمێنێت/ بە لاتەوە سەیرە).
٦-(البَراحُ): دەرکەوتن‌و ڕوونبوونەوە.
(«لابَراحَ»): گومانی نییە.
(«جاءَنا الأَمرُ بَراحــاً»): کارەکەمان ڕوون‌و ئاشکراو بێگومان بۆ هات.
(«جاءَ بِالكُفرِ بَراحاً»): جاڕی کفرو ڕەفیدا/ ئاشکرای کردی.
(أَلبَراح): زەوییەکی فراوانی ڕووتەن‌و چۆڵ.
(بَرحــى): نــە ئافارەین (وشــەیەکە کاتێك دەوترێت کە تیرەکە نەپێکێت).
(مَرحــى): ئافەریــن، کاتێــك دەوترێت کە بپێکێت.
(ألبارِح (ج) بَوارِح): بای گەرم‌و گڕاویی.
(إبن بَريح): قەلەڕەشە.
برد: ١-(بَرَدَ و بَرُدَ. بَرْداً و بُرودَةً): ساردبوو. ساردبووەوە.
(بَرْد وَبارِد و بَرُود وَبُراد): ســارد. ساردیی. سەرما.

(بَرَدَ و بَرُدَ- الخُبزَ): نانەکەی تەڕکرد
(-العینَ): چاوی ڕشت.
(-اللَّيلُ): شەوساردیکرد.
(- بَرَدَ- عَلَینا): شــەو ســاردیکردو سەرمای شەو لێیداین/ شەو سەرمای لێکردین.
(بَرَدَ وبَرَّدَ- هُ): ساردی کردەوە.
( - الوَجْعَ): ژانەکەی سوککردو دایمرکاند.
(- فُــلانٌ): فیســار کەس ســاردبووەوە/ خاو بووەوە.
(«جَدَّ فِي الأَمرِ ثُمَّ بَرَدَ»): لە کارەکەدا گەرم بوو پاشان خاو بووەوەو پشتی لێساردبووەوە.
(بُرِدَ- تِ الأَرضُ): زەویەکە تەرزەی لێباری
(- القَومُ): خوێشــگەل تەرزە یان لێباری یان سەرمایان بوو.
(أَبــرَدَ): کەوتــە ســەرماکەوە یــان تــەرزە بارینەکەوە.
(- الشيءَ): شتەکەی ساردکردەوە.
(تَبــرَّدَ): خۆی فێنــك کــردەوە/ حەزی لە ساردیکرد.
(«نَزَلَ فِي الماءِ يَتَبَرَّدُ»): خۆی خستە ئاوەکەوە تا فێنك ببێتەوە.
(«لاتُبَرِّد عَن فُلان»): باری گوناهی فیســار ســووك مەکە بــەوەی ئەگەر ســتەم‌و زۆری لێکردیت جنێوو قسەی پێبڵێیت.
(تَبارَدَ): خۆی وا پیشــاندا کە ســەرمایەتی، خۆی بە سەرمابردوو پیشاندا.

(إبْتَرَدَ): بە ئاوی سارد خۆی شت.
(إستَبْرَدَ- هُ): بە ساردی زانیو دانا.
(ألْبَرْد): سەرما.
البَرَد: تەرزە.
(ألبَــرَدَةُ):١-یەك دەنكە تــەرزە/ تەرزەیەك. ٢-تلْخە/ ئینتەلا (بۆیــە وای پێدەڵێن چونكە گــەدە ســارد دەكاتــەوەو ناهێڵێــت خواردن بكێشێت یان هەرسیبكات).
(ألْبَرُود): جۆرە كلێكە چاوی پێدەرێژرێت.
(«ثَوبٌ بَرودٌ»): بەرگێكە نەرم نەبێتو پرووشــی نەبێت.
(ألبُرَداء):تا بە لەرزە.
(ألبَرَّاد): بەفرگرە.
(ألبَرَّادة): ئاو بەستە.
(ألمَبْرَدَة): ساردكەرەوە. فێنكەكەرەوە.
(«هذا مَبْــرَدَةٌ لِلْبَــدَن»): ئەمە لەش فێنك دەكاتەوە.
(ألبارِد) (فا): ١ فێنككەرەوە ٢-ساردكەرەوە.
(«عَيشٌ بارد»): ژیانێكی شادو هێمن.
(«غَنيمَــةٌ بــارِدَة»): دەســكەوتێكی (ئیف/ بەلاش/ خۆرایی).
(ألبَرْدان والأبْرَدان): سەرلەبەیانیو سەرەتای شەو/ سەرلەئێوارێ.
٢-(بَرَدَ- الحَقُّ عَلَيهِ أو لَهُ. بَرْداً): مافەكەی لەســەر ســاغ بووەوە یان مافەكەی بۆ ســاغ بووەوەو پێویست بوو كە بدرێت.

(بَــرَدَ و بَــرَّدَ- الحَقَّ): مافەكەی ســەلماندو پێویستی دانەوەی كرد.
٣-(بَرَدَ- فلانٌ): فیسار نوست.
(ألْبَرْد): نوستن/ خەوتن.
٤- (بَــرَدَ- الحَديــدَ. بَرْداً): ئاســنەكەی بە برِبەند رنی.
(إستَبْرَدَ- عَلَيهِ لِسانَهُ): زمانی لێبەربوو تێر جنێوی پیسیو بێشەرمانەی پێدا.
(ألبُــرادَةُ): برِشــتی ئاســن كە بــە برِبەند دەوەرێت.
(ألمِبْرَد): برِبەند.
(ألبارِد): برەر.
ألمُرْهِفاتُ البَوارِد): شمشێرە تیژە برەرەكان.
٥-أبْــرَدَ- هُ المَــرَضُ: نەخۆشــییەكە لاوازو بێتینیكرد.
(ألبارِد): لاواز/ بێتین.
(«حُجَّــةٌ بــارِدَة»): بەڵگیەكــی لاواز/ بیانوویەكی بێهێز.
٦-(أبْرَدَ- إليهِ البَريدَ): پۆســتەكەی بۆ نارد یان فرستادەكەی بۆ نارد.
(البَريد (ج) بُرُد):١-فرستادە ٢-ماوەیەكە كە فرستادەكە دەیبرێت كە (١٢) فۆناغەو نزیكەی ١٢ میلە.
(ألبَريد): پۆستە.
(«إدارة البَريد والبَــرق»): بەرێوەبەرێتیی پۆستەو برووسكە. (نووسینگەیەكە كە پۆستەو

شـتی نێرراو وەردەگرێتو دابەشـیدەكاتو وەریشـدەگرێتو دەینێرێت بـۆ خاوەنەكانی (فارسیە) ٣-نامەو دەستە شتە نێرراوەكان.
٧-(ألبَرد (ج) بُرود وأبراد وأبْرُد): بەرگێكی میلدارە.
(«وقـع بَینَهُم قَدٌ بُـرودٌ یَمانِیَّـة»): واتا بـە گژیەكدا چـوون تا جلـە بەنرخەكانیان بە بەریەكەوە نەهێشـت ئەمـە پەندێكە بۆ دوژمنایەتیەكی زۆر دەوترێت. ٢-سەربەرگێكە لە خوریی ڕەشەو لە خۆوە دەپێچرێت.
(بُرْدَة): دانەیەكە لەو سەربەرگە ڕەشە.
(ألأبْرَد (ج) أبارِد (م) ألأبرَدَة) (ح): پڵنگ.
(ألبَردِيّ) (ن): قەرەم، ڕووەكێكە وەك قامیش. جارانی زۆر زوو توێكڵەكەی بۆ لێنووسین بە كاردەهێنرا.
(- البَردِيّ): باشترین خورمایە.
٨- (البَرذَعَـة والبَرذَعـة*): جلـی وڵاخ، كورتانی لوریی.
٩-(بَردیوط (یونانیة): پایەی كاهینێكە كە قەشە دەینێرێت بۆ سەردانی دیانەكان. ئێستا لای مارۆنیەكان پایەیەكی خۆرهەڵاتیە.
الملحق:
برد: (التّبرید): ساردكردنی شت/ ساردكردنەوەیشت.
(تَبریـدُ المأكـولات): خـواردن سـاردكردن. سـاردیدان بـە خـواردن/ بۆ پاراسـتنی یان بـە هـەوا زانسـتیانە خۆشـكردنی هـەواو فێنككردنی.
(جهازُ التَبرید): ئامێری ساردیدان.
(تبریـدُ الأَلَـم): سـووككردنو دامركاندنی ئازار.
(غرفَـةُ التَبریـد): ژووری سـاردكردنو ساردكردنەوە.

---

بـرذ: (بَرْذَنَ- الرَجُـلَ): پیاوەكەی بەزاند/ ملی بە پیاوەكە شۆڕكرد.
(- الفَرَسُ): چارەوێكە وەك بارگیر ڕۆیشت.
(البِرذون (م) برذونَة (ج) براذین): ئەسپو ماینی باریی/ بارگیر.
برز: ١-(بَرَزَ. بُرُوزاً): چووە سەر پێشاو.
(بَرَّزَ): پێشاویكرد/ گوویكرد/ پیساییكرد.
(تَبَرَّزَ): چووە سەر پێشاوو خۆی داتەكاند.
(ألبَراز): ١-دەشتی پانو چۆڵو بێدارو درەخت ٢ چوونە سەر پێشاو (ئیدیۆمە).
(ألبراز): ئەوەی لە كۆمەوە دەردەچێت/ گوو/ پیسایی.
ألمَبْـرَز والمُتَبَـرَّز): ئاودەسـت/ شـوێنی پیساییكردن، ئاودەستخانە.
٢-(بَـرَزَ و بَرِزَ. بَـرَزاً): دەركەوت پاش ون بوونو سستییو خاوبوونەوە.
(بارز): دەركەوتوو/ دیار/ سەركەوتوو.
(بَرَّزَ- الشيءَ): شتەكەی دەرخست/ نواند.
(أبْرَزَ- هُ): قوتیكردەوە/ دەریخستو نواندی.
(أبْرَزَ- الكِتـابَ): پەرتووكەكەی/ كتێبەكەی

بڵاوكردەوە.
(إسْـتَبرَزَ- ەُ): دەریهێنـا یـان داوایكـرد دەربهێنرێتو پیشانبدرێت/ دەربخرێت.
٣-(بَـرُزَ. بَرازَةً): لـە هاورێكانـی لە رووی ئازایەتـیو چاكـەو رووییـترەوە لە پێشـترو دەركەوتووتر بوو.
(بَرْزٌ (م) بَرْزَةٌ): دەركەوتووترین/ دیارترین.
(بَرَّزَ- الفَرَسُ): ئەسپەكە لە پێشبركێكەدا لە پێشەوە بوو بردیەوە.
(بَرَّزَ- الرَجُلُ في العِلْم): پیاوەكە لە زانستدا دەركەوتووترینی هاورێكانی بوو.
٤-(أبْرَزَ- الرَجُـلُ): پیاوەكە بۆ گوزار لێبراو نیازیكرد.
٥-(بـارَزَ- ە. مُبارَزَةً وَبِـرازاً): ١-بەرەنگاری بوو، شـەری لەگەڵدا كرد ٢-شـەرە شمشێری لەگەڵدا كرد.
(ألبَراز (مص): دەرپەرین بۆ بەگژداچوونو بەرەنگاربوونەوە.
٦-(ألبَرزَخ (ج) بَرازِخ): ١-لەمپەر/ تیغەیەكی نێوان دوو شـت ٢-لەلای جوگرافیەناسـەكان زەوییەكـی تەسـكی نێـوان دوو دەریایە كە وشـكاییەك بە وشـكاییەكیتر بگەیەنێت یان نیمچە دوورگەیەك بە وشكاییەك بگەیەنێت. ٣-نێوان ژیانی دنیـاو زیندووبونەوە/ واتا لە مردنەوە تا زیندووبوونەوە.
(بَرازِخُ الإیمان): لە سـەرەتای برواهێنانەوە تا كۆتایی/ واتا نێوان گومانو برواهێنانی تەواودا.
٧-(تَبَـرْزَقَ- القَومُ): خوێشـگەل بێ ولاخو سواریی كۆبوونەوە.
(ألبَرازِیق): كۆمەڵانی خەڵك.
(برزِیق): ١-كۆمەڵە خەڵكێك ٢-كۆمەڵە رێگەی ئەملاولای شەقامە سەرەكییەكە (فارسیە).
(ألبَـرازِق) (ط): جـۆرە چۆرەكێكە تەنكو كونجیدار.
(بُرزُقَـةُ): دانەیەكـە لەو چۆرەكـە تەنكە كونجیدارە.
برس: ١-(بَرِسَ. بَرَساً): تەنگی بە نەیارەكەی هەڵچنی: زۆری بۆ هێنا.
(بَرَّسَ- الأرضَ): زەویەكەی تەختو خۆشكرد.
(ألبُرْس والبِراسُ): لۆكە/ پەموو.
٢-(ألبِرْسِیان): جۆرە خورمایەكە.
٣-(ألبِرسْـكُون) (یونانیة): زەمینبین كە لە سەروو بەرچاوگرەوە شتی پێی دەبینرێت.
٤-(بَرْسَم- ەُ): تووشی هەوی سورێنچكیكرد.
(بُرسِمَ): تووشی هەوی سوورێنچكبوو.
(مُبَرْسَم): هەوی سورێنچكگرتوو.
(ألبِرسـام «طب»): هەوی سوورێنچك كە لە نێوان جگەرەو دڵدایە/ ئاوبەنگ.
برش: ١-(بَرِشَ وابْرَشَّ. بَرَشاً): خاڵاویبوو- شـڵبوو یـان خاڵی سـپی كە لە پێسـتەكەی نەچێت.
(أبْرَشَ و مُبْرَش): خاڵدار. خاڵاویی. شڵ.

(مَكانُ أَبْرَش): شـوێنێك گژوگیـای هەمەڕەنگی لێبڕوێت.
(سَنَةٌ بَرْشاء): ساڵێكی تەڕكە گژوگیای زۆر بێت.
(ألبَريش= الأَبْرَش): خاڵاویی.
(ألبُرشَـةُ = ألبَـرَش): ١-پەڵەی سـپی بێخی نینۆك ١-خاڵی لەشـی ئەسـپ كە لـە ڕەنگی تووكەكەی نەبێت/ كونج كونج بێت.
٢-(بَرْشَـمَ – الرَجُلُ بَرْشَـمَةً و بِرشـاماً): ماتبوو و پەژارە دایگرت.
(- إلَيهِ): تیژ چاوی تێبڕی.
(ألْبُراشِم): چاوتیژ.
(ألبُرشُم): پەچە/ ڕووپۆش.
٣-(بَرشَـنَ- الرِسـالَةَ): نامەكەی لۆكو مۆر كرد.
(البرشـان): ١-لۆك/ نانێكی تەنكە نامەی پێ لۆكدەكەن. ٢-(طب) گولاجی بۆش كە دەرمانی تێدەكەن ٣-نانـی تەنكی نەبڕاو بۆ پیرۆزیی لە كڵێسەدا بەكاردەهێنرێت (سریانیه).
برص: (بَرِصَ. بَرَصاً): تووشی بەڵەكییبوو.
(أَبْرَصَ- الرَجُلُ): پیاومكە كوڕێكی بەڵەكیبوو.
(- اللهُ فُلاناً): خودا فیساری تووشی بەڵەكیی كرد.
(ألبَرَص): نەخۆشیی بەڵەكیی كە پێست توێژ هەڵـدەدات‌و خورووییەكـی ئازاراوی تووشـی نەخۆشەكە دەكات.
(ألأَبْرَص (م) بَرْصَاء) (ج) بُرْص): كەسێكە توشوی بەڵەكیی بووبێت.
(«حَیَّةٌ بَرصاء»): ماری بەڵەك/ پێست خاڵ سپی.
٢-(تَبـرَّصَ- الأرضَ)/ گیـای زەوییەكـەی پەڵەپەڵە خۆر كرد.
(«ارضٌ بَرْصَـاء»): زەوییـەك پەڵەپەڵـە گیاكەی خورابێت‌و ڕووتكرابێت.
٣-(ألأَبْرَص): مانگ.
(سـام أبرَص= أبو بريص) (ح): شـەوگەرد، بۆكردنی بەدوان دەڵێن (هذان سامّا أَبْرَص): ئەو دوو شـەوگەردە. بۆ كردنی بە كۆ دەڵێن (هؤلاء سُـوّامُ أَبْـرَص و أَبـارِص): ئەوانە شەوگەردن.
برض: (بَـرَضَ- النَّباتُ بُرُوضاً): ڕوومكەكە سەری دەرهێنا.
(بَرَّضَ وأَبرَضَ المَكانُ): گیای شوێنەكە جوان سەریدەرهێنا/ شوێنەكە گیای زۆری دەركرد.
تَبَرَّضَ- تِ الأرضُ: ڕووەكی زەوییەكە سـەری دەرهێنا. ڕووا.
(ألبارِض): سەری ڕووەكی تازە دەرهاتوو.
(ألبُرضَـةُ): زەوییـەك كـە درەختـی تێدا نەڕوێت.
٢-(بَرَضَ – المـاءُ مِنَ العَـينِ بَرْضاً): ئاوی كانییەكە چۆڕچۆڕ هاتە دەرێ.
(العَينُ البَروض): كانیە چۆڕە/ كانیی كەم ئاو.
(تَبَـرَّضَ- المـاءَ): چۆڕچـۆڕ ئاوەكـەی

خواردەوە.

(- الشـيءَ): ١-شـتەکەی کەم کـەم برد ٢-بە گوزەرانێکی کەم قایل بوو/ ملی بۆ گوزەرانێکی کەم شۆڕکرد.

(ألبَـرْض (ج) بَراض و بُـرُوض وأبراضْ): کەمێك- جۆرێك/ کەمەکێك.

(«هـذا بَرْضٌ مِن عِـدٍ»): ئەمە کەمەکێکی زۆرێکە.

(ألبُراض والبُراضَة): کەم/ تۆزێك.

(ألْمَبْرُوض): هەژارکەوتوو لەبەر بەخشـینی زۆرو جوامێریی.

برط: ١-(البَرْطاش): بەردەرگاکە لە بەرداش بێـت. (ئەمـە بێگانەیـەو عەرەبیەکـەی) (ألأُسْكُفَّة).

٢-(بَرْطَلَ- هُ. بَرطَلَةً): بەرتیلی دایە.

(تَبَرْطَلَ): بەرتیلی وەرگرت.

(ألبُرطُلْ): کڵاو.

(ألبرطيل= الرَّشْـوَة): ١ بەرتیل ٢-بەردێکی لاکێشـەییە، یان ئاسـنێکی درێـژە بیرازی بەرداشی پێدەکرێت.

٣-(بَرطَم- اللَّيلُ): شـەو تاریك بوو/ بوو بە شەوەزەنگ.

(- الرَّجُلُ): لە تووڕەییدا لچی داهێشت.

(بَرْطَمَ وتَبَرْطَمَ): لە ڕقو تووڕەبووندا سکی هەڵاوسا.

(ألبِرطام والبُراطِم): لچو لێو ئەستوور.

الملحق:

برط: (ألبَرْطَمان أو المَرْطَبان) (فارسـية): قاپێکە شووشـەیە یان کاشـییە مرەبای تێدا هەڵدەگیرێت.

---

برع: ١-(بَرَعَ و بَرِعَ و بَرُعَ. بَراعَةً و بُروعاً): لە جوانیدا یان زانسـت یان ڕەوشـتبەرزییو چاکیـدا لە هەموان بالاتر بوو/ دەرکەوتووتر بوو.

بـارِع: ١-بالادەسـت/ کارامـەو دەرکەوتوو/ سەرکەوتوو. ٢-دڵبەر لە جوانیدا ٣-مامۆستا.

(بَرَعَ- هُ بُرُوعاً): لە زانسـت یان جوانی یان ڕەوشتبەرزیو چاکیدا لەو لە پێشتر بوو

(- الجَبَلَ): سەرکەژەکە کەوت.

(ألبَريع): ژیرو جوانی بێهاوتا.

(«البَرقُ البَريع»): هەورە بروسکەی دوور.

(البَراعَة): ١-کارامەییو چالاکیی. ٢-بالابوون لە زمانزانییو زمانپاراوییدا.

٢-(تَبَـرَّعَ- بالعَطـاءِ): خێری بەخشـی یان پارمەیتـدا بێئـەوەی داوای لێبکـەن یـان چاوەڕێی پاداشت بێت.

(«فَعَلَـهُ تَبَرُّعـاً و مُتَبَرِّعـاً»): ئەوەی کە کـر وەك کۆمەککردنێـك یـان یارمەتییەك بێپاداشت.

٣-(بَرعَـمَ وتَبَرْعَـمَ الشَّـجَرُ. بَرعَمَـةً): درەختەکە گۆپکەیکرد.

(ألبُرعُم والبُرعُمَـة (ج) بَراعِم والبُرعُوم

والبُرعُومَة (ج) بَراعِيم (ز): چرۆ/ گۆپكەی چڵو گەڵا یان گوڵ/ خونچەی گوڵ پێش كردنەوەی.

بـرغ/ ١-(بَرغَثَ- المَكانُ): شوێنەكە كێچی هەڵهێنا/ كێچی زۆر بوو.

(بُرغُوث (ج) بَراغِيث (ح): كێچ. (مۆریچەیەكە لەسەر لەشی مرۆڤ و زیندەوەرە شیردەرەكان دەژیو لەسەر خوێنی فرێدراویش. گەشتنەكەی ژەهراویەو لەوانەیە ببێتە هۆی تاعون.

(بَرغوث البَحر) (ح): كێچەدەریایی/ ڕۆبیان جۆرێكە لە توێكڵدارە دە پێییەكان لە كێچ دەچێت. خەڵكە ڕەمەكییەكە پێیدەڵێن: (القُرَیْدس).

٢-(ألبَرغَش) (ح): مێشوولە.

ابَرغَشَة: مێشوولەیەك.

٣-(ألبُرغُل والبرغِل) (تركیة): ساوەر.

٤-(ألبَرغیّ والبُرغِيّ (ج) بَراغِيّ) (حي) (تُركیَة): جەڕ: بورغوو.

برف: (ألبرفیر) یونانیة: ڕەنگێكە لە سوورو شین پەیدا دەبێت/ ئەرخەوانی.

برق: ١-(بَرَقَ- البَرقُ. بَرْقاً وَبُرُوقاً و بَرَقاناً و بَریقاً): هەورە تریشقەكە برووسكەیدا/ برووسكەكە شەوقیدایەوە/ درەوشایەوە.

(تِ السَّماءُ): ئاسمان برووسكەیدا/ چەخماخەیدا.

(- الشَّيءُ): شتەكە شەوقیدایەوە/ بریسكایەوە/ كەوتە باق و بریق.

(أبْرَقَ): هەورەتریشقە لێیدا/ برووسكەی بەركەوت.

(- تِ السَّماءُ): ئاسمان چەخماخەیدا.

(- بسَیفِهِ): شمشێرەكەی لە هەوادا هەڵسوراندو بریسكەی پێهێنا.

(- عَن وَجهِهِ): ڕزوی خۆی دەرخست.

(ألبَرْق (ج) بُرُوق (ف): چەخماخە/ هەورە برووسكە/ برووسكە/ هەورە تریشقە (ڕووناكییەكە لە ئاسماندا شەوق دەداتەوە لە ئەنجامی تەقینەوەیەكی كارەبایی ناو هەور).

(«بَرقُ خُلَّبٌ و بَرقُ خُلَّب و بَرقُ الخُلَّب»): (چەخماخەی / برووسكەی) بێباران.

(ألبارِقَةُ): ١-هەورێكی بە برووسكە ٢-شمشێرەكان.

(بَرَّاقَة): لریقەدار/ ورشەدار/ شەوقدار/ بریسكەدار.

(سَحابَةُ بَرَّاقَة): هەورێكی بە برووسكە.

(مَبْرَقُ الصُبْح (ح) مَبارِقَةُ: شەبەقی بەیان/ سپێدە/ بەرەبەیان.

٢- (بَرِقَ- الرَجُلُ): هەرەشەیكرد.

(أبْرَقَ): هەرەشەیكرد.

٣-(بَرَقَ وَأبْرَقَ- تِ المَرأَةُ. بَرْقاً): ژنەكە خۆی ڕازاندەوەو جوانكرد/ خۆی ئارایشتكرد.

(بَرَّقَ- هُ): ڕازاندیەوە.

(- تِ المَرأَةُ): ژنەكە خۆی ئارایشتو

جوانكرد.

٤-(بَـرِقَ- بَرقَـاً): حەپەسـاو نەبلەقبـوو. نەيدەبينى.

(ألبَــرِق (ج) أبْــراق وبُرقــان): تۆقــينو حەپەسانو نەبلەقبوون.

(ألبَرقَةُ): ترسو سەرساميى.

(ألبَروق- مِــن الرِجال): پياوى زيرەكردوو/ زۆر ترسنۆك.

٥-(بَرَّقَ عَينَيهِ وبِعَيْنَيْهِ): چاوى بزكردەوەو تيژ تەماشايكرد.

٦-(بَرَّقَ): بــۆ شــوێنێكى دوور گوزاريكرد/ سەفەريكرد.

(أبْرَقَ): برووسكەيەكى نارد/ تەلێكى نارد.

(ألبَــرْق) (ف): برووســكەنێر. (نامێرێكــە برووسكەى پێدەنێرن).

(دائــرةُ البَريد والبَرق): پۆســتەو تەلخانە. فەرمانگەيەكــە كاى وەرگرتنــى پۆســتەو بروسكەو ناردنيانە.

(ألبَرقِيَّة): بروسكە (ناخاوتنێك يان نامەيەك بە هۆى برووسكەوە دەنێررێت.

٧-(ألبَرْق (ج) أبْراق و بُرقَان) (ح): كارمامز/ كارئاسك.

(ألبُرقَــةُ (ج) بُــرَق والأبْــرَق (ج) أبارِق): زەوييەكــە رەقــەن كــە بــەردو لــمو قورى تێدابێت.

(ألأُبَــيرِق): زەمينۆكێك رەقــەنو بەردو لەمو قورى ببێت.

(الأبْرَق): رەنگى دێز/ ماشو برنج.

(ألتَباريق): رۆنى شــل يان چەورييەكى كەم كە كرابێتە خواردنێكەوە.

٨-(بَرْقَــحَ وتَبَرْقَــحَ- وَجْهُــهُ. بَرْقَحَــةً): روخسارى ناشيرين بوو.

(- الثَّــوبُ): جلەكــە پيــس بــوو، پەڵــەى بەركەوت.

٩-(بَرْقَــشَ- هُ. بَرقَشَــةً): رەنگئامێزيكرد/ رەنگاورانگيكرد.

(- في الــكلام): ورێنەيكرد/ قســەى تێكەڵو پێكەڵيكرد.

(تَبَرْقَشَ): بە هەموو رەنگ خۆى رازاندەوە.

(ألبِرْقِش) (ح): پەرگەش جۆرە (باڵندەيەكى بچووكى دەنگ خۆشو پەر رەنگينە).

(أبــو بَراقِــش) (ح): باڵندەيەكــى بچووكە سەرەوەى پەرەكەى رەنگ خاكييەو ناوەراست سوورە، ژێر سكى رەشــە كە خۆى فشكردەوە رەنگەكەى زۆر جۆر دەنوێنێت.

(أبــو بَراقِش): پياوى بێبــار، كە هەردەمەى خۆى بە رەنگێك بنوێنێت.

(ألبَرْقُوش): پێڵاوى كۆن.

١٠-(بَرْقَــطَ): ١-هەنگــاوى وەك يەكــى نــا ٢-تێيتەقانــدو نــاورى بەمــلاولاى خۆيــدا دەدايەوە.

(- الكَلاَم): شرم برم قسەيكرد/ بێسەرو بەر دوا.

١١-(بَرْقَعَ- المرأة): پەچەی بە ژنەکە گرتەوە/ رووی ژنەکەی پۆشی.
(تَبَرْقَعَت): ژنەکە پەچەیگرتەوە.
(ألبُرْقُع (ج) بَراقِع): پەچە/ رووپۆشی ژن.
١٢-(بَرْقَلَ): درۆیکرد.
(ألبَرقَلَةُ): قسەی بێکردار.
(ألبِرْقيـل) (ا ع): قۆچەقانـی (ئامێرێکـی جەنگ بوو، بەردو شتیتری پێ هەڵدەدرا.
١٣-(ألبُرْقُـوُق) (ن): هەڵووژەیەکـی کێویی وردە.
١٤-(ألبَـرْواق والبَـرْوَق) (ن): دارە زیـوی، رووەکێکـە لە کۆمەڵەی شـلێر لاسـك درێژە گوڵـی زۆرە بـۆ مەبەسـتی رازاندنـەوەی باخچەکان بەکاردێت. دەڵێن ئەگەر هەوریکرد لە خۆیەوە دەروێت بێئەوەی باران بێت. بزن نایخوات.
برك: ١-(بَرَكَ- بالمَكانِ بُرُوكاً): لە شوێنەکەدا نیشتەجێ بوو. نیشتەنی بوو.
(بَـرَكَ و بَرَّكَ واسْـتَبرَكَ- البَعيرُ. بُرُوكاً و تَبْراكاً): حوشـترەکە سـنگی دادا. بخەوێت/ سنگی بەزەیەکەوە نووساند.
(أبْرَكَهُ): خەواندی/ سـنگی پێبە زەویەکەوە دادا.
(إبْتَرَكَ- فُلاناً): دای بە زەویداو چۆکی نایە سەر.
(- فُلاناً في عَرْضِهِ وعَلَيهِ): جنێوی پیسـی پێداو ناموسی شکاند/ سوکیکرد.
(- القَـومُ): خوێشـگەل بـە چۆکـدا هاتن‌و کەوتنە شەرەوە.
(ألبَرْك): ١-سنگ ٢-حوشترگەلی سنگداداو.
(بـارِك (م) بارِكة (ج) بُرُوك): حوشـترێکی سنگدا داو.
(ألبِركـةُ (ج) بِرَك): شـێوەی سـنگدادانی حوشترو خەوتنی حوشتر.
(ألبَريك = البارِك): سنگدادەر.
(ألمَبْـرَك): شـوێنی سـنگدادان‌و خەوتنـی حوشتر.
("لَيـسَ لفُـلانٍ مَبْـرَكُ جَمَـلٍ): شـوێنی سـنگدادانی حوشترێکیشـی نییە. واتا هیچی نییە.
٢-(بَرَكَ — فيه): نزای فـەرو بەرەکەتی بۆ کرد.
(بـارَكَ- الرَجُلَ):١-پیرۆزبایی لێکرد، دۆعای فەری بۆ کرد. ٢-لێی قایل بوو.
(- بـارَكَ اللهُ لَكَ و فيـكَ وعَلَيكَ و بارَكَكَ: خـودا لێت پیرۆز بکات‌و ببێتـە مایەی فەر/ فەرو بەرەکەتت بەسەردا ببارێنێت.
(«بـارَكَ عَلى الأنْبِيـاءِ وآلِهِـم»): خودا لە پێغەمبـەران‌و بەرەیان گەورەیی‌و سـالاری‌و پایە بلندییان لێ هەمیشەیی‌و پیرۆز کرد.
(«بورِك فيكَ»): خودا بتداتێ (بە سـواڵکەر دەڵێن بۆ ئەوەی بڕوات‌و هیچیش نەدەنێ).

(تَبَرَّك – بِهِ)/١ خۆی پێ فەردراو موبارەك كرد- لێوەی پیرۆزیی‌و موبارەكیی وەرگرت.
(تَبارَكَ- اللهُ): خودا پاك‌و پیرۆزو بێخەوشە.
(- بـهِ): بە پـاك‌و پیرۆزی داناو گەشـبینی لێبینی.
(إستَبْرَكَ): پیرۆزیی‌و فەری لێ چاوەڕێكرد.
(ألبَريك): پیرۆزكراو – نزای فەرو پێگەیشتن بۆ كراو.
(ألْبَرَكَـةِ: ١-بەختیاریی/ شـادمانیی ٢-فەرو بەرەكـەت ٣-پڕبوون ٤-وتەیەكە قەشـە پاش نوێژ خەڵكەكەی پێ بەرێدەكات.
٣-(إبْتَرَكوا- في العَدْوِ): چابووكانە/ گورجانە رایانكرد.
٤-(ألْبُركَـةُ (ج) بُـرَك وَأبْـراك و بُرْكان): مزەئـاش – (ح) باڵندەیەكـی ئاویی بچووكی سپییە.
(ألبركَـةُ (ج) بِـرَك) (ح): مەری شـیردەر ٢-چاڵاو/ گۆلاو/ گۆل/ گۆماو/ ئەستێرك.
(بركِيَّـة) (ن): قامیشـۆك (لـە ڕووەكـی زەلكاوەكانە) گەڵا درێژو لاسك ڕاستە).
(ألبَرّاك): ١-ئاشەوان ٢-مزەگری ئاش.
(ألبـاروك): ١-ترسـنۆكی زیرەكـردوو ٢-مێردەزمە.
٥-(ألبـركار وَالبيـكار) (هـ) (فارسـية): پەرگاڵ. بۆ وێنەكێشانی بازنە.
٦-(البُركان) ايطاليَّة) كانئاگرین/ بوركان.

٧-(بَرْكَعَ- الفَـرَسُ): بەپێوە بوو بە چۆكدا كەوت.
(بَركَعَ- هُ): بری‌و دایبەزەویدا.
(تَبَركَعَ- الرَجُلُ): پیاوەكە بە قنگدا كەوت.
(ألبُركُع): پیاوی كورتەباڵا.
بـرل (ألْبَرلَمـان) (فرنسـية): پەرلەمان/ ئەنجومەنی نوێنەران.
(النظام البرلماني): ڕژێمی پەرلەمانی.
برم: ١-(بَرَمَ وَبَـرَّمَ وَ أبْرَمَ- الحَبلَ. بَرْماً): پەتەكەی دوولۆنە كردو بایدایەوە.
(إنْبَرَمَ): دوولۆنە بایخوارد.
(حَبـلُ مَـبروم وبَريـم): پەتی/ گوریسـی دوولۆنەكراوو بادراو.
(- بَـرَمَ و بَرَّمَ وأبْـرَمَ- الأمـرَ): كارەكەی دامەزراوو قایمكرد.
(«قَضـاءُ مُـبرَم»): بنبڕكردنێكـی تـەواو چارەنەماو.
(ألبَرّام): بنجبەستكار/ ١-دامەزرێن ٢-پێچدەر/ بادەر/ لوولدەر.
(ألبَريم والبَرام): ١-پەتی بادراو ٢-دەزوو یان هەر شتێك كە بابدرێت.
(ألمِبْرَم (ج) مَبارِم): تەشی.
(ألمَبرومَة): بازنە پێچی زێڕ.
٢-(بَرِمَ. بَرَماً): وەڕس بوو/ بێزارو دڵتەنگ بوو.
(أبْرَمَ- هُ): بێتابوشت‌و بێزاریكرد/ وەڕسیكرد.

(تَبَرَّمَ): بێزارو دڵتەنگ بوو، وەڕسبوو.
٣-(بَــرِمَ- بحُجَّتِهِ بَرَمــاً): نەیتوانی بەڵگەو بیانوو بهێنێتەوە.
(أبْرَمَ- علیــه في الجــدال): زۆری بۆ هێناو بــە شــەڕە بەڵگە ویسـتی دەمکوتــی بکاتو بیبەزێنێت.
٤-(البَرَم): ١-بەدزمانــی ڕژدو ڕەزیل. ٢-وردە بەرسیلە کە سەرەتا دەردەکەوێت.
(ألبُرُوم): خەڵکێکی بەدڕەوشــتی بەدخوو/ سەرسەری.
(ألبُرما) (ترکیة): برمە (جۆرە شیرینییەکە).
(ألبُرْمَــة )ج) بُــرَم و بِــرام): مەنجەڵــی بەردین.
(ألبَریم): لەشکر/ سوپا.
(البَریمــة): برێــم/ کونکــەرە (ئامێــری کونکردن).
٥-(البَرمائِــيّ- مِــنَ الــدَّوابِّ والزَحافات): چوارپێو خوشـۆك کــە لە وشـکانیو ئاودا دەژی.
(ألْبَرْمائِیَّــة): ئوتومبیلێکــە کــە لــە ئــاوو وشکانیدا دەڕوات.
٦-(ألْبِرمیــل (ج) بَرامیــل): پیــپ کــە لە تەختەدار دروستدەکرێتو بۆمەیو شتیترە.
برن: ١-(ألبَرناسِــیَّة) (فرنسیة): ڕێڕەوێکی ویژەیی ئەو شــاعیرانەیە کــە بەربەرەکانێی شــیعری ڕۆمانتیکیو گۆرانیســازییان کردو

ڕوویانکــردە وشەســازدانو شــێوەکاریی ڕازاندنەوەی پەردەی هەڵبەســتو وشــەیان لامەبەست بوو.
٢-(البَرنامــج (ج) بَرامِــج) (فارسـیة): ١-لە بنچینــەدا بەو کاغەزە وتــراوە کە کۆی ژمێرە بووە/ لیســتەی ژمێرە. ٢-بلاوکراوەی بەرنامەی ئاهەنگێرانە یان مەرجی پێشبڕکێیە ٣ بەرنامەو پلانــی کاری یەکێکە کە بیەوێت بیــکات. عەرەبییەکــەی: ١-المنهــاج: بەرنامە ٢-المیزانیة: بۆدجە.
٢-(بَرْنَــسَ- هُ): بەرگــە کڵاودارەکەی لەبەر ئەو کرد (فرنسیة)
(تَبَرْنَــسَ): بەرگەکڵاودارەکــەی لەبەرکرد (فرنسیة)
(ألبُرْنُس) ١: هەموو بەرگێك کە کڵاوێکی پێوە بێتو لێبکرێتەوەو لێیجیابێت. ٢ کڵاوقووچ کە لە سەرەتای ئیسلامدا لەسەر دەکرا.
(بْرِنْس (م) بْرِنسِسْ) ١: میر ٢-نازناوی هەموو ئەندامێکی فامیلیای شاهی بوو (فرنسیە).
٤-(ألبُرْنَیطَة) = (القلنسُوة) (ایطالیة): کڵاو.
٥-(البَرْنِیَّــة) (ج) بَرانــيّ): گۆزەڵەیەکــی کاشی.
برە: ١-(بَرِهَ. بَرَهاً): لەشــی خۆش بووەوەو هاتەوە بــە خۆیــدا/ پاش نەخۆشــییەکەی بەخۆیدا هاتەوە.
(أبْــرَە (م) بَرْهــاء (ج) بُــرْە): لــەش

بەخۆداهاتوو/ خاسەوەبوو.

(أَبْرَهَ): بەڵگەی هێنایەوە.

أَلبُرهَة والبرهَـــة (ج) بُرَه و بُرهات): دەم: ســاتێك/ ســەردەمێكی كەم یــان زۆر/ تاو – چاخێكی كەم یان زۆر.

٢-(أَلبَراهِمَة): نۆكەرانی خودای هیندییەكان كە براهمایە.

(بَرَهْمَن): نۆكەرێكی ئەو خودایەیانە.

٣-(بَرهَنَ- الشـــيءَ وعَلَيهِ وعَنهُ): شتەكەی بە بەڵگە سەلماندو بە بەڵگە روونیكردەوە.

(تَبَرْهَنَ الشيءُ): شتەكە بە بەڵگە سەلمێنرا.

(أَلبُرهــان (ج) بَراهِين): ١-بەڵگــەو بیانوو ٢-سەلماندن.

بــرو: ١-(أَلبــرواز) (فارســية) = إطــار: چوارچێوەی وێنەو شتیتر.

٢-(أَلبُروتِســـتو (لاتينيـــة):١-ســكاڵاكردن و دەبرینـــی جۆری ئەو ســكاڵایەو دیاریكردنی زیانــەكان. دووانــی: (بروتســتوان) (ج) (برۆتســتوات) ٢-ئــەو نامەیەی ئــەو جۆرە سكاڵانامەیەی تێدا دەنووسرێت.

(«عَمَــلَ البُروتســتو»): ســكاڵانامەیەكی نووسیو بەڵگەی پیشاندا.

(سَحَبَ البُروتستو): سكاڵانامەكەی كێشایەوەو بەڵگەی پیشاندا.

٣-(البُروتِستانتي) (فرنسية) ئەوەی سەر بە رێرەوی پروتستانت بێت (لە ئاینی دیانەكاندا كە بەشێكن لە جیهانی دیان.

٤-(بروتوت) (ف): برۆتۆن (ناوكی هایدرۆجین واتا ئوتۆمەكەیەتی كە كارەباییەكەی لەدەستدا بێت.

٥-(أَلبُروليتاريا) (لاتينية): چینی كرێكار.

٦-(أَلبروم)(ك): تەنێكی سادەیە، بۆگەنە، لە ئاوی دەریا دەردەهێنرێت بە شێوەی شلەیەكی سووری ژەهرداره هێماكەی (Br)ە.

(بَروُمُــور) (يونانية): ناوێتەیەكە پێكهاتووە لە برۆم و تەنێكی سادە/ یەكێكە لە ئاوێتەكانی برۆم.

٧-(أَلبرُونز أو الصفر) (ك): زەرد: تێكەڵییەكی مس و قورقوشــمە بۆ دروســتكردنی زەنگ و پەیكەر بەكاردەهێنرێت و بۆ شتیتریش.

٨-(أَلبَروميــتر): بارومەتــر پەســتانپێوی هەوایە لەوانە پەستانپێوی هەوای تۆماركەر.

بــرا: (بَرا وأبْــرَى- الناقَةَ بَــرْواً و إبْراءً): قوڵفەی كردە لووتی مێحوشترەكەوە.

(أَلبُــرَةُ (ج) بُرَى وبُــرات و بُرِين وبِرِين): هەموو ئەڵقەیەك/ قوڵفەیەك ســا بازن بێت یان لووتەوانە بێت یان پاوانە بێت.

(«أعْطَتْهُ الدُنيا بُرَتَها»): جیهانی دەســتگیر بووەو تیایدا سەركەوتوو بووە.

بری: ١-(بَرى وابتَرى السَّهَمَ والقَلَمَ. بَرْياً): نووكی تیرەكەو قەڵەمەكەی دادا.

(إنْبَرى القَلَمُ والسَّهمُ): نووكی پێنووسەكەو تیرەكە دادرا.

(بُرِيٌّ و مَبْرِيٌّ): نووكدادراو.

(بَرى – الشَخْصَ): زەلامەکەی لە رو بێهێزکرد.
(ألْبارِي): نووکـدادەری پێنووس‌و تیژکەری نووکی تیر.
(«أعطِ القَوسَ باريها»): کارەکەت بە شـارەزا بسپێرە.
(ألْبرايَــة والبُــراء): داتاشـین و تاشـین‌و نووکتیژکردن.
(ألبَرَّاءَة والمِبْــراء والمِبْراة): ١-چەقۆ ٢-رەندە ٣-نووکدادەر ٤-خامەتاش.
(ألإبْرِيَــة والتِبْرِيَة): کرێشـی سـەر کە بە داهێنان بەردەبێتەوە.
٢-(أبْرى): خۆڵی لێنیشت.
(ألبَرَى): خۆڵ/ گڵ.
٣-(بارَى- إمرَأتَه): ژنەکەی لەسـەر دەسـت لێکبەردان/ تەلاقدان قایلکرد.
(- الرَجُلَ): پێشبڕکێی لەگەڵدا کرد.
(تَبارَيـا): پێشـبڕکێیانکردو بەریـان لـە یەکتریگرت.
(إنْبَرى- لَهُ): بەری لێگرت‌و بەرەنگاری بوو.
(تَبَرَّى- لِمَعروفِهِ): بەرچاکەو پیاوەتیی ئەو کەوت.
٤-(ألبارِي (فـا): ١-پەروەردگـار/ داهێنەرو دروستکەر ٢-تیرتاش.
(ألبَرِيَّــة): ١-دروسـتکراوی خـودا ٢-مرۆڤ/ خەڵك.
٥-(ألبرِيفِه): بروانامەی سەرەتایی بالا.

الملحق:
بري: (ألبَروَة): بنیسکە سابوون.
(ألْمُبــاراة (ج) مُبارَيــات): پێشـبڕکێ یان ململانێ لە نێوان دوو کەس یان پتر. دوو تیپ لە بــواری بیر یان وەرزش یــان هی تردا و بە پێی دەستوورێك کە بۆی دانرابێت.
(مُرَشَّــحون لِمُباراة): پاڵێوراوانی پێشبڕکێی یارییەك.
(مُباراةٌ في كُرَة الطائِرَة): پێشـبڕکێی یاریی تۆپی باسکەی نێوان دوو تیپ.

---

بزّ: ١-(بَزَّ- ُه. بَزّا و بِزِّيزَى: بەسـەریدا زاڵ بوو/ بەزاندی.
٢-بَــزَّ- ُه. بَــزّ و بِزِّيزَى: بەزۆر لێیســەند/ رووتیکردەوە.
(بَزَّ- الشــيءَ مِنــهُ): بە زۆر لێیســەند/ بە نابەدڵیی لەدەستی دەرهێنا.
(إبْتَزَّ- مِنهُ الشيءَ): شتەکەی بە زۆر دارەکەی لە چنگ دەرهێنا.
٣-(البَزّ (ج) بُزوز): ١-چەك ٢-پۆشـاکێك کە لە کەتان یان لۆکە دروستکرابێت.
(أَبِزَّة): ١-پۆشاك/ جل ٢-چەك ٣-سەروسیما/ قەلافەت/ دیمەن.
البَزّاز: بازرگانیی کوتاڵ.
(ألبِزازَة): کووتاڵفرۆشی.
٤-(بَزْبَز): ١-خێرا رۆیشــت ٢-خێرا لێیخوری ٣-هەلات ٤-زۆر بزوا/ بزێویی زۆر کرد.

يزب: (ألْبَزبورط وبَسابورط = جَوازُ السَّفَر (ايطالية): پەساپۆرت/ گوزەرنامە.

بزج: (بَزَجَ- عَلَيَّ فُلاناً. بَزْجاً): فیساری لێ هاندام: لێیتیژکردم.

٢-(بَزَجَ. بَزْجاً): شانازییکرد.

(بازَجَ- هُ وتَبازَجا): شانازیی بەسەردا کردو شەرە شانازییانکرد.

٣-(بَزَّجَ- هُ): رازاندیەوەو چاكو جوانیکرد.

بزخ: ١-(بَزِخَ. بَزَخاً): سنگی دەرپەڕیو پشتی بەناودا چوو.

(أبْزَخ (م) بَزخاء (ج) بُزخ): کەسێکە سنگی دەرپەڕێتو پشتی بەناودا بچێت.

(تَبازَخَ): وەك سنگدەرپەڕیوو پشت بەناواچوویەك رۆیشت یان دانیشت.

٢-(بَزَّخَ- لَهُ): سەری بۆ شۆڕکردو لەبەردەستیدا زەبوونیی نواند.

(تَبازَخَ- عَنِ الأمرِ): لە کارەکەدا سستیکردو خۆی دواخست.

بزر: (بَزَرَت الإناءَ. بَزْراً): قاپەکەی پڕکرد.

٢-(بَزَرَ و بَزَّرَ- القِدرَ): بەهاراتی کردە مەنجەڵەکەوە.

(«فُلانُ بَزَرَ کَلامَهُ وتَوبَلَهُ»): فیسارکەس بەهاراتی بە قسەکەیەوە کرد واتا خۆشیکردو لێیزیادکرد.

(ألبِزْر (ج) أبْزار و (جج) أبازیر): بەهارات.

(«مِثلي لا یَخفی عَلَیهِ أبازِرَكَ»): یەکێکی وەکو من قسەرازاوە فشەهەڵدراوەکانت نامخەڵەتێنێت.

(ألبَزّار): بەهاراتفرۆش.

(البَیزَر): چەکوشی بەهاراتهاڕ بەهاراتفرۆش.

٢-(بَزَرَ- الحُبوبَ. بَزْراً): تۆوەکانی وەشاندو چاند.

(ألبِزْر (ج) بُزُور): تۆو/ تۆمە/ تۆوی چاندن/ ناوکی بەری درەخت.

(ألبِزرَةُ): دەنکە تۆوێك بە بەرێکیش دەوترێت کە وشك بووبێتو دەمی نەکردبێتەوەو تۆوێکی تێدابێت، هەروەها بە کۆمەڵە تۆوێك کە لە بەرێکدا بێت — (ز) هەموو دەنکە تۆوێکە کە بچێنرێتو بوەشێنرێت.

(ألبَزّار): تۆوفرۆش/ دانەوێڵەفرۆش.

٤-(البَیزَر): داری/ چیلکەی خومگەر.

(البَزراء): بە تۆو. بە بەر.

(المَرأةُ البَزراء): ژنێکە کە سك زۆر بکات. منداڵی زۆر بێتو بەبەربێت.

(البَیْزار (ج) بیازِرَة) (فارسیة): ١-بازهەڵگر/ بازدار ٢-کێڵەر/ جوتیار.

بزغ: ١- (بَزُغَ الغُلامُ. بَزاغَةً): مێردمنداڵەکە جوانبوو هەڵیداو بەخۆیدا هات.

(بَزیغ (م) بَزیغَة): کوڕ یان کچی بەخۆدا هاتوو و شێوە شیرینو رووکراوەو ژیر.

(تَبَزَّغَ الغُلام): مێردمنداڵەکە بە خۆیدا هات ژیرو روو کراوە بوو.

(البُزاغ والبَزيغ- مِنَ الغلمان): مێردمنداڵی زمانشیرینو رووکراوەو ڕۆح سووك.
٢-(تَبَزَّغ – الشَّرُ): خراپە لە ئەندازە بەدەر بوو.
٣-(ألبُزاغ): مێردمنداڵی ڕووکراوە کە بێشەرم قسە بکات.
(ألبَزيغ): گەورەیەکی خانەدان/ وەجاخزادە.
بـــزغ: ١-(بَزَغَ- تِ الشَّـــمسُ: بَزْغاً و بُزُغاً): خۆرهەڵهات/ گزنگیدا.
(إبتَزَغَ- الرَّبيعُ): بەهار سەریهەڵدا.
(بَوازِغ): هەڵهاتووەکان.
(نُجومٌ بَوازِغ): ئەستێرە زوو هەڵهاتووەکان.
٢-(بَـــزَغَ- دَمَهُ. بَزْعاً و بُزوعاً): خوێنەکەی لەبەر ڕشت.
(- الحاجم أو البيطار): عەجاماتگرەکە یان بەیتاڵەکـــە پێســـتەکەی هەڵدڕی تـــا خوێنی لێبگرێت یان خوێنی لەبەر بهێنێت.
(المِبـــزَغ): ئامێـــری هەڵدڕیـــنو ئامێـــری عەجاماتگرتن.
بزق: (بَزَقَ. بَزْقاً): تفیکردەوە/ تفیڕۆکرد.
(البُزاق = البُصاق): تفی ناودەم.
(ألبَزّاق)(ح): جۆرە هێلکە شـــەیتانۆکەیەکە زیندەوەرێکـــە لـــە بنەچـــەی زینـــدەوەرە نەرمەکانـــە بـــە زۆری لە وڵاتە ســـاردەکانو زەویە شـــێدارەکاندا دەژی گیای زەویو بەری وەریو دەخوات.
(بُـــزُق) (ترکیـــة): تەمـــوورە (ئامێرێکـــی مۆسیقایە).
(ألباش بوزوق) (ترکیة): دەستە سەربازێکی سوارەن.
(بـــزل: بَـــزَلَ و بَـــزَّلَ الشـــيءَ): شـــتەکەی کوناودەرکرد.
(تَبَزَّلَ و إنْبَزَلَ)/ کوناودەر بوو/ سمرا.
(تَبَـــزَّلَ الشَّـــرابَ): شـــەربەتەکەی پاڵاوتو سافکرد.
(تَبَـــزَّلَ وابْتَـــزَلَ الخَمْرَ): قاپـــی مەیەکەی کونکرد.
(إسْـــتَبزَلَ –الخَمْـــرَ): مەیەکـــەی پـــاڵاوتو سافکرد.
(ألبَزال): کونکەرە/ سمۆ.
(ألبُزال): شـــوێنی کونکردنی قاپی مەی/ ئەو شـــوێنەی کە شـــەراب یان مەیەکـــە، یان هەر شتێکیتری لێوە ڕۆدەکرێت.
(المِبزَل):١ کونکەرە ٢-شەربەتپاڵێو/ مەیپاڵێو.
٢-(بَـــزَلَ و بَزَّلَ- الشَـــيءَ بَزْلاً): شـــتەکەی قڵیشاند دەرکیتێکرد.
(بَـــزَلَ- البَعيرُ. بُزُولاً): حوشـــترەکە کەڵبەی دەرکرد/ کەڵبەی سەری دەرهێنا.
(- نابُ البَعيرِ): کەڵبەی حوشترەکە دەرهات.
(بـــازل) (ج) بَوازِل وبُزَّل وبُـــزُل:١-کەڵبەی حوشتر ٢-حوشتیری کەڵبەدەرهاتوو.
(تَبَزَّلَ الشيءُ): شتەکە قڵیشیبرد.
(إبتَزَلَ- الجَسَدُ): لەشەکە خوێنی لێتکا.

(- السَّقاءُ): ئەوەی لە مەشکەکەیان کوندەکەدا بوو تکەتکە لە بەری ڕۆیشت.

(إستَبْرَلَ- الشيءَ): شتەکەی کردەوە.

(ألبـازِل): دانێـك کـە لـە کاتـی خۆیـدا سەردەربهێنێت.

٣-(بَـزَلَ- الأمرَ): کارەکەی بردە سـەرو کۆتایی پێهێنا.

(بَـزَلَ و بَـزَّلَ- رَأيَـهُ): ڕای تـازەی خۆی خستەڕوو و داهێنا.

(ألبازِل): پیاوی پسپۆڕ.

(«رُمِيَ بِأشـهُبِ بـازِل»): تووشـی کارێکی گرانیانکرد.

(ألبَزْلاء): ١-ڕای چاكو دروست.

(«إمْرَأةٌ بِزلاءُ الرأي»): ژنێکی ڕا دروسـتو چاك.

(«خِطَّةٌ بَـزْلاء»): ڕەنگرێژێك/ پلانێك کە ڕاسـتو ناڕاست لە یەك جیابکاتەوەو دەریان بخـات/ تۆکمە بێـت. ٢-گرفتاریی سـەخت/ چورتومو وەیی گران.

(ألبَزْل): سەختیی/ توندوتیژیی.

٤-(ألبُزْل) (ح): جۆرە بزنە کێوییە کە ڕۆنی بیزواری لێدەگیرێت.

بزم: (بَزَمَ- عَلَيهِ. بَزْماً): بە دانی پێشەوەی گازی لێگرت.

(- بالشَّيءِ): شتەکەی هەڵگرت.

(- فُلاناً ثَوبَهُ): جلەکەی لێ داگیرکرد.

(- النّاقَةَ): مێحوشـترەکەی تەنها بە پەنجە گەورەو پەنجەی شایەتمان دۆشی.

(- وَتَـرَ القَـوس): بـە پەنجـەی گـەورەو شـایەتمان ژێی کەوانەکەی ڕاکێشاو تیرەکەی هاویشت.

(ألبَزيـم): ١-گەڵا یان توێکڵـی دارخورماکە. سـەوزەی پێدەبەسـترێت. ٢-مـاوەی شـلەی بێگۆشـت کـە لـە بنـی مەنجەڵەکـەدا دەمێنێتەوە.

بزا: (بَزا- عَلَيهِ. بَزواً): بە گژیدا چوو.

(بَزا- هُ و أبْزاهُ وأبْزى عَلَيهِ): بەزاندیو پێی وێرا/ دەرەقەتی هات.

(بَـزا و بَزِيَ. يَبْـزى وأبزى بَـزاً و إبْزاءً): سنگی دەپەڕیو پشتی بەناودا چوو.

(أبْزى (م) بَزواء): سنگ دەرپەڕیوی پشت بەناودا چوو.

(تَبـازي): ١-خۆی کـرد بە بازدار ٢-سـمتی دەرپەڕاندو/ لە ڕۆیشتندا لەنجاندی.

(ألبَزو): هاوچەشن/ هاو وێنە.

(ألبَزيّ): مەمکەخۆرە.

(«هُـو بَزِيّـی»): ئـەو هاوشـیرمە/ بـرای شیریمە.

(البَزاء): چەرداوەرووی بێنابرو.

(ألبـاز والبـازي) (ح): بـاز (باڵندەیەکـی گۆشتخۆرە ڕاوی پێدەکەن.

بـسّ: ١- (بَـسَّ- الإبِـلَ بَسّـاً): هێـواش

حوشترەکەی لێخوڕیو یخەی لێکرد.
(بس بس): یخە یخە.
أ (بَسَّ- الإبِلَ): هێواش حوشترەکەی لێخوڕیو یخەی لێکرد.
(أبَسَّ-بالنَّاقَةِ): مێحوشترەکەی بۆ دۆشین لاواند.
(إنْبَسَّ): کشا.
(بِسْ بِسْ و بُسْ بُسْ): یخە یخەو گدی گدیو وەحە وەحە لە حوشترو مەڕ دەکەیت بۆ بانگکردنو دەرکردنیانو لێخوڕینیان.
ألبَسوس (ج) بُسُس: مێحوشترێك کە بە بێ لاواندن شیرنەدات.
٢-(بَسَّ- القَومَ – عَنهُ): خوێشگەلی دەرکردو لێی دوورخستەوە.
(إنْبَسَّ): وازیهێناو لاچوو.
(بَسْ= حَسَبْ): بەس.
٣-(بَسَّ- المالَ في البِلادِ): داراو ماڵەکەی ناردە وڵاتو بڵاویکردەوە.
(- عَقارِبَهُ): پیاوە بەدزمانەکانی خۆی بەم لاولادا بڵاوکردەوە.
٤-(بَسَّ – السَّوِيقَ): ئاردە وردەکەی چاندە ناو ڕۆنە شلەکەوە یان ڕۆنەکەوە.
(ألبَسِیسَةُ): پەسیسە، ئارد تێکەڵ بە ڕۆن بکرێت یان ڕۆنی شل بکرێت. ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن: (ألَمسِیسَة).
٥-ألبَسّ و البِسّ (ج) بِسَاس (ح): ١-پشە/ پشیلە ٢-ڕەنج/ کۆشش.
(ألبَسِیس): کەمەکە خواردنێك.
(أبَسُوس): ئافرەتێکە لە خێڵی بەکر کە بە هۆمیوە شەڕێکی چل ساڵیی لە نێوان بەکرو (تەغلوب)دا ڕوویداو پێیدەڵێن شەڕی بەسوس. بۆ شوومیی کراوە بە پەند دەڵێن: لە بەسوس چارە ڕەشترە.
٦-(بَسبَسَ) بِالغَنَمِ أو الإبِلِ): دەنگی لە مەڕەکە یان حوشترەکە کرد یان بانگیکردن.
(بَسبَسَ – بِهِ): پێیوت بەسە بەسە.
(ألبَسْبَسَ: (ج) بَسابِس): چۆڵەوانییەکی وشكو بێئاو ٢-فیشاڵو درۆو دەلەسە.
تُرَّهاتُ البَسابِس: فیشاڵو درۆو دەلەسەی هیچو پووچ.
بست: ١-(ألبُستان (ج) بَساتِین): باخو بێستان (کە دارو/ کشتوکاڵی تێدایەو پەرژینو دیواری هەیە.
(ألبُستانِي): ١-باخەوان ٢-خاوەن باخ.
(- (ن) مِنَ النَّباتِ: ڕووەکی ناوباخ کە ڕووێنرابێت پێچەوانەی ڕووەکی دەشتیو سروشتیی.
٢-(بِسْترِینَة) (ایطالیة): خەڵاتی ڕۆژی سەری ساڵی فەڵەکان/ دیانەکان.
الملحق:
بست: (بَسْتَرَ): بەستەرەی شتەکەی کرد.
(ألبَسْتَرَةُ): ڕێگەو چۆنیەتی پاکژکردنی

هەندێك خۆراك وەك شیر بە ڕێگەی باستۆر کە زانایەکی فەرەنسیی بوو ئەویش بە گەرمکردنی تا ٧٥-٨٥ پلەی سەدیی بەوە میکرۆب دەمرێت چێژو ڤیتامینەکانیش دەمێنێتەوە.

(اَلبَسْتَنَة): زانستی باخداریی.

بسر: (بَسَرَ. بَسْراً و بُسُوراً): ڕووی گرژ کرد.

---

(باسِر): ڕووگرژ/ مۆن. لەمەوە بە شێر دەڵێن: (اَلبَسور): شێر واتا ڕوو گرژو تاڵ.

(اُبْتُسِرَ- لَونُهُ): ڕەنگی (گۆڕرا/ تێکچوو).

٢-(بَسَرَ- هُ. بَسْراً): شکاندی/ بەسەریدا زاڵ بوو/ بەزاندی.

(- القُرحَة): برینەکەی پێش گەیشتنی گوشیو بەستی.

(أَبْسَرَ القُرحَة): برینەکەی گوشیو بەستی.

٣-(بَسَرَ- هُ بَسْراً): پەلەی لێکرد.

(- النَخلَةَ): پێش دەم خورماکەی تۆوە نێر پرژێنکرد.

(بَسَرَ وتَبَسَّرَ وابْتَسَرَ الحاجَةَ): پێش کاتی خۆی پێداویستیەکەی خواست.

(أَبْسَرَ- النَخلُ): بەری دارخورماکە ماتەیدا.

(أَبْسَرَ- النَخلَةَ): پێشدەم دارخورماکەی تیو نێر پرژێنکرد.

أَلبُسر: فەریکە خورما خورماکە ماتەیدا بێتو پێنەگەیشتبێت.

(أَلبُسرَة): دەنکە خورمایەکی ماتەداوی زەردبووی پێنەگەیشتوو.

(«ج» بِسار) / فەریکە خورماکان.

٤-(بَسَر وأَبْسَرَ- النباتَ): ڕووەکە ساواکەی کرد بە قەرسیلو ئاژەڵەکەی تێکرد. کردی بە لەوەڕگا.

(إِبْتَسَرَ- الشيءَ): بە تەڕو بڕیی شتەکەی بردو وەرگرت.

(أَلبُسر): نۆبەرەی هەموو شتێك/ تەڕو تازەی هەموو شتێك.

٥-(إِبْتَسَرَ- بالأَمر)/ دەستی بە کارەکە کرد.

٦-(البَسر): ئاوی سارد.

(وَجهٌ يَسْرٌ): ڕوویەکی سارد.

(أَلباسور (ج) بَواسِير) (طب): مایەسیریی (دەردێکی کۆمە کە بە هۆی کشانی دەماری کۆمەوە پەیدا دەبێتو خوێنی لەبەر دەڕوات.

(أَلمَبسور): مایەسیریدار.

(أَلمُبسِرات): بای باران.

بسط: ١- (بَسَطَ- الرَجُلَ بَسْطاً): دڵی پیاوەکەی کردەوەو دڵی خۆشکرد.

(بَسُطَ- بَساطَةً): ١-سادەو ساویلکە بوو ٢-زمانی بە گەمەو خۆشیی کرایەوە.

(باسَطَ- هُ): ڕووی خۆشی تێکردو لەگەڵیدا کراوە بوو.

(تَبَسَّطَ): گەڕانو سەیرانیکرد.

(إِنْبَسَــطَ): ١-دڵیكرایەوەو ڕووی گەشایەوە/ ڕووخــۆش بــوو. ٢-كەوتە گەمەو ســوعبەت ٣-كەوتە گەڕانو سەیرانكردن.

(ألبَســیط (ج) بُسَــطاء): ســاكار/ ســادەو ڕووخۆشو گەمەباز.

(بَسِیطُ الوَجهِ): ڕووخۆش.

٢-(بَســطَ- الرَجُلَ. بَسْطاً): پیاوەكەی بوێر كردو شادیشیكرد.

(تَبَسَّــطَ وانبَسَــطَ): بوێر بوو شەرمیشكاو ڕووی كرایەوە.

٣-(بَســطَ- فُلاناً عَلَیهِ. بَسْطاً): فیساری لەو لە پێشتر گرت.

(- العُذرَ): بیانووی پیشاندا: ١-عوزرخوایی بۆ هێنایەوە. ٢-بیانووی لێوەرگرت.

٤-(بَسَطَ- الیَدَ- بَسْطاً): دەستی درێژ كرد.

(-السَّیفَ): شمشێرەكەی هەڵكێشا.

(- المَكانُ القَومَ): شوێنەكە خوێشگەلیگرت.

(تَبَسَّطَ وانبَسَطَ): ١-بڵاوبووەوە ٢ درێژبووەوە.

(- تَبَسَّطَ وانبَسَطَ و بَسَطَ- الثَّوبَ): جلەكەی هەڵخستو بڵاویكردەوە.

(یَدٌ بُسْطٌ و بُسُطٌ): دەستێكی كراوەو بەرەڵاو درێژەوەبوو.

(«بَسیطُ الیَدَینِ»): جوامێر/ بەدەستو دڵ/ خێرخواز.

(ألبَســیط (ج) بُسَــطاء): زەویــی بەربڵاوو فراوان.

(بَسیطُ القَلب): ساویلكەو بێفروفێڵ. (هـ).

بَسیط: ڕوو.

(بَسیطُ إسطواني): ڕوویەكی لوولەكیی.

(ألبَسَاط): زەویی بەربڵاوو فراوان.

(ألبساط) (ج) بُسُط: ڕایەخ. فەرش. كلیم.

(ألباسِــطُ): خودای مەزن، چونكە بۆ ئەوەی بیەوێت ڕۆژیی بۆ فراوان دەكات.

(ألباسِطَة): ماوەی دوور.

(ألبَســیطَة): زەمین/ ڕووی زەمین/ زەوییو هەرچی لەسەریەتی.

(ألبَسْطَة): فراوان بوون.

(«زادَ بَســطَةً في العِلمِ والجِسْــمِ»): زانست زۆرو گوشادو لەش تەواو بوو.

(بُسْــطَةُ العَیْــشِ): خۆشــگوزەرانییو تێرو تەسەلیی/ دارایی.

(بَسطُ العیَش): خۆشبوونی ژیان.

٥-(بَسطَ العَملیات الجَبریَة بَسطاً مِن ضَربٍ وجَمعٍ وغَیرِهما) (ع. ح): كردە جەبریەكانی كردو كورتیكردنەوەو بە ئەنجامی گەیاندن.

(ألبَســیطُ): ١ سادە/ ساكار/ سووك ٢-كێشێكە لە كێشەكانی شیعری عەرەبی كە (مُسْتَفْعِلُن فاعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ فَعِلُنْ).

٦-(ألبَسطُرْما (تركیة): باستورمە.

الملحق:

(بسط): (ألبَسْط – في عِلم الحساب قدیما): ســەرەی كەرتی ئاســایی كە ئەمڕۆ پێیدەڵێن

(اَلصُورَة).

(اَلبَسْــط – فِي التَصَوُّف): ڕەوشی یەکێکە کە هەمــوو دنیا دەگرێتە باوەش و هیچ نییە ئەو بگرێت.

(بســق): ١-(بَسَق. بَسْــقا): بەلغەم یان تفی فرێدا/ ڕۆکرد.

٢-(بَسَــقَ- النَّخْــلُ. بُسُــوقاً): دار خورماکە (بالآیکرد/ بەرزبووەوە).

باسِق: بەرز/ بلِّند.

(بَسَقَ أَصحابَهُ و علَى أَصحابِهِ): لە پیاوەتی و مەردایەتیــدا لە هاوڕێ و دۆســتەکانی بەرزتر بووەوە.

(بَسَّقَهُ): درێژیکرد.

(تَبَسَّقَ): درێژ بوو/ بالآیکرد/ بەرزبووەوە.

٣-(الباسِقَهُ (ج) بَواسِــق):١-چورتوم/ وەی/ کۆست. ٢-هەوری سپی بێگەرد.

(بَواسِــقُ السَّــحابِ): هــەوری ســەرەتا دەرکەوتوو.

(بسك): (اَلبِســكوتی) (فرنسي): ١-پسکیت. جــۆرە نانێکــی ڕەق و وشــکە دەتوانرێــت ماوەیەکــی زۆر هەڵبگیرێــت بــە تایبەتی بۆ ســەربازو دەریاوانەکان. ٢-جۆرە شیرینییەکە لە ئاردو شــیرو شــەکر یان لە ئــاردو هێلکەو شەکر دروستدەکرێت. (فرنسیە).

٢-(اَلّبِســكُولُوجيا) (یونانیــة): زانســتیی دەروون یان زانستیی فەلسەفەی ئاوەزیی.

بســل: ١- (بَسَــلَ- الرَجُلُ. بُسولاً): پیاوەکە لە تووڕەبووندا یان لە ئازایەتیدا ڕووی گرژو تاڵکرد.

(بَسْــل و بَسِيل): گرژو تاڵی ڕق هەستان یان ئازا بوون.

(بَسُلَ. بَسالَةً و بَسارً): دلێرو نەبەرد بوو. لە ئازایەتیدا ڕووی گرژ کرد.

(إِسْتَبْسَلَ): قارەمانانە جەنگی و خۆی هاویشتە باوەشی مەرگەوە بکوژێت یان بکوژرێت.

(اَلبَسالَة): دلێریی/ ئازایەتیی. نەبەردیی.

(الباسِــل (ج) بَواسِــل): ١-شــێر ٢-قارەمان/ نەبەرد/ دلێر/ ئازا.

(«یَومٌ باسِل وغَضَبٌ باسِل»): ڕۆژی سەخت و تووش و توورە بوونێکی توندو سەخت.

٢-(بَسَلَ النَبیذُ بسُولاً): مەیەکە تیژ بوو.

(البَسَل): توندوتیژیی.

(اَلبَسيل): پاشماوەی مەی لە قاپەکەدا.

٣-(بَسَلَ- اللَّحْمُ. بُسُــولاً): گۆشتەکە بۆگەن بوو.

٤-(بَسَلَ- هُ. بَسْلاً): سەرزەنشتیکرد.

٥-(بَسَــلَ- هُ عَــن حاجَتِهِ بَسْــلاً) (ضد): ١-ڕێــی پێداویســتیەکەی لێگرت. نەیهێشــت دەســتی بیگاتێ/ نەیدایە ٢-(ضد) بۆی شیاو حەڵاڵکرد ٢-بۆی ناشیاوو حەرامیکرد.

(أَبْسَلَ- اللهُ الشيءَ): خودا شتەکەی حەرامکرد.

(اَلبَسْــلُ) (ضد): ١-حەڵاڵ/ شــیاو ٢-حەرام/

نەشـــياو. (بۆ تاك و كۆو نێـــرو مێ وەك يەك بەكاردێت).

(«هذا بَسْلٌ عَلَيْكَ»): ئەمە بۆت حەرامە.

(«بَسْلاً لَهُ»): جەهەنەمی لێپربێت.

(اَلْبَسيل): حەرام/ نەشياو/ ڕێپێنەدراو.

٦-(بَسَّلَ- هُ): نەويستيكرد/ بێزراويی.

(اَلْبَسيل): بێزراو/ ڕەزاتاڵ/ چارمگران.

(اَلْبَســالَة): ڕقلێبـــوون/ لێبێزاربـــوون/ بێزراويی.

٧-(أَبْسَــلَ- هُ): ١-بارمتەيكــرد/ بــە بارمتە داينا.

٨-(البِسلّى) (ن): پۆڵكە.

بسم: ١- (بَسَــمَ و تَبَسَّمَ وابْتَسَــمَ. بَسماً): زەردەخەنەيگرت.

(باسِــم مُبتَسِــم): زەردەخەنەگرتــوو/ دەم بەخەندە.

(اَلْمَبْسِم) (ج) مَباسِم): دەم.

(اَلْبَسّــام والمِبْســام): هەميشــە دەم بــە زەردەخەنەو بە خەندە/ ڕووخۆش.

٢-(البَسْــمَلَةُ- عِنــدَ النَّصــارى): لــەلای فەلەكان: بــە ناوی باوك و كوڕو گيانی پيرۆز. لــە لای موســڵمانەكان: بە ناوی خــودای پڕ بەزەيی و دڵاوا (بِسْــمِ اللهِ الرَّحمنِ الرحيم): بيسميلايكرد.

بســن: (أَبْسَــنَ): ڕەنــگ و ڕووی چاكبــوو و قەڵافەتی ڕێكبوو.

بشّ: ١- (بَشَّ. بَشّــاً و بَشاشَــةً): ڕوی خۆش بوو/ ڕووی كرايەوە.

( -لِلشَّيءِ): دڵی بە شتەكە كرايەوە/ شتەكەی پێخۆش بوو.

(- بالصَّديق): ١-بە ڕوی گەشــەوە پێشوازيی لە دۆســتەكەيكرد. ٢-بە بينينی دۆســتەكەی شاد بوو.

(بَشّ و باشّ و بَشُوش و بَشّاش): ڕووكراوەو پێ شاد بوو. ڕووخۆش.

أَبَــشَّ- تِ الأَرضُ/ زەويەكــە گيــاو ڕووەكی چاكی هێناو تێكئاڵاند.

٢-(بَشْــبَشَ الرَجُل): ڕووی گەش و خۆشــی نواندو شادبوو.

(تَبَشْــبَشَ- بِهِ): ڕووی خــۆش بۆ نواند/ بە ڕووخۆشييەوە پێشوازيی لێكرد.

بشــت: (أَلبشــتَخْتَة) (تركيــة): ســنوقی بچووك.

بشــر: ١-(بَشَــرَ الجلــدَ بَشــراً): پێســتە تووكاويەكەی تاشی.

(- الشــارِبَ): ســمێڵەكەی ســووككرد تــا پێستەكەی دەركەوێت.

(- الجَــرادُ الأَرْضَ): كوللەكــە زەويەكــەی ڕووتكــرد/ هەرچی ڕووەكێك لــە زەويەكەدا بوو خواردی.

(أَبْشَرَ- الشيءَ): شتەكەی پاككردو توێكڵەكەی گرت.

أَلبَشرة (ج) بَشر): پێستی سەرەوەی لەش.
(أَلبُشـارَة): ئەوەی لـە پێسـت کراوەتەوەو تاشراوە.
(-المِبْشَرَة): مەکینەو ئامێری تاشین.
(مِبْرَشة) (عامية): توێکڵتاش.
٢-(بَشَـرَ- الأمرَ. بَشْراً): بە تەنگ کارەکەوە هاتو گرتیە ئەستۆی خۆی.
(باشَـرَ- الأمْـرَ): کارەکەی گرتە ئەسـتۆی خۆیو دەستی پێکرد.
٣-(بَشَـرَ و بَشِـرَ و أبْشَـرَ واسْتَبْشَرَ- بِهِ): پێیدڵخۆش بوو/ لای خۆشبوو.
(«بَشَـرَني بِوَجْهِ حَسَـن»): بـە ڕوویەکی خۆشـەوە (بـەرەو ڕوووم هات/ پێشـوازیی لێکردم).
(بَشَّـرَ-هُ): مـژدەی خۆشـی دایـەو دڵـی خۆشکرد.
(أبْشَرَ- فُلاناً): مژدەی خۆشیی بە فیساردا.
(- الأمْـرُ وَجْهَـهُ) کارەکـە ڕووی گـەشو ڕوونکردەوە.
(باشَرَ- هُ النَّعيمُ): فەرو سامانی بێئەندازەی بەسەردا ڕژاو خۆشگوزەران بوو.
(تَباشَروا بالأمر): مژدەی خۆشیی کارەکەیان بە یەك گەیاند.
(ألبِشْر): ١-ڕووخۆشیی/ دەمبەخەندە بوون. ٢-مژدە.
(ألبَشير) (ج) بُشَراء): مژدەدەر.

(ألمُبَشِّر): مژدەدەر.
(ألبُشرى (ج) بُشرَيات أو البِشارَة (ج) بِشارات و بَشائِر): هەواڵی خۆش/ مژدەی خۆشیی.
(بِشـارَةُ الإنجيل): مـژدەی ئینجیل چونکە واتای ئینجیل بە یۆنانی مژدەیە.
(ألبَشارَةُ (ج) بَشائِر): جوانییو قەشەنگیی.
(«بَشائِرُ الوَجهِ»): جوانیی دەموچاو/ ڕوو.
(«بَشائِرُ الصُبحِ»): سەرەتای بەیان.
(ألبُشارَة): مزگێنی.
(ألتَباشِـير): ١-مـژدە ٢-سـەرەتای هەمـوو شتێك.
(«تَباشيرُ الصُبحِ»): سپێدەی بەیان/ سەرەتای بەیان.
٤-(أبْشَـرَ- تِ الأرضُ): زەوی سـەر تۆمـەی دەرخست.
(ألبَشَرَةُ (ج) بَشَر): ١-ئەو ڕووەکەی لە زەوی دێتەدەرەوە. ٢-سەوزەو گژوگیا.
٥-باشَرَ- المَرأةَ: لەگەڵ ژنەکەدا جووتبوو.
٦-(ألبَشَـر): مرۆڤ (چ نێـر چ مێ بێت. تاكو کۆی).
(أبو البَشَر): باوکی مرۆڤان (ئادەم).
(إبنُ البَشَـر): نازناوی حەزرەتی عیسایە لای دیانەکان.
الملحق:
بشر: (ألبَشَريّات): هەرچی دەربارەی مرۆڤ بێت.

(ضُعف البَشَــرِيَّة): بێتوانایــی مرۆڤایەتیو بێدەسەڵاتیی).
(«الجنسُ البَشَرِيّ»): رەگەزی مرۆڤ.
(«تَأريخ البَشَرِيَّة»): مێژووی مرۆڤایەتی.
(التَّبشير): مژدەگەیاندن.
ألتَّبشير بالنَّجاح): مژدەی سەرکەوتن پێدان.
(ألتَّبشير- دينِيّاً): بەڵێنی پاداشتی چاك.
(ألتَّبشير- مَســيحِيّاً): بانگکردنی خەڵکی بۆ ئاینی عیساییو کردنیان بە دیان.
(تَبشــيرُ الريــحُ بالمَطَرِ): باهێنانــی بارانو مژدەی باران.

---

بشع: ١-(بَشِعَ- الشَيءُ والمَرْءُ. بَشَعاًو بَشاعَةً): شتەکە ناشیرینو پیس بوو. مرۆڤەکە حراپو (بەدفەساڵ/ ڕەزاگران) بوو.
(تَبَشَّــعَ): ١-دزێو بوو/ بەدفەساڵ بوو ٢-خۆی پیسو ناشیرین نواند.
(إسْتَبْشَعَ- هُ): ناشیرینو پیس هاتە بەرچاوی یان بەدو بێرەزای دانا/ قێزی لێهاتەوە.
٢-(بَشَــعَ- فُــلانٌ بالأمر): فیســار قێزی لە کارەکە هاتەوەو لێیوەرس بوو.
بشــق: (بَشَــقَ و بَشِــقَ- هُ بالعَصا. بَشْقاً): دارکاریکرد.
(ألباشِق (ج) بَواشِق) (ح): واشە (باڵندەیەکی بچووکی گۆشتخۆرە).
بشك: (بَشَكَ. بَشْكاً): هەڵەشانە پەلەییکرد.
(- الثَّوبَ): جلەکەش شاش دروو.
(- في عَمَلِه): کارەکەی ناپوخت کرد.
(- الخَبَرَ): هەواڵەکەی بە درۆ هەڵبەست.
(إبْتَشَكَ): درۆیکرد.
(- الكَلام): قســەکەی هەڵبەستو لە خۆیەوە یەکسەر کردی.
(أبَشَّاك): درۆزن- قسە هەڵبەست.
الملحق:
(ألبَشكير): خاولییەکی گەورەیە لە گەرماودا بەکاردێت.

---

بشــم: (بَشِمَ- مِنَ الشَّــيءِ بَشَماً): لە شتەکە (وەڕسبوو/ بێزاربوو).
(بَشِم): وەڕس/ بێزار.
(- امِنَ الطَّعــام): بە خواردنەکە تلْخەیکرد/ ئینتەلایکرد.
(البَشَام) (ن): درەختێکی بۆنخۆشە گەڵاکەی قــژرەش دەکات چیلکەکــەی بــۆ دانئاژنــین بەکاردێ. تۆوەکــەی لای دەرمانگرەوەکان بە تۆوی (بَلسان) دەناسرێت.
بــصَ: ١- (بَــصَّ. بَصيصــاً و بَصّــاً): ورشەورشیبوو/ درەوشایەوە/ شەوقیدایەوە.
(بَصَّصَ- الجَــرْوَ): تووتکەکە چاوی ترەکی/ چاوی هەڵهێنا.
(- تِ الأَرضُ): زەویەکــە ترەکــیو گیاکــەی سەری دەرهێنا.
(- تِ الشَجَرَةُ): درەختەکە گەڵای دەرکرد.
(ألبَصيص): بروسکە/ شەوقدانەوە/ تریسکە/

درەوشانەوە.
(اَلبَصَّاصَةُ): چاو، چونکە بریسکە دەداتەووە.
٢-(بَصَّ- الماءُ. بَصيصاً و بَصّاً): تکەتکەو وردە وردە ئاوەکە لە بەربرۆیشت/ دایدا.
(- لِيَ بيَسيرٍ): کەمەکێکی دامێ.
٣-(بَصبَصَ. بَصبَةً) = بَصَّصَ: ترەکی.
بَصَّصَ- فلان: مەراییکرد.
(-الكَلبُ): سەگەکە کلکی ڕاوەشان.
تَبَصبَصَ- الكلبُ: سەگەکە کلکی ڕاوەشاند.
بصر: (بَصَرَ وبَصِرَ-هُ بَصَراً وبَصارَةً): دی/ چاویکرد.
(بَصَّرَ- الجَروَ): توتکەکە چاوی هەڵهێنا.
(أَبْصَرَ-هُ): ١-دی ٢-چاویکردەوە.
(باصَرَ- الشيءَ): لە سەرەوەو لە شتەکە دوورەوە ڕوانیە.
(تَبَصَّرَ- الشَّيءَ): سەرنجی وردو تەواوی لە شتەکە دا.
(- فِي الشَّيءِ): لە شتەکە وردبووەوەو بیری لێکردەوەو لێیکۆڵیەوە.
(تَباصَرُوا): ١-پێشبڕکێی دیتنیانکرد ٢-یەکتریان چاوکرد/ یەکتریان دی.
(إِستَبْصَرَ- الأَمرَ): چووە بنجو بناواتی کارەکەوە تا تێیبگات.
(-فيه): بیری لە کارەکە کردەوەو لێیکۆڵییەوە.
(اَلبَصَر) (ج) أَبْصار): چاو/ بینا/ هەستی بینین.
أَلباصِرَةُ (ج) (بَواصِر): چاو/ دیدە/ بینا.
(«خَيرُ العَشاءِ بَواصِرُهُ»): باشترین خواردنی ئێواران هی ئێوارانێکە کە هێشتا تاریك دانەهاتبێت.
(اَلمُبصِر): چاوساغ/ چاودێر.
(«رَتَّبْتُ على بُستاني مُبْصِراً»): باخەکەم داوەتە دەست چاوساغێك چاودێریی بکات.
٢-(بَصُرَ و بَصِرَ- هُ و بِهِ بَصَراً و بَصارَةً): پێیزانی/ چاویکرد.
(بَصُرَ- هُ الأَمرَ): لە کارەکە ئاگاداریکرد. کارەکەی تێگەیاند.
(- لَهُ) (عامية): بەختی بۆ گرتەوە/ بەختی بۆ تەماشاکرد.
(أَلبَصَر (ج) أَبصار): زانست.
(عِلْمُ البَصَرِيّات) (ف): بەشێکە لە فیزیا، ئەو زانستیەیە کە لە یاسای ڕووناکییو بینین دەدوێتو دەکۆڵێتەوە.
(البَصيرَة (ج) بَصائِر): ئاوەزی ژیریی‌و هوشیاریی/ تێگەیشتن/ هەستپێکردن. ٢-پەند.
(أَلمُبَصِّر والبَصّارَة) (عامية): بەختگرەوە/ فاڵگرەوە.
(التَبْصير) (عامية): بەختگرتنەوە/ فاڵگرتنەوە.
٣-(بَصَرَ- الشَيءَ. بَصْراً): شتەکەی بڕی/ شتەکەی لەتکرد.

٤-(أَبْصَـــرَ- الطَريقُ): ڕێگەکــە دەرکەوت‌و دیاربوو.
(إسْــتَبصَرَ- الأَمْرُ): کارەکە ڕوون‌و ئاشــکرا بوو.
(- الأَمْرَ): کارەکەی ڕوونکردەوەو دەریخست/ ئاشکرایکرد.
(اَلبَصــيرَة (ج) بَصائِــر)/١-بەڵگــەو بیانوو ٢-شایەت/ گەواه.
(«جَوارِحُــهُ بَصيرَةٌ عَلَيــهِ»): ئەندامەکانی لەشی لەسەری شایەتن.
(«فِراسَــةٌ ذات بَصــيرَةٌ»): ســەرنج لێدانێکی دروســت‌و چاك کە لە شــت بگات، بەڵگەهەڵهێنە.
(اَلمَبْصَر والمُبْصَرَة): نیشانەو بەڵگەی دیارو ڕوون.
٥-(أَبْصَرَ- الرَجُلُ): هاتە بەسرە.
(بَصَّرَ): هاتە بەسرە.
(اَلبَصْرَة): شاری بەسرە.
(اَلبَصْرَتان): شاری کووفەو بەسرە.
(اَلبَصْــرَةُ (ج) بِصــار)(ط١): زەوییەکــی ڕەقــەن‌و قوڕێکی مڵی قاچگرتــوو کە چەوو بــەردی نەرمی ســپی تێدایە/ ئــا بەوانەوە بەسرە ناونراوە.
الملحق:
بصــر (اَلبَصــير (ج) بُصَــراء)= المُبصِــر: ١-چاوســاغ (پێچەوانەی چاوکوێر) ٢-پسپۆڕی شارەزا.
(بَصيرٌ بِالأُمور): شارەزای کاروبار.

---

بصع: ١-(بَصَعَ- هُ. بَصْعاً): کۆیکردەوە.
٢-(بَصَــعَ- الماءَ. بَصْعاً): ئاوەکەی ڕشــت یان پاڵاوت.
(اَلبَصْع): درزێکی بچوك‌و تەسك.
(اَلبَصيع (ج) بُصْــع): ئارەقی لەش کە ئاوی لێوە دەردەدرێت.
٣-(اَلبَصْع): پەنجــەی باڵابەرزە کە لە نێوان برای تووتەو پەنجەی شایەتمانە.
(اَلبصْع): بەشێکی شەو.
(اَلأَبْصَــع (م) بَصْعاء (ج) أَبْصَعُون و بُصْع): گەوج.
بصــق: (بَصَقَ بَصْقاً= بَــزَقَ): تفی کردەوە. تفی ڕۆکرد/ بەڵغەمی فڕێدا.
(البُصاق= البُزاق): تفی ئاودەم/ بەڵغەم.
(باصِقاتُ اللَّهَب) (ا ع): ئاگرپرژێن.
(باصِقَةُ اللَّهَــب): ئاگرپرژێنێــك ئامێرێکی جەنگە شلەیەکی گڕاویی بەسەر ئەو شوێنەدا دەپرژێنێت‌و ئاگر لەو شــوێنە بەردەدات کە بۆی هەڵدەدات.
بصــل: (بَصَّــلَ و تَبَصَّــلَ- هُ مِــن ثيابِهِ): جلەکەی لەبەرداکەند/ ڕووتیکردەوە.
(تَبَصَّلَ- القِشرُ): توێکڵەکەی ئەستوورو چڕ بوو.
(البَصَــلُ (ت): پیاز، لە بنەپەی زەمبەقە لە

ئاسیای ناوەراستەوە هاتووە، کەڵکێکی زۆری هەیە بە کاڵو کوڵاوی دەخورێت.

(بَصَلُ القَأر (ن): پیازە خووگانە/ پیازی دەشتەکی خەڵکە ڕەشۆکەکە پێیدەڵێن (البصَّیلة).

(البصَّیلَة) (البَصَلَةُ (ن): ١-پیاز، قەدێکی خڕی ناوزەوییە کە لە گەڵێك خەپکەی گۆشتییو توێکڵی گۆشتیی پەیدا بووە کە پاڵیان بە یەکەوەداوە ٢-کڵاو ئاسن کە بۆ جەنگ لەسەر دەکرێت.

(«خَرجوا كَأنَّهُم الأَصَلُ و على رؤوسِهِمُ البَصَلُ»): دەرپەڕین وەك مارێکی کوشندەو کڵاوی ئاسن لەسەر.

بصم: ١-(بَصَمَ القِماشَ. بَصْماً): نیگاری لەسەر (چیتەکە/ کوتاڵەکە) کێشا.

(أَلبَصْمَةَ): نیشانە (عامیە).

(أَلبُصْم): قولانج.

(«ثَوبٌ ذو بُصْم»): بەرگێکی سفتو چاك چنراو.

(«رَجُلٌ ذو بُصْم»): پیاوێکی سروشت توند/ سروشت ڕەق.

٢-(البَصْما) (تركية): بەسمەك (جۆرە شیرینیەکە).

بصا: (بَصا- غَريمَهُ. بَصْواً): هەرچی لە بندەستی قەرزارەکەدا بوو لێیسەند/ هەرچیی هەبوو نەبوو لێیسەند.

(أَلبَصْوَةُ): پشکۆ.

بَضَّ: ١-(بَضَّ. بَضاضَةً و بُضُوضَةً): لەبەر چەوریىو گۆشتی پیست تەنكو نەرمو نۆڵ بوو.

(بَضٌّ و باضٌّ و بَضيضٌ): ناسكو نەرمو نۆڵو پێستتەنك.

(بَضَّةٌ و باضَّةٌ و بَضيضَةٌ): ژنی ناسكو نەرمو شلو ملو پێستتەنك.

٢-(بَضَّ- تِ العَينُ. بَضّاً و بُضُوضاً و بَضيضاً): چاوەکە فرمێسکی ڕشت.

(فُلانٌ ماتَبِضُّ عَينُهُ): فیسار فرمێسك نارێژێتو بە ئارامەو لەسەر نەهامەتیی شوکرانەبژێرە.

(- الماءُ): ئاوەکە چۆڕەچۆڕە ڕۆیشت.

(-الحَجَرُ): بەردەکە کەم کەمە ئاوی لێڕۆیشت وەك ئاو دەربدات.

(فُلان مايَبِضُّ حَجَرُهُ): فیسار هیچی لێهەڵناوەرێت/ ئاولەدەستی ناتکێت (ئەمە بە مرۆڤی چرووك دەترێت).

(بَضَّ):

- لَهُ بَضَضاً و بُضاضَةً: شتێکی کەم یان چۆرەناوێکی دایە.

أَبَضَّ- لَه: شتێکی کەمی دایە/ کەمەکێکی دایە.

(تَبَضَّضَ- حَقَّهُ مِن فُلان): مافەکەی خۆی کەمەکەمە لە فیسار وەرگرتەوە.

(تَبَضَّضَ – فُلاناً): هەرچی سامانێکی فیسار بوو بردی‌و رووتیکردەوە.
(ألبَضوض (ج) بَضاض- مِنَ الآبار): چاڵاوی کەم ئاو.
(ألبَضيضَةُ): هەرچی مرۆڤ هەیەتی‌و لەژێر دەستیدایە.
(«أخرَجتُ لَهُ بَضيضَتي»): هەرچی هەبوو لەبەردەستمدابوو دامێ.
٣-(بَضَّ- أوتارَ العودِ): (مو): ژێی عوودەکەی بزواند تا ئامادەی لێدانی بکات.
(بَضَّضَ. تَبضيضاً): ساماندارو خۆشگوزەران بوو.
(إبْتَضَ- القَومَ): خۆیشــگەلی لە رەگ‌و ریشە دەرهێنا.
بضــع: ١-(بَضَــعَ و بَضَعَ- الشــيءَ. بَضْعاً): شــتەکەی بە نەشــتەر لەتکرد. ٢-شــتەکەی هەڵدری.
(إنْبَضَعض): لەتبوو بەنەشتەر هەڵدڕا.
(ألباضِع): شمشێری بڕەر.
(ألمِبْضَع (ج) مَباضِع): گازنە/ شفرە.
(البِضْعَةُ والبَضْعَةُ (ج) بَضْع و بِضَع و بِضاع و بَضَعات): کوتە گۆشت/ گوڵمە گۆشت.
٢-(بَضَــعَ- الــكَلامُ. بُضُوعــاً): ئاخاوتنەکە روون‌و ئاشکرا بوو.
(- الكَلامَ): لە ئاخاوتنەکە گەیشت.
(أبْضَــعَ- هُ الــكَلامَ): ئاخاوتنەکــەی بــۆ روونکردەوەو تێیگەیاند.
٣-(أبْضَعَ- الشــيءَ) (ت): شــتەکەی هێنایە سەر فرۆشتن‌و نرخی دیاریکرد.
(تَبَضَّــعَ):ماڵــی فرۆشــتنی پەیداکــرد بیفرۆشێت.
- (الشَّيءَ): شــتەکەی هێنایە سەر فرۆشتن‌و کردی بە ماڵی فرۆشتن.
(إســتَبضَعَ): ماڵــی فرۆشــتنی پەیداکــرد بیفرۆشێت.
(- الرَجُلُ الشَيءَ): پیاوەکە شتەکەی (کرد بە ماڵی فرۆشتن/ هێنایە سەر فرۆشتن).
(ألباضِــع): ١-وردەواڵەفرۆش. ٢-کووتاڵفرۆش کە بەمەلاولادا دەیبات. ٣-چەرچی.
(ألبِضاعَــة) (ج) بَضائِع): کاڵای فرۆشــتن: شتی بزرگانیی‌و فرۆشتن.
٤-(بَضَعَ- فُــلانٌ بُضُوعاً): کابرا وەڕس بوو/ چارسبوو.
(تَبَضَّعَ- العَــرَقُ): ئاو/ ئەرەق وردە وردە لە بن تووکەکانەوە دەرچوو.
(ألبِضْعُ و البَضْعُ): ١-بەشێکی شەو. ٢-برێك/ هەندێك چەند لە نێوان سێ تا نۆیە.
(«بِضعُ عَشَرَةَ مِنَ النِّساء»): دەژن تا نۆزدە.
(«بِضعٌ و عِشرون): امْرَأَة»): بیست‌و چەند ژنێك.
(بِضْعَــةَ عَشَــرَ مِــنَ الرِّجــالِ): دەوچەند پیاوێك.

(بِضْعَةٌ و عشــرون رَجُلاً): بيســتو چەند پیاوێك. (پێویسته وشەی ( بضع) پێشبخرێت ناوترێت (عشرون و بضع).

بضم: (بَضَمَ- الزَرْعُ. بَضْماً): دانی کشــتەکە پرو قەڵەوو پتەو بوو.

(ألبُضْم): گوڵە گەنم یان جۆ ٢-دەروون.

(«هُـوَ کریــمُ البُضم»): ئــەو دەروونپاکەو پیاوچاکە.

بــط: (بَــطَّ- الجــرحَ. بَطّاً): بە/ نەشــتەر برینەکەی هەڵدڕی.

(ألمِبَــط (ج) مَباطــه و المِبَطّة): مەقەســتی پێهەڵدرین/ نەشتەر/ چەقۆی نەشتەرگەریی.

٢-(بَطَّطَ): شەکەتو پەککەوتە بوو.

(ألبَطّ (ج) بُطوط و بِطاط) (ح): مراوی.

(ألبَطَّةُ): یەك مراوی (بۆ نێرو مێی).

(ألبَطّةُ): ســوراحیی ملباریك کە لە شــێوەی مراویدایە.

(تَبطِيــط أو تَفَلْطُــح الأَرض): (ع ف): ئەندازەی شــێوە هێلکەیی زەوی = جیاوازیی نێوان تیرەی کەمــەرەی زەویو تیرەی هەردو جەمســەری گۆی زەوی دابەش بکرێت بەسەر کەمــەرەی ناوقەدیــدا کــە دەکاتــە ١/٢٩٧. (ئەنــدازەی هێلکەیــی پەرچیــس دەکاتــە (١/١٥)ە.

٣-(بَطْبَــطَ. يُبَطبِطُ- البَــطُّ): مراوییەکە واکاندی. ٢-خۆی بە ئاوەکەدا کرد.

(- الرَجُلُ): توانای بیرکردنەوەو ڕادەربڕینی کز بوو.

(ألبَطْبــاط) (ن)/ دارەشــوانە ڕووەکێکــە، ساڵانەیە، یان تەمەندرێژە، لەوانەیە کەپرۆکە بۆ خۆی بکات، گوڵەکەی بێکاســەیە سپی یان پەمەیی دەبێت.

٤-(ألبَطاطــا) (ن) القلقــاس): ڕووەکێکــە دەچێنرێت لە ئەمەریکای باشوورەوە هاتووە لە کۆمەڵەی باینجانە/ پەتاتە.

(بَطاطا حلــوة او قلقاس هندي) (ن): وەك پەتاتەی تر، ڕســت دەگرێتو ســەلك دەکات، بــەڵام ســەلك گەورەتــرە زۆر جــۆری هەیە هەندێکــی شــەکردارە هەندێکــی وردەڵەیە، تامــی وەك تامی بــەڕووی هیندیە، لە وڵاتە گەرمەکاندا زۆر دەخورێتو بەکاردێت.

(بطاطا صينية) (ن): ڕووەکێکە هی ئاسیایە پەلدەهاوێــت ڕەگەکانی هەڵدەئاوســێت وەك پەتاتــە دەخورێــت لــە وڵاتــە گەرمەکاندا دەروێت.

بطؤ: (بَطُــؤَ و أبطأَ. بُطْأً و بِطاءً و بُطُوْءً): خاوەخاویکــرد. ســســتییکرد: هێواشــبوو/ خۆیخایاند.

(بَطِــيء (م) بَطيئة (ج) بطــاء): هێواش/ لەسەرخۆ/ خاو/ سست.

(أَبْطَأَ و بَطَّأَ. عَلَيه بالأمر): دوایخست.

(باطَأَ-ه): خایاندی/ دەستی دەستیی پێکرد/

ئەمرۆ بە سبەیی پێکرد.

(تَبَطّــأَ و تَباطَأَ- في سَــيرِهِ): لە رۆیشــتندا سستییکرد/ خاوەخاویکرد. دواکەوت.

(إسْــتَبْطَأَ- هُ): سســت هاتە بەرچــاوی/ بە خاوی دانا.

(أَلمَبْطَأَةُ): دواخەر/ هۆی سستیی‌و خاویی.

(بطــح): - (بَطَــحَ- هُ. بَطْحاً): بــە دەمدا دایبەزەویدا.

(إنْبَطَــحَ- الرَجُلُ): لە پەوروو ڕاکێشــا/ لە سەردەم کەوت.

(أَلباطِــح) (فــا): لە پــەوروو کەوتــوو/ لە سەردەم کەوتوو/ بەرووداکەوتوو.

٢-(بَطَحَ- هُ): ڕایخست.

(بَطَّحَ- البَيتَ): چەوو لی لەماڵەکەدا ڕشت‌و تیایدا تەختیکرد.

(تَبَطَّحَ وانْبَطَحَ واسْتَبطَحَ- الوادي): دۆڵەکە تەخت‌و بەرفراوان بوو.

(أَلبَطحــاء (ج) بِطاح وبَطائِح وبَطْحاوات و الأَبْطَــح (ج) أَباطِح والبَطيحَة (ج) بَطائِحو البَطيح): شــیوو خرگە/ ئاومرۆیەکی فراوان کە پر لە خرەکە بەردو لەو چەو بێت.

(أَلبَطْحَةُ): ماوە.

٣-(البَطْحَةُ): بەژن/ باڵا.

أَلبُطْحَةُ: سروشت‌و خەسڵەت/ پیشە/ خوو.

هــذه بُطحــه صــدق: ئەمە سرووشــتێک‌و نیشانەیەکی ڕاستەقینەیە.

(أَلبُطَاح): (طب): بزرکاندنی تای زۆر.

(أَلبُطاحِــيُّ): دمردێکــە وەك هەوکردنــی پەردەی سی.

الملحق:

بطح: (الإنبطاح): (جووڵەیەکی سەربازییە): لە سەردەم کەوتن.

---

بطخ: (بَطَخَ- هُ. بَطْخاً): لستیەوە.

(أَبْطَخَ): کاڵەکی لە لا زۆر بوو.

(البِطّيــخ) (ن): شــووتی (ڕوومکێکــە لــە کۆمەڵــەی کووڵەکەیــە بەرمکــەی گەورمیە کورۆکەکەی سوورەو خۆشە).

(الطِيخُ الأَصْفَر) (ن): کاڵەك/ گندۆرە.

(أَلمَبْطَخَة (ج) مَباطِخ): شــوێنی شــووتی‌و کاڵەك‌و جێی ڕواندنیان.

بطر: ١-(بَطَرَ- هُ): قلیشــاندی/ شــەقیکرد/ لەتیکرد.

(مَبطــور و بَطــير): شــەقکراو/ لەتکراو/ قلیشێنراو.

٢-(بَطِرَ- الحَقَّ- بَطَراً): بێزی نەهات پێ لە مافەکە لە ڕاستیەکە بنێ‌و پێی قایل نەبوو.

(- الشــيءَ): ڕقی لە شــتەکە بوو بێ ئەوەی شتەکە ئەو ڕقە بهێنێت.

٣-(بَطِــرَ. بَطَراً): خۆشــی نــازو دارایی لە پر سەرســام‌و گەشــکەی کرد- دارایی‌و سامان تێکیداو لە ڕێ لایداو بایی بوو.

(بَطِــرَ- النِعْمَــةَ): بایەخــی ســامانەکەی

نەزانیو نەفامانە لە ڕێی خراپدا بە فیڕۆیداو بەختیکرد.
(بَطِر): بە دارایی لەپڕ بابیو پێنەزان.
(بَطِرَ و أبْطَرَ- هُ): خەپەساندی/ سەرسامیکرد- گەشکەی پێگرتو خستیە هەلەکەسەما.
٤-(بِطراً): بە فیڕۆو نارەوا/ بە خۆڕایی.
(ذَهَبَ دَمُهُ بِطراً): خوێنی بە فیڕۆوو نارەوا ڕۆیشت.
(البَطّاريَّــة) (ا ع): کۆمەڵــە تۆپێکــە، وا دادەمەزرێنرێت کە پێکەوە ئاگربارانی دوژمن بکەن.
(ألبَطّاريَّــة الكهربائيَّة) (ف) (فرنســية): پاتریی کارەبــا. (کۆمەڵە بۆرییەکی تایبەتیە هێــزی کارەبــا پەیــدا دەکات.لــە ڕادیۆ یان ئوتومۆبیلدا.
٥-(بَيْطَرَ- الدابَّةَ): وڵاخەکەی چارو ناڵکرد.
(مُبَيْطِــر و بَطير و بَيطــار (ج) بَياطِرَة): بەیتاڵ.
طَبيب. بَيطَري: پزیشکی ئاژەڵ.
٦-(البِطريــر): ١-دەمهــەراش/ زمانــدرێــژ ٢-شاتەشاتکەر.
٧-(ألبَطْرَشــيل والبَطْرَشــين): چنراوێکی درێژە قەشــە لە کاتی کارگوزاریــدا دەیکاتە ملیو بەسەر سنگیدا بەریدەداتەوە.
٨-(ألبَطْــرَك والبَطريــرَك والبَطريك (ج) بَطارِكة وبَطارِيك): ســەرداری ســەرۆکانی قەشەکانی سەر وڵاتانێکی دیاریکراون یان هی سەر بەرەیەکی فەلەن.
٩-(ألبِطريــق (ج) بَطــارِق وبَطارِيــق وبَطارِقَــة): ١-سوپاســالارێکی رۆم ٢-(ح) باڵنــدەی پەنگوین. لە پۆپــەی باکووری گۆی زەویــدا دەژی سەرپشــتی ڕەش‌و ژێرســکی ســپییەو پەردەیــش لــە نێــوان پەنجەکانی قاچیدا هەیە.
بطــش: (بَطَــشَ- بِــهِ. بَطْشــاً): زەبرێکی ســەختو توندی لێوەشاندو لە گۆیخست یان فەوتانی.
(- عَلَيهِ): دەســتی ســەختی لێوەشاند خۆی بەسەردادا بەزاندی.
(باطِــش وبطّــاش و بَطيــش): ١-زەبــرو زەنگوەشێن ٢-دەستباڵا.
(«فلان بَبطِش في العِلم بباع بَســيط»): لە زانستدا دەستباڵاو بە توانایەو چابوکە.
(باطَشَ- ه): هەریەکەیان زەبری لەویترد‌ا.
بطع: (الأَبْطَع): کەسێکەدانی پێشەوەی، هی خوارەوەی کەوتبێت.
بطــق: (البطاقــة (ج) بَطائِــق) (آرامية): ١-نامە ٢-بلیت ٣-پسووڵە ٤-کارت کە بە جلەوە دەکرێتو نرخەکەی لێدەنوسرێت.
بطل: ١-(بَطَلَ. بَطْلاً وبُطولاً): لەدەستچووو/ فەوتا/ بەفیڕۆ چوو.
(باطِل): لەدەستچوو/ فەوتاو/ لەناوچوو.

(أَبْطَـلَ- الشـيءَ): ١-شـتەکەی لەدەسـتدا/ لەناوبرد. ٢-نادروستیکرد.
(أَلبُطْـلِ ألباطِل): ١-بەفـیڕۆ چوو ٢-فەوتاو/ لەناوبراو/ پووچ.
(«ذَهَـبَ دَمُهُ باطِـلاً»): خوێنەکەی بەفیڕۆ ڕۆیشت.
(أَلبُطّلات): شتی (هیچو پووچ/ بێبایەخ).
٢-(بَطَـلَ- الفاعِـلُ مِـنَ العَمَـلِ بَطالَة): کارکردەکە بیکار بوو- دەستبەتاڵ بوو.
(بَطّال): بێکار- دەستبەتاڵ.
(بَطَّلَهُ): بێکاریکرد/ لەکاریکرد/ ١-بێئیشـی کرد. ٢-پەکیخست.
(تَبَطَّلَ): پەکـی کاریکەوت/ لەکار وەسـتا/ بێکار بوو.
(أَلبَطالَة): بێکاریی/ دەستبەتاڵیی/ لەکاربوون.
٣-(بَطَـلَ. بُطْـلاً و بُطُـولاً وبُطْلانـاً): ١-گەندبـوو/ خراپبـوو ٢-نادروسـت بـوو/ ناڕاستیی دەرکەوت.
٤-(بَطَـلَ- فِي کَلامِهِ بَطالَةً): قسـەکەی بە گەمـەو سـوعبەتکرد/ کردی بە فشـقیات/ کەوتە گەمەو قسەی سوعبەت.
(أَبطَلَ- الرجُلُ): گەمەیکرد/ سوعبەتیکرد.
٥ – (بَطُلَ. بَطالَـةً وبُطولَةً): قارەمانێتیی نواند/ دلێریکرد/ ئازا بوو.
(بَطَلٌ (ج) أَبْطـال (م) بَطَلَة (ج) بَطَلات): قارەمان پاڵەوان.

(تَبَطَّلَ): ١-گەمەو فشـقیاتی نواند ٢-ئازا بوو ٣-بێکاربوو.
٦-(أَبْطَلَ): ١-نارەواییکردو پیشاندا ٢-درۆیکرد.
(مُبْطِل): نارەواکردە/ درۆزن.
(تَبَطَّـلَ- القَـومُ بَیْنَهُـم): ١-کاری نـارەواو ناراسـتیان لەگەڵ یەککـرد ٢-درۆیان لەگەڵ یەککرد.
(أَلبُطْل): درۆ.
(الباطِل (فـا) (ج) أَباطیل): کاری نابەجێو نارەوا ٢-شەیتان ٣-تەلیسمباز/ ئەفسونباز.
(بطـم): (ن): دار قـەزوان. گـەڵا وردە، لە درەختـی فسـتق دەچێت مـادەی تربەتینی تێدایە
(بطـن) ١-(بَطَنَ. بُطوناً وبَطْناً): شـارراوە بوو/ پەنهانبوو.
باطِن: شارراوە/ پەنهان.
(- الأَمْرَ. بَطناً): ناوەڕۆك کورۆکی کارەکەی زانی.
(باطَنَ- هُ): دڵی ڕاکێشایەوەو هێنایەوە جێو رازی دڵی خۆی بە چرپە پێوت.
(بَطَّ- الثَّوبَ): بەری بۆ جلەکە کرد.
(أَبْطَنَ- الشيءَ): شتەکەی شاردەوە.
(- الثَّوبَ): بەری بۆ پۆشاکەکە کرد.
(تَبَطَّنَ واسْـتَبْطَنَ- الأَمْرَ): بـە ناوەڕۆكو ڕاستیی کارەکەی زانی.
(الباطِنَـةُ): نهێنیی دەروونی مرۆڤ/ ئەوەی

(أَبْلَـهَ- الرَجُـلَ): كابـراى بـه گێـل هاته بەرچاو.

(تَبَلَّـهَ): ١-گێـل بـوو ٢-نەیتوانـی بەڵگـە بهێنێتەوه.

(تَبالَـهَ): خۆی گێل كردو پیشـانداو گێلیش نەبوو.

٢-(بَالَهَهُ: هۆشی لێبری‌و لەخشتەیبرد.

٣-(تَبَلَّهَ: بە دوای ونبووەكەیدا گەرا.

(- الطَريقَ): گێلانەو بێپرسـیار له كەس بە رێگەكەدا رۆیشت كە بەڵەدی نەبوو ونبوو.

(بُلَهْنِيَـةُ العَيْـشِ): خۆشـگوزەرانی‌و تێرو تەسەلیی.

٤-(بَلْـهَ): (كرداری داخوازیيـە): وازبهێنە/ لێگەرێ.

(«بَلْـهَ هذا الأمـرِ»): واز لـەم كاره بهێنە/ لێیگەرێ.

٥-(بَلْهَسَ): گوری دایە رۆیشـتنەكەی/ خێرا رۆیشت.

بـلا: بَلاَ- الرَجُـلَ بَلْواً و بَـلاءً: پیاوەكەی تاقیكردەوه/ پیاوەكەی هەڵەسنگاند.

بلـي: (بَلِيَ- الثَـوبُ بِلىً و بَـلاءً): جلەكە (شڕبوو/ رزی).

(بالٍ و بَلِيّ: شڕ/ دڕاو/ رزیو.

(بَلَّى وأَبْلَى – الثَّوبَ. تَبْلِيَةً و إبلاءً): جلەكەی (شڕكرد/ دڕاند).

(ألبِلْو والبِليُ (ج) أَبْلاء): كۆنی دڕاوو شڕو دڕ.

٢-(بُلْيَ- الرَجُلُ): پیاوەكە تاقیكرایەوه.

(أَبْلى – اللهُ عِبـادَهُ): خودا بەندەكانی خۆی تاقیكردەوه بەوەی چاكەی لەگەڵدا كردن.

(أَبْلى في الحَرب بَلاءً حَسَناً): له جەنگەكەدا دەستی چاكی لە دوژمن وەشاندو قارەمانێتی نواند.

(تَبَالا- هُ): تاقیكردەوه/ هەڵیسەنگاند.

إبْتَلا-هُ): تاقیكردەوه.

(إبْتَلى- الشيءَ): شتەكەیزانی‌و پەی پێبرد.

(إسْتَبْلا-هُ): تاقیكردەوه.

(ألبَلْوى والبِلوَة والْبلية والبَلِيَّة (ج) بَلايا): ١-تاقیكردنـەوه/ هەڵسـەنگاندن. ٢-چورتوم/ وەی/ بەڵا/ گرفتاریی/ گێرۆدە/ تووشبوون.

(ألبَـلاء): ١-بە (چاكەو فـەرو وەی‌و خراپە) تاقیكردنەوەی مـرۆڤ ٢-گـیرۆدەی پەژاره/ داخی زۆر هەروەكو لەش تاقیبكاتەوه.

(ألبِلْـو والبِلْيُ (ج) أَبْلاء): خاوەن ئەزموون‌و دەرهاتوو/ ڤاڵ.

(«هُـوَ بِلْـيُ أَسْـفارٍ وبِليهـا»): ئـەو ڤاڵ‌و دەرهاتووی گوزارو مەراق‌و ئەزموونی زۆره.

(«بِليوُ شَرٌ و بِلْيُهُ»): زاڵە بەسەر گرفتاریی‌و ناهەمواریداو زۆر لێقەوماویی دیوه.

٢-(بالَى-ه): كەموكووریی دایە پاڵ ٢-شانازیی بەسەردا كرد.

٤-(بـالَى- الأَمـرَ وبالأمـرِ. مُبـالاةً و بِلاءً و بالَـةً وبالاً): بـە تەنگ كارەكـەوه هات/

مشووريخوارد.
(أَبْلى- فُلاناً عُذرَه): بیانووی بۆ هێنایەوە تا لێیبورێت. ئەویش لێیخۆش بوو/ عوزرخوایی بۆ هێنایەوەو ئەویش چاوپۆشیی لێکرد.
٥-(أَبْلَى- هُ يَميناً): سوێندی بۆ خواردو دڵی هێنایەوە جێ.
(إبْتَلى): سوێندیدا/ داوای لێکرد سوێند بخوات.
٦-(إبْلَولى- العُشبُ): گیاکە درێژ بوو.
٧-(ألْبَلِيَّة) (ح): ئەو حوشترەی کە لە سەردەمی پێش ئیسلامدا لەسەر گۆڕی خاوەنەکەی بەبێ ئاوو ئالیك دەبەسترایەوە تا مردار دەبووەوە.
(ألْبَلِيّات): ئەو ژنانەی کە شیوەنیان لەسەر حوشترە مردارەوەبووەکە دەکرد.
٨-(بَلى = نَعَم): بەڵێ/ ئەرێ/ با (وەڵامی پرسیارە، پرسیارەکە بە ئەرێ بێت یان نەرێ بێت).
(أقامَ زَيدٌ): ئایا زەید هەستا؟
بَلى: بەڵێ.
(«أما قامَ زَيدٌ؟»): ئایا زەید هەڵنەستا؟
(بَلى): بەڵێ واتا هەستا/ با هەستا.
٩-(البليار) (فرنسية): یاریی بلیارد (یارییەکە بە تۆپی عاج لەسەر مێزێکە چنراوێکی سەوزی بەسەرەوەیە، بە دارێکی سەر لاستیك یاری دەکرێت.

الملحق:
بلي: (ألبَلْيُون: ملیۆن ملیۆون.
(ألبَلْيون في الولاياتُ المتحدة يساوي ألف مليون): لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دەکاتە هەزار ملیۆن واتا ملیارێك.
(«اللامُبالات»):گوێنەدان/ بەتەنگەوەنەهاتن/ بەدەربەسەوە نەهاتن.
(أللامُبالات بِمَصائِب الغَير): بە دەربەست چورتومو گرفتاریی‌و گرفتاری‌و دەردی ئەمو ئەوەوە نەهاتن.

---

بم: (البَمّ (ج) بُموم) (مو): ١-ئەستوورترین ژێی عوود. ٢-گرو قەبەترین دەنگی عوود.
بن: ١-(بَنَّ بالمَكان. بَنّاً): لە شوێنەکەدا بەند بوو/ مایەوە/ جێگیر بوو.
(أَبَنَّ- بالمَكان): لە شوێنەکەدا نیشتەنی بوو/ بەند بوو.
(أَبَنَّ- تِ السَّحابُ): هەورەکە چەند رۆژێك مایەوە.
٢-(بَنَّنَ- الشاة): مەڕەکەی بەستەوەو هێشتەوە بۆ قەڵەوکردنی/ کردی بە دابەستە.
(ألبَنين): دابەستە/ قەڵەو.
٣-(تَبَنَّنَ- في الأَمرِ): لە سەر کارەکە ستارەیگرت‌و مایەوە ٢-لە کارەکەدا هێمن‌و لەسەرخۆ بوو.
(ألبَنين): ستارەگر لەسەر کارو ژیرو

لەسەرخۆ.

٤-(البُـنّ) (ن): درەختــی قــاوە. درەختێکە بەرێکــی وردی هەیە دەهاڕرێت‌و دەکرێت بە قاوە. لە نیوە دورگــەی عەرەبدا دەرکەوتووە قــاوەی عەدەنیــی‌و قــاوەی بەرازیلیــی دووجۆرین.

(ألبِنّ- مِنَ الأمْكِنَة): شوێنی بۆگەن.

(ألبَنّــة): (بــۆن‌و بەرامــە)ی خــۆش یــان ناخۆش.

(ألبَنان): ١-سەری پەنجەکان ٢-پەنجەکان.

(ألبَنانَة (ج) بَنانات): هەموو پەنجەکە.

(ألبَنــان): ١-یەك پەنجە ٢-گرێی ســەرەوەی پەنجەکە نینۆکەکەی پێوەیە.

(ألبُنانَــة): باخچەی گەشــاوەو شــکۆفەدار/ میرغوزار.

بنــت: ١-(بَنَّــتَ- عَنهُ): بــە دوای هەواڵیدا گەڕا/ سۆراغیکرد.

(- هُ بِكَذا): بەوە لێیدا.

٢-(ألبَنتوغراف) (حــي): ئامێرێکە هەموو وێنەیەك بە میکانیکی دەگوێزێتەوە.

بنج: ١-(بَنَجَ. بَنجاً): چووەوە ســەر ڕیشــەو بنج‌و بێخی خۆی.

ألبنـج: بنج/ بناوان/ ڕیشە/ بێخ/ نەژاد.

٢-(بُنَّــجَ- هُ): ١-بەنجیکــرد/ بــە بەنــج بێهۆشیکرد/ نواندی ٢-بە بەنج سڕیکرد.

(ألبَنْج) (ن): ڕووەکێکە ژەهردار لە بنەچەی باینجانە گەڵا گەورەو لینجە، گوڵەکەی ســپی یان زەردە یان خاڵ بنەوشــەییە لە کەلاوەیان نێوان کشــتوکاڵیتردا دەڕوێت بۆ سڕکردن یان بێهۆشــکردن بەکاردێت/ بێهۆشــداروو/ هی ئەوە.

٣-(ألبَنْجَــرَةُ (ج) بَناجــر) (ا ع) (تركية): لوولەی تۆپ.

٤-(ألبَنْجَكِشت) (ن) (فارسية): مێخەك.

بنــد: ١-(ألبَند (ج) بُنود): ١-ئاڵایەکی گەورە ٢-دەریاچە ٣-کــەرت یان بڕگەی کتێب ٤-کۆت ٥-فێڵ.

(«فُــلان كَثــيرُ البُنــود»): فیســار زۆر بە بەندوباوە/ فێڵبازە (فارسیە).

٢-(ألبَنــدَر (ج) بَنادِر): ١-بەســتگەی پاپۆڕ لەســەر ڕۆخی دەریا ٢-ئەســکەلە ٣-لەنگەرگا ٤-(ت) مەڵبەندی بازرگانەکان لە شاردا.

(ألشاه بَندَر): سەربازرگان (فارسیە).

(البَنْدير) مــو) (أعْجَمِيَّة): دەهۆڵی گەورەو مەزن.

٤-(بَنادُورَة) (ن): تەماتە.

٥-(ألبَنديرَة) (ايطالية): ئاڵا.

٦-(بَنْدَقَ- إليهِ): تیژ چاوی تێبڕی.

(ألبُنْدُق): ١-(ن) فستق.

(البُنْدُقــة): دەنکە فســتقێك- درەختێکە لە بنەچەی بەرووە لە دارســتانەکاندا دەڕوێت‌و لەناوچە هــەوا مامناوەندییەکاندا، بەرەکەی

بادامیو خۆشـەو بچووك زۆر جۆریشی هەیە
٢-ساچمە.
(اَلبُنْـدُ قِیَّـة): (ا ع): تفەنـگ ١-تفەنگـی ساچمەزەن ٢-شەسـتیر (ا ع) = الرَّشـیش: تفەنگێکـە تازەیەکە بە جارێك فیشـەکێکی زۆر دەردەهاوێت وەك ئاورشێن بکات.
١- (البُندُقِیَّة المُواتِرَة) (ا ع): جۆرە تفەنگێکە کە دەتوانێـت بێپڕکردنەوەی یـەك لە دوای یەك. چەند فیشەکێك بهاوێت/ گولله پرژێن.
بنـز: (اَلبِنزِین) (ك) (فرنسـیة): بەنزین: مادەیەکی ئەندامییە پلەی گڕگرتنی نزمە زوو دەبێتە هەڵـم لە نەوتی خاو پوختەدەکرێت، یەکێکە لە سـووتەمەنییەکانی ئوتومۆبیلو هۆکانـی تـری هاتوچـۆ. هەروەهـا بۆ جل پاکردنەوەش بەکاردێت.
(بنـس): ١-(بَنِـسَ و أَبْنَسَ. بَنَسـاً): لەتاو شەرو خراپە هەلات/ خۆی لێلادا.
(بَنَّسَ- عَنهُ): لێیدواکەوت.
٢-(بنسِـلین): (طب) پەنسـلین دەرمانێکە بۆ چارەسـەرکردنی هەوی ناوسـكو هەناوو دەرەوەی لەش.
بنص: (اَلبِنْصِر (ج) بَناصِر) (ع ا) (مؤَنَّثة): پەنجەی برای تووتە/ پەنجەی پاڵ تووتە.
بنـط: (بنطلون) (ایطالیة) = (سـراویل): پانتۆڵ/ شەرواڵ.
بنـف: (اَلبَنَفْسَـج) (ن): گوڵەوەنەوشـە: گوڵـی تەمـەن سـاڵێکە یان تەمـەن درێژە. گوڵەکـەی زۆر دەمێنێتەوەو جوانە، سـپیو زەردو وەنەوشـەییە. یەکێك لە جۆرەکانی وەنەوشـەی بۆنە کە لـە ئەوروپاو ئاسـیادا هەیـەو کە لە پزیشـکیدا. بـۆ رەوانیی گەدە بەکاردێت.
(اَلبَنَفسَـجُ الثالوث): وەنەوشەی سیانیی کە گوڵەکەی گەورەیە.
(اَلبَنَفْسَجَة): یەك گوڵە وەنەوشە.
بنق: (بَنَقَ و أَبْنَقَ- إلَیهِ. بَنْقاً): گەیشتێ.
(بَنَّقَ- بالمَکانِ): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو.
(- الـکَلامَ): ئاخاوتنەکـەی کۆکـردەوەو رێکخستو رازاندیەوە.
(- الکَـذِبَ): درۆکـەی هەڵبەسـتو بەجێو رێیکرد.
(- الشـيءَ): لاسایی شـتەکەیکرد/ لە وێنەی ئەو شتە شتی دروستکرد.
(-ظَهْـرَهُ بالسَّـوط): بـە قامچـی پشـتی شیکردەوە.
(- القَمیـصَ): پارچـەی لە کراسـەکەدا تا گەورەتر بێت.
(- إلَیهِ): گەیشتێ.
(اَلبَنیقَـةُ والبِنَقَـةُ): پارچەیەکە دەدرێتە ملی کراس تا فراوانتر بێت.
(مُبَنَّق): پان/ فراوان.
(طَریقٌ مُبَنَّق): رێگەیەکی پانو فراوان.

بنــك: ١-(بَنَّــكَ- تِ الجاريَتــان): دوو كەنیزەکەکە هەریەکە لە گەرمەکەی خۆیەوە دەرچوو هەواڵی گەرمەکەی خۆی‌و خوێشانی بەویتر گەیاند.

٢-(تَبَنَّكَ- بالمَكان و في المَكان): لە شوێنەکەدا مایەوەو نیشتەنیبوو.

(تَبَنَّكَ- في عِزِّه): لە سـەروەریی‌و خۆشـیدا مایەوە.

٣-(البَنـك (ج) بُنـوك) (ت) (لاتينيــة) = المَصْرَف (ج) مَصارِف: بەنك.

(أَلبُنــك): ١-رەچەڵــەك/ بنــەرەت/ نــەژاد سەرچاوەی شت ٢-کاتژمێرێکی شەو.

("مَضى بُنكٌ مِنَ الليل): کاتژمێرێکی شـەو تێپەڕی.

(بنکریــاس) (ع ا) = (لــوزَةُ المَعْــدَة): پەنکریــاس. (لوویەکــی گەورەیە) لە پشــت گەدەوەیە ناوێکی تایبەتیی بەکار دەرژێنێتە ناو گەدەوە بۆ هەرسکردنی خواردن.

بنی: ١-(بَنى- البَيْــتَ. بَنْياً و بِناءً و بُنْياناً و بِنيَــةً و بِنايَــةً): خانووەکــەی ســازاند/ دروستکرد.

(- الأَرضَ): خانوویەکی لە پارچە زەویەکەدا هەستاند/ دروستکرد.

(بَنّا-هُ: تَبنيَةً): خانوویەکی پێکەوەنا.

(أَبْنا- هُ): ١-خانوویەکی دایە یان گەرمســەی پێدروســتکردنی خانــووی دایــە ٢-وایلێکرد خانوویەك دروست بکات.

(بانا- هُ): لە خانەســازیدا پێشبڕکێی لەگەڵدا کرد.

(تَبَنَّــى- الرَجُــلُ): پیاوەکە خۆی دارشــت‌و لەش تۆکمە بوو.

(«إذا جلَســتْ تَبَنَّــت»): هەرکــە دانیشــت بنجبەست‌و دامەزراو دەبێت.

(إبْتَنَــى- بَيْتــاً): خانوویەکــی پێکەوەنــا/ دروستکرد.

(إسْتَبْنى- المَنْزِلُ): خانووەکە شڕبوو پێویستی بە دەستپێداهێنان بوو.

(أَلبنــاء (ج) أَبْنِيَة (جــج) أَبنيات): خانە/ خانوو/ پێکەوەنراوە/ بینا.

(«بناءً عليه»): بــە پێی ئەوە/ بە گوێرەی/ لەبەرئەوەی.

(بنــاءً على ذلك): کەواتە/ بە پێی ئەوە/ بە گوێرەی ئەوە.

(أَلباني (فا) (ج) بُناة (م) بانِيَة (ج) بَوانٍ): خانەساز/ دروستکەر/ بنیاتنەر/ بەنا.

(«بنــى البَيتَ عَلى بَوانيــهِ»): خانووەکەی لەسەر بنچینەکانی هەستاندو دروستکرد.

(حائِــط علــى بنيَتَــين (ب): دوو دیواری لێکدراو ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن (الكلين).

(أَلبُنيَة (ج) بنى وبنىً): ئەوەی دروستکراوە/ ئەوەی پێکەوەتناوە.

(أَلبِنيَــة (ج) بُنــىً وبِنــيً): ١-ئــەوەی

پێکەوەنراوە/ دروستکراوە ٢-سروشتکراو.

(فـلان صَحيـحُ البِنيَـةِ): لەشسـاغە،/ تەندروستە.

(ألبِنايَـةِ): ١-خانە/ بينـا ٢-خانەی گەورەی چەند نهۆمو چەند بەش.

(ألبُنيـان) (مـص): خانـەی هەڵسـێنراوو دروستكراو.

(«كأنَّهم البُنيانُ المَرصُوص»): وەكو خانەی پتەوی تێهەڵكێشن. (لێرەدا (بُنيان) چاوگە لە بری (بناء ومَبنی)هاتووە.

(ألبَنّاء (ج) بَناؤون): خانەساز/ بەنا. كەسێكە پیشەی خانوو دروستكردن بێت.

(المَباني): خانووەكان. خانەكان/ بیناكان.

٢-(بَنـى- الرَجُـلَ): پیاوەكـەی پێگەیاند/ چاكەو پیاوەتیی لەگەڵدا كرد.

(إبتَنى- الرَجُلَ): چاكەی لەگەڵدا كرد.

٣-(بَنى- الطَعامَ بَدَنَهُ): خواردنەكە لەشـی دارشتو قەڵەویكرد.

٤-(بَنى- على كَلامِهِ): شـوێن قسەكەی ئەو كەوتو بە قسەی ئەویكرد.

٥-(بَنى علـى أهليه وبِأهلِهِ أي عَروسَـهُ): ١-بووكـی بۆ گوێزرایـەوە ٢-چـووە پەردەی زاوایەتییەوە.

(إبْتَنـى- علـى أهلِـهِ و بها أي عَروسَـهُ): ١-بووكـی بۆ گوێزرایـەوە ٢-چـووە پەردەی زاراوەیەتییەوە.

(إسْـتَبْنى- الرَجُـلُ): پیاوەكـە بووكـی گوێزایەوە/ ژنی هێناو شاییكرد.

٦-(بَنى- الكَلِمةَ): بە پێی ڕێزمانو پێویست سەرو بۆری بۆ وشەكە كرد.

(بنـاءُ الكَلِمَـةِ علـى حَرَكَةٍ مِـنَ حَرَكاتِ الإعـراب. هُوَ أن تَلزَم الكَلِمَـةُ هذهِ الحَرَكةَ في آخِرِهـا): (بنـای) وشـە لـە دەركەوتنی شـیكردنەوەیدا ئەوەیە كە بە پێـی ڕێزمان سـەروبۆر بخرێتە دوا پیتی وشەكەوە وەكو: (أمسِ) (كە مەبنییە بە ژێر): دوێنێ.

(حُـرُوفُ المَبانـي = حُرُوف الهِجـاء) پیتی دەنگەكانی زمانی عەرەبی.

٧-(تَبَنّـى- هُ): كـردی بە زارۆڵـەی خۆیو بەخێویكرد.

(إبْتَنى- الرَجُلُ): پیاوەكە كوڕی زۆر بوو.

(ألإبن (ج) بَنون وأبناء): كوڕ (م).

(إبنَة): كچ/ دۆت/ كیژ/ كەنیشك.

(بُنَيَّ): كوڕە بچكۆلە.

(إبنِيّ و بَنَوِيّ) بَنَوِيّ: كوڕانە.

(إبْنُ بَطْنِهِ): گەدەپەرست/ خەمخۆری ورگ.

(إبْنُ جلا): مرۆڤی ناودار/ بەناوبانگ.

(إبْنُ ذُكاء): بەیانی.

(إبْنُ السَبیل): ڕێبوار/ ڕاگوزار.

(إبْنُ الطُور): دەنگدانەوە.

(إبْنُ لَیلِها): كوڕی كاری گەورە.

(إبْنُ یَومِهِ): كوڕی ئەو ڕۆژەیە كە تیایدایەو

به دەربەس سیەیەوە نایەت.

(اَلبُنُوَّة): زارۆڵەیی/ فرزەندێتی.

(اَلأُبْنُم): کوڕ (میمەکەی زیادە بۆ زیادڕەویی وا وتراوە)

(اَلبِنْــت (ج) بَنــاة): کــچ/ دۆت/ کیــژ/ کەنیشك.

(بِنتِيّ و بَنَوِي): کچانە.

(بِنتُ الأَرْض): چەو.

(بِنتُ الشَّفَة): وشە.

(بِنتُ العُنْقود أو الكرم): مەی.

(بِنتُ العَين): فرمێسك/ ئەسرین.

(بِنتُ اليَمَن): قاوە.

(بَناتُ الأَرض): چەمەکان.

(بَنــاتُ اللَّيلِ و بَناتُ الصَــدرِ): پەژارەکان/ خەفەتــەکان/ خەمــەکان/ ناســۆرەکان/ داخەکان/ جەخارەکان.

٨-(بِنتُ (ج) بَناتُ القُنصُل) (ن): کلاوبووك: جۆرە ڕووەکێکە لە مەکسیکەوە هاتووە. گەڵای پانە لە ناوچــە گەرمەکان یان شــوێنێك کە ناووهەوای دەریای ســپی بێتو بەستنی کەم بێت باش دەڕوێت.

(وَرْدان أَو صُرْصُــور) (ح): سیســرك. جۆرە مۆریچەیەکە باڵ ڕاســت شاخی درێژی هەیە لە چێشــتخانەو ئاودەســتو ماڵو فڕنەکاندا زۆرە.

(بَنــاتُ نَعْشِ الكُبرى) (فــك): حەوتەوانەی گەورە حەوت ئەســتێرەن لەلای جەمســەری باکوورەوە دەبینــرێت.

(بَنــاتُ النَّعــشِ الصُغــرى): حەوتەوانــەی بچــووك: حــەوت ئەســتێرەن وەك هــی حەوتەوانە گەورەکان. ئەو ئەســتێرەیەی کە سەرەکییە. پێیدەوترێت.

(النَّجمُ القُطبي): ئەستێرەی جەمسەریی کە نیشانەیە بۆ پنتی جەمسەری سەروو.

٩-(البِنايَة): خانەدانیی و مەزنیی.

(اَلبِنيَــةُ): (ف ج): ڕەنگرێژیکە/ پلانێکە کە بەشەکانی وێنەکەی پێ ڕێکدەکەوێت.

(اَلبَوانــي) (ع ا): ١-دانــە پەراســووەکان ٢-چوارپەلی مێحوشتر.

(بُنَيَّاتُ الطَرِيقِ): ئەو قوڵانەی کە لە شەقامە سەرەکییەکە دەبێتەوە.

(«دَعْ بُنَيّاتِ الطَّرِيقِ»): کارە ســەرەکیەکان بگرەو واز لە پێچو پەنا بهێنە.

الملحق:

بَنــيَ: (اَلبَنّــاؤون الأَحْــرار): کۆمەڵەیەکی نیمچــە نهێنییە دروشــمیان برایەتییە لەناو ئەندامەکانیانــداو بــە هێماو ئامــاژە یەکتر دەناسن پێیان دەڵێن (ماسۆنییەکان).

(اَلتَّبَنِّــي): هەڵگرتنــەوەو بەخێوکردنــی منداڵێــكو کردنــی بە زارۆڵــەی خۆ کە هی خۆیشی نەبێت.

(اَلتَّبَنِّــي بِالوَصِيَّــة): زارۆڵەیەك بکەیت بە

كـوڕی خـۆت بە وەسـيـەتێك كە لـە تۆيش نەكەوتبێتەوە.

(تَبَنّي الرأي): رايەك وەربگيرێت‌و پەيڕەويی بكرێت.

---

بهـا: (بَهَأ و بَهِـيءَ و بَهُؤَ لَهُ. بَهـأً و بَهاءً و بُهُوءً): پێيزانی/ پەيپێبرد/ هەستی پێكرد.

(«مابَهَـأتُ لَـهُ و مابَأَهْتُ لَـهُ»): بيرم بۆی نەچوو/ پەيم پێنەبرد.

(بَهَأَ و بَهِيءَ و ابْتَهَأَ- بِهِ): دڵی بەو كرايەوە/ هاودەميی ئەوی پێخۆش بوو.

(بَهَأَ و أَبْهَأَ- البَيْتَ. بَهْأً): ماڵەكەی لە كەلوپەل چۆڵكرد.

بهت: ١-(بَهَتَ- هُ. بَهْتاً): لە ناكاودا گرتی.

(بَهِتَ و بَهُتَ وبُهِتَ. بَهْتاً و بَهَتاً): واقيوڕماو بێدەنگ بوو/ حەپەساو چوو/ زمانی بەسترا.

(بَهَّتَ- هُ و باهَتَـهُ-هُ): بەو درۆو بوختانەی بو بيكرد حەپەساندی‌و سەرساميكرد.

(البَهوت (ج) بُهُت): وڕو كاسكەری خەڵك كە بە درۆو بوختانانەی دەيداتە پاڵيان.

(ألبَهيتَةُ): سەرساميی‌و كاس بوون/ چوون.

٢-(بَهَـتَ- هُ): بَهتاً و بُهتانـاً): بوختانی بۆ كرد/ درۆو قسەی بۆ هەڵبەست.

(بَهّاتَ و بَهُوت (ج) بُهُت): بوختانكەر/ درۆو قسە بۆ هەڵبەست.

(باهَتَ- الرَجُلُ): كابرا بوختانيكرد.

(ألبَهيتَـةُ و البُهْـتُ والبُهتـانُ): درۆ بـۆ هەڵبەستن/ بوختان/ بە ناڕەوا تاوانباركردن/ گوناهدانە پاڵ.

(بهـج: ١-: بَهَـجَ- هُ و أَبْهَـجَ- هُ. بَهْجـاً): دڵيگەشاندەوەو دڵخۆشيكرد.

(بَهِـجَ- بِـهِ بَهَجاً): دڵـی پێكرايـەوە/ دڵی پێخۆش بوو. شاد بوو.

(بَهِـجٌ و بَهِيـجٌ): دڵخـۆش/ دڵكـراوە/ كەيفخۆش.

(إبْتَهَجَ و تَبَهَّجَ و تَباهَجَ واستَبهَجَ- بِهِ): دڵی پێخۆش بوو/ دڵی پێكرايەوە.

(ألبَهْجَـةُ): ١-دڵخۆشـيی/ كەيفخۆشـيی/ دڵكراوەيی/ گوشاديی ٢-جوانيی- گەشاوەيی.

(ألبَهِج): كەيفخۆشی/ دڵخۆش.

٢-(بَهُجَ. بَهاجَةً و بَهَجاناً): جوان‌و گەشـاوە بوو.

(بَهيـج) (م) (مِبهـاج): ئافرەتـی (جوان‌و ڕازاوە/ شۆخ‌و شەنگ).

(بَهَّجَ- هُ): چاك‌و جوانيكرد.

(«بَهَـجَ اللهُ وَجْهَهُ»): خـودا (ڕووی گەش‌و جوان/ پاراو كرد).

(باهَجَ- هُ): نازی جوانيی‌و قەشـەنگيی خۆی بەسـەردا كردو شانازيی بەسـەردا كرد، يان بەسەريەكياندا كرد.

(أَبْهَـجَ و تَباهَجَ –المَكانُ): شـوێنەكە دڵگيرو خۆشبوو ڕووەكەی گەش‌و جوانبوو.

(تَبَهَّجَ): جوان‌و دڵكێشبوو.

(أَلبَهْجَةُ): ١-ناسـكيىو جوانيى/ گەشـاوەيى ٢-خۆشـيى/ كەيفخۆشى/ دڵخۆشـيى ٣-تەڕو پاراويىو شكۆفە.

بهر: ١-(بَهَرَ- ەُ. بَهْراً): بەسـەريدا زاڵ بوو/ بۆرى پێداو لەو باشتر بوو.

(-الرَجُـلُ): پياوەكە سـەركەوتووى هەموو هاوەڵەكانى بوو.

(-القَمَـرُ): تيشـكى مانگەكـە تيشـكى ئەستێرەكانى برى.

(-ت فُلانَةُ النِساءُ. بَهْراً و بُهوراً): نافرەتەكە لـە جوانيىو شـۆخيدا هيـچ ژنێكـى ترى نەگەيشتێ.

(باهَرَ- ەُ. مُباهَرَةً وبِهاراً): شانازيى بەسەردا كردو شەرە شانازى لەگەڵدا كرد.

(أَبْهَرَ): شتێكى سەيرى هێنايە كايەوە سەرى سورماند.

(أَلبَهار): جوانيى/ قەشەنگيى.

٢-(بَهَرَ- الشَّمسُ. بَهراً و بُهوراً): خۆر تيشكى دايەوەو رووناكيى بلاّوكردەوە.

(تبهَّرَ- تِ السَّحابَةُ): هەورەكە روون بووەوە، شەوقيدايەوە.

٣-(بَهَرَ- فُلاناً. بَهْراً): بوختانى بۆ فيساركردو تاوانباريكرد.

(أَبْهَرَ): هەردەمەو لەسەر رەوشتێك بوو.

(إِبْتَهَرَ): فيشاڵيكردو هيچيشى نەكردبوو/ وتى ئەوەو ئەوەم كردووەو هيچيشى نەكردبوو.

(إِبْتَهَرَ- ەُ): رِسـوايكردو هەموو نەنگييەكى دەرخست.

٤-(بَهَرَ- فُلاناً. بَهْراً): هەناسـەى سواركرد/ هەناسەى لەبەر برى.

(بُهِرَ و انْبَهَرَ): لە رەنجو شەكەتيدا هەناسەى سواربوو/ هەناسەى لەبەر برا.

(بَهـيرٌ و مَبْهُورٌ): هەناسەسـوار/ هەناسـە لەبەربراو.

(إِنْبَهَرَ): لـە شـتەكەدا زيادرەويكردو خۆى بۆشەكەتكرد.

(إِبْتَهَرَ): ئەوپەرى رەنجيداو خۆى شەكەتكرد/ هەناسەبركێى بەخۆيكرد.

(أَلبُهْـرُ): هەناسەسـواريى/ هەناسـەبركێى شەكەتيى.

(«بُهـراً لَـه»): هەناسـەى لەبەربرِێـت/ پەتۆنەبات.

(أَلبَهِيرَةُ (ج) بَهائِر): ژنێكى خانەدانى كەتەى سمت پان لەبەر گۆشتو قورسى لە رۆيشتندا هەناسەى سوار بێت.

٥-(أَبهَـرَ): پـاش هەژاريى پێگەيشـتو دارا بوو.

(تَبَهَّرَ- الإِناءُ): قاپەكە پڕبوو.

٦-(أَبْهَرَ): كەوتە قرچەى گەرماى نيوەڕۆوە.

(إِبْتَهَرَ- السَّـيفُ): شمشێرەكە لەناوەڕاستيدا دوولەت بوو.

(إِبهـارَّ- اللَّيلُ أَو النَّهارُ): شـەويان رۆژ نيوە

بوو.
(اَلبُهرَةُ مِنَ المَكانِ والزَّمان): ناوەڕاستی شوێن یان ناوەندی کات.
٧-(إبْهارَّ عَلَيْنا اللَّيلُ): شەو درێژەی لێکێشاین‌و درێژ بووەوە.
(إبْهارَّ واسْتَبهَرَ- اللَّيل): شەو تەووا تاریك بوو/ بوو بە شەوەزەنگ.
٨-(اَلبَهارُ) (ن): چاوەگا. ڕووەکێکە بۆنخۆش. پێشی دەوترێت هەمیشە بەهاری دەشتی.
(اَلبُهار): ١-بت ٢-پەرەسێلکە ٣-لۆکەی شیکراوە ٤-نەهەنگی سپی.
(اَلأَبْهَر): ١-پشت/ پاڵ. («فلانٌ شديدُ الأبْهَرِ»): فیسار پتەو پشتە. ٢-(ع): شادەماری خوێنبەر لامل.
(اَلأَبْهَران) (ع ا): دوو شاخوێنبەرەکەی کە لە دڵەوە دەردەچن‌و خوێن بۆ لەش دەبەن‌و لێیانەوە پەلوپۆی خوێنبەرەکان دەردەچن.
(«مازالَ يُراجِعُهُ الأَلَمُ حتى قَطَعَ أَبْهَرَهُ»): نەخۆشیی‌و ئازار لێینەگەڕا تا مراندی.
(اَلباهِرَةُ) (ن): ڕووەکێکە لە بنەچەی نێرگزە. گەڵا گەورەیە، بەیەکدا دەچێت. دڕکاوییەو سێبەر دەکات. بۆ جوانی دەروێنرێت لە تەمەنیدا تەنها جارێک گوڵدەگرێت.
بهر: ١-(بَهَرَجَ- الدِّماءَ): ١-بەفیڕۆ خوێنی ڕشت ٢-ڕێی بە خوێنڕشتن دا.
(- المَكانَ): شوێنەکەی بێپەرژین‌و بەرەڵا کرد.
(«مَكانٌ بَهْرَجٌ»): شوێنێکی بەرەڵاو بێپەرژین‌و پاراستن.
(تَبَهْرَجَ- المَكانُ): شوێنەکە بەرەڵا بوو، هەرچی هات لێیلەوەڕاند.
٢-(بَهْرَجَ- بِهِمُ الدَّليلُ): ڕانوماکە بەڕێی ڕاستدا نەیبردن‌و ڕێیتری پێگرتن.
(اَلبَهْرَج): ١-ناڕاست‌و ناڕەوا ٢-خراپ/ ساختە/ قەڵب.
(«لُؤلُؤٌ بَهْرَجٌ»): مرواریی ساختەو قەڵب.
(«درهم بَهْرَج»): پارەی قەڵب.
٣-(تَبَهْرَجَ- تِ المَرأَةُ): ژنەکە خۆی نەخشاندو ڕازاندەوە/ ئارایشتیکرد. ٢-فیزی نواند.
بهرم: (بَهْرَمَ- شَعْرَهُ. بَهْرَمَةً): خەنەی گرتە قژی.
(تَبَهْرَمَ): قژی بە خەنە سوور بوو.
(اَلْبَهْرَم): خەنە.
(اَلبَهرَم والبَهْرَمان): ڕەنگێکی زەردە.
(اَلبَهَرمَةُ): خونچەی گوڵ.
٢-(البَهْرَمَةُ): براهمایی ئایینی هندستانییەکان.
بهز: (بَهَزَ- هُ و أَبْهَزَ- هُ. بَهْزاً): ١-توند پاڵی پێوەنا ٢-بەزاندی.
(اَلبَهَز): بەرگریی/ بەرگریکردن.
(بَهْز): ١-پاڵپێوەنانێکی توند ٢-بەزاندن.
بهش: ١-(بَهَشَ- إلَيهِ. بَهْشاً): ١-بە تاسەو خۆشییەوە بەرەو ڕووی چوو ٢-تاسەیکرد.

(اَلْبَهْش مِنَ الرِّجال): پیاوی ڕووخۆش/ دەم بە پێكەنین.
٢-(بَهَشَ- بيَدِهِ إلَيهِ): دەستی دۆستایەتیی بۆ درێژ كرد.
(- لِلبُكاء): دڵی قوڵپی گریانیداو خەریك بوو بگری.
(- عَنهُ): بۆی گەڕا.
٣-(تَبَهَّشَ- القَومْ): خوێشكەل گردبوونەوە/ كۆبوونەوە.
٤-(اَلبَهْش): فەریكی بەری درەختی (دوم) كە درەختێكە لە خورما دەچێت.
(اَلبَهْشَيَة) (ن): دەومنێكە لە بنەچەی بەهشیەكانە لە ناوچە ناووهەوا مامناوەندییەكاندا دەڕوێت گەڵاكەی دڕكاوییە بەرەكەی خڕو سووره دارەكەی نایابە بۆ دەسكی هەندێك شت بەكاردێت.
بهص: (بَهْصَرلَ و تَبَهْصَلَ): جلەكانی داكەندو كردی بە خۆمار.
(«بَهْصَلَ القَومَ مِن مالِهِم»): خوێشكەلی لە داراو سامانەكەیانی دەرپەڕاندن و ڕووتیكردنەوە.
بهظ: (بَهَظَ و أَبْهَظَ- هُ الحَمْلُ أو الأمْرُ): گرانیی باریان كار تووشی زەحمەتیكرد.
(اَلباهِظة): ١-هەر شتێكە، هەر كارێكە كە گران بێت و هۆی ماندوێتیو ئازار پێگەیاندن بێت ٢-وەی/ چورتوم/ ئاپۆره.

(اَلبَمْهوظ): كەسێكە كارێكی گرانی وای بەسەردا درابێت كە لە توانای ئەو دانە بێت/ شكست پێهێنراو/ بەزێنراو.
(اَلقرنُ المَبْهوظ): هاوكوفی شكستخواردوو.
٢-(أَبْهَظَ حَوضَهُ): گۆلەكەی/ حەوزەكەی پڕكرد.
بهق: (اَلبَهَق): پەڵەی سپیی لەش كە نیشانە بێت.
(بَهَقُ الحَجَر) (ن): قەوزە بەردینە.
بهل: (بَهَلَ- هُ اللهُ بَهْلاً): خودا نەفرەتی لێكرد.
(باهَلَ بَعضُهُم بَعْضاً): نەفرەتیان لە یەكتریكرد.
(تَبَهَّلوا و تباهَلوا): شەرە نەفرەتیان لەگەڵ یەككرد/ نەفرەتیان لە یەككرد.
(إبْتَهَلَ- الرَجلانِ): شەرە نەفرەتیان كرد.
(اَلْبَهْلَةَ والبُهْلَةَ): نەفرەت/ لەعنەت.
٢-(بَهَلَ: بهل و ابْهَلَ- هُ): بەجێیهێشت/ وازی لێهێنا.
(بَهَل واستَبْهَلَ- الوالي رعِيتَضهُ): والییەكە لە خەڵكەكەی گەڕا سەربەستیكردن چی دەكەن بیكەن.
(بَهلتِ- الناقَةُ. بَهَلاً): تووڕەكەی گوانی مێحوشترەكە لێكرایەوە تا بەچكەكەی بیمژێت.
(اَلباهِل (ج) بُهْل و بُهَّل- مِنَ النُّوقِ):

١-مێحوشـــتری گـــوان بێتوورمکه ٢-کەســـێکی بێچـــەك ٣-شـــوانێکی بێگۆچـــان/ گۆپـــاڵ ٤-کەسێکی بێکار که هەر بێتو بچێت.
٢-(إبْتَهَــلَ – إلى اللهِ): لــه خــودا پارایەوەو نزایکرد.
(ألبُهْلُــول (ج) بهالِيــل): ١-گەورەپیاوێکــی خاوەن هەموو خەســڵەتێکی باش ٢-قۆشمە/ کەسێکه خەڵك دەهێنێته پێکەنین.
٤-(البَهْلَوان): تەنافباز.
بهــم: ١-(بَهَّــمَ- بالمَــكانِ): له شــوێنەکەدا نیشتەجێ بوو به جێی نەهێشت.
(أبْهَــمَ- ه عَــنِ الأمــرِ): لــه کارەکــەی (دوورخستەوە/ لایدا).
٢-(بَهَّــم البَهْــمَ): گوێرەکەیــان کارەکه یان بەرخەکــەی له دایکی جیاکردەوە تا به تەنیا بۆ خۆی بلەوەرێت.
(ألْبَهَــم والبَهْم والبِهَــام): گوێرەکەیان بەرخ یان کار.
(ألبَهْمَة والبَهمَــةُ): گوێرەکەیەك بەرخێك، کارێك.
(ألبَهيمَة (ج) بَهائِــم): هەموو چوارپێیەکی وشــکانیو ئاو جگه له درنده گۆشــتخۆرەکان هەموو باڵندەکان.
(أبْهَمَ- المكانُ): شوێنەکه گیایەکی وەك جۆی دەرکرد.
(البُهْــى) (ن): ڕووەکێکــه له جــۆ دەچێت/ قەلاس.
٤-(أبْهَمَ- البابَ): دەرگاکەی داخست.
(أبْهَمَ- الأمرَ): کارەکەی نادیارو بێســەروبەر کرد.
(تبَهَّمَ واستَبسَــمَ- الأمرُ عليــه): کارەکەی لێچەواشه بوو.
(أسْــتُبهِمَ- عليه): زمانی بەستراو قسەی بۆ نەکرا.
(ألبَهَم): گیروگرفتی کار.
(ألبُهمةُ (ج) بُهَم): ١-کاری ئاڵۆزو تێهەڵکێش ٢-ئەو ئازایەی هاوەڵەکانی شوێنی لێوە هاتنی نەزانن.
(ألبهيمة): هەموو بێزمانێك که قسه نەکاتو قسەی نەبێت.
(ألمُبْهَــم): ناڕۆشــن/ نادیار تاریــك به پێچو چەنا/ ئاڵۆز.
(أمْرٌ مُبْهَم): ئاخاوتنێکی ناڕوون.
(طريــقٌ مُبْهَــم): ڕێگایەکــی نادیــارو بێسەرودەر.
(حائطٌ مُبْهَم): دیوارێکی بێدەرگا.
(الأبْهَــم (ج) بُهْــم): لاڵو کەســێکه کــه له زمانەکەی باش نەگەن.
٥-(ألبُهْمَة (ج) بُهَم): تاوێری ڕەقی لووس.
(ألبَهيم (ج) بُهْم و بُهَم): ڕەش.
(فَرَسٌ بَهيم): ئەســپێکی یــان چارەوێیەکی ڕەنگ تاریكو یەك ڕەنگ.

(لَيلٌ بَهيم): شەوەزەنگ.
(الإبْهام (ج) أباهِم وأَباهيم): پەنجە گەورەی دەســتو قاچ (لە عەرەبیدا مێیە دەیشکرێت بە نێر).
بهن. (تَبَهْنَسَ): بە کەشو فشو خۆبادانەوە رۆیشت.
بهــا: (بَهــا. بَهــاءً): جــوانو ناســك بــوو/ قەشەنگبوو.
بَهِي: جوانو شۆخو ناسك (م).
بَهِيَّة: جوانو قەشەنگو ناسك.
(بَهــا- هُ): لــەو جوانــترو ناســكتر بــوو/ قەشەنگتربوو.
(بَهُوَ. بَهاءً): جوانو قەشەنگو ناسك بوو.
بهی: ١-(بَهِيَ. بَهاءً): ناسكو جوانو قەشەنگ بوو.
(بَهِيٌّ): جوانو شۆخو ناسك (م).
(بَهِيَّة): جوانو قەشەنگو ناسك.
(باهَا- هُ فِي الحُسْــنِ): شانازیی جوانیی خۆی بەسەردا کرد. خۆی لەو بە جوانتر زانی.
(بَها- هُ): شــانازی جوانترو قەشــەنگتری لەو کرد.
(أَبْهى): روخساری جوانو ناسك بوو.
(إِبْتَهى- بِهِ): شانازیی پێوە کرد.
(تَباهَوا): شــانازییان بەســەر یەکــدا کرد/ بەسەریەکدا خۆیان بادا.
٢-(بَهِيَ- البَيتُ بَهــىً): خانووەکە داتەپیو بێکەڵك بوو.
(بَهّىَ – البَيتَ): خانووەگەی فراوانتر کرد.
(أَبْهــى- البَيــتَ): خانووەکــەی بــە چۆڵیی بەجێهێشت.
(- الخَيلَ): ئەســپەکەی رووتکردو بۆ شەڕی نەبردو سورای نەبوو.
(- الإناءَ): قاپەکەی بەتاڵکرد.
(ألبَهْــو (ج) أَبْهــاء و بُهُوّ و بُهــيّ): ١-ژووری میوان لە ماڵدا/ دیوەخان/ ژووری پێشوازیی/ هــۆڵ/ ٢-(خانوویــەك یان دەوارێــك بە جیا لە بەردەمــی ماڵەکەدا دەکــراو هەڵدەدرا بۆ میوانو نەناس).
بــاء: (باءَ يَبُــوءُ- إِلَيهِ. بَــوْءً): گەڕایەوە بۆ لای.
(- هُ وَ بِهِ): گێڕایەوە.
(باءَ بِالحَــقِّ أَو بِالذَّنْب): پێیلــە مافەکە لە راستیەکە نا یان لە گوناهەکەنا.
(أَبــاءَ- الشــيءَ و بِالشَّــيءِ إِلَيــهِ و عَلَيهِ): شتەکەی گەڕاندەوە- شتەکەی بۆ گەڕاندەوە/ بۆ گێڕایەوە.
٢-(بــاءَ- فُلانٌ بِفُلان بَواءً): قیســار لە بری کوژراوەکە کوژراو/ خوێن بە خوێن بوو.
(«دَمُ بَواءُ دَم»): خوێن بە خوێن بوو/ خوێن لە بری خوێن بوو.
(أَباءَ – القاتِلَ بِالقَتيل): کوژەرو کوژراوەکەی وەك یــەك لێکــرد. واتا لە بــری کوژراوەکە

کوژەرەکەی کوشت.

(تَباوأَ- الشيئان): دوو شتەکە یەکسان بوون/ هاوتا بوون.

(إستَباءَ- القاتِلَ بالقَتيل): کوژەرەکەی وەك کوژراوەکە لێکرد.

٣-(بَوَّأَ- الرمحَ نَحْوَهُ): نێزەکەی ئاراستەی ئەو کرد.

(-هُ و لَهُ مَنزِلاً): خانوویەکی بۆ ئامادە کردو تیایدا دانا.

(-المَكانَ): لە شوێنەکەدا نیشتەنی بوو/ چووە ناوی.

(أَباءَ- بالمَكان): لە شوێنەکەدا نیشتەنی بوو.

(- هُ مَنْــزِلاً و في المَنــزِل): لــە خانووەکەدا داینا.

(تَبَوَّأَ- المَــكانَ وبِهِ): لە شــوێنەکەدا جێگیر بوو/ نیشتەجێبوو.

(إســتَباءَ – المَنْــزِلَ): خانووەکــەی کرد بە شوێنی نیشتەجێی خۆی.

(ألبــاءَة والبِيئَة والمَبْوَأ والمَباءَةُ): ١-هەوارگە/ خانــە/ نیشــنگە/ ژینگــە ٢-ناوەنديــی/ دەوروبەر.

٤-(أَباءَ- مِنهُ): لێیهەلات/ لە دەستی هەلات.

٥-(البيئَة): ١-رەوش/ بار ٢-ژینگە/ دەوروبەر.

(«إنَّهُ حَسَنُ البيئَة»): بارو گوزەرانی باشە.

(ألمُبيئَــةُ- مِــنَ الحاجــات): شــتە زۆر پێویستیەکان.

(ألبُواء) (ح) (لاتينية): مارێکی زۆر گەورەیە ژەهــردار نییــە چوار مەتر درێــژ دەبێت لە وەچەی ئەسەلەیاتە.

باب: ١-(بابَ- لَهُ. بَوباً): بوو بە دەرگاوانی.

(تَبَــوَّبَ- الرَجلَ): پیاوەکــەی (بە دەرگاوان راگرت/ کرد بە دەرگاوان).

(ألبــاب (ج) أبواب و بيبــان): دەرگا/ قاپی/ دەروازە.

(ألبَوَّاب): دەرگاوان.

(ألبوابَة): ١-دەرگاوانی ٢-کرێی دەرگاوانیی.

٢-(بَــوَّبَ- الكِتــابَ): (پەرتووکەکــەی/ کتێبەکەی) بەشبەش کرد.

(ألبــابُ- مِنَ الكِتــاب): بەشــێکی تایبەتیی پەرتووکەکە کە بابەتێکی جیا بێت.

٣-(ألبابَةُ (ج) بَابَات في الحِســاب والحُدُود): ١-ئامانجو کۆتایی لە ژمێرەو سنووردا. ٢-مەرج ٣-جۆرو بابەت ٤-نیشانەو خەسلەت ٥-دەربارە بابەت ٦-شێوە.

(«هذا شــيءُ مِــن بابَتِكَ»): ئەمە شــتێکە دەربارەی ئەوەیە کە بۆ تۆ باشە.

(بابــاتُ الكِتــاب): دێرەکانــی (کتێبەکــە/ پەرتووکەکە).

بوت: ١-(ألبُوت) (ن): رەشە درك: درەختێکە کورتەبــالا یان بــالا ناوەندییە لــە بنەچەی گوڵە، وەك گوێزەو دڕکاوییە، گەلا دادڕدادڕە، گوڵەکەی سپی یان ئاڵە، لە شوێنە فێنکەکاندا

دەبێت.

٢-(ألبوتاس) (ك): پۆتاس/ ترتە/ مادەیەكی وشكی سپییە، یەق دەكاتەوەو لە ئاودا زوو دەتوێتەوە. پۆتاس لە لای خەڵك كاربۆناتی پۆتاسیومە (K2CO3) كە بۆ پاكژیی بەكاردەهێنرێت.

(ألبوتاسیوم) (ك): تەنێكی سادەیە، كانزایەكی سپی زیوینەو نەرمە، یەكێكە لە پێكهێنەرەكانی مادە زیندووەكان، خوێكانی بۆ دروستكردنی پەینی كیمیاوییە. هێماكەی (K)یە.

٣-(ألبوتان (ك): گازێكیە كە لە ماڵاندا بۆ سووتەمەنی زۆر بەكاردەهێنرێت، هێماكەی (C4H10) بە زۆری (بروپان)ی تێكەڵدەكرێت كە هێماكەی (C3o8)تا زوو هەست بە بەرەڵابوونی گازەكە بكرێت.

٤-(ألبُوتَقَة والبُودَقَة) (فارسیة): بۆتە كە زەرنگەر كانزای تێدا دەتوێنێتەوە.

باث: (باثَ و أباثَ و آبتاثَ- الشيءَ و عَنِ الشَّيء. بَوثاً): بۆ شتەكە گەڕا. سۆراغیكرد.

(- التُرابَ): خۆڵەكەی بڵاوكردەوە.

(-المَكانَ): شوێنەكەی هەڵكەندو گڵی تێكەڵكرد.

(-الرَّمادَ): خۆڵەمێشەكەی وروژاندو جیاجیایكردەوە/ بڵاویكردەوە.

(إستَباثَ- التُّرابَ): گڵەكەی دەرەدا.

(«ترك دارَهُم حُوثَ بُوثَ»): خانووەكەیان بە پێی وڵاخەوە رۆیشتۆ كاول بوو.

باج: ١-(باجَ- الشَّرُّ فُلاناً عَلَیهِ بَوْجاً): نەهاتی تووشی فیسار بوو. نەهامەتی دایە سەریدا.

(إنْباجَت- عَلَیهِمُ الدَّواهي): (چورتوم/ ئاپۆرەیان) بەسەردا باری.

(ألبائِجَةُ (ج) بَوائِج): نەهامەتیی/ چورتوم/ ئاپۆرە/ بەڵا.

٢-(باجَ- البَرقُ. بَوْجاً): هەورە تریشقەكە بریسكەیدا.

(إنباجَ و تَبَوَّجَ- البَرقُ): هەورە تریشقەكە چەخماخەیداو شەوقیدایەوە.

٣-(باجَ- البَعیرُ. بَوجاً): حوشترەكە شەكەت بوو.

٤-(الباج):١-هاواركردنو قیژاندن ٢-مەرانە (باجی مەڕ) ٣-جۆرو شێوە.

باح: ١-(باحَ- الشَّيءُ. بَوحاً و بُؤوحاً وبُؤوحَةً):شتەكە دەركەوتو ناوی پەیداكرد/ ناوێر بوو.

(- إلَیهِ بالسِّرِّ): نهێنیەكەی (لادركاند/ ئاشكرایكرد).

(أباحَ- السِرَّ): نهێنییەكەی (ئاشكرا كرد/ دركاند).

(البَواح): ئاشكراو دیار.

(«فَعَلَهُ بَواحاً»): بێپەرواو ئاشكرا

کردەکەیکرد.

(ألبَؤُوح): کەسێکە کە ڕازو نهێنی لا ڕاگر نیە/ زمانی تێنەوەستاوە.

٢-(أباحَ- الشَّيءَ): ڕێی بە شتەکە داو ڕەوایکرد.

(إستَباحَ- الشيءَ): ڕێی بە شتەکە دا/ شیاویکرد یان بە شیاوی دانا ٢-شتەکەی تالآنکرد ٣-خۆی ئەو کارەی کرد.

(-القومَ): خوێشگەلی ئەتککردو ڕیشەکێشی کردن.

(ألإباحِيّ): ١-کەسێکی بەرەڵای هەموو دەستووروئاین‌وئەرك‌ونەریتێکی‌کۆمەڵایەتی ٢-هەموو کردەوەو شتێك بۆ خۆی‌و خەڵکی بە حەڵاڵ‌و ڕەواو شیاو بزانێت.

٣-(الباحَة (ج) بُوح): ئاو ١-ئاوێکی زۆر ٢-دارخورمایەکی زۆر ٣-حەوشەی خانوو.

(باحَةُ الطَريق): ناوەڕاستی ڕێگا/ چەقی ڕێگا.

(البَوحى): بە زەویدا خراو/ لاڵ‌و پاڵخراو.

(«تَرَكَهُم بَوحى»): هەموویانی لاڵ‌و پاڵ خستن‌و بەجێیهێشتن واتا کوشتنی.

الملحق:

بوح: (الإباحِيَّة):١-بەرەڵایی‌و گوێنەدانە هیچ یاساو دەستوورو ئاین‌و نەریتێکی کۆمەڵایەتی ٢-ڕووتبوون.

(إباحِيَّة مَشهَدٌ سينمائي): بینگەیەکی سینەمایيە کە تیایدا ڕووت‌و قووتیی‌و بەرەڵایی یاساو شەرم‌و شکۆ پیشان بدات ٢-دەستە سۆفیگەلێکن دەڵێن مرۆڤ ناتوانێت خۆی لە خراپە بە دوور بگرێت، هەروەها دەڵێن نابێت کەس خاوەنی هیچ بێت، ماڵ‌و سامان تا ژنیش هی هەموان بێت/ هاوبەشبن لە هەموو شتێکدا.

---

باخ: (باخَ- اللَحمُ. بُؤُوخاً): گۆشتەکە بۆگەنبوو.

(-بَوْخاً): شەکەتبوو.

(عَدا حتى باخَ): ڕایکرد تا شەکەتبوو.

(باخَ- الحَرُّ والغضَبُ والنارُ): گەرماکەو ڕقەکەو ئاگرەکە کزبوون‌و نیشتنەوە/ دامرکانەوە.

(أباخَ- النَّارَ): ئاگرەکەی کوژاندەوە.

(«أبِهْ عَنْكَ الظَهرَةَ»): دانیشە تا گەرمای ڕۆژ دەنیشێتەوە.

باذ: (باذَ. يَبُوذُ. بوذاً):١-نەدارا بوو/ هەژار کەوت. ٢-(بێفیز/ بێهەوا) بوو.

بار: ١-(بارَ- تِ السُوقِ أَوِ السِلعَةُ. بَوْراً و بَواراً): بازار کەوت‌و وەستا یان کەلوپەل‌و کالآکە بازاری کز بوو.

(- العَمَلُ): کارەکە وەستا.

(-تِ الأرضُ): زەویەکە بە هیچ کشتەیەك نەکرا.

(بَوَّرَ- الأرضَ): زەویەکەی بە بەیاریی

هێشتەوەو هیچی تێدا نەچاند.

(البائِر (ج) بُوْر): زەویی بەیار/ نەچێنراو.

(«حائِرٌ بائِرٌ»): نە بە قسەی کەس دەکاتو نە روو لە هیچیش دەکات.

(اَلْبُور- مِنَ الأَرض): زەویی بە یار کە بە هیچ نەکرێت/ هیچی تێدا نەچێنرێت.

(البَوار): بێبازاڕیی.

٢-(بارَ وابتارَ- الرَجُلَ): پیاوەکەی تاقیکردەوەو خستیە ژێر ئەزموونەوە.

٣-بارَ. بَوراً و بَوَاراً): فەوتا/ لەناوچوو.

(أبارَ- هُ): فەوتاندی. مراندی.

(تَبَوَّرَ- نَفْسَهُ): بۆ بەدبەختییو پەرێشانیی خۆی گریاو ناڵاندی.

(البُور): ١-گەند/ بۆگەن ٢-فەوتاو ٣-بێفەڕ/ بێکەڵك.

(«إمرَأَةٌ بُورٌ»): ئافرەتێکی خراپو بێکەڵك.

(«قَوْمٌ بُورٌ»): خوێنگەلی بێفەڕو ناتەواو.

(البَوار): فەوتان/ لەناوچوون.

(«دارُ البَوار»): دۆزەخ/ جەهەنەم.

٤-(البُورجوازِيَّة) (فرنسية): چینی ناوەندی گەل کە لە نێو کرێکارو خاوەن پلە ماماناوەندییەکانو خانەدانە کۆنەکانو پارەدەرەکانن، ئەم چینە تا ئەندازەیەك خۆشدەژینو گوزەرانیان باشە.

٥-(البورصة) (ايطالية)= المثابة: بۆرسە/ کۆمەڵگایەکە بۆ کڕینو فرۆشتنی بەشدارییو پارەمەنیو ئاڵتونو کەلوپەل دەگێڕێت ٢-فەرمانگەیەکی داراییە کاری کڕینو فرۆشتنی بەشدارییو پارەمەنیو زێڕو کەلوپەلی تێدا دەکرێت.

٦-(اَلبُوْرَق (ك) (فارسية و قيل يونانية) = النطرون: بۆرەك.

٧-(اَلبوري (ج) بَوَاري) (ج) (فارسية): جۆرە ماسییەکی رووبارەو زۆر جۆری هەیە.

(اَلبُورِيَّة و البُورياء) (فارسية): حەسیرێکە لە قامیش دروستدەکرێت.

(اَلبَوَّاريّ): فرۆشیاری حەسیری قامیش (فارسیە).

باز: (اَلباز (ج) بيزان وأَبْوان) (ح): باز.

(اَلبُوز والبُوزَة) (ط) (فارسية): دۆڵدرمە شیرینییەکە لە شەکرو شیر یان شتیتر دروست دەکرێتو بە ساردکردنەوە دەبەسترێت. وشەکە بە فارسی سەهۆڵ دەگەیەنێت.

باس: ١-(باسَ- هُ. بَوساً): ماچیکرد (لە وشەی (بوش)ی فارسییەوە وەرگیراوە).

٢-(اَلبوسير= الباسور (ج) بَواسير): مایەسیری.

٣-(البُوسطه): ايطاليَّة = البَريد): پۆستە.

باش: (باشَ و بَوَّشَ و تَبَوَّشَ- القَومُ. بَوْشاً): خوێنگەل بە یەکیاندا داو کردیان بە دەنگەدەنگو غەڵبەغەڵب.

(اَلبُوش والبَوش): کۆمەڵە خەڵکێکی

هەمەچیزەی بەیەکداچوو.
(«تَرَکَهُـم هَوشـاً بَوشـاً»): کۆمەڵە خەڵکە هەمەچیزە بە یەکداچووەکەی بەجێهێشت.
(ألَأوباش): تاقمێکی سەرســەری/ خوێریی‌و هەمەچیزەی ناو خەڵك.
(ألبوشِيّ و البَوشِيّ): هەژاری خێزاندار.
بــاص: ١-(بــاصَ- ەُ. بَوصاً): پێشـیکەوت‌و ئەوی بەجێهێشت.
(-فِي الأَمــرِ): پێی لەســەر کارەکــە داگرت‌و هەتەریبوو.
(-مِنهُ): لێیهەڵات‌و خۆی لێشاردەوە.
(بَوَّصَ): لە مەیدانەکەدا پێشکەوت.
(البَوص ج أبواص): دووریی/ ماوە.
(ألبائِصْ مِنَ الطُرُقْ): ڕێگەی دوورو سەخت‌و نارەحەت.
٢-(بَوَّصَ- الشــيءُ): ڕەنگی شتەکە سافبوو/ ڕوونبووەوە.
(ألبُوص): ڕەنگ‌و شێوە.
(البُوص): ڕەنگ‌و ڕوخسارو شێوە.
ألبَوص= البُوص: ئاوریشمی سپی یان کەتانی سپی.
٣-(إنْباصَ): کرژبوو.
(ألبَوْص (ج) أبواص): پاشین/ دامێن.
الملحق:
بــوص: (البُوصَلَــة): قیبلەنمــا (ئامێرێکە دەرزییەکــی موگناتیســاویی تێدایە لەســەر تەوەرەیەکی بچووك دەســووڕێتەوە هەمیشە سەرێکی ڕوودەکاتە باکوور.

---

(باضَ. بَوضاً): ڕووی لەو پەلانەی کە پێوەی بوو سپی‌و پاك بووەوە/ جوانبوو.
(-بالمَكانِ): لە شوێنەکەدا نیشتەجێ بوو.
باط: (باطَ. بَوطاً): لێکەوت‌و هەژارکەوت کە لــە پێشــدا دارا بوو یان بێدەســت بوو کە لە پێشدا دەستدار بوو.
(ألبُوطَــة (ج) بُــوَط= البُوتَقَــة): ١-بۆتــە ٢-نیگارێکی شێوە خڕە کە لە سەر پۆشاك یان شتیتر دەکرێت (فارسیە).
(البُوط) (فرنسية): چەکمە/ پۆتین.
باع: ١-(باعَ و تَبَوَّعَ- الحَبلَ. بَوْعاً): پەتەکەی بە باڵ پێوا.
(-لِلمَساعي): باڵی یارمەتیی درێژکرد.
(ألباع (ج) أبواع وباعات و بيعان): هێندەی درێژیی هەردوو باڵی کراوە.
(طَويــلُ البــاعِ): بە دەســتەڵاتە/ دەستی درێژە.
(رَحــبُ البــاعِ): دەســتکراوەو ســەخییە/ خێرخوایەو بە دەسەڵاتە لە بەخشیندا.
(قصيرُ الباعِ و ضَيِّقُ البَاعِ): دەســتقووچاوو کەمدەسەڵاتە/ بەرچاوتەنگە.
(ألبَوع (مص) البُوع= الباع: ١-باڵ ٢-توانا.
(«لا يَعرِفُ لَوْعَهُ مِن بَوْعِهِ»): ڕاست‌و چەپی خۆی لێکجیاناکاتەوە/ گەمژەیە.

٢-(بــاع- ت الفَرَس. بوْعاً): چارمویێکە پەلی بڵاوی هاویشت/ خێرا ڕۆیشت.

ألبَيِّع: هەنگاو بڵاو.

«فَــرَسٌ بَيِّــع»: چارموێیەکی بــە هەنگاو/ هەنگاوبڵاو.

٣-(باعَ. بوْعا): دەســتی بەخشینی کردەوەو درێژ کرد.

(إنْبــاعَ- الرجُــل إليــهِ): دەســتی کۆمەك و بەخشینی بۆ درێژ کرد.

(-له في البِضاعَةِ): لــە نرخی کەلوپەلەکەدا خاتریگرت.

(-العَرَقُ): ئاوو ئارەقی دەردا.

(-تِ الحَيَّــةُ): مارەکە خۆی کــردەوەو خۆی ئامادەی بازرەقە کرد.

(-الشّــجاعُ مــن الصــفِّ): دلێرەکــە بــۆ بەرەنگداربوون لە ڕیز هاتە دەرێ.

(باعَةُ الدّارِ): حەوشەی خانووەکە.

٤- (البوع): ئێسکێکە کە دوای پەنجە گەورەی پێدێت.

بــاغ ١-(باغَ- هُ. بَوغاً): بەســەریدا زاڵ بوو/ بەزاندی/ بۆریدا. ٢-هاوتای بوو.

(«إنَّكَ لَعالِمٌ لاتُبــاغ»): تۆ زانایەکیت کەس هاوتات نابێت و ناتگاتێ.

(تَبَوَّغَ- فُلانٌ عليه): فیســاری بەسەردا زاڵ بوو. پێشیکەوت.

٢-(تبــوَّغَ- الدَمُ بــهِ): پێی خوێــن وروژاو سەریکرد.

(ألبَوغاء): گەردو تۆزی هەستاو.

(-بَوغــاءُ الطيــب): بەرامەی بۆنیخۆشــی هەستاو.

٣-(بوغ) (ن): جــۆرە ڕەگەزێکی درەختە لە بنەچەی گوڵەباخە لە بەشــی سەرووی گۆی زەویــدا بــڵاوە، بەرەکــەی وردەو ناوکەکەی جاری وا هەیــە دەخورێ دارەکەی چاکەو بۆ جوانیش دەروێنرێت.

٤-(البُوغنفليَّــة) (ن): ڕووەکێکە کەپرۆکەی هەیــە لــە ئەمەریــکاوە هاتــووە گوڵەکــەی لوولەییــەو گەڵای تەمەندرێــژ خولیدەدات و گوڵەکە ڕەنگ ئاڵ و واڵیە سوورو وەنەوشەیی و ئەرخەوانــی، لەناوچە گەرمــەکان و وڵاتانی لێــواری دەریــای ناوەڕاســتدا بــۆ جوانــی دەروێنرێت.

بــاق: ١-(بــاقَ. بَوْقــاً و بُؤوقــاً): خراپەو دوژمنایەتی بەرپا کردو هێنایە کایەوە.

(-تِ البائِقَةُ القومَ):ناهەمواریی و لیقەوماویی دای بەسەر خوێشگەلدا.

(-القومَ): ناپاکیی لەگەڵ خوێشــگەلدا کرد. دزیی لێکردن.

(-القَــومُ عَليهِ): گەلەکۆمەکێیان لێکردو بە نارەوا کوشتیان.

(إنْباقَ بهِ): ستەمی لێکرد.

(-عليهِمُ الشَــرُّ): تووشی ناهەمواریی و وەی

بوون.

(تَبَوَّقَ- الوَبَاءُ في الماشِيَةِ): پەتاو دەرد لەنێو ئاژەڵەکاندا بڵاوبووەوە.

(أَلبائِقَةُ): ناهەمواری/ خراپەو چورتوم.

(«رفعت عَنكَ بائِقَةُ فُلان»): خراپەو وەیی فیسارم لەسەر لابردیت.

(- البائِقَــة (ج) بَوائِق): گرفتاریی/ ئاپۆرە/ بەڵا/ وەی/ چورتوم.

٢-(باقَ): درویکرد.

(تَبَوَّقَ): درۆی (کرد/ هەڵبەست).

(المُبَــوَّق): قســەی هەڵبەســتراوی (نــاڕەوا/ ناڕاست).

٣-(باقَ- الشــيءُ) (ضد):١-شتەکە دەرکەوت ٢-شتەکە ونبوو.

(- تِ السَفينَةُ): پاپۆڕەکە نوقوم بوو.

٤-(باقَ- الشيءُ): شتەکە (خراپ/ گەن) بوو.

٥-(بَــوَّقَ- في البُوقِ): فووی بــە کەڕەناکەدا کرد.

(البُوق (ج) أَبْواق و بیقان و بُوقات) (مو): کەڕەنا/ شەیپوور/ بۆریی.

(«جــاءَ بالبُوقِ و نَفَــخَ في البوقِ»):١-فووی بــە بۆریی درۆو فیشــاڵەکانیدا کرد ٢-لە بنی کوولەکەکەیــداو بــە بەرچــاوی هەموانەوە جاڕیدا/ بانگی شتە ناڕەواو ناڕاستەکەیدا.

(البَوّاق) (مو): بوریە ژەن/ شەیپوورژەن.

٦-(أَلبائِقا- مِنَ المَتاع): کەلوپەلی پەڕپووتو بێهوودە.

(مَتــاع بائِــق): کاڵای بێبایــەخو داڕزاو/ پەڕپووت.

(أَلباقَــة (ج) باقــات): دەســکەگوڵ/ چەپکە گوڵو گیا.

(أَلبُوقَة (ج) بُوَق): تاوە بارانێکی توند.

٧-(بوقیصــا) (ن): دەردار درەختێکــە گەورەو قەبەیە، گەڵاکانی بچووکو ســادەن، لە جەمســەری ســەروی گۆی زەوی دەڕوێت، دارەکــەی نەرمە. جــاری وا هەیە بۆ جوانیی دەروێنرێت.

(بــاك: (بــاكَ- المَتــاعَ بَــوكاً) (ضــد): ١-کەلوپەلەکەی فرۆشت ٢-کریی (- الرَجُلَ): تێکەڵی بووو تەنگی پێهەڵچنی.

(باك – الأمــرُ): کارەکە (ئاڵۆز/ چەواشــە) بوو.

(-القَومَ رَأيَهُم): ڕاکانی خوێشــگەل بەیەکدا چــوونو چەواشــە بــوون، چارەیــان بــۆ نەدۆزرایەوە.

(إنباكَ- علیه الامر): لێیچەواشە بوو/ ئاڵۆز بوو.

بال: ١-(بال. بولا و مَبَالاً): میزیکرد.

(بَوَّلَ- هُ وأَبالَ- هُ): میزی پێکرد.

(أَلبُوَال): دەردی میزەچوڕکێ.

(البَوْل (ج) أَبْوال): میز.

(أَلبُوَلَةُ): کەسێکە زۆر میز بکات.

(المَبولَة): هۆی میزکردن/ میزپێکەر.

(المِبوَلَة): (لەگەنی، دۆلکەی) میزتێکردن.

٢-(البال): مێشكو بیرو دڵ.

(«ماخَطَرَ الامـرُ ببالي»): کارەکە بە بیرمدا یان بە دڵمدا نەهات ٢-بارو گوزەران.

(«فُلانٌ رَخيُّ البال»): فیسـار دڵئاسوودەیەو سەر ڕەحەتە.

(فـلان كاسِـفُ البـال): سـەری جەنجاڵەو دڵنائاسوودەیە.

٣-(البـال): ئـەوەی کە بە بیرتـدا بێتو بە تەنگیەوە بێیت.

(«لَيْسَ هذا مِن بالي»): ئەوە ئەوە نییە کە من بە تەنگییەوە بێم/ بە بیرو دڵمدا بێت.

(«أمـرٌ ذوبـال»): کارێکـە گرنگـەو بیری لێدەکرێتەوە.

(«مابالُك»): چی خەریکی کردوویت/ چیتە.

(ألبـال) (ح): نەهەنگێکی مەزنـی دەریایە، بێپەرەکەی سەر پشـتە درێژیی (٥٠) تا (٦٠) پێیە. (لاتینیە).

(البالَة) (ایطالیة):١-قاپێکی شووشەی درێژە، شووشـەی بۆنە ٢-بەستەك کەلوپەلو کاڵا کە دەپێچرێتەوەو شەتەك دەدرێت.

٣-(بولقار) (فرنسیة): شەقامی ئوتوموبیل، پان، چـاك قیرتاوکراوە. لەمبەرو لەوبەریەوە شۆستەی پیادەڕەوە داریشی لێ ڕوێنراوە.

٤-(البولیـس): (یونانیـة) = (الشـرطيّ والجلـوَز): ١-پۆلیس ٢-ئەو پۆلیسـەی کە لە بەردەمی دادوەردایەو هەمیشـە بە دەنگیەوە دەچێتو لە هاتوچۆدایە.

٥-(البولیصـه والبولِصَـة (ج) بَوالِـص) (ایطالیـة): = الوصـل:١-گەیاننامە ٢-کارتی نێرراو بۆ ئاگاداریی ٣-پسوولەی بڕە پارەیەکی نێرراو ٤-نامە.

(«بولیصة الشَّحن»): بارنامە (هلایطالیم).

بـوم: (ألبُـوم والبُومَـة (ج) أبْـوام) (ح): ١-کوندەبـوو (بۆ نێرومـێ بەکاردێت) و لە کەلاوەکانـدا دەژی بـۆ بە دوومی/ شـوومی بەکاردێت.

٢-(بـوم صَغـير أو خَبَـلْ) (ح): بایەقوش باڵندیەەکـی بچووکی گۆشـتخۆرەو بە شـەو دەگەڕێـتو لـە بنەچـەی کوندەبووە بە تایبەتی لە دارسـتانەکانی ئەوروپادا دەژیو زۆرە.

بان: ١-(بانَ- هُ. بَوْناً): لە چاکەو باشیدا لەو لە پێشتر بوو.

(ألبُون والبَونَة): باشتریی‌و بەسەرداشکانەوەو چاکە.

٢-(البُون والبَوْن): جیاوازیی‌و میانەی نێوان دوو شـت یان دوو کار. ٢-دووریی ٣-جیاوازیی چاکیی‌و خەسڵەت.

(ألبـان): درەختێکـە قـەد مامناوەندیـی سـەرچاوەی بوونـی ئاسـیای جەمسـەرە،

گەڵاكـــەی نەرمە وەك گەڵای بی، لە تۆوەكەی ڕۆنێكی بۆنخۆشی لێدەگیرێت، قەدی مرۆڤو بـــە تایبەتـــی قـــەدو بە ژنـــی نافرەتـــی پێ دەچوێنرێت.

(أَلبـــوان والبُوان (ج) أَبْونَة) و بُون و بُون): ستونی ڕاگری ڕەشماڵ/ دەوار.

٢-(بُوْنْسـيانە): (ن): درەختێكـــی جوانـــە، درێژیی لە هەشـــت تا دە مەتـــر دەبێت گەڵا گەورەیە گوڵەكەی شـــێوە هێشووەو سووریکی شـــەوقدارە، بۆ جوانیی دەروێنرێت، لە وڵاتە گەرمەكانـــداو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشـــدا دەرووێت.

باه: (باهَ- لِلشَّـيءِ. بَوْهاً): بیری بۆ شـــتەكە چـــوو/ بـــە شـــتەكەیزانی هەســـتی پێكـــرد پەیپێبرد.

(«مابِهْتُ وما بُهْتُ لِلأمرِ»): بیرم بۆ كارەكە نەچوو/ دەركم پێنەكرد/ پێیمنەزانی.

(باهَةُ الدّارِ): حەوشەی خانووەكە.

(أَلْبُوهَة): ١-گەوجە پیاو ٢-خوریی شـــیكراوە بـــۆ مەرەكەبدانو پێش تەركردنی كە تەركرا پێیدەڵێن (لیفە).

(أَلبوهَة) (ح): مێی (بـــوە)ە كە باڵندەیەكە وەك كونەبەبـــووە یـــان هـــەر كونەبەبـــوو خۆیەتی.

(أَلبوّ): ١-بەچكە حوشـــتر ٢-پێســـتی بەچكە حوشـــتر لە كا یان لە شـــتیتر دەئاخنرێتو لە حوشترە شیردەرەكە نزیك دەكرێتەوە تا باش شیر بدات، بەوە فریویدەدەن.

(«فلانٌ أَخدَعُ مِن البَوِّ»): فیســـار لە بەچكە حوشترە درۆزنەكە بە فریوترە.

بوَی: (بَوَی: بَبوي. بَيّاً): لاسایی كەسێكیتری كردەوە/ چاوی لەیەكێكیتر كرد.

(أَلبَوَی): ١-لاساییكردنەوەو چاولێكردن ٢-هیوا ٣-خۆرســـك ٤-ئازار/ ژان ٥-ســـركیی/ لێجارس بوونو لێدووركەوتنەوە.

بـــات: ١-(باتَ – في المَـــكانِ بَيْتـــاً و بَياتاً و بَيتُوتَةَ و مَبيتاً و مَبَاتاً): شەو (لە شوێنەكەدا مایەوە/ گلیخواردەوە).

(-فُلاناً و بِهِ وَ عِنْدَهُ): ١- شـــەو لای فیســـار كەس گلیخواردەوە ٢-لای ئەو شەوی بەسەردا هاتو مایەوەو شەوی بەسەربرد.

(«باتَ يَفعَلُ كذا»): شـــەوانە كارەكەی كرد/ نەوەیكرد (وەكو چۆن دەوترێت («ظَلَّ يَفْعَلُ كـــذا»): ڕۆژانە یـــان بـــە ڕۆژ ئەوەیكرد ئەو كارەیكرد.

(أَباتَهُ): شەو گلیدایەوە.

(«أَباتَهُ اللهُ أَحْسَـــنَ بيتَةٍ»): خودا باشـــترین هێشـــتنەوە هێشـــتییەوە (ئەمـــە دۆعـــای باشییە).

(بيتَة= إباتَة): گلدانەوە/ هێشتەوە.

(بَيَّتَ- الشيءَ): بەشـــەو پلانـــی شتێكی گێڕا یان بە شەو ئەنجامیدا.

(بَيَّـتَ- العَـدُوَّ): دوژمنی شـەبەیخونکرد/ بەشەو هەڵیکوتا سەر دوژمن.

(بَيَّتَ رأيَهُ): بە شـەو بیریکـردەوەو راکەی گەڵاڵە کرد.

(إستَبات): خواردنی شـەوی بۆ خۆی ئامادە کرد.

(ألبَيات): شـەبەیخونکردنی دوژمن/ بە شەو هەڵکوتانە سەر دوژمن.

(ألبائِت): شیر یان ئاوێ کە شەو هێڵرابێتەوەو سارد بووبێت.

(ألبَيّوت): شیر یان ئاوێك شەو هێڵرابێتەوەو ساردبووبێت.

(«أسْـقِني مِـن بَيُّوتِ السَّـقاءِ»): شـیرێکم بدەرێ شـەو دۆشرابێت و کرابێتە مەشکەوەو شەو هێڵرابێتەوەو سارد بووبێت.

(ألبَيُّـوت): ١-کارێك كە شـەو پێوەی خەریك دەبێت و بە تەنگیەوە دێت ٢-ئەو مەراقەی كە شەو مرۆڤ پێوەی دەتلێتەوە.

٢-(باتَ الرَجُلُ. بَيْتاً): پیاوەکە ژنی هێنا.

(- الرَجُلَ): ژنی بۆ پیاوەکە هێنا/ کردنی بە خاوەن هاوسەر.

٣-بُيِّتَ- الشَـيءُ: وا دانرا کە شـتەکە بێت و ئەنجامی هەبێت.

٤-(بَيَّتَ- الشيءَ): شتەکەی خانەخانە کرد.

(-البَيْـتَ): خانووەکـەی (پێکەوەنـا/ دروستکرد).

(ألبَيْـت (ج) بُيُوت وأبيات و (حج) بُيُوتات أبابيت): خانە/ خانوو/ نشینگە.

(بيوتـات وأباييـت): وا وتـراوە کـە ئـەم دوانە بۆ ماڵـە گەوران و نـاوداران وترابێت. بچووکراوەکەی.

(بُيَيت): خانوچکە/ خانوو چ دەوار بێت یان گڵ بێت.

(«هُوَ جارى بَيتَ بُيتَ»): ئەو دراوسێمە ماڵ بە ماڵەوە/ خانوو بە خانووەوە.

(ألبَيت): شکۆیی/ مەزنیی.

ألبَيْـتُ العَتيـق والبَيْتُ الحَـرام- الكعبة): کابە.

(بَيتُ الرَجُلِ): (خێزانی/ خانەوادەی) پیاو.

(بَيـتُ المَقْدِس أو البَيـتُ المُقَدَّس): قودس/ ئۆرشەلیم.

(بَيتُ المال): گەنجینەی کیشوەر.

(بَيـتُ العَنكَبوت): ماڵـی جاڵجاڵکە/ تەونی جاڵجاڵۆکە.

(بَيتُ الشَّـعر): دێرێکی هەڵبەسـت کە دوو بەرە، بەری پێشەوەی و بەری دواوەی.

(- القَصيدَة): جوانترین دێری هەڵبەستەکە کە ئامانجی هەڵبەستەکە بنوێنێت یان هەموو هەڵبەستەکە.

(المَيـت): هەوار/ سـتارگە/ نشـینگە/ لانە/ ماڵ/ ئەوا.

(ألبِيْت والبيتَة): خۆراك/ رۆژیی/ قووت.

(لَهُ بيــتُ لَيلَــةٍ): **تەنها خۆراکی شـەوێکی هەیە.**

(المُبَيِّتَةُ- مِنَ النِّســاءِ): **ئافرەتــی مێرددارو خانەدار.**

(ألمُستَبيت): **هەژار.**

بيــج: (بيجاما (ج) بيجامـــات) (اعجمية): **بیجامەی نوستن.**

باد: ١-(بادَ. بَيْداً و بَياداً و بُيُوداً و بَيْدودَةً): **فەوتا/ مرد/ لەناوچوو/ بەفڕەهات.**

(أبادَ- هُ): **فڕیهێنا/ فەوتاندی/ لەناویبرد.**

(ألبَيــداء (ج) بيــد و بَيْــداوات): **بیابانــی فراوانی وشكو بێئاو.**

٢-(بادَ- الشَّمسُ. بُيوداً): **خۆرئاوابوو.**

٣-(بَيْدَ): **کەچی/ بەڵام- هێشتا/ هەر/ لەگەڵ ئەوەدا.**

(«فُلانٌ كثيرُ المال بَيْدَ أَنَّهُ بَخيل»): **فیســار کــەس دەوڵەمەندە بــەڵام چرووکە/ کەچی چرووکە.**

(البَيَّادَة (ا ع) (فارسية): **سەربازی پیادە.**

(البَيَّادِيّ): **کەسێکی سەربازی پیادەڕەو.**

٤-(بيــدا غُوجيــا) (يونانيــة): **هونــەری پەروەردەو فێرکردنی منداڵ.**

٥-(بَيدَرَ- الحُنطَة): **گەنمە دوروراوەکەی کرد بە خەرمان.**

(البيدَر) (ز): **خەرمان/ جۆخین.**

٦-(البَيــدَق) (ح): **باڵندەیەکــە گۆشــتخۆرە ئەوەندەی واشەیەکە.**

بيــذ: (البَيــذق (ج) بيــاذِق) (فارســية): **١-ڕانومای گوزار ٢-ڕێبواری پیادەڕەو.**

(بَيْــدَقُ الشَــطرَنـج): **ســەرباز لــە یاریــی شەترەنجدا.**

بير: ١-(البَيرَق (ج) بَيارِق): **ئاڵا.**

(البَيرقدار) (تركية): **ئاڵاهەڵگر.**

٢-(ألبَيرَمــون والبارامون) (يونانية): **ڕۆژی پێش جەژنی هەندێك فەڵەکان، وەك جەژنی لەدایکبوونی حەزرەتی عیســا کــە تیایدا بە ڕۆژوو دەبن و خوداپەرستیی تێدا دەکەن.**

٣-(بيرة) (ايطالية): **ئاوی جۆ/ بیرە (لە جۆی ترشــێنراوو لــە ڕووەکە گورگەی ترشــێنراو دروستدەکرێت).**

٤-(بيروقراطية) (يونانية): **دەسەڵاتی بەڕێوەبەری نووسینگەکان هی بەڕێوەبەرێتییەکان بێت یان هی میری بێت.**

بيــز: (ألبَيــزار (ج) بَيــازِرَة) (فارســية): **١-بازهەڵگر/ بازدار ٢-کێڵەر/ جوتیار.**

(ألبَزدَرَة) (فارسية): **١-بازداریی ٢-جوتیاری/ کێڵەریی.**

الملحق:

بيز: (البيزنطيّ): **خەڵکی بیزەنتە یان شتی بیزەنتە.**

(الفَنُّ البيزنطي): **هونەری بیزەنتەیی.**

(جَدلٌ بيزنطي): **چەلەحانێــی بیزەنتیانە**

کە هەر نابڕێتەوەو درێژە دەکێشێتو لەسەر هیچیشو بێسوودیش.

بیـش: (بَیَّـشَ اللهُ وَجْهَـهُ): خـودا ڕووی جوانکرد/ قایم چەقاند.

(أَباشَ- الشَـجَرَةَ): درەختەکەی بنجبەستو قایمکرد.

(ألبیش (ج) أیبـاش) (ز) (عامیة): ١-چاڵی درەخـت تێدا ناشـتن ٢-(ن) کۆمەڵە گیایەکە تەمەندارو ژەهراوییە لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەڕێ ژەهرێکی کوشندەی هەیە لە پزیشکیدا بۆ کرژنەبوونی لەش بەکاردەهێنرێت.

بیص: (ألبَیص والبیص): تەنگو چەڵەمە/ تەنگانەو گیروگرفت.

(«وقَعـو في حَیصَ بَیص و حیص بیص»): کەوتنـە گێـژاوی تەنـگو چەڵەمەیەکەوە دەرهاتنیان نەبێت.

بـاض: ١-(بـاضَ- بالمَكان): لە شـوێنەکەدا نیشتەنی بوو.

٢-(بـاضَ- السَّـحابُ): هەورەکە دایڕشـتە باران.

٣-(باضَ- الحَرُّ): گەرما تاویسەند.

(بَیضَـةُ الحَـرِّ): نەوپـەڕی تینـی گەرما/ قرچەی گەرما.

٤-(باضَ- فُلاناً): لەو سپیتر بوو.

(بَیَّضَ- هُ): سپیکردەوە.

(تَبَیَّضَ): سپیبووەوە.

(«تَبْیـضُ الكِتابَـةَ»): پاکنووسـکردنی نوسراوەکە.

(تَبیضُ الآنِیَة): سپیکردنەوەی قاپو قاچاخ/ مزگەریکردنی دەفرو قاپو قاچاخ.

(«بَیَّضَ اللهُ وَجْهَهُ»): خودا ڕووی سپیکرد.

(بایَضَ): کەڵکی لە ڕووناکیی ڕۆژ وەرگرت.

(بایَضَ- هُ): ١-لەو سـپیتر بوو ٢-شـانازیی بە سپێتی خۆیەوە کرد.

أَباضَ- ت المَرْأَةُ): ژنەکەی منداڵی سپیکەلانەی زۆری بوو.

(إبْیَضَّ و إبْیاضَّ): سپی بوو/ سپی هەڵگەڕا.

(ألبَیاض): ١-سـپێتیی ٢-(ط) سپیایی (شیر) (ماسـت) ٣-(ط) گۆشتی سـپی، ئەوەی کە لە خواردندا سـپی بێت وەك سپێنەی هێلکە کە لە پارێزدا پەیڕەو دەکرێت.

(«بَیاضُ العَین») سپێنەی چاو.

(«بَیاضُ البَیْضَة»): سپێنەی هێلکە.

(«بَیاضُ الجِلْد»): پێستی بێتووك.

(«بَیاضُ الوَجه»): ڕوو سپێتیی کە ڕێزداریو ناوچاکیی پێوەیە.

(«بَیاضُ النَّهار»): ڕووناکیی ڕۆژ.

(«بیاضُ الیَوم»): درێژایی ڕۆژ.

(«بَیاضُ الأَرض»): ڕووتیی زەوی کە خانەی لەسەر نەکرابێت.

(«بَیـاضُ البَطن»): چەوریی ناوسـك وەك چەوریی گورچیلە.

(«فُلانٌ يَلْبَسُ السَّوادَ والبَياضَ»): فيسار رەشپۆش‌و سپیپۆشە (رەش هێمایە بۆ گەنیی‌و خراپی سپیش بۆ چاکیی).
(الأبْيَض (م) بَيضاء (ج) بِيض): ١-سپی. ٢-شمشێر.
(«ألمَوت الأبْيَض»): مردنی لە ناکاو.
(«ألخَيط الأبْيَض»): سپێدەی بەیان.
(«البِيضُ- مِنَ اليالي»): شەوانی مانگەشەو.
(«الأيّامُ البِيض»): ڕۆژانی ڕووناك.
(الأبْيضتان): شیرو ئاو یان ماستاوو ماست یان چەوری یان نان‌و ئاو.
(«مارَأيْتُهُ مُذ أبْيَضَين»): دوو ڕۆژی ڕووناکە یان دوو مانگە نەمدیوە.
(«هذا أبْيَضُ من ذاك»): ئەمە لەو سپیترە (کە ئەمە شازە دەبێ بوترێت.
(«أشَدُّ بَياضاً») (اليَدُ البَيْضاء): دەستی سپی واتا دەستی (پیاوەتیی‌و چاکە/ جوامێریی).
(«أتيتُهُ في بَياضِ القَيظِ»): لە قرچەی نیوەڕۆدا هاتمە لای.
(«كَلَّمْتُهُ فَما رَدَّ عَلَيَّ بَيضاءَ ولا سَوداءَ»): دواندم کەچی نە بە چاك‌و نە بە خراپ وەڵامینەدامەوە.
(البيضان- مِنَ الناس): سپیپێستەکان پێچەوانەی (السودان): ڕەشپێستەکان.
٥-(باضَ- الطائِرُ بَيْضاً): باڵندەکە هێلکەیکرد.

(بائِض (م) بائِض (ج) بَوائِض): هێلکەکەر.
(بَيُوض (ج) بُيُض و بِيض): زۆر بە هێلکە.
(البَيضَةُ (ج) بَيضات بَيْض (ج) بُيُوض): ١-(ع ا) هێلکە ٢-گەرای هێلکە/ تۆپەڵە هێلکۆکەیە/ توخمێکە کە لە هێلکەدانی زۆرینەی زیندەوەراندا دروستدەبێ، هێلکەیەکی تێدایە واتا تۆوی زیندەورەکە کە لەو زیندەوەرە دەچێت کە هێلکەکەی لێپەیدا دەبێت‌و لە هێلکەدانیدا دروستدەبێت. ٢-گون.
(«بَيضَةُ الديك»): هێلکەی کەڵەشێر (بۆ شتێك دەوترێت کە هەرگیزاو هەرگیز نەبێت. چونکە کەڵەشێر هێلکە ناکات).
(البُيَيضَة (ج) بُيَيْضات) (ع ا): گەرای هێلکۆکەی هێلکەدانی (توخمی) مێیینە.
(بَيوض) (ح): ئەو زیندەوەرانەن کە بە هێلکەکردن زۆر دەبن، ئەمەش بەشی هەرە زۆری ئەو زیندەوەرانەن کە شیردەر نین.
(المَبيَض) (ع ا): ١-هێلکەدان ئەو ئەندامەیە لە لەشی زیندەوەردا کە هێلکۆکە/ گەرای تێدا دروستدەبێت. ٢-ن: تەختی گوڵ/ تۆو دان.
(البيّاضَة): بە هێلکە/ ئەوەی هێلکە زۆر بکات/ پرهێلکە.
٦-(بايَضَ- هُ): کردی بە هاورازی خۆی/ دڵی خۆی بۆ یەکالا کردەوە.
٧-(إبْتاضَ): خودە ئاستەکەی لەسەرکرد.
(البَيْضَة) (ا ع): کلاوئاسن/ خودەی ئاسن کە

له شەڕدا لەسەر دەكرێت.
٨-(إبتاضَ-القَومَ): ١-فڕی‌خستە خوێشگەلەوەو لەناوبردن ٢-چووە گۆڕەپانەكەيانەوە.
(بَيضَـــةُ القَــوم): مەيدانـــی/ گۆڕەپانـــی خوێشگەل.
(- البَلَدِ): سەرداری شارەكەيان ولآتەكە.
(البَيْضَـــةُ): بێناوێكی كەس نەناس كە كەس نەزانێت كوڕی كێيە.
(بَيْضَةُ الخدر): كەنيزەك.
(-العُقرِ): مندالّی پاشەبەرە.
(باظ: (باظَ): قەلّەو بووەوە كە لە پێشدا لەڕ بوو.
(ألبَيظَ): گەرای مێرووله.
بـــاع: ١-(بـــاعَ- فُلاناً كِتابـــاً أو مِـــن فُلانٍ كِتابـــاً. بَيْعاً و مَبيعاً) (ضـــد): كتێبێكی بە فيسار فرۆشـــتو پارەكەی لێوەرگرت. يان بە پێچەوانەوە كتێبێكی لێكڕیو پارەكەی دايە.
(بائِع): فرۆشـــيار (ج باعة): فرۆشيارەكانو كڕيارەكان.
(مَبيع): كالآو شتی فرۆشراو يان كڕراو.
(أَبـــاعَ- الشَـــيءَ): شـــتەكەی هێنايـــە ســـەر فرۆشتنو پيشانيدا.
(إبتاعَ- الشيءَ): شتەكەی كڕی.
(إنباعَ- الشَـــيءُ): شـــتەكە فرۆشـــراو بازاری گەرمبوو.
(تَبايَعا = بايَعا): كڕينو فرۆختيانكرد.
(إستَباعَ- هُ الشيءَ): سەودای شتەكەی لێكرد يان ويستی لێيبكڕێ.
(البَيع) (ت): كڕينو فرۆشتن.
(باعَهُ): لێيكڕی.
(باعَهُ): پێيفرۆشت.
(ألبياعَـــة (ج) بياعـــات): ئـــەوەی ســـەودا دەكرێت/ ١-كڕراو ٢-فرۆشراو.
(أَلْبَيِّع والبَيَّاع): ١-فرۆشيار ٢-كڕيار.
٢-(بايَـــعَ- هُ. مُبايَعَةً): پەيمانيدايە/ بەلّێنی لەگەلّدا بەست.
(«بايَعـــوهُ بالخَلافَـــةِ»): پەيمانياندايـــە كە بيكەنە (خەليفە/ جێنشين).
(بُويعَ لَهُ بالخَلافَةِ): كرا بە خەليفە.
(البَيْعَـــةُ): كار گرتنەدەســـتو پەيمـــان بـــە بەڕێوەبردنی.
(المُبايَعَـــة بالخَلافَـــةِ): گەورەپياوانـــی ولآت دەست دەخەنە ناو دەستی ئەوەی بە خەليفە دەكرێـــت كە نيشـــانەی پێقايل بوونو مل بۆ كەچكردنو پەيمان پێدانی دەبێت.
٣-(البَيْعَـــة (ج) بَيـــع وبَيعـــات وبيعـــات): پەرستگای فەلەو جوولەكە/ كلّێسە هی دیانە، كەنيشتە (هی جوولەكەيە).
بـــاغ: (بـــاغَ. يَبيـــغ. بَيْغـــاً): خوێنەكـــە هوروووژميكردو هەستا.
(تَبَيَّغَ- الدَمُ): خوێنەكە هەستاو هوروووژميكرد.
بيق: ١-(ألبيقَةُ (ن): گيادانە/ گيندەلّ: جۆرە

ڕووەكێكی گیاییە. گوڵەكەی وەنەوشـەییە. دەچێنرێت‌و بۆ لەوەڕی ئاژەڵ باشە لەناوچە مامناوەندیەكاندا هەیە.

٢-(بَيقَرَ): شـەكەتبوو/ پەكیكـەوت ٢-مرد ٣-سـەری شـۆڕكردەوەو خێرایكرد ٤-سـەری خۆی هەڵگرت‌و نەیزانی كەس بۆ كوێ چوو.

(بَيقَرَ- فِي مالِهِ): تالانی بە داراكەی خۆیداو گەنیكرد.

(-الدارَ): چووە خانووەكەوە.

(الأُبَيْقَر): پیاوی بێفەر/ بێكەڵك.

بيـك: ١-(ألبيـك (ج) بَكـوات وبيـكات) (تركية): بەگ دەوترێت.

(بِـهِ وبَهَـوات): نازنـاوی كـوڕی وەزیران‌و دەركەوتووەكانـی كۆمـەڵ‌و هەمـوو خاوەن دەسـەڵاتێكبوو ٢-لەسـەربازیدا كـورت دەكرێتـەوەو دەوترێـت (قایمقام)یـان ئەمیرەلای.

٢-(البيكار = البركار): پەرگاڵ.

(= بَيكَر و بَوْكَر) = پەرگاڵ.

بيل: (البَيلَسان والبَلَسان = (ن): گلێجە گیا. ڕووەكێـك‌و درەختێكـی جوان‌و پزیشـكییە گوڵەكەی وردە، سپییە، بۆنخۆشە.

بيم: (البيمارسـتان والمارستان) (فارسية) (طب = مُستَشفى): خەستەخانە.

بـان: ١-(بـانَ. بَيانـاً و تَبيانـاً و تِبياناً): ڕوونبووەوەو دیاربوو/ دەركەوت/ ئاشكرا بوو.

(بَيِّـن و بائِن (ج) أبينـاء و بُيَناء و أَبْيان): دیار/ ڕوون‌و ئاشكرا/ دەركەوتوو.

(بَيَّـنَ- الشَّـيءُ): شـتەكە دەركـەوت‌و ڕوونبووەوە.

(بَيَّـنَ- الشـيءَ): شـتەكەی دەرخسـت/ ڕوونكردەوە.

(- الشَـجَرُ): درەختەكە گـەڵای دەركەوت‌و گرت.

(أَبانَ- الشـيءُ): شـتەكە دەركەوت/ ئاشكرا بوو.

(مُبين): دیار/ ئاشكرا/ دەركەوتوو.

(«ضَرَبَهُ فَأَبان رأسَـهُ مِن جَسَدِه»): پیایدا كێشاو سەری لە لەشی جیاكردەوە.

(أَبـانَ- الشَّـيءَ): شـتەكەی ڕوونكـردەوە/ دەرخست.

(تَبَيَّـنَ- الشـيَءُ): شـتەكە ڕوونبـووەوەو دەركەوت‌و ئاشكرابوو.

(- الشيْ): ١-شتەكەی دەرخست‌و ئاشكرایكردو ڕوونكردەوە ٢-سـەرنجی لێداو لێیكۆڵییەوەو زانی.

(إسـتَبانَ- الشـيءُ): شـتەكە ئاشـكرابوو ڕوونبووەوە/ دەركەوت.

(- الشيءَ): سەرنجی لە شتەكەدا لێیكۆڵییەوە، بۆی ڕوونبووەوە/ دەركەوت.

(البَيـان) (مص): ١-دەرخسـتن/ ئاشـكراو دیاریكردن ٢-بـاش دەربڕینی نیـازو ئامانج

(تــاقَ- ت عَينُــهُ بِالدُّمُوعِ): چــاوی پڕ له فرمێسکبوو.
(- مِنهُ): سڵێلێکردەوەو خۆی لێپاراست.
(- بِنَفسِهِ): خۆی کرد به قوربانیی.
(تَنَــوَّقَ- إلى الشَــيءِ): دڵی بۆ شــتەکە لێدا/ حەزی لە شتەکە کردو ئاواتی بۆ خواست.
تال: (تالَ يَتولُ. تَــوْلاً): جادووگەرییکرد/ ئەفسونبازییکرد.
(ألتُولَةُ و التِوَلَةُ): جادوو/ ئەفسوون.
(ألتُولَــة والتَولَــةُ (ج) تَــولات): زۆرزان- ئەفسوونباز.
تــوم: (ألتُــوم (ن) ســير) (عامية): ڕەشــە خەڵکەکە وایپێدەڵێن.
(ألتُومَــة (ج) تُومُ و تُوم): ١-گوارە ٢-هێلکەی وشترمرغ ٣-دەنکە زیوێك لە دوڕ بچێت.
(ألمُتَوَّم): ١-ســکپڕی گوارە لــە گوێ ٢-گەردانە لە مل.
تون: (تَتاوَنَ و تَتــاءَنَ- الصَّيدَ): نێچیرەکە جارێــك لای ڕاســتیەوە هــاتو جارێــك لای چەپییەوە هات/ ئەملاولای لێدەکرد.
تاه: (تاهَ. تَوْهاً): فەوتاو لەناوچوو/ ڕۆیشت.
(تَوَّهَ- هُ و أتا- هُ): مراندی/ لەناویبرد.
(ألتَــوْه والتُوه (ج) أتْــواه و (حج) أتاويه): مردن/ فەوتان/ لەناوچوون.
٢-(تاه. تَوْهاً): لووتبەرزییکرد/ فیزینواند.
٣-(تــاهَ. تَوهــاً): ١-ونبــوو/ ڕێیهەڵە کرد ٢- چەواشە بوو/ ئەقڵی شپرزە بوو.
(ألتُوه- مِن الفَلَوات): بیابانی وشك و چۆڵ کە تیایدا ون دەبن.
تــوى: (تَــوِيَ- المــالُ تَــوًى): ماڵیاتەکــە/ مرداربووە/ لە دەستچوون.
تَوِ و تــاوٍ): ماڵیاتی لەدەســتچوو/ ئاژەڵەکە مردارەوە بوو.
(«أتْواهُ اللهُ إتواءً): خودا مراندی/ لەناویبرد/ فەوتاندی.
(ألتَّوى): لەدەسچووەو زیان.
(«لاتَوى عليه»): نە تووشی زیانبێتو نە لە دەستچوون.
(ألمَتــواة (ج) مَتاوِ و مَتوَيــات): لەناوبەرو زیانبەخش/ هۆی لەناوچوونو لەدەستچوون.
(«ألشُــحُ مَتواةٌ»): چرووکیی ماڵوێرانکەرەو هۆی زیانە.
تيت: (ألتِياتــرُو) (ايطالية): ســەماخانە/ شانۆ.
تــاح: ١-(تاحَ- في مَشــيِهِ. تَيحــاً): بەلارەوە لارەوە ڕۆیشت.
٢-(تاحَ- لَــهُ. تَيحاً): ١-بــۆی ڕێکەوت/ بۆی هەڵکەوت ٢-بۆی لووا.
(أتــاحَ – هُ إتاحَةً): ئامادەیکــرد/ لوواندی/ ڕێی بۆتەختکرد.
(«أتاحَ اللهُ لَهُ الشَــرَّ»): خودا بەدی بۆ هێناو خــراپ تووشــیکرد/ گرفتــاری خراپەیکرد/

وايبۆدانا.
(أَلمُتاح و المِتياح):١-كاری ڕێپێدراو ٢-كاری بۆ ئاسانكراو ٣-بۆ دانراو.
٣-(أَلتِيــاح و التَّيحان والتَّيَّحــان والتَّيَّحان والمِتيَــح): لووتتێژمنــی كاری ئــەمو ئــەو/ خۆتێهەڵقورتێن.
(«رَجُلٌ مِتَيح»): پیاوێكی خۆتێهەڵقورتێنه هەمیشه بەڵای بەسەرەوە دەبێت.
تاخ: (تاخَ- ةُ. تَيْخاً): بەداردەست یان بە لقی دارخورما لێیدا.
(أَلمِتيَخة):١-داردەست ٢-لقی دارخورما.
تاد: (أَلتَّيْد): دڵ پێسووتان/ بەزەیی.
(«تَيْدَكَ زَيداً»): دڵت بەزەیدا بووســتێتو لەگەڵیدا هێواش بەو نەرمبە.
تار: ١-(تارَ- البَحرُ. تَيراناً): دەریاكە هەستاو كەوتە شەپۆڵدان.
(أَلتَّيار): تەوژمی شەپۆلی دەریای هەستاو.
(التَّيــاراتُ الفِكريَّــة): تەوژمــی شــەپۆلی بزووتنــەوەی هــزر/ بــیر كە وەك شــەپۆل دەبێت.
(قَطَعَ عرقاً تَيّاراً): ڕەگێكی گورجی بڕی.
(«فَــرَسٌ تَيّــار»): چارەوێیەكــی تیژڕەوی شەپۆلیی/ غار بە تەوژم.
(أَلتَيّــارُ الكَهرُبائي) (ف): تــەزووی كارەبا. ڕۆیشــتنی لێشــاوی ئەلیكترۆنات بە تەلێكی گەیەنــەردا یــان ئــەو شــلانەی كــە توانای شیبوونەوەیان هەیە.
(التَّيّــارُ المُتَّصِل) (ف): تــەزووی نەگۆڕ ئەو تــەزووە كارەبایەیــە كــە لە بڕو ئاراســتەدا ناگۆڕێت.
(أَلتَّيّــارُ المُتَنــاوِب): تــەزووی گــۆڕراو ئەو تەزووەیە كە بڕو ئاراســتەكەی دەگۆڕێتو لە كارەبای ماڵاندا بەكاردێت.
٢-(أَتارَ- ةُ): جار لە دوای جار دووپاتیكردەوە/ گێڕایەوە.
(تارَةً (ج) تارات): جارێك/ كەرەتێك.
٣-(أَلتِيْر): گومڕایی‌و لووتبەرزیی/ فیز.
(أَلتَيّار): پیاوی گومڕاو لەخۆبایی/ بەفیز.
تاز: (تــازَ- ةُ و تايَزَ- ةُ. تَيْــزاً): بەزاندی/ بەسەریدا زاڵبوو.
(«تازَ السَّــهمُ في الرَّمِيَّة»): تیرەكە چەقییە نیشانەكەوەو تیایدا لەرییەوە.
(أَلتَيّــاز): پیاوی كورتەبنــەی جومگە قایم‌و تۆكمە.
تاس: ١-(تاسَ. يَتيسُ- الجِديُ): كارە نێرەكە بوو بە سابرێن.
(تَتايَس ت و اســتَتْيَسَ تِ- العَنزُ): بزنەكە وەك سابرینی لێهات.
(أَلتَّيــس (ج) تُيُــوس و أَتْياس و تِيَسَــة): ســابرینی بزن‌و كەڵی بزنــە كێویی‌و بەرانی مەرەكێویی‌و كەڵی ئاسك.
(لِحْيَةُ التَيس) (ن): ڕیشە بزن/ شەنگ.

(أَلتَّيسِيَّة و التَّيُوسِيَّة): سروشتی سابرێنیی‌و خۆ وەك سابرێن لێكردن.

(«فِي فُلانٍ تَيْسِيَّةٌ أَو تَيُوسِيَّة»): فیسارکەس وەك سابرێنە/ سابرێن ڕەفتارە.

(أَلتَّيّاس): خاوەن سابرێن/ سابرێندار.

(أَلأَتْيَس): کەسێکی حەســڵەت سابرێنی یان بەرانیی.

٢-(تَيَّسَ- هُ عَن كذا): بەری ئەوەی لێگرت‌و گێرایەوە/ دەستی نایەبەری.

(- فَرَسَهُ): چارەوێکەی ڕامکرد.

(تايَسَ- هُ): شــەڕەپاڵی لەگەڵدا کردو تەنگی پێهەڵچنی.

(تَتايَسَ- الماءُ): شەپۆلەکانی ئاوەکە بەیەکیاندادا.

تاع: ١-(تاعَ- القَيُّ. تَيْعــاً و تَيَعاً و تَيَعاناً): ڕشانەوەکە دەرپەڕییە دەرەوە.

(أَتــاعَ- ماأَكَلَــهُ): ئــەوەی خواردبــووی هەڵیهێنایەوە.

(- الشيءَ): شتەکەی گێرایەوە.

٢-(تــاعَ- الماءُ. تَيعاً و تَيَعاً و تَيَعاناً): ئاوەکە ڕۆیشت‌و بەسەر زەویەکەدا بڵاوبووەوە.

٣-(تاعَ- الطَّريقَ. تَيْعاً): ڕێگەکەی بڕی.

(- السِــمنَ): ڕوونەکەی بــە پارچەیەك نان لێکردەوەو هەڵیگرت.

٤-(- إلَيــهِ. تَيعاً و تَيَعــاً و تَيَعاناً): هەڵپەو پەلەی بۆ لایکردو تاسەیکرد.

(تَتَيَّــعَ- فِي الأَمرِ): بە کارەکەدا هەڵەشــەیی بێدەربەسانەیکرد.

(«إنَّــهُ يَتَتايَــعُ فِي الأُمــور»): لــە کاروباردا هەڵەشانەو بێدەربەسانە تێهەڵدەچێت.

(تَتَيَّعَ- إلي الشَــرِّ و تَتايَعَ- فيه): جرپنانەو هەڵەشــانە خۆی هاویشــتە خراپەکارییەوەو لەسەری ڕۆیشت.

«تَيِّع و تَيِّعان»: کەسێکی شپرزەو هەڵەکاری خراپەخوازیی.

(تَتَيَــعَ- تِ الرِّيحُ بِالــوَرَقِ): باکە گەڵاکەی ڕافڕاند.

تاك ١-(تاكَ. تُيُوكاً): گەوج بوو.

(تائِك): گەوج.

(أَتاكَ- الشَعرَ): تووکەکەی هەڵکێشا.

٢-(تيك): ئامــرازی ئاماژەیە بۆ مێیەك زۆر دوور نەبێت، ئەو/ ئەوە.

«تانك»: ئامرازی ئاماژەیــە بۆ دوو وەمێ کە زۆر دوور نەبن، ئەوانە/ ئەوان.

(ج) أُولئِكَ): ئەوانە، ئەوان.

(تيّاك): بچووککراوەی (تِيك)ە.

(ها)ی وریاکردنەوەی دەچێتە ســەر دەبێتە: (هاتيك): ئا ئەوە.

تال: (أَلتِّيل) (ن): تۆڵەکەی گۆش. ڕووەکێکە لــە بنەچەی تۆڵەکەیە گوڵــی گەورەی هەیە، ســورن یان ســپی، لە وڵاتــە گەورەکانداو لە وڵاتی دەریای ناوەڕاستیشدا دەڕوێنرێت.

تــام: ١-(تــامَ- هُ و تَيَّمَ- هُ الحُــبُّ): حەزو

دلداریـی‌و نەویـن زەبـوون‌و کۆیلەیکـرد/ شەیدایکرد.
(أَلتَّيْـم): ١-بەنـدە/ کۆیلە ٢-هـۆش لێبراو/ دێوانە/ شەیدا.
(«هوَ تَيْمُ الله»): ئەو بەندەی خودایە.
(أَلتَّيمـاء): بیابانێکی وشـك کـە تیایدا ون دەبێت‌و دەفەوتێیت.
(أَرضٌ تَيمـاء): ١-چۆڵەوانییەکـی وشـك‌و بیابانیی تیایدا ون بیـت‌و بفەوتێیت ٢-ناوی شوێنێکە.
٢-(أَلتِّيمَـة والتِئمَـة): ١-مەڕ کـە لە ماڵەوە بەخێـو بکرێـت‌و بدۆشـرێت ٢-مـەڕ کە لە رۆژانی گرانیی‌و برسێتیدا سەرببڕرێت.
تان: (أَلتّين): هەنجیر.
تِينَة: قلە هەنجیرێك.
(تـينُ البُنغـال): هەنجیری بەنغـال. جۆرە هەنجیرێکە پەلەکانی شـۆڕدەبنەوەو بە هەر چـوارلای دارەکەدا دەخەوێنرێـن‌و دەروێن‌و دەبنە داریتر.
«أَلمَتانَـة = أَرضٌ مَتانَـة»: هەنجیرسـتان شوێنێکە کە هەنجیری زۆر تێدا بروێنرێت.
(التَّيَّان): هەنجیرۆش‌و هەنجیروشککەرەوە.
تیـو: ١-(أَلتَيُّوع) (ن): هەموو سـەوزەیەك/ رووەکێك کە بڕیت. شیرێکی سپی دەربکات.
٢-التیوقراطِيَـة: میرییـەك/ دەسـەلاتێك/ کاربەدەستانێك ول دەروانێتە دەسەلاتەکەی‌و دەڵێـت کە لە خـوداوە پێیـدراوەو نوێنەری خودایە لەسەر زەویدا (یونانیە).
تاه: ١-(تاهَ. تِيهاً): فیزینواند/ لووتبەرزیکرد.
(أَلتّائِـه و التَّيهـان والتَيِّهـام والتَّيّـاه): ١-لووتبەرز، بە فیز/ ترزل ٢-بیابانێکی وشـك کە تیایدا وندەبن.
(أَلتِّيـه (ج) أَتْيـاه وَ أَتاوِيـه وَأَتاوِهَـة): چەرداومرووبی‌و لەخۆباییبوون.
٢-(تـاهَ. تَيهـاً و تَيَهانـاً): ١-ڕێیگومکـرد ٢-سەراسیمانە رۆیشت.
(تَيّاه و تَيْهان): ١-ڕێ لێونبوو ٢- سەرگەردان/ سەراسیمە.
«تَيَّهَ- هُ و أَتـاهَ- هُ»: ١-گومڕایکرد ٢-ونیکرد ٣-چەواشەیکرد.
(أَلتِّيـه (ج) أَتْـاه وأَتاوِيـه وأَتاوِهَـة): ١-لە خۆباییبوون/ لاف لێدان‌و فیز ٢-گومڕایی ٣-دەربەدەریی‌و ونبوون ٤-بیابانی وشکی چۆڵ کە خەڵك تێیدا ونبێت.
«أَرضٌ تَيهـاءٌ و مَتيَهَـةٌ و مَتِهَةٌ ومَتيهَهٌ و تِيهٌ»: خاکێك کە مرۆڤ ونبکات مرۆڤ تیایدا سەردەرنەکات.

# ث

ث: (الثـــاء): **چوارەمـــین پیتـــی ئەلفوبێـــی عەرەبییە (ث) لە ژمێـــرە کۆی پیتەکاندا بە (٥٠٠) دادەنرێت.**

ثئـــث: ١-(ثئـــب و ثئـــب وتثائـــب. ثأبا): **باوێشکیدا.**

(مثؤوب): **باوێشکدەر.**

(الثأب والثؤباء = التثاؤب): **باوێشکدان.**

(«أعـــدى مـــن الثؤباء»): **لە باوێشـــکدان بە تەشەنەترە.**

٢-(تثاءب- الأخبار): **سووسەی هەواڵەکانیکرد.**

ثأثـــأ: (ثـــأ ثـــأ- ة) (ضـــد):١-**تینوویکـــرد ٢-تینوێتی شکاند.**

(- النار): **ئاگرەکەی کوژاندەوە.**

(- الغضب): **تووڕەییەکەی دامرکاندەوە.**

(ثأثـــأ- ة عن الأمر): **لـــە کارەکەدا دایبڕی و ڕێلێگرت.**

ثأج: (ثأج- ت الغنم ثأجا): **مەڕەکان باڕاندیان.**

(الثؤاج): **بارەی مەڕ/ بارەباری مەڕ.**

ثئد: ١-(ثئـــد- النبـــت. ثـــأدا): **ڕووەکەکە ئاورنگیگرت/ تەڕ بوو.**

الرجل أو المكان): **پیاوەکە ســـەرمای بوو یان شوێنەکە سارد بوو.**

(ثئد و ثئيد): **پیاوی سەرما بوو یان شوێنی سارد بوو.**

(الثـــأد والثـــاد):١-**ئاورنـــگ ٢-خـــۆڵ/ خاك ٣-سەرما.**

٢-(الثأد والثاد):١-**کاری دزێو ٢-ڕووەکی تازە چووز.**

(الثأدة): **ئافرەتی (زۆر قەڵەو/ گۆشتن).**

(الثأدة): **قەڵەوییو لەش پڕ غەزوبەز.**

(الثـــأداء): **کەنیزەکـــی کۆیلـــە/ کارەکـــەری کۆیلە.**

ثـــأر: (ثـــأر- القتيـــل و بالقتيـــل. ثـــأرا): **بکوژەکەی کوشتەوە و تۆڵەیسەند ٢-بە شوێن**

خوێنی کوژراوەکەدا گەڕا.

(ثائر): تۆڵەسێنی کوژراو خوێنگری کوژراو.

(«ثأر- هُ بِكذا»): بەوە تۆڵەی کوژراوەکەی سەندەوە.

(«ثُئِرَ زَيدٌ»): تۆڵەی کوژراوەکە لە زەید سەنرایەوە/ کوژرایەوە.

(أثْأرَ و إِثَّأرَ- مِنهُ): تۆڵەی خوێنڕژاوەکەی لێسەندەوە.

(إِستَثْأَرَ): هاواری کۆمەکیو تۆڵەسەندنەوەی خوێنەکەیکرد.

(ألثَّأر و الثُّؤرَة (ج) أثآر و آثار و ثائر: ١-داوای تۆڵەو سزادانی کەسێك کە زیانی پێگەیاندبێت ٢-تۆڵەی کوژراو بە کوشتنی کوژەرەکە.

(«هُوَ ثأرُك»): ئەو خوێنەخوێنە/ کوژەری کەسەکەتە.

(ألثَّأرُ المُنيِم): تۆڵەی تەواو، کە خاوەن خوێنەکە/ خوێنگرەکە، کە بکوژەکەی کوشتەوە واز دەهێنێتو دڵئارام دەبێت.

(ألثّائِر): تۆڵەسێن/ کەسێکە تا تۆڵە نەسێنێت سرەوتی نابێت.

ثئط: ١-(ثَئِطَ- اللَّحمُ. ثَأطاً): گۆشتەکە بۆگەنیکرد/ خراپ بوو.

ألثَّأْطَة (ج) ثَأط): قوڕاوی بۆگەن.

٢-(ثُئِطَ- الرَّجُلُ): کابرا هەڵامەتیگرت.

(مَثْؤُوط: هەڵامەتگرتوو.

(ألثُؤاط: هەڵامەت.

٢-(ألثَّأطاء): ئافرەتی گەوج.

(إمرَأة ثأطاء): ئافرەتێکی گەوج.

(ثأل: (ثُؤْلِلَ و تَثَأْلَلَ جَسَدُهُ): لەشی زیپکەی رەقی خڕی دەردا.

(ألثُؤْلول (ج) ثآليل) (طب): ١-زیپکەی ڕەقی خڕی دەرکەوتوو ٢-(اع) گۆی مەمك.

(ثأى: ثَأى و أثْأَى- الشيءَ. ثأياً): ١-شتەکەی کونکرد ٢-هەڵیدڕی/ هەڵیقڵیشاند.

(ثَئِبَ- الشيءُ. ثَأًى): شتەکە ١-کونکرا ٢-هەڵقڵیشا/ هەڵدڕا.

٢-ثَأى- هُ وأثأى- هُ ثَأْياً): کزو بێهێزیکردو تێکیدا/ گەنیکرد.

(ألثَّأي: گەندەڵیی.

(«فُلانٌ يَرْأَبُ الثّأْيَ»): فیسار خراپبوونەکە گەندەڵییەکە چاکدەکاتەوە/ دێنێتەوە قەوام.

١-(أثْأى- في القَوم): لە خوێشگەل ڕاپەڕیو کەوتە کوشتنو بڕینیانو برینداركردنیان.

(ألثأى): شوێنبرینداركردن.

ثبّ: (ثَبَّ. ثَباباً): ئامادانە خۆی ناوەتەوە.

(- الأمرُ): کارەکە تەواو بوو.

ثبت: ١-(ثَبُتَ. ثَباتَةً و ثُبوتَةً): خۆڕاگرو ئازا بوو.

ثَبيت: خۆڕاگرو ئازا.

(ألثُّبات): سوارەیەکی دلێر کە نەبەردانە بجەنگێت/ بە ڕاست پەلامار بدات..

٢-(ثَبَتَ- في المَكانِ. ثَباتاً و ثُبُوتاً):

یەکشەوە/ داسە مانگ ٢-(ح) تورمتە/ هەڵەکە باڵندەیەکی گۆشتخۆرە لە واشە دەچێت و کەمەکێك لەو بچووکترە دەنوکی وەك قەوچی وایە پێشی دەڵێن: (ألبُؤْبُؤْ وأبي رياح): لە بەر سووکەڵەیی و خێرایی وایپێدەڵێن.

(ألجَلَم (ج) جلام): ١-سابرێن و نێرەی ئاسك و بەرانەکێوی ٢-کارژۆلە.

(ألجُلامَة): خوریی برراوە.

(ألجَيْلَم): مانگی پڕ/ مانگی چواردە.

٢-(جَلَمَ واجْتَلَمَ – الجَزُورَ. جَلْماً): گۆشتی بە ئێسقانی ئاژەڵە سەربرراوەکەوە نەهێشت و دایماڵی/ ئێسقانەکەی رووتکرد.

(ألجَلْمَةُ والجُلْمَةُ والجَلَمَة): هەموو شتەکە/ سەراپای شتەکە.

(«أخَذتُ الشيءَ بِجَبَلمَتِهِ»): شتەکەم (تێکرا/ سەراپا/ هەموو/ گشت) برد.

(«هذه جَلْمَةُ الجَزورِ»): ئەمە هەموو گۆشتی سەربرراوەکەیە.

٣-(ألجَلْمَدُ (ج) جَلامِد والجُلْمود (ج) جَلاميد): ١-تاوێری گەورەو سەخت.

(«رَجلٌ جَلْمَد»): پیاوی توندو قایم/ پتەو/ رەق.

(«أرضٌ جَلْمَدَة»): زەوییەکی بەردەڵانی.

(«رَشَحَ أو بَضَّ جَلْمَدُهُ»): بە چروك دەڵێن: شتێکی لەدەست بووەوە ٢-حوشتر گەلێکی گەورە/ رەوە حوشترێکی گەورە.

٤-(جَلْمَقَ – القَوسَ): شتی گرتە شوێن دەستی داری کەوانەکە.

(ألجلماق): شتی/ شوێندەستی داری کەوان.

جلن ١-(ألجُلَّنار (فارسية)): گوڵنار/ گوڵهەناری فارسی.

٢-(جَلَنْجَبين) (فارسية): مرەبای گوڵ و هەنگوین.

جلە: (جَلَهَ- الشيءَ. جَلْهاً): شتەکەی دەرخست و لایخست/ لایدا.

(- المَرْءَ): گێڕایە دواوەو بەریگرت.

(- العَمامَةَ): مێزەرەکەی/ سەروبەستەکەی لەسەر ناوچەوانی لادا.

(جَلِهَ جَلَهاً): قژەکەی لەسەر ناوچەوانی لاچوو و ناوچەوامانی دەرکەوت.

(أجْلَه): ناوچەواندەرکەوتوو.

(ألجَلْهَةُ (ج) جِلاه- مِنَ الوادي): ١-(لێواری/ قەراغی/ ناوچەوانی) دۆڵ ٢-ئەو لایەی کە لەبەر دەمتدایە.

(بَيْتٌ مَجلُوه): خانوویەکی بەرەڵای بێدیواری حەوشەو بێدەرگا.

٣-(جَلاهِق) (فارسية): ١-تەنێکی بچووکە/ قورە یان قورقوشمە خرە دەگیرێتە شت و بۆی هەڵدەدرێت. ٢-ئەو کەوانەیەی پێیهەڵدەدرێت.

جلا: ١-(جَلا- عَن بَلَدِهِ ومِنهُ): لە شارەکەی یان وڵاتەکەی باریکرد/ دەرچوو/ بۆ

پوختەکردنو بە ئاو شتنیەتی.

ثبـج: (ثَبَـجَ و ثَبَّـجَ- الـكَلامَ. ثَبْجـاً): ئاخاوتنەکەی بە پێچو پەنا کردو دەرینەخست.

(- الخَطَّ): نووسـینەکەی ئاڵۆز کرد/ هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو/ دیارنەبوو.

٢-(ثَبَجَ. ثَبْجاً و ثُبُوجاً): لەسەر نووکی پێی چیچکەیکرد/ بە چیچکانەوە دانیشت.

٣-(ثَبَّجَ و تَثَبَّجَ- الراعي بالعَصا): شوانەکە گۆچانەکەی خستە پشتیەوەو هەردو دەستی لەمسەرو لەوسەریەوە ئاڵاند.

(إثْبأَجَّ- الرَجلُ): پیاوەکە کەتەو شلگۆشت بوو.

(- السَقاءُ): کوندەکە پڕبوو.

أَلثَّبَـج (ج) أَثباج و ثُبوج- مِن كُلِّ شـيءٍ): ١-ناوەراستی هەموو شتێك ٢-زۆرینەی شتەکە.

(«يَركبـونَ ثَبَـجَ هذا البَحر»): بە بەشـی زۆری ئەم دەریایەدا دەگەڕێنو سواری شەپۆلە بەرزەکانی دەبن.

(-أَلثَّبَج): سـەرەوەی شـت ٤-نێوان کەمەرو سەرشان.

(أَلأَثبَج): ١-کەسـێکی ناوشـان پانو ناوشـان دەرپەڕیو ٢-قەمبوور.

(أَلمُثَبَّج- مِنَ الرِجال): پیاوی درێژی ناقۆڵاو ناوشانکوور.

ثـبر: (ثَبَـرَ- هُ. ثَبْـراً): ١-نەفرەتـی لێکرد ٢-دەریکرد ٣-نائومێدیکرد.

(- عَن كَذا): نەیهێشت/ ڕێی ئەوەی لێگرتو دەریکرد.

(ثَبرو ثَبَّرَ- فُلاناً بِالشَّيءِ): شتەکەی لێگرتو نەیهێشت دەستی بیگاتێ.

(أَلمُثَبَّر): بێبەش.

٢-(ثَبَرَ. ثُبُوراً): مرد/ فەوتا.

(- هُ): مراندی/ فەوتاندی.

(ثَبَّرَ- اللهُ فُلاناً): خودا مراندی/ لەناویبرد.

(أَلثُّبُـور): فەوتـان/ مـردن ٢-بارکەوتـنو گرفتارییو پەژارە ٣-فەوتاندن ٤-چورتوك.

«دعـا بالوَيـلِ والثُّبُور» أي قـالَ «واوَيلاه واثُبـورا»: یەکێـك وا دەڵێـت کە تووشـی چورتومێکی گەورە بێت یان گرفتارو مەترسی لەناوچوونی بێت، دەڵێت: ئەی خاك بەسـەر خۆم هەیهاوار سەرگەرداندو فەوتاو خۆم.

٣-(ثَبِـرَ- ت. القُرحَةُ ثَبَـراً): دوومەڵەکە تەقییو کێمو زووخەکەی لەبەر ڕۆیشت.

٤-(ثابَرَ- على الأَمر. ثِباراً و مُثابَرَةً): لەسەر ئەنجامدانی کارەکە ڕۆیشتو سەرومڕ بوو.

(ثِبـارة مَثابَـرَة): لەسـەر ئەنجامدانی کار هەتەر بوونو ڕۆیشتن/ بەردەوامبوو.

(مُثابِـر): پشـتگەرمی کار/ لەسـەر کارو ئەنجامدانی هەتەرو بەردەوام.

٥-(تَثابَروا): لە یەکتر ڕاپەڕین.

(أَلثَّبْرَة): ١-زەوی تەخت/ تەختانی ٢-چاڵ لە زەویدا یان لە شاخدا.

(أَلمَثْبِر): ١-سـەربڕگەی ئاژەڵ ٢-ئەو شوێنەی ژن منداڵـی تێـدا دەبێـت یان حوشـتر تێدا

دەزێت/ زانگە.

أَلْمُثَبَّر: بە ئەندازە/ سنووردار.

ثبط: (ثَبَطَ- هُ و ثَبَّطَ- هُ عَنِ الأَمرِ. ثَبْطاً): پشتی لە کارەکە ساردکردەوەو بەری لێگرت‌و خلافاندی.

(- هُ علــى الأَمرِ): کارەکەی هەر بەرەو ڕووی ئەو کرد/ بەوی سپارد.

(أَثْبَــطَ- هُ المَــرَضُ): نەخۆشــیەکەی هــەر لێنەبووەوە.

(تَثَبَّطَ- عَــنِ الأَمرِ): لە کارەکەدا دواکەوت/ خاوەخاویکرد/ شینەیبوو.

(أَلثَبِــطُ (ج) أَثْبــاطَ و ثِبــاط (م) ثَبْطاء: ١-نەتواناو سست ٢-گەوج.

ثبق: (ثَبَقَ- النَّهرُ. ثَبْقاً و تَثْباقاً): ڕووبارەکە ئاوی زۆرو خوڕو تیژ بوو.

(- تِ العَينُ): فرمێسك بە خوڕ بە چاوەکەدا هاتەخوارێ.

ثبل: (أَلثُبْلِ و الثَبَل): پاشــماوەی بن قاپ‌و دەفرو شتیتر.

ثبن: (ثَبَتَ- الثَــوبَ ثَبْناً و ثِباناً): قەراغی جلەکــەی نوشــتانەوەو درووی/ تێکوبنتیکی جلەکەیکردو درووی.

(- الشَــيءَ): ســەرەوەی شــەرواڵەکەی لــە شتەکەوە پێچایەوە.

(ثَبَنَ و تَثَبَّنَ- الشَيءَ): شتەکە لە دامێنی/ پێش‌و لۆچی جبەکەیەوە ئاڵاندو بە دەستیەوە گرت.

أَلثِّبين: لۆچی جبە یــان عەبا/ دامێنی جبە یان عەبا/ کە بینوشتێنیتەوەو بە دەستیەوە بگریت.

(أَلثُبْنَــةُ (ج) ثُبَن والثِبان (ج) ثُبُن): لۆچی کراس/ دامێنی کراس کە دەینوشــتێنێتەوەو شتی تێدەکەیت‌و هەڵیدەگرێت.

(أَلمَثْبَنَــةُ (ج) مَثابِن): توورەکەی ئارایشــتی ژنان.

ثبــی: ١-(ثَبــى- الشــيءَ ثَبياً): شــتەکەی کۆکردەوە.

(ثَبَّى- الشيءَ): شتەکەی گرد کردەوە.

(«ثَبَّى اللهُ لَهُ النِعمَ»): خودا ســامان‌و فەڕی بە سەردا ڕشت.

(أَلثُبَّــةُ (ج) ثُبَــات و ثُبُــوت): ١-کۆمــەڵ ٢-ناوەڕاستی گۆل/ حەوز ٢-دەستەیەك سوار.

(أَلأُثْبِيَّــةُ) (ج) أَثَابِــيّ: گەلەیــەك خەڵك/ خەڵکێکی زۆر.

٢-(ثَبَى- الشَيءَ): شتەکەی مەزنکرد.

(- على فُلان): فیساری هەڵناو ستایشیکرد.

(أَلثَّبِيُّ): زۆر ستایشکەری خەڵك.

٣-(ثَبَّى- الشــيءَ): ١-شــتەکەی چاککردەوە ٢-شتەکەی تەواوکرد.

(- على الأمرِ): لەسەر کارەکە بەردەوام بوو/ سەرومڕ بوو.

ثج: (ثَجَّ- الماءُ. ثُبُوجاً): ئاوەکە کشا/ ڕۆیشت.

(- الماءَ. ثَجّاً): ئاوەکەی کشاند/ ڕاکێشا.

(إنثَجَّ- الماءُ): ئاوەكە كشا/ ڕۆیشت.

(ألثَجَاج- مِن الأمطار): لێشاوی تیژی بارانی بەخوڕ.

(ألثَجُوج- مِنَ العُيون): سەرچاوەی فرەئاو.

(ألثَّجيج): لێشاوی گەورە.

(ألمِثَج): وتاربێژی زمانپاراوی زمانزان.

٢-(ثَجثَجَ- الماءَ): ئاوەكەی ڕاكێشا.

(تَثجْثَجَ- الماءُ): ئاوەكە كشا/ هات.

ثجر: (ثَجَرَ- الثَّمرَ. ثَجَراً): خورما گەیوەكەی تێكەل بە كاڵەكە كرد.

(ثَجَّرَ- هُ): فراوانو پانیكرد.

(ألثَجْرو والثَّجر والأَثْجَر- مِنَ الوَرَقِ و نَحْوَهُ): گەڵاو شتی لەو جۆرەی ئەستوورو پان.

(ألثُجرَةُ (ج) ثُجَر): ١-دەوروبەری كون ٢-ناوەڕاستی شت.

(«أقاموا فِي ثُجَرةُ الوادي»): لە ناوەڕاستی دۆڵەكەدا هەڵیانداو نیشتەنیبوون.

(ثَجيرُ البُسر): خڵتەی خورمای نەبەكام/ نەگەیو.

ثجل: (ثجِلَ. ثَجَلاً): ورگی لێهات.

(أثجَل: ورگن/ ورگلێهاتوو.

(ألثَّجلاء (ج) ثُجْل- مِنَ النِّساء): ١-ژنی كەتەو ورگن ٢-جەوەندەی فراوان.

ثجم: (ثَجَمَ- تِ السَّماءُ. ثَجْماً): باران بە خوڕ باری/ لێزمەیكرد.

(- هُ عَنهُ): زوو ئەوی لێلاداو دووریخستەوە.

(أَثْجَمَ- تِ السَّماءُ): ئاسمان كردی بە لێزمەو باران.

(ثَجا: ثَجا: ثَجواً): كپبوو/ خامۆشبوو/ بێدەنگبوو.

(أثجى-ه): بێدەنگیكرد.

ثخن: (ثَخُنَ- ثِخناً وثَخانَةً وثُخونَةً): ١-ئەستوور بوو ٢-ڕەقو پتەو بوو.

(ثَخين (ج) ثُخَناء): ١-ئەستوور ٢-ڕەقو پتەو.

(أثخَنَ- فِي الأمر): لە كارەكەدا زیادڕەویكرد.

(-فيي العَدُوَّ): دڵڕەقانەو زیادڕەوانە دوژمنی كوشت.

(-فِي الأرض): كوشتاری زۆریكرد.

(-تْهُ الجراحُ): برینەكان پەكیخستنو لاوازو بێهێزیكرد.

إثَّخَنَ: لاوازو بێهێزی برینەكانی بوو.

(إسْتَثْخَنَ- مِنهُ المَرَضُ أوَ النَومُ): نەخۆشییەكەیان خەوەكە بە سەریدا زاڵ بووداى بە زەویدا.

ثوغ: (ثَدَغَ- رَأسَهُ. ثَدْغاً): سەری قرنجاند.

(إنْثَدَغَ): سەری قرنجا.

ثدق: (ثَدَقَ- المَطَرُ. ثَدقاً): بارانەكە دایڕشت.

(- السَّحابُ): هەورەكە دایڕشتە باران.

(ثادِق): هەوری باران داڕشتە.

(إنْثَدَقَ- الناسُ عَلَيهِ): خەڵك بەسەریدا داباریڕنو پەلاماریاندا.

ثـدم: (ثَـدَّمَ – الإبريـقَ): ئاوپاڵێوی نا به مەسینەکەوە.
(أَلثِّدام): پاڵێو.
(أَلثـدْم: (م) ثَدْمَة): ١ـمرۆڤـی بێدەموپل/ قسەنەزانو بێبەڵگە ٢ـگەوج.
ثـدن: (ثَـدِنَ- اللَّحـمُ: ثَدَناً): گۆشـتەکە بۆنیکرد.
(ثَدِنَ وثُدِّنَ- الرَجُلُ): پیاوەکە گۆشتی زۆری گرتو قورس بوو.
(ثَدِن و مُثَدَّن): گۆشتگرتو و قورس بوو.
(أَثْدَنَ- الشيءَ): شتەکەی کورتکرد.
ثدا: (ثَدا- هُ: ثَدْواً): تەڕیکرد.
(ثَديَ. ثَدىً): تەڕ بوو.
(ثَدّا- هُ تَثْدِيَةً): خۆراکی دایە.
(أَلثَّـدي و الثَّـدى (ج) ثُدِيّ و ثِـدِيّ و أَثْدٍ (ع ا): (دەکرێتــە نێرومــێ): مەمــك کە ژن شیرەکەی پێدەداتە کۆرپەکەیو گۆی هەیە.
(أَلثَّدْياء): ژنی مەمك گەورە/ مەمك زل.
ثر: ١-(ثَرَّ- الشَـيءُ. ثَرّاً و ثُرُوراً و ثُرُورَةً و ثَرارَةً): شتەکە فراوان بوو.
(- تِ السَّـحابَةُ أَوِ العَـيْنُ): هەورەکــە ئاوو بارانــی زۆر بوو یان چاوەکە فرمێســکی زۆر بوو/ بە فرمێسك بوو.
(ثَرَّة و ثَرُور): هەوری پڕ ئاو/ ئاودار.
عَينٌ ثَرَّةٌ و ثَرور: چاوی بە فرمێسك.
عَينٌ ثَر (ج) ثِرار: کانی فرەئاو.
(- تِ السَّـحابَةُ ماءَهـا): هەورەکە ئاوەکەی داکرد/ بارانەکەی داکرد/ دارشت.
(أَلثَّرارَةُ- مِنَ العيُون): کانییو سـەرچاوەی فرەئاو.
(أَلثَرّ): زۆر بلێ.
«مَطَـرٌ ثَـرّ»: بارانی دڵۆپ گـەورە گەورەو لێزمە.
(«فَرَسٌ ثَرّ»): چارەوێیەکی بە هەڵپەو هەڵمەت.
(«شـاةٌ ثَرَّة»): مەڕێکی بەشیرو دەماری شیر فراوان.
(أَلثّارَّة): زۆربلێ/ چەنەباز.
٢-(ثَرَّ- هُ. ثَرّاً): پەرشو بڵاوی کردەوە.
(ثَرَّرَ- المَكانَ): شوێنەکەی تەڕکرد.
٣-(ثَرْثَرَ- الشيءَ. ثَرثَرَةً): شتەکەی پەرشو بڵاوکردەوە.
(- الـكَلامَ): چەنــەی زۆرداو قســەی هیچو پووچی بەسەریەکدا کرد.
(ثَرثار (م) ثَرثـارَة): چەنەبــاز/ زۆربلێ/ قەرەچەن.
(أَلثَّرثـارَة والثُرثُـورَة- مِنَ عيُـونُ الماء): سەرچاوەو کانیی ئاو زۆر/ فرەئاو.
(أَلثَرْثَرَةُ): زۆر وتن/ زۆر بلێیی/ چەنەبازیی/ هەڵەوەڕیی.
ثـرب: ١-(ثَـرَبَ و أَثْـرَبَ-هُ ثَرْبـاً): ١ـسەرزەنشـتیکرد ٢ـکردارەکەی بە شـتێکی دزێو دانا.

(ثَرَّبَ- هُ و عَليهِ): ١-سەرزەنشتیکردو تەشەری لێدا ٢-کردارەکەی بە شتێکی ناشیرین دانا.

(اَلْمُثَرِّب): چەواشەکارو تێکدەری خەڵك.

٢-(أثْرَبَ- الكَبشُ): ورگ و ریخۆڵەی بەرانەکە بەزی زۆر گرت.

(أثْرَبَ (م) ثَرْباءُ): بەز گرتوو/ بەرانی ورگو ریخۆڵە بەزدار.

(اَلثَّرب (ج) ثُرُوب و أثْرُب و (جج) أثارِب): ئەو بەزە تەنکەیە بە ورگ و ریخۆڵەی بەرانەکەوەیە/ بەزی ناوسك.

ثرد: ١-(ثَرَدَ و أثْرَدَ و إثَّرَدَ. ثَرْداً): تریتیکرد.

(- الخُبزَ): نانەکەی وڵیە ناو شلەکەوە/ شۆرباکەوە/ تریتیکرد.

(الخُبزُ الثَرید و مَثْرُود): نانی وڵیوراوی شۆرباوە.

(اَلثَّرید و الثَّریدَة (ج) ثَرائِد و ثَرود) (ط): تریتی ئامادە کراو/ تێگوشراو/ تێگوشین.

(اَلثَّرْد): نمەباران/ نەرمەباران.

(اَلمَثْرُودَةُ و المُثَرَّدَةُ- مِنَ الأرضي): زەوییەك رشێنەبارانێکی بەرکەوتبێت.

٢-(ثَرَدَ- الثَّوبَ): جلەکەی لە رەنگ نا/ لە رەنگ هەڵکێشا.

(ثُرِدَ و ثُرِّدَ- مِنَ المَعرَكَةِ): لە جەنگەکەدا بە بریندارییی هەڵگیراو گوێزرایەوە.

٢-(اَلثَّرد): قڵیشانی لچ و لێو.

(اَلأثْرَد): لچ و لێوی هەڵقڵیشاو.

ثرع: ١-(ثَرِعَ- الرَجُلُ. ثَرَعاً): کابرا مشەخۆرییکرد.

ثَرَع: مشەخۆریی.

٢-(الثُرْعُلَةُ): پەری ملی کەڵەشێر.

ثرغ: (اَلثُرغَل) (ح): دێڵەرێوی.

(اَلثُّرغُول) (ن): برۆمی گیایەکە لە کۆمەڵەی گەنمە، رووەکێکە.

ثرم: (ثَرَمَ و أثرَمَ- هُ. ثَرماً و ثَرَماً): دانی لە بێخەوە شکاند.

(ثَرِمَ وانثَرَمَ): دانەکە لە بێخدا شکا.

(أثرَم) (م) ثَرماء (ج) ثُرم): کەسێکە دانی لە بنجەوە شکێنرابێت.

(اَلثَّرمَان) (ن): درەختێکی بێگەڵایەو لاسکەکەی ئاوی زۆرەو ئاژەڵ دەیخوات.

(اَلأثَرَمان): ١- شەوو رۆژ ٢-رۆژگارو مردن.

ثرا: (ثَراءَ- القَومُ. ثَراءً): خوێشکەل زۆر بوون.

(- اللهُ القَومَ): خودا ژمارەی میللەتی زۆر کرد.

(- هُ): لەو داراتر بوو.

(ثَرى و ثَرِيَ- الرَجُلُ. ثَرىً): پیاوەکە دەوڵەمەند بوو/ دارا بوو.

(أثرى. إثراءً): دەوڵەمەند بوو/ دارا بوو/ سامانداربوو.

(ثَريّ و مُثرٍ وأثرى (م) ثَرواء): دەوڵەمەند/ دارا/ سامانداز.

(اَلثراء و الثَّروَة): ساماندارِیی/ دەوڵەمەندیی/ دارایی یان زۆربوونی ژمارەی نەتەوەیەك.

اَلثَّـريّ و الثَري- مِنَ المال): ماڵو سـامانی زۆر. دارایی فرە.

(- مِنَ النّاس): دەوڵەمەند- خاوەن سـامانی زۆر/ دارا.

(- مِنَ الرِّياح): بای زۆر.

(ألأثرى (م) ثَرواء): سـاماندار/ دەوڵەمەند/ دارا.

(الثَروان (م) ثَروى): ساماندار/ دارا.

(اَلثُّرَيّـا (فك): ١-ئەسـتێرەی كـۆ/ پەروین (كۆمەڵە ئەستێرەیەكن، بۆیە ناونراوە لەبەر زۆرییان كە لە شـوێنێكی تەسـكدانو ڕێكو پێكن، نزیك یەكن بە شـێوەیەك هەروەكو لە یەك جیانەبنەوە وان) ٢-چلچرای ماڵان.

ثري: ١-ثَريَ: دەوڵەمەند بوو/ ساماندار بوو/ دارا بوو/ بووە بوو.

٢-ثَـريَ و أَثـرى- الـتراب. ثَـرىً): خاكە وشكەكە تەڕو نەرم بوو.

(ثَريَ و أثرى): نەرمو تەڕ.

(ثَرِيَةٌ وثَرياء): نەرمو تەڕ.

(ثَرّى- هُ): تەڕو نەرمیكرد.

(ثَرّى- المَكانَ): شوێنەكەی تەڕو ئاوڕشێنكرد.

(أَثْرَ- تِ الأَرضُ): زەوییەكە تەڕبوو، گڵی زۆر بوو.

(- المَطَرُ): بارانەكە خاكەكەی تەڕو نەرمكرد.

(اَلثَّرى (ج) أَثـراء): ١-زەویی تەڕ ٢-ئاورنگ- تەڕیی.

(اَلثَّـرى و الثَّراء (ج) أَثـراء): گڵی تەڕبوو/ خاكی شێدار.

(«يَبِـسَ الثَّـرى بَينَهُم»): بوونـە دوژمنی یەك، كە لەوەپێش دۆستی یەك بوون.

(اَلثَّرى): خێرو بێر.

(« فُلان قَريبُ الثَّرى»): فیسـار خێری لێوە نزیكە/ خاوەن چاكەو پیاوەتییە.

ثـعّ: (ثَـعَّ. ثَعّـاً): خوارنەكـەی هێنایەوە/ ڕشایەوە.

(إنْثَـعَّ الأَكلُ مِـن فَمِهِ أَو الدَّمُ مِـن أَنفِهِ أَو جرحِهِ): ڕشایەوە، خوێنی لووتی بەربوو یان خوێن لە برینیەكەیەوە ڕۆیشت.

ثعـب: (ثَعَـبَ- عَلَيهِمُ الغارَةَ): شـاڵاوی بۆ بردن/ پەلاماریدان/ هەڵیكوتایە سەریان.

(- الماءَ): ئاوەكەی كشاند/ ڕاكێشا.

(إنثَعَـبَ- المـاءُ): ئاوەكە بە پلووسـكەكەدا ڕۆیشت.

(اَلثَّعْب (ج) ثُعبان): شیوی ناو ۆدڵ/ ئاوەڕۆی ناو ۆدڵ.

(اَلثَّعـب و الثَّعَـب و الأُثعُوبُ- مِـنَ الماءِ أَو الدِّماءِ): ئاو یان خوێنی لەبەر ڕۆیشتوو.

(اَلمَثعَب): پلووسكی گۆل یان سەربان.

(اَلثُعْبان ج) ثَعابين (ج): مار (نێرو مێی).

ثعط: (ثَعِطَ- اللَّحمُ أَوِ الماءُ. ثَعَطاً): گۆشتەكە

یان ئاوەکە بۆگەنبوو.
ثعل: ١-(ثَعِلَ- تِ اســنانُهُ. ثَعلاً): دانەکانی خوارو خێچ دەرهاتنو سواری یەکبوون.
(أثعَل (م) ثَعلاء (ج) ثُعل): دان خواروخێچ.
(ألثُعْــل: ١-دانــی زیــادە کــە لە پشــت دانە ڕەسەنەکەوە دەردێت. ٢-دانێك کەلەژێر دانە ڕەسەنەکەوە دەردێتو خورا دەبێت.
(ألثَّعْــل و الثَّعَــل): گوانــە دروّزنــەی مەڕو مێحوشتر کە لە پاڵ گوانەکەیدا دەبێت.
٢-(أثْعَلَ- الأمــرُ): ١-کارەکە گەورەو ئاڵۆز بوو/ سەری لێدەرنەدەکرا. نەدەزانرا چۆن بۆی بچن.
٢-الضُیُوفُ: میوانەکان زۆر بوون.
٣-(الثُعْل): ١-مرۆڤی بــەد ٢-(ح) کرمێکە لە کوندەی بۆگەندا پەیدا دەبێت.
(ثُعَال و ثُعالَة): دێڵە ڕێوی.
(أرضُ مَثْعَلَة): شوێنێکە ڕێوی زۆر بێت.
ثعلــب: ١-(ثَعْلَــبَ و تَثَعْلَــبَ): فێڵباز بوو/ ڕێوییانە ڕەفتاریکرد.
(ألثَّعْلَب (ج) ثَعالِب و ثَعال): ڕێوی.
(ثَعْلَبَة): دێڵە ڕێوی.
(ثُعلبــان): گۆڵە ڕێــوی، گیانداریکە بە فێڵ بەناوبانگــەو هەمــوو ســاڵێك تووکەکــەی هەڵدەوەرێتو دێتەوە.
(داءُ الثَّعلَــب): مووە ڕزە/ تــووك هەڵوەران کە تووشی دەبێت هەمو مووی لەشی هەڵدەوەرێت.
(مَکانُ مُثَعْلِبَة): شوێنێکە ڕێویی زۆربێت.

(أَرضُ مُثَعْلَبَة): خاکێکە ڕێویی زۆرە.
٢-(أَلثَّعلَب): سەری نێزەیەکە دەچێتە نووکی نێزەکەوە.
(عِنَبُ الثَّعلَب) (ن): ڕەزڵە/ تووڵەزەرە.
(أَلثَّعْلَبَةُ): ١-ئێسقانی کلك ٢-بنچ/ بن.
ثــغ: (ثَغْثَــغَ- کَلامَــهُ. ثَغْثَغَةً): قســەکەی بەیەکداداو بلتەبلتیکرد.
(ثَغْثاغَ و ثَغْثَغُ): پلتە پلتکەر.
(«فُلان یُثَغْثِغُ فِي کَلامِهِ») لە قسەکردنەکەیدا فیسار هەر بلتەبلتیەتی.
ثغــب: ١-(ثَغَــبَ- الشــاةَ ثَغْبــاً): مەڕەکەی سەربڕی.
(ثَغَبَ- هُ بالرِّمح): نێزەیەکی پێداکرد.
٢-(ثَغِبَ- الجَمَدُ): بەستووەکە توایەوە.
(- الدَمُ): خوێنەکە لەبەری ڕۆیشت.
(تَثَغَّبَــت لِثَّتُهُ بالــدَّم): پووکی پڕ لە خوێن بوو/ خوێنی لێهات.
(أَلثَّغْــب (ج) ثِغــاب و أَثْغــاب والثَغَب (ج) ثِغبان و ثُغبان): گۆمێك/ لە شوێنێکی نسێدا کە ئاوەکەی سارد دەبێت.
ثغر: ١-(ثَغَرَ- الإناءَ. ثَغْراً): قاپەکەی کەلکرد یان شکاندی.
(- الجــدارَ): کەلەبــەر یــان درزی کــردە دیوارەکەوە.
(أَلثَّغْر( ج) ثُغور): ١-کەلەبەر/ دەرە/ دەلاقە کە دوژمن لێوەی دزە دەکاتو پەلامار دەدات.

٢-ئەسـكەلە/ شـارى سـەر دەريـا ٣-هەموو كەلەبەرێك يان دەرەيەك كە لە شـاخو دۆڵدا بێـت ٤-سـنوورى نێـوان دوو (دوژمن/ دوو ناحەز) دا.

(«أَمْسَو ثُغُوراً»): سـنووريان بۆ يەك داناو لە يەك جيانو بران.

(الثُغْرَة): كەلەبەر/ كەلێن/ دەلاقە.

(أَلْمَثْغَـر (ج) مَثاغِـر): ١-كـون/ كەلێـن/ كەلەبەر/ دەرە كە لێوە بچنە ژوورى٢-شوێنى پاڵ دوژمنو نزيك دوژمن.

(أَلثُّغْـرورو): مـەرزو سـەر سـنوورێك كە مەترسيى هاتنە ناوەوەى دوژمنى لێبكرێت/ ترسەكە لەبەر.

٢-(ثَغَـرَ- الثُلْمَـةَ. ثَغْـراً): درزەكـەى/ كەلەبەرەكەى گرتو قەپاتكرد.

(«ثَغَرَهُم و ثَغَرَ عَلَيهِم»): دەرەى كێوەكەى لێ بەستن.

٣-(ثَغَـرَ- سِـنَّهُ. ثَغْـراً): دانى پێشـەوەى پياوەكەى شكاند.

(ثُغِر و أَثْغَرَ): ناودەمى هاڕرا يان شكێنرا.

(- الصَبِـيُ): ١-دانى شـيريى منداڵەكە كەوت ٢-دانى پێشەوەى رووا/ دەرهات.

(إِثَّغَـر و اثْغَـرَّ- الصَبِـيَ): ١-دانى شـيريى منداڵەكە كەوت ٢-دانى پێشەوەى هاتەوە.

(أَلثَغْر (ج) ثُغور): ١-دانى پێشەوە ٢-دەم.

٤-(أَلثُغْـرَةُ (ج) ثُغَـر): ١-خۆشـەڕێ/ خۆشەڕێباز.

(«هُـوَ يَختَرِقُ ثُغَـرَ المَجدِ»): ئـەو ڕێبازو شەقامى شكۆيى دەبڕێت ٢-چاڵى قورگ كە لە نێوان دوو چەڵەمەكەدايە.

ثغم: (ثاغَمَ- هُ): ماچيكرد.

٢-(أَثْغَـمَ- الرَجُلَ): ١-كابراى قوشـقيكرد/ توورەيكرد ٢-توشى (گرفتيكرد/ ئينتەلايكرد).

٣-(أَثْغَـمَ- الوادي): دۆڵەكـە دارى (ثغام)ى لێرووا.

(- الرأْسُ): سەرەكە وەك (ثغام) سپى بوو.

(أَلثَغَام) (ن): درەختێكە لە شاخدا دەروێتو گوڵەكەى سپيە.

ثُغامة (ن): دانە درەختێك لەوە.

٤-(أَلثَغم): سەگى نەهێنبرو در.

ثغا: (ثَغا- تِ الشاةُ. ثُغاءً): مەڕەكە باڕاندى.

(أَثغى- الشـاةَ. إِثْغـاءً): بارەى بـە مەڕەكە خست.

(«أَتَيتُهُ فَما أَثْغى ولا أَرْغى»): هاتمە لاى نە مەڕى داوەمێو نە حوشتر.

(أَلثاغي) (فا): بارەكەر.

(«مابالـدارِ ثـاغٍ ولا راغٍ»): لـە ماڵەكـەدا دەنگێكـى تێدا نيە/ كەسـى تێـدا نييە. نە قارەيە نە بارەيە.

(«مالَهُ ثاغِيَةٌ ولا راغِيَةٌ»): نە مەڕى هەيەو نە حوشتر.

(أَلثَغْيَةُ): ١-برسـێتيى ٢-هەژاريىو برسێتيى

ناوایی.
اصـاب الحَـيَّ (ثَغيَـةُ): ئاواییەکە تووشـی برسێتیی‌و نەبوونیی بوو.
ثفا: (ثَفأَ- القِدرَ. ثَفْأً): مەنجەڵەکەی لە کوڵ خست.
ثغد: (ثَغَدَ- الدِرعَ): ناوی گرتە قەڵغانەکە/ بەری بۆ قەڵغانەکە کرد.
(اَلثَغافِيـد: ١-بەری پۆشـاك ٢-هەوری سـپی لەسەر یەك کەڵەکە بوو.
(مِثْفَد (ج) اَلمَثافيد): بەری پۆشاك.
ثفـر: (أَثْفَرَ و ثَفَّرَ- الحِمارَ): ١-کەرەکەی بە دوای خۆیدا بەکێشـکرد ٢-پاڵووی بۆ کەرەکە کرد یان پاڵووەکەی لە کورتانەکەی بەسـت‌و توند کرد.
(إِسـتَثْفَرَ – الكَلبُ بِذَنَبِهِ): سـەگەکە کلکی بەناو گەڵیدا کرد.
(- المُصـارِعُ بِثَوبِـهِ): زۆرانبازەکە جلەکەی پێچایـەوەو لـە بـن ڕانیـەوە دەریهێناو بە کەمەریەوە بەست.
(اَلثَّفْر و الثَفَرُ (ج) أَثفار): پاڵوو کە چەرمەو لە پشـت زینەکەوەیە بە پاشووی وڵاخەکەوە دەبەسترێت.
ثفل: (ثَفَلَ و ثَفَّلَ- الشيءَ. ثَفْلاً): شتەکەی بەیەکجار بڵاوکردەوەو پانکردەوە.
٢-(ثَفَلَ و ثَفَّلَ- الرحى. ثَفلاً): دەستاڕەکەی بە پێستێك پاراست کە لە ژێریدا ڕایخست.
(اَلثِّفال): چەرمێکە ژێردەستار دەخرێت.
(اَلثِفَـال و الثُفـال): بـەردی ژێـرەوەی دەستارەکە.
٣-(ثافَـلَ- هُ): هاونشـینی بـوو/ لەگەڵیدا دانیشت.
(تَثَفَّلَ- إِسْتَهُ): بە قنگەوە دانیشت.
٤-(أَثْقَـلَ- الخَمْرُ): خڵتەی مەیەکە نیشـتە بنی.
(- الشَّرابُ): شەربەتەکە خڵتەیگرت.
(اَلثُفْل و الثافِل): خڵتەکە دەنیشێتە بن.
٥-(تَثَفَّلَ): کەم‌و کوریی لە چاکەدا کرد.
(«تَثَفَّلَهُ عِرقُ سـوءٍ»): دەماری نارەسەنیی ڕێگەی پیاوەتی‌و ڕەفتاری جوانی لێگرت.
٦-(اَلثَفال): حوشترو هێتری خاوو سستەپێ.
ثفن: ١-(ثَفَنَ- هُ ثَفْناً): پاڵی پێوەناو لێیدا.
(- تِ الناقَةُ): ئەژنۆی دادا بۆ خەوتن.
(اَلثَفِنَـةُ (ج) ثَفِنـات- مِـنَ البَعـيرِ): ئەو شـوێنەی لەشـی حوشـتر کە دەکەوێتە سەر زەوی کاتی یخبوونی کە ئەستوور دەبێت وەك ئەژنۆی.
(«خَـوى البَعيرُ على ثَفِناتِهِ»): حوشـترەکە بەسەر ئەژنۆیدا خۆی دادا بکەوێت.
(اَلثَفِينَةُ – مِنَ الخَيلِ): ڕەفیچکی ئەسپ.
(- مِنَ الانسان): ئەژنۆی مرۆڤ.
٢-(ثَفَنَ – الشـيءَ. ثَفْناً): بە شتەکەوە لکاو لەگەڵیدا بوو.

(ثافن- هُ): لەگەڵیدا دانیشت تا بزانێت چی لە دڵیدا هەیە.
(- هُ علی كذا): بۆ ئەوە كۆمەكیكرد.
(ألثَفِنَةُ): كۆمەڵە خەڵكێك.
٣-(ثَفِنَ- ت يَدُهُ): دەستی بە هۆی كاركردنەوە ئەستوور بوو.
(أثْفَنَ- العَمَلُ يَدَهُ): كاركردن پێستی دەستی ئەستوور كرد.
ثفا: (ثَفا-هُ. ثَفْواً): شوێنیكەوت.
(ثَفَى و أثْفَى- القِدرَ): مەنجەڵەكەی خستە سەر سێپاكە.
(ألأُثْفِيَّة (ج) أثافِيَة): سێپا.
(أثفى- الرَجُلُ): پیاوەكە سێ ژنی هێنا.
(ألمُثَفَّى): سێ ژنی مردبێت یان زیاتریش.
(ألمُثَــفَّاة): ژنێك ســێ مێــردی مردبێت یان زیاتریش.
ثقــب: ١-(ثَقَبَ- الشَّــيءَ. ثَقْباً): شــتەكەی كونكرد.
(إنثَقَبَ- الشيءُ): شتەكە كونبوو.
(ثَقَّبَ- الشَّيءَ): شتەكەی كونكرد.
(تَثَقَّبَ- الشَّيءُ): شتەكە كونبوو.
(تَثَقَّبَ- هُ): شــتەكەی كونكــرد/ كونیكردە شتەكەوە.
ألثَقْب (ج) أثْقَب و ثُقُوب): كونی كوناودەر.
(ألثَّقــب (ج) ثُقوب) (مو): كونی شمشــاڵ و زورناوز نامێریتری مۆسیقا.

(ألثُقبَةُ (ج) ثُقْــب و ثُقَب): كونی بچووكی كوناودەر.
(ألمِثْقَب) (حي): كونكەرە/ سمۆ/ درەوشە.
(ألمِثْقَــب و المَثْقَب): شــەقامێكی گــەورە كــە خەڵك پیایدا بڕوات. شــارێ/ شاشــەقام ٢-ڕێگەی سەخت و بەردەلانیی.
(ألمُثَقَّب = المَثْقُوب): كونتێكراو.
٢-(ثَقَــبَ- تِ النَــارُ. ثُقُوبــاً): ئاگرەكــە تەشەنەیكردو بڵاوبووەوە.
(- الرائحة): بۆنەكە (پەخشبوو/ بڵاوبووەوە).
(- النَّجْمُ): ئەستێرەكە درەوشایەوە.
(- الطائِر): باڵندەكە زۆر بەرزبووەوە.
(ثَقُبَ- ثَقابَةً): وەك سووریی ئاگر سوور هەڵگەڕا.
(ثَقيــب (م) ثَقيبَــةُ): ڕەنگ ئاگــری/ زۆر سوور.
(ثَقَّبَ- النَّارَ): ئاگرەكەی كردەوە.
(- هُ الشَــيْبُ و ثَقَّبَ فيه الشَّــيْبُ): پیریێتی لێیدەركەوت/ سپێتی سەری دەركەوت.
(-أثْقَبَ- النارَ): ئاگرەكەی كردەوە.
(ألثِقــاب و الثُقُــوب): ئــەوەی كــە ئاگری پێدەكرێتەوە وەك شقارتە (كە ڕەشە خەڵكەكە پێیدەڵێت ( شخط) یان نەوت. یان چیلكە.
٣-(ثَقَــبَ- تِ الناقَةُ. ثَقْباً): مێحوشــترەكە شیری زۆر بوو.
٤-(ثَقَــبَ – رَأيُهُ. ثَقْباً): ڕاكــەی جێبخۆی گرت و كاری پێكرا.

(ألثاقِب): جێگیر بوو/ دروست/ وەرگیراو.
(«رَأْيٌ ثاقِب»): رایەکی دروستی وەرگیراو.
(«عَقْلٌ ثاقِــب»): ئاوەزێکی دووربینو تیژو پێزان.
(«حسبٌ ثاقِب»): رەچەڵەکێکی بەناوبانگو ناودێر.
(«نَحنُ أَثْقَبُ النَّاسِ أَنساباً»): ئێمە لە هەمووان رەسەنترینو لە هەموو کەسێکەوە دیارین.
(ألمثقَّب): را وەرگیراوو دروست/ قسەڕۆیشتوو.
(«رَجُلٌ مِثقَب»): پیاوێکی پســپۆڕو لێزانو هوشیارو را وەرگیراوو پەیپێبەرە.
(«هُوَ. طَلاَّعُ المَثاقِب»): ئەو پێشەنگی بوێرو نەبەردو جەربەزەکانە.
ثقــف: ١-(ثَقِفَ و ثَقُــفَ. ثَقْفــاً و ثَقَفاً و ثَقافَةً): کارامەو فاڵو چابوكو شارەزا بوو.
ثَقْــفُ و ثَقُــفُ و ثَقِــفُ و ثَقِــفُ: کارامەو چابوكو شارەزا.
(ثَقِفَ- الكَلامَ: ثَقْفاً و ثَقافَةً و ثُقُوفَةً): زوو لە ئاخاوتنەکە گەیشتو لای روون بوو.
(- هُ ثَقْفاً): بەسەریدا زاڵ بوو یان گەیشتێ.
(ثَقَفَ- هُ ثَقْفاً): لەو شارەزاو کارامەتر بوو.
(- هُ بالرمح): نێزەکەی/ رمەکەی پێداکرد.
(ثاقَــفَ- هُ): ١-بەربەرەکانیو پێشــبڕکێی لە شــارەزاییدا لە پســپۆڕیدات لەگەڵــدا کردو بەزاندی.
(«ثاقَفَهُ فَثَفَهُ»): پێشــبڕکێو بەربەرەکانیی شــارەزاییو پســپۆڕیی لەگەڵــدا کــردو بەزانــدی ٢-بە چەك نیشــانە شــکێنیانکرد ٣- دوژمنایەتیکرد.
(تَثاقَفا): ١-پێشــبڕکێی پسپۆڕیو شارەزاییان لەگــەڵ یەکدا کــرد ٢-دوژمنایەتیــان لەگەڵ یەکدا کرد/ ناتەبا بوون.
(أَلثِّقاف مِنَ النِّســاءِ): ژنــی (کارامە/ وریاو دەرهاتوو).
(ألثِقاف): ناحەزییکردن/ دوژمنایەتیکردن/ ناتەبایی/ ناکۆکیی/ نەیاریی.
(ألثِّقيـف): زۆر شارەزاو کارامە.
٢-(ثَقَفَ- الرمحَ): نێزەکەی ڕاستو لووسو سافو تیژ کرد.
(- الوَلَدَ): کوڕەکەی پەروەردەو بەرەوشــتو خوێندەوار کرد.
(تَثَقَّــفَ: تَهَــذَّبَ و تَعَلَّــمَ): بــە ڕەوشــتو رۆشنبیرو خوێندەوار بوو.
(مُثَقَّف (م) مُثَقَّفَة): رۆشنبیرو خوێندەوارو رەوشــدار بــوو (ئەمــە لــە ڕاســتکردنەوەو سافکردنی نێزەوە وەرگیراوە).
(ألثِّقــاف): ئامێــری لووسو ڕاســتکەرەوەی نێزە/ رم.
(ألثَّقافَة): رۆشنبیریی و شارەزایی لە زانیاریی و زانستو وێژەو هونەردا.
(أَلْمُثَقَّف) ١-لەلای شــاعیرەکان نێزەی ڕاســتو لووسکراوەیە ٢-مرۆڤی رۆشنبیرو تێگەیشتوو.

٢-(اَلثِّقِّيف): زۆرترش.

(«خَلٌّ ثِقِّيف»): سرکەیەکی زۆر ترش.

ثقل: ١٠)ثَقُلَ. ثِقلاً و ثَقالَةً»): قورسبوو.

(ثَقيل وثُقــال و ثَقال (ج) ثُقَلاء و ثِقال و ثُقْل: سەنگین/ قورس/ گران.

(- تِ المَــرْأَتُ): ژنــە سـكپڕەكە قورســبوو/ سكەكەی دەرکەوت.

(- القَولُ): قسەکە لەبەر گوێ ڕەق‌و ناخۆش بوو.

(- المَريضُ. ثَقَلاً): نەخۆشــەکە کە شەنگبوو نەخۆشەکە دەردەکەی گرانبوو.

(ثَقَلَ- هُ. ثَقْلاً): بەدەســت هەڵیســەنگاند/ سەنگیکرد.

(ثَقَّلَ- هُ): قورسیکرد.

(- عَلَيــهِ): بــاری گرانکــرد. شــتی گرانــی پێهەڵگرت.

(ثاقَــلَ): خواردنــی قورســی خــوارد یــان خواردنی قورسی دەرخواردی یەکێکدا.

(أثْقَــلَ- هُ): باری گرانی بــە کۆڵیدادا/ باری گرانکرد.

(- تِ المَرأةُ): ســکی ژنەکە قورس بوو دەمی منداڵبوونیبوو.

(مُثْقِل و مُثْقِلَة): ئافرەتی ســکپڕی قورس‌و نزیك منداڵ بوونی.

(- هُ المَرَضُ): نەخۆشییەکە زیفی لێسەند.

(تَثاقَــلَ): خاوەخاوەیکــرد/ تەمەڵیکــرد/ قنگگران بوو.

(- عَنهُ): سست‌و بێدەربەسیی نواند.

(- القَومُ): خۆیشگەل بە دەنگە فریاکەوتنەکەوە نەچوون کە هانایان بۆ بردن.

(إسْتَثْقَلَ- الشَّيءُ): شتەکە قورس بوو.

(- الشَّيءَ): شتەکەی لا قورس بوو/ بە قورسی زانی.

(- بِفُلانٍ): هەستی بە قورسیی فیسار کرد.

(اَلثَّاقِــل (ج) ثَواقِــل): ١-قورس/ ســەنگین ٢-توندو سەخت.

(- مَرَضٌ ثاقِل): نەخۆشییەکی گران.

(أصْبَحَ ثاقِلاً): نەخۆشییەکە کەشەنگیکرد.

(اَلثَقَــل (ج) أثْقال): بارگــەو بنەو خێزانی گوزارکار/ سەفەرکەر.

«لِلمُســافِرِ ثَقَلٌ كَبيرٌ): گوزارکار بارگەوبنەو عەلەو جەلەی گەورەو زۆرە.

(اَلثِقْــل (ج) أثْقــال): ١-باری قــورس/ کۆڵی گران ٢-سەنگ.

(«أعْطِــهِ ثِقْلَهُ»): ســەنگی خــۆی بدەرێ/ بایەخی خۆی بدەرێ.

(اَلثِقْلُ): قورسیی/ سەنگینی/ بارگرانی.

(اَلثَقْلَةُ و الثِقلَــةُ الثَقَلَةُ والثِقَلَةُ و الثَقِلَةُ): کەلوپــەل‌و کــۆڵ‌و بــارو هەمــوو شــتێکی کاروانکرد.

(«إرْتَحَلو بِثِقلِهم»): بە هەموو کەلوپەلێکی گــران‌و بــاری قورســیانەوە باریانکــرد/

کۆچیانکرد.

(أَلثَقْلَــةُ): ١-قورسـیی خـواردن لـه گەدەدا ٢-وەنەوز کە بتباتەوە.

(«وجدتُ ثَقْلَةً فِي جَسَـدي»): هەسـتم بە خاویی‌و لەشقورسیی کرد.

(أَلمِثْقــال (ج) مَثاقِيل): سـەنگێك کەشـتی قورس یان سوکی پێدەکێشـرێت بە تایبەتی شتی گرانبەها.

(مِثقالُ الشيءِ): سەنگی ئەو شتە یان شایەنی ئەو شتە/ مسقاڵی ئەو شتە.

٢-(ثَقَلَ- السَّـمعُ ثِقــلاً و ثَقالَــةً): گوێکە گرانبوو.

٣-(ثَقَّلَ- الحَرْفَ): دانـی توند بە پیتەکەدا نا/ پیتەکەی گرت.

٤-(إثّاقَــلَ- إلى الدُّنيا): دنیـــای/ جیهانی بە گرانگرت.

٥-(أَلثّاقِل): تەواوو ساغ/ بێکەموکوریی.

(دِينارٌ ثاقِل): دینارێکی تەواوو ساغ.

(أَلثَّقَل (ج) أَثقال): هەموو شتێکی گرانبەها.

(أَلمِثقال): مسـقاڵ. (بـاو وایە کە درهەمێك یان نیو درهەم یان زۆرتریان کەمتر بێت).

(أَلأَثْقال): گەنجی ناو سکی زەوی‌و ئەوەی لە خاکدایەو شاراوەتەوە بە مردووە کانیشەوە.

(«أَخْرَجَتِ الأَرضُ أَثقالها»)»: زەوی هەرچی تێدابوو هەڵیدایە سەرەوە.

(أَلثَّقَلان): مرۆڤ‌و جنۆکە.

ثکل: (ثَــكِلَ- إبْنَهُ. ثُكْلاً و ثَــكَلاً و ثَكْلاً): کورەکەی لەدەستچوو/ سکیسووتا.

(ثــاكِل و ثَــكْلان): باوکـی زارۆڵــە مردو/ کوستکەوتوو.

(ثاكِل و ثاكِلَة و ثَكْلى (ج) ثَواكِلْ و ثَكَالى): ژنــی سکســووتاو/ جگەرســووتاو- زارۆڵــە مردوو.

(أَثْكَلَ- الأُمُ وَلَدَها): دایکەکە جەرگی سووتاو زارۆڵەکەی لەدەستچوو/ مرد.

(أَثْــكَلَ- الوَلَدُ أُمَّــهُ): زارۆڵەکە دایکی مرد/ بێدایکبوو.

(أَثْكَلَ- تِ المَرأَةُ): ژنەکە جەرگســووتاو بوو زارۆڵەکەی مرد.

(أَلثَكُــول و المِثكال (ج) مَثاكِيل): کەســێکە کۆستی زۆر بکەوێت/ جەرگی زۆر بسووتێت.

(نِساءُ الغُزاةِ مُثاكيلُ): ئافرەتانی غەزاکەرەکان کۆســتیان زۆر دەکەوێــت/ جەرگیــان زۆر دەسووتێت.

(أَلمَثْكَلَة): هۆی سکسووتان‌و هۆی کۆستکەوتن.

(«رمْحُهُ لِلوالِداتِ مَثْكَلَــةُ»): نێزەکەی ئەو مایەی جەرگسووتانی دایکانە.

(أَلثُكْل): سکسووتان/ جەرگسووتان/ کۆستکەوتن.

ثكم: (ثَكَمَ- بالمَكان. ثَكْماً): لە شـوێنەکەدا نیشتەنیبوو/ دانیشت.

(- الأَمْرَ أَو الطَّريق): بە کارەکەوە لکا دەستی لێبەرنەدا یان ملی ڕێگەکەیگرت‌و بەرینەدا.

(- الآثارَ): بەدوای پاشماوە دێرینەکاندا گەڕا.
(- لَهُ الأمرَ): کارەکەی بۆ ڕوونکردەوەو دەرخست.
ثَكِمَ- بالمكان. ثكماً): لە شوێنەکەدا نیشتەجێ بوو.
(ثكن: ألثُّكْنَةُ (ج) ثُكَن) (اع): ١-لەشکرگا ٢-پۆلە کۆترو هیتر.
(«حَمامُ ثُكَنٍ»): ١-کۆتری مۆڵخواردوو/ مۆڵ ٢-کۆمەڵە خەڵك و گەلە چوارپێ جگە لە درندە ٣-ملوانکە ٥-ئاڵا.
ثـل: ١-(ثَلَّ- البئرَ. ثَلاًّ): گڵی بیرەکەی دەردا.
(- الوعاءَ): چی لە قاپەکەدا بوو بردی.
(ألثَّلَةُ (ج) ثِلَل و ثِلال): گڵی دەردراوی چاڵاو/ بیر.
٢-(ثَلَّ- التُّرابَ. ثَلاًّ و ثَلَلاً): گڵەکەی ڕۆکرد/ ڕشت.
(إنثَلَّ التُّرابُ): گڵەکە ڕۆکرا.
٣-(ثَلَّ- القومَ. ثَلاًّ و ثَلَلاً): خوێنشگەلی لەناوبرد/ فەوتاند.
(- البَيتَ): خانووەکەی ڕووخاند.
(«ثَلَّ اللهُ عَرْشَهُم»): خودا تەختو تاراجی تێکدان.
(ثُلَّ عَرْشَهُم): شکۆو سەروەرییان لەدەستدا/ پایەماڵبوون.

(أثَلَّ- هُ إثلالاً): فرمانیدایە کەل و کۆمو لارووخاوییەکە چاك بکاتەوە).
(- فَمُهُ): دانەکانی کەوت.
(تَثَلَّلَ- البَيتُ): خانووەکە وردە وردە ڕووخاو کاول بوو.
(ألثَّلل): ١-مردن/ فەوتان ٢-دانکەوتن.
(ألثِلَّةُ (ج) ثِلَل): مردن/ فەوتان/ لەناوچوون.
٤-(ثَلَّ- كُلُّ ذي حافِرٍ ثَلاًّ و ثَلَلاً): چوارپێ سمدارەکە تەرسیکرد (کەرو ئێسترو بارگیرو ئەسپ و ماین) (گاو گامێش) شیاکەیکرد. بزن و مەڕو حوشتر پشلقیانکرد.
٥-(أثَلَّ- الرَجُلُ. إثْلالاً): کابرا مێگەلی زۆر بوو/ ڕانە مەڕی زۆربوو.
(ألثَّلَّةُ (ج) ثِلَل و ثِلال): ١-ڕانە مەڕی گەورە ٢-خوریی (بە خوازە وای پێدەڵێن).
(«كَساءٌ جَيِّدُ الثَّلَّةِ»): پۆشاکێکە لە خورییەکی چاکە ٢-خوری و موو و بەرگنی حوشتر پێکەوە تێکەڵ.
(ألثُلَّة): دەستەخەڵك/ گروپێکی خەڵك.
(«فُلان لايُفَرِّقُ بَينَ الثَّلَّةِ والثُّلَّةِ»): کابرا دەستە خەڵك و مێگەلەمەڕ لەیەك جیاناکاتەوە.
(ألمَثَلَّة): ڕەشماڵێکی گەورەی ناو بیابان.
ثلب: ١-(ثَلَبَ- هُ ثَلْباً): دەریکرد.
٢-ثَلَبَ- هُ. ثَلْباً): ١-لە پاشملە بە خراپیی

ناویهێنا/ غەیبەتیکرد. ٢-خەوشی لێدەرهێناو سەرزەنشتیکرد ٣-جنێوی پێدا.

(ألثِلْــب والثِلِــب): ١-نەنگینکراو/ ســووكو رِســواكراو ٢-لەكەدار كراو/ خەوشــداركراو/ ناتەواو.

(ألمِثْلَب): خراپگۆ/ نەنگۆ/ كەســێكە كە هەر عەیب لە خەڵك دەربهێنێت.

(ألمَثْلَبَةُ (ج) مَثالب): ١-خەوش و كەموكورِیی.

«ما عَرَفتُ فيه مَثلَبَةً»: خەوش و كەموكورِیم لێنەدیوە/ بیخەوشە ٢-جنێو.

(«مَثالِــبُ الأمــرِ»): خــەوش و كەموكورِیی كارەكە.

٣-(ثَلِبَ- الجلدُ. ثَلَباً): پێســتەكە كرژ بوو/ چووە یەك.

٤-(ثَلِبَ- الشَّــيءُ. ثَلَباً): شتەكە كەڵبوو یان درزی تێبوو.

(ثَلُبَ الشيءِ): كەڵبوونی شت.

(ثَلَبَ الشَّــيءَ: ثَلْباً): شــتەكەی كەلكرد یان درزی تێكرد.

(ثَلَّبَ- الرَجُلُ): كابــرا پیرو پەككەوتە بوو. كەل و كۆمبوو و دانەكانی هەڵوەری.

(ألثَلِب- مِنَ الرِّماح= المُتَثَلِّم): نێزەی كۆڵ.

(ألثِّلْــبُ (ج) ثِلَبَة وأَثْلاب): حوشــتری پیری دانكەوتوو.

(ألإثْلَــب و الأثْلَب (ج) أثالِــب): وردە بەردو گڵمتك.

ثلــث ١-(ثَلَــثَ – الشَّــيءَ. ثَلْثاً): ســێیەكی شتەكەیبرد.

(- القَومَ): سێیەكی ئەوەی برد كە خوێشكەل هەیانبوو ٢-سێهەمكەسی خوێشكەلبوو.

(ثَلَّثَ – الإثْنَين): دوانەكەی بە خۆیەوە كرد بەسیان.

(- الشيءَ): شتەكەی سێگۆشە كرد، سێسووچ كرد.

(- الشَّرابَ): شەربەتەكەی كوڵاند تا سێیەك بە هەڵم بوو.

(«العَرَقِ المُثَلَّث»): ئارەقی خەستەوەبوو.

(ثَلَّثَ- الشيءَ): شتەكەی سێبارەكرد/ سێجار ئەنجامدا.

(أثْلَــثَ- القَومُ): ١-خوێشــكەل لوون بە ســێ ٢-بوون بە سێ.

(«كانوا تِسْعَةً و عِشرون فَأثْلَثوا»): بیستو نۆ بوون بوون بە سێ.

(ألثَلاثَةُ (م) ثَلاث (ع ح): ژمارەی سێ.

(ثَلاث قوى): سێلۆنە.

(«حَبــلٌ ذو ثَــلاث قِــوى»): گوشــێكی/ گوریسێكی/ پەتێكی سێلۆنە.

(فَعَلَهُ ثلاث مــرات): ســێجار (ئەنجامیدا/ كردی).

(ألثِلْث): سێهەم بەچكەی، مێحوشترەكە.

(«سَــقَى زَرعَهُ ألثِلْثَ»): كشــتەكەی سێرۆژ جارێك ئاودا/ سێرۆژەیكرد.

(أَلثُلْث و الثُلُث (ج) أثلاث): سێیەك.
(أَلثَلِيْث): سێیەم.
(أَلثَلاثــاء والثُلاثــاء ويَومُ الثَلَثــاء): رۆژی سێشەممە.
(ثَلاثاءان): دوو سێشەممە (ج).
ثَلاثاوات وثُلاثاءات و أَثالِث): سێشەممەکان.
ثُلاثَ أَو مَثْلَثَ): سێ سێ.
(أَتو ثُلاثَ أَو مَثْلَثَ): ســێ سێ هاتن (لێرەدا نێرو مێ تیایدا وەك یەکن).
(أَلمِثْلَث (ج) مَثالِث (مو): ١-ئەوەی کە لەسەر سێ ژێیە ٢-ژێی سێهەمینی عود.
(أَلمَثلــوُث): ســێلانە ســیانیی ٢-ئــەوەی کە سێیەکی وەرگیرابێت.
(- مِنَ الجِبال): گوریسی سێلۆنە.
(أَلثَّالوث): ئەوەی لە ســێ پێکهاتبێت/ ســێ بنکەی هەبێت.
(«الثالوث الأَقْدَس. لأَقانيــم الذات الإلهِيَّة. ســر التَثْلِيث»: لای دیانــەکان نهێنی بوونی سێ ئەقانیم لە زاتی خوادا.
المُثَلَّث (- مِنَ الأَحْرُف): پیتێك سێ پنت یان سێ بزوێنی هەبێت.
(مُثَلَّــث): (هــ): ڕوویەکــە بــە ســێ هێڵ دەورەدرابێت.
(مُثَلَّثُ مُضَلَّع): سێگۆشەی سێلا.
(مُثَلَّث مُخْتَلِفُ الأَضلاع): سێگۆشەی جیالا.
(مُثَلَّثْ متساوي السَّاقَين): سێگۆشەی دوولا.
(مُثَلَّث متساوي الأَضلاع): سێگۆشەی یەکلا.
(مُثَلَّــث قائِمُ الزاوية): سێگۆشــەی گۆشــە وەستاو.
(مُثلث حاد الزوايا): سێگۆشەی گۆشەتیژ.
(مُثَلَّــث مُنفَــرِجُ الزَوايــا): سێگۆشــەی گۆشەکراوە.
(مُثَلَّــثُ كُرَوِيّ): سێگۆشــەیەکە کە لەســەر بازنەیــەك کێشــرابێتو لاکانــی کەوانــەی بازنەی گــەورەن کە هەمــوو کەوانەیەك لە نیوە بازنەیەك بچووکتر بێت.
(إِرتِفاعُ المُثَلَّث): بەرزی سێگۆشە ستونێکە لە ســەرێکەوە دێتە خوارەوە بۆ لای بەرامبەری هەرسێ بەرزییەکەیش لە پنتێکدا یەکدەگرن کە جەرگەی بەرزییەکانە.
(متوسط المثلث): ناوەندی سێگۆشە: پارچە هێڵێکە ســەری سێگۆشەکە بە ناوەڕاستی لای بەرامبەرەکەی دەگەیەنێ سێناوەندییەکەش لە پنتێکدا یەکدەگرن کە جەرگەی قورسایی سێگۆشەکەیە.
(مُنَصِّــفُ المُثَلَّــث): یەکســانە کەرتکــەری گۆشە: سێکەرتکەرەکە لە پنتێکدا یەکدەبڕن کــە ناوەندی بازنــە هێڵکێشــراوەکەیە لەناو سێگۆشەکەدا.
(قاعِدَةُ المُثَلَّث المُتَســاوي السّــاقَين): بنکەی سێگۆشــەی جووتلا: ئــەو لایەیە کە هێندەی دوولاکەیتر نییە.

(اَلقاعِـدَة فِي المُثَلثـاتِ الأُخـرى): بنكـەی سێگۆشـەکانیتر. هەمـوو لایەکی بـە بنکەی سێگۆشەکە دادەنرێت.

(رأسُ المُثَلَّث المُتَسـاوي السـاقَين): سـەری سێگۆشـەی جووتـلا ئـەو سـەرەیە کە هی هاوبەشی دوولا وەك یەکەکەن.

(اَلمَثلُوث- مِنَ الأَكسِـيَة): پۆشـاکێکە کە لە خوریی‌و موو و تووکی حوشتر چنرابێت.

(الثلاثون: سی/ سێ دەیی (بۆ مێ‌و نێر).

٢-(الثُلُثِيّ- مِنَ الخُطوط): نووسینی درشتە پیت.

(اَلمُثَلَّث و المُثلِث): کەسێکە بە هۆی خزمیەوە لە شا نزیکبێتەوە.

أَلثَّلثان و الثُّلثان (ن): رەزلە/ رێزەلە.

ثلـج: ١-(ثَلَجَ و أَثْلَـجَ- تِ السَّـماءُ. ثَلجاً): بەفرباری/ ئاسمان بەفریداکرد.

(«ثَلَجَتْنا السَّماءُ»): ئاسمان بەفری لێباراندین وەك چۆن دەڵێن: (مَطَرَتْنا): بارانی بەسەردا باراندین.

ثُلِجَت وأَثْلَجَتِ- الأَرضُ: زەوی بەفری لێباری.

(أَثْلَـجَ- القَـومُ): خوێشـکەل چوونـە نـاو بەفرەکەوە.

(اَلثَّلج (ج) ثُلوج: بەفر.

(ثَلجَةٌ): بەفرێك.

ماءُ ثَلْجٌ: بەفراو.

(اَلثَلاّج): بەفرفرۆش.

(اَلمَثْلَجَة): بەفردان سەهۆڵدان.

(اَلمَثْلُوج): بەفراوی/ بە بەفر ساردکراوە.

(أَلثلاجيّ): سپی وەك بەفر ڕەنگ بەفرین.

(«نَصلُ ثَلاّجـي»): دەمێکی ڕەنگ بەفرینی تیـغ. نووکی ڕمی ڕەنگ بەفرین (واتا سـپی وەك بەفر).

(أَلثَّلاجَة): بەفرگرە.

٢-(ثُلِجَ- فُؤادُهُ): کەودەن بوو).

_مَثلوج الفُؤاد): کەودەن.

(أَثْلَجَ ماءُ البئرِ): ئاوی چاڵاوەکە برا.

(- ت عَنهُ الحُمّی): تاکەی ساردبووەوە/ تاکە بەریدا.

٣-(ثَلِـجَ و أَثْلَـجَ- ت نَفسـي بِـهِ. ثَلَجاً): فێنکایی‌و خۆشی بە دڵمدا هێنا.

(ثَلَجَت – نَفسـي بِهِ و إِلَيـهِ. ثُلوجاً): دڵم پێیکرایەوەو سرەوتیکردو دڵنیابووم.

(أَثْلَجَ- هُ): فێنکی‌و خۆشیی بە دڵیدا هێنا.

ثلـع: (ثَلَعَ- رأسَـهُ. ثَلْعاً): سـەری قرجاند، شکاند.

ثلـغ: (ثَلَـغَ- رأسَـهُ): سـەری قرنجانـد/ شـکاند..(أَلمُثَلَّغ- مِنَ الثَّمرِ): دەنکە خورمای هەڵوەریوی رووشاو.

(«تَناثَرَتِ الثِّمارُ فَتُلُغَت»): بەری درەختەکە وەری‌و شەقیبرد یا پان بووەوە یان رووشا.

(ثلـم: (ثَلِـمَ- فِي مالِـهِ. ثَلْمَةً): شـتێك لە ماڵەکەی، لە داراکەی لەدەستچوو و ڕۆیشت.

(ثَلَّمَ- الإناءَ. ثَلْماً): قاپەکەی کەلکرد/ لێوی قاپەکەی شکاند.

(ثلَّمَ و تَثَلَّمَ و انثلَمَ- الحائِط. ثَلْماً): درزی کردە دیوارەکەوە یان دیوارەکەی کەلکرد.

(اَلثَّلْـم (ج) أَثْـلام و الثُّلْمَـة- فِي الحائِـط ونَحْـوَهُ): ١-درزی دیـوارو کەلیـیو کـونو کەلەبـەری شـت ٢-کەلێنی شـتێکی شـکاو/ شوێنی شکاوی شتێك.

(اَلأَثْلَـم): درزی زۆر دیـار- کەلیـی دیـارو دەرکەوتوو.

ثم: ١-(ثَمَّ- الشَّيءَ ثَمّاً): شتەکەی چاکسازکرد، کۆککردەوە.

«(ثَمَمْتُ أُمُـوري»): کارەکانم (ڕێکخسـتو چاککرد/ کۆککرد).

(اَلثَّمُّ): چاکسازی/ کۆککردن.

«کنّا أهلَ ثِمَّةٍ و رِمةٍ»: ئێمە بووین کارسازو راسکەرەوەی کاروبار.

(«هُـوَ ثَمُّـهُ وَرَمُّهُ أَو ثُمُّهُ ورُمَّـهُ أَو ثِمُّهُ و رِمُّهُ»): ئـەوە چاکەکەیەتیو خراپەکەیەتی یان زۆرەکەیو کەمەکەیەتی.

(«مالَهُ ثُمٌّ ولا رُمٌّ»): نەکەمی هەیەو نەزۆر/ هیچی نییە.

٢-(ثَـمَّ- تِ الشـاةُ النَبتَ بِفيهـا): مەڕەکە گیاکەی بە دەم هەڵکێشا.

(اَلثُّمَّةُ): قولێك گیا.

(اَلثَّمـام واحِدتُـهُ ثُمامَة: کـزن ڕووەکێکی بێهێزەو بالاّ ناکات.

الثُّمامَة: بنجێك لەو کزنە.

(اَلمِثَـم- مِنَ النـاس): خەڵکانێکن خواردنی چاكو خراپ (دەماشنەوە/ دەخۆن).

٣-(إنْتَـمَّ- الشَّـيخُ): پیرەمێردەکە تەواو بە ساڵدا چوو ئیفتادە بوو.

(ثِمَّة): پیری ئینقادە.

(إنْثَمَّ- الجِسْـمُ): لەشەکە پووکایەوەو بێهێز بوو.

٤-(إنثَـم — عَلَيـهِ): بەسـەریدا داباری/ بە سەریدا ڕژا.

٥-(ثَـمَّ و ثَمَّـةَ و ثَمَّـتَ= هُنـاك): ئەوێ/ ئەولایە/ ئەو جێیە.

(ثُمَّ): پاشـان/ لە پاشـان/ دوایی/ پاشنەوە/ لە دوايیـدا/ لە ئەنجامدا/ ئەوسـا (ئامرازی پەیوەسـتە بۆ بەرودواو بۆ ریـزی کارەکان/ شـتەکانو مـاوە لـە نێوانیاندا بێـت) ت)ی دەچێتە سەرو دەوترێت (ثُمَّتَ).

ثمـأ: (ثَمَـأَ- هُ ثَمْـأً): خواردنـی چـەوری دەرخواردا.

(- الرأسَ): سەری قرنجاند، شکاند.

(إنْثَمأَ — الرأسُ): سەرەکە قرنجا.

(ثَمأَ- الأَنْفَ): سـەری لووتی شکاندو خوێنی ڕژا.

ثمـج: (ثَمَـجَ- هُ. ثَمْجـاً): تێکەڵیکـرد/ تێکیهەڵدا.

(أَلْثْمِــجُ): خومگەر/ ئــەوەی جل بە هەموو ڕەنگێك ڕەنگدەكات.

ثمد: ١-(ثَمَدَ- الشيءُ فُلاناً. ثَمْداً): شتەكە. سامانەكەی لەدەست فیساردا.

(- الناقَةَ بِالحَلَب): شـیری مێحوشـترەكەی تەواو دۆشی.

(أَلْثْمُــود – مِــنَ الرجال): پیاوێك بۆ شـت سەری بكەنە سەرو هیچی پێنەهێڵن.

٢-(ثَمَــدَ و أَثْمَدَ واسْــتَثْمَدَ- المــاءَ. ثَمداً): گۆلێكی بۆ ئاوەكە كرد تا تێیدا كۆببێتەوە.

(إِثَّمَــدَ و اثْتَمَدَ): ئاوەكە هاتــە گۆلەكەوەو تیایدا كۆبووەوە.

(أَلثَمْــد و الثَمَــد (ج) ثِمــاد): بارانــاو كە لــە گــۆلاودا كۆدەبێتــەوە، بــە زســتانو بە هاویــن نامێنێت ٢-چاڵێك كــە باراناوی تێدا كۆدەبێتەوە.

٣-(إِسْتَثْمَدَ- هُ): داوای چاكەی لێكرد.

٤-(أَلإثمِــدْ والأُثْمُــدُ) (ك): بەردێكە چاوی پێدەڕێژرێــت. لای زانایانــی كیمیــا بــە (ئەنتیموان) دەناسرێت.

ثمــر: ١-(ثَمَرَ و أَثْمَــرَ- الشَــجَرُ. ثُموراً): درەختەكە هاتە بەر/ بەریگرت.

(ثامِر ومُثمِر): درەختی بەرگرتوو/ بەردار.

(أَثْمَــرَ- الشَــجَرُ الثَمَــرَ): درەختەكــە بەریداهێشت. میوەیگرت.

(- القَومَ): میوەی دەرخواردی خوێشاندا.

(إِســتَثْمَرَ- الشَــيءَ): شــتەكەی خســتە بەرهەمــەوە/ وەبــەری هێنــا كــە ســوودی هەبێت.

(- الرَجُلُ): میوەی دەستگیر بوو.

(أَلثَمَرُ): میوە/ بەر.

(ثَمَرَة و ثَمْرَة): میوەیەك/ بەرێك (ج).

ثِمــار (جــج) أثمــار وثُمُــر): ١-(ز) بەری درەخــت/ میــوە (گوڵــە دەبێتە میــوە پاش پیتانــدن (یەكگرتنــی تــۆوی نێــرو مــێ) ٢-بەرهەم/ بەروبووم.

(أَلثَّمْــرَة= الثَمَرَة): ١-میــوە/ بەری درەخت ٢-زارۆڵە/ فرزەند/ وەچە.

(ثَمَرَةُ السَــوطِ): گرێی ســەری قامچی (كە وەك بەری شۆرەوەبوو وایە).

(«أَمَــرَ الجَــلَّادَ أَن یَــدُقَ ثَمَرَةَ سَــوطِهِ»): جەڵدەلێدەرەكە فەرمانیدا كە گرێی ســەری قامچیەكــەی بقرتێنێــت، تــا كەمــتر ئازار بگەیەنێت.

(أَلثَمْراء- مِنَ الشَجَر): درەختی بەردار.

(أَرضٌ ثَمْراء): زەوییەكی زۆر بەبەر.

(أَلثامِر): لۆبیا/ ماشە سپی.

٢-(ثَمَرَ- الرَجُلُ. ثُموراً): ١-دارای پێكەوەنا/ ســامانداربوو ٢-پارەكەی خستە كارەوەو پێی دەوڵەمەند بوو.

(ثَمَّــرَ- مالَهُ): (ســامانەكەی/ داراكەی) زۆر كرد.

الثَّمَر: بەری ڕەنج‌و ئەنجامی بەرهەمی ماڵ‌و سامان/ دارا.
(ثَمَــرَة و ثَمْرَة (ج) ثِمــار و (جج) أَثْمار و ثُمُرٌ): هەموو جۆرە ماڵ‌و سامان‌و دارایيەك.
٢-(ثَمْرَةُ اللِّسانِ): سەری زمان.
«ثَمْرَةُ القَلْبِ»: خۆشەويستی‌و سۆزی ناودڵ.
(خَصَّنــي بِثَمْــرَةِ قَلبِــهِ): گەرميی ســۆزو خۆشەويستيی دڵی دامێ.
ثمل:١-(ثَمَلَ-ه.ثَمْلاً): بەخێويكرد/ خواردن‌و خواردنەوەی دايەو سەرپەرشتيكرد.
(- هُ: بەفريايەوە چوو كۆمەكيكرد.
(ثمــالُ القَوم): فرياكەوتەی خوێشــگەل كە كاروبارَيان بۆ جێبەجێ‌و بەڕێوە دەبات.؟
٢-(ثَمِلَ. ثَمَلاً): سەرخۆشبوو/ مەستبوو.
(ثَمِلٌ): سەرخۆش/ مەست.
(أَثْمَلَ- هُ): سەرخۆشيكرد.
(تَثَمَّــلَ- مافي الإنــاءِ): جۆرمبڕی ئەوەی ناو قاپەكەيكرد/ هەمووی خواردەوە.
٣-(أَثْمَلَ- اللَّبَنُ): شيرەكە كەمێ زۆر بوو.
(أَثمَــلَ و تَثَمَّــلَ- اللَّبَــنَ): ماســتەكەی ژەندو ڕاوەشــاند تا كەرەكەی ســەركەوێت‌و جيابێتەوە.
(أَلثُّمالَة): كەف.
(أَلثَّميل): ماستی ترش.
٤-(ثَمَّلَ- الشيءَ): شتەكەی هێشتەوە.
(أَثْمَلَ- الشيءَ): شتەكەی هێشتەوە.

(أَلثَّمَلَــةُ (ج) ثُمُــول و الثُمَلَــةُ (ج) ثُمَل و الثَمِيلَة (ج) ثَميــل و ثَمائِل و الثُّمالَة (ج) ثُمال): ئاو يان خڵتەو هەر شــتێك كە لە بنی قاپ‌و دەفرو گۆلدا دەمێنێتەوە.
(ألثُمال و المُثَمَّل): ئەو ژەهرەی كە دەيخەنە ناوەوە چەند ڕۆژێك تا دەترشێت‌و هەڵدێت.
(أَلثَّمَلَــة): تانكيــی ئــاوو نــەوت/ عەماراو ٢-زەلكاو.
(أَلمَثْمَلَــة): ١-خڵتەو ليتەی بنی گۆلاو/ حەوز ٢-تووركەی شوان كەدەيخاتە سەرشانی.
ثمن: ١-(ثَمَنَ- الرَجُلَ. ثَمْناً): هەشــتيەكی (ماڵی/ دارای) پياوەكە برا/ وەرگيرا.
(- الشيءَ): هەشتيەكی شتەكەی برد.
( - القَومَ): هەشتەمينی خوێشگەلبوو.
(ثَمَّنَ- الشــيءَ): (هەشت پايە، يان هەشت لا، يان هەشت كەنار)ی بۆ شتەكە كرد.
(أَثْمَنَ- القَومُ): خوێشــگەل بوون بە هەشت كەس.
(أَلثُمْن والثُمُن (ج) أَثمان): هەشتيەك.
(أَلثَمين): هەشتيەك.
(أَتوثُمانَ و مَثْمَنَ): هەشت هەشت هاتن.
(أَلثَّمانِيَة و (م )ثمانٍ) (ع ح): هەشت.
(ثمانِيَةَ عَشَرَ رَجُلاً و ثَمانيَ عَشْرَةَ إمرَأَة): هشەت پياوو هەشت ژن.
(أَلثامِن): هەشتەمين.
(أَلثَمانون): هەشتا.

(أَلْمُثَمَّن) (هـ): هەشتلا.
٢-(ثَمُنَ- الشـيءُ ثَمانَةً): شـتەكە گرانبەها بوو/ نرخی گران بوو.
ثَمَّنَ- الشيءَ): شـتەكەی نرخاند/ نرخی بۆ شتەكە دانا.
(أَثْمَنْتُ المالَ زَيداً و لِزَيدٍ): نرخی شـتەكەم بە زەید دا.
(أَلثَمَـن (ج) أَثْمان و أَثْمِنَة وأَثْمُن): نرخی شتی فرۆشراو/ پارەی شتی فرۆشراو.
(أَلْمُثَمَّن): نرخێنرا/ نرخ بۆدانراو.
(أَلثَّمين): بە نرخ/ گرانبەها.
ثن: (أَلثُنَّة (ج) ثُنَن): تووكی پشت قولەپێی چارەوێ.
ثنـد: (أَلثُنْدُؤَة و الثَنْـدُوَة (ج) ثَنادٍ (ع ١): مەمكی پیاو.
ثنـى: (ثَنـى- الشـيءَ. ثَنْيـاً): شـتەكەی نوشتانەوە/ پێچایەوە/ لاكانی بەسەریەكدادا.
(«ثَنِيَ صَدرُهُ»): رك و كینەی پەچنییە دڵیەوە یان ئەوەی لە دڵیدا بوو دەرینەخست.
(تَثَنَّـى –الشـيءُ): شـتەكە (١-پێچپێچـوارد ٢-خواربووەوە).
(- في مَشـيِهِ): لە رۆیشتندا بە لارەوە لارەوە رۆیشت.
(- في صَدري كذا): ئەوە هاتە دڵمەوە/ ئەوە بە دڵمدا هات/ رابورد.
(إنْثَنى وأَثَنَّى): ١-نوشـتایەوە ٢-هەندێك لای بەسەرهەندێكیتردا شكایەوە.
(إثْنَونى- صَـدرُهُ على البَغضاءِ): دڵی پڕ لە كینەو رق بوو و پەچنیە دڵیەوە.
(أَلثِنْـي (ج) أَثْنـاء- مِنَ الثَّـوب): (توێی/ لۆچی) جل.
(«أَرسَلْتُهُ ثَنيَ كِتابي»): لە توێی كتێبەكەدا نامەكەدا ناردم.
(أَلثَني- مِنَ الحَيَةِ): پێچی مار.
(- مِنَ الوادي): پێچی دەرەوە/ دۆڵ.
(- مِنَ اللَّيل): كاتژمێرێكی شەو یان دەمێكی شەو.
(أثناءُ الكَلام): كاتی ئاخاوتنەكە/ لە گەرمەی قسەكردنەكەدا.
(«جـاؤوا في أَثْنـاءِ الأَمـر»): لـە كاتی/ لە گەرمەی كارەكەدا هاتن.
(أَلثِناء): پەتی پێچداری بەستنەوەی حوشترو ولاخیتر.
(أَلمَثْنى (ج) المَثاني مِن الوادي): پێچی دۆڵ/ دەرە.
(أَلمَثاني): ئایەتەكانی قورئان.
مِنَ الشيءِ): هێزو وزەی شت.
(أَلمَثناة (ج) مَثانِيَة): ١-پێچو لۆچو چرچییو نوشتاوە ٢-گوریسی خورییو موو و شتیتر.
٢-(ثَنى- زَيداً. ثَنياً): زەید دووهەمبوو.
(«هـذا واحِـدٌ فاثنِهِ»): ئەمـە یەكەمە تۆ دووەمین ببە.

(- الأَمْـــرَ أَو الرَمْـــلَ): كاره گەورەكـــەی بە دەستەوە گرت‌و ئەنجامیدا یان سەر بەرزاییە لینەكە كەوت.

(- فلانٌ فِي الكَرَم): فیسار كەس زۆر بەخشندە بـــوو وەك بڵێـــی فیســـار گیانی لە بەخشـــین دروستبووبێت.

(- فلاناً مِن بَين القَوم): لەناو خوێشـــكەلدا فیساری هەڵبژارد.

(الجســـم (ج) أَجســـام وأَجْسُـــم و جُسُوم): ١-لـــەش/ تـــەن ٢-ئـــەوەی درێژیـــی‌و پانیی‌و قووڵیی هەبێت.

(جِسْـــمِيّ و جِسْـــمانِيّ): لەشـــی/ تەنیـــی/ جەستەیی.

(الجُسُم): كاری گەورەو گرنگ.

(أَلأَجْسَـــم): زەلامـــتر/ قەبەتـــر/ كەتەتـــر/ زەبەلاحتر.

(أَلمُجَسَّـــم): ١-قەبـــارەدار ٢-هەرچـــی پانیی‌و درێژیی‌و قووڵیی هەبێت ٣-ئەنجامی لێكدانی پانیی‌و درێژیی‌و قوڵیی تەنێك لە یەك.

(الجُسْمان = الجسم): تەن/ لەش/ جەستە.

٤-(تَجَسَّـــمَ- فِي عيني كـــذا): وا گەورە هاتە بەرچاوم.

(- الأَرضَ): نیـــازی ئەو شـــوێنەیكردو ڕووی تێكرد.

الملحق:

جسم: (التَّجْسيم):١-گەورەكردن/ مەزنكردن/ ٢-قەبارە پێدان.

(التَّجسيم- فِي التوصف): شـــتەكە وا نیشان بدرێت‌و وەسف بكرێت كە بهێنرێتە بەرچاوو تەنداربكرێـــت وەك (« حَدَّثَنـــي نفســـي»): دەروونم دواندمی.

(أَلتَّجســـيم- فِي عِلـــمُ الـــكَلام): لە زانســـتی ئاخاوتندا ئەوەیـــە بوترێت كە خودا مەزنەو هەیە.

(التَجسيم) (هـ): قەبارەپێدان ئەوەیە پانی‌و درێژی‌و ئەستووریی بدەینێ.

---

جســـا: (جَسا. جَســـواً و جُسُـــواً): ڕەقبووو زبربوو.

(جاســـي- هُ مُجاســـاةً): دوژمنایەتی لەگەڵدا كرد/ بوو بە ناحەزی.

(مُجاسَاة): دوژمنایەتیكردن.

جش: ١-جَشَّ- هُ. جَشّاً): كوتای‌و شكاندی.

(أَجَشَّ- الشيءَ): بە شتەكەیدا كێشا/ كوتای‌و شكاندی.

(- البُرَّ): گەنمەكەی درشت هاری.

(أَلبُرُّ الجَشيش وجَشُوش): بروێشی گەنم.

(أَلمِجَش والمِجَشَّة): دەستار.

٢-(جَشَّـــي- القَـــومُ) (ضـــد):١-خوێشـــكەل كۆبوونـــەوە ٢-بڵاوەیـــان لێكـــردو لـــە یـــەك دووركەوتنەوە.

(أَلجَشَّة والجُشَّة):كۆمەڵە خەڵكێك بە كۆمەڵ بێن‌و بوروژێن.

٣-(جَشَّ- المَكان): شوێنەکەی گەسکداو پاکیکردەوە.
(جَشَّ دَمْعَهُ): گریاو فرمێسکی ڕشت.
٤-(جَشَّ- هُ بالعَصا): بەدار لێیدا.
٥-(أَجَشَّ واجْتَشَّ- المَكانُ): ڕووەك گیای شوێنەکە بەیەکداچوو.
٦-(ألجَش- مِنَ المَواضع): شوێنی بەردەڵانیو بەرد گەورە گەورە.
(ألجَشَّةُ والجُشَّةُ): دەنگی گڕ.
(ألأَجَشَّ (م) جَشَّاء): مرۆڤی دەنگگڕو دەنگقەبە.
(جشأ: (جَشَأَ- ت نَفسُهُ: جُشُوءَ و جُشْأً و جَشَأً): دەروونی هەڵچوو و هێڵنجیدا/ لە ترسو بێئارامیو خەفەتدا دڵی تێکەڵهات.
(- البَحْرُ): دەریاکە هەستاو کەوتە شەپۆڵدان.
(جَشَأ و تَجَشَّأَ. تجشِئَةً و تَجَشُّؤً): قرقێنەی دایەوە.
(إجتَشَأَ — البِلادَ): لە وڵاتەکە دەرپەڕی.
(تَجَشَّأَتْهُ البِلادُ): وڵاتەکە دەریپەڕاند.
(ألجُشَاء): قرقێنە.
(جُشْأَة وجُشَأَة): یەك قرقێنە.
٢-(جَشَأَ- المَكانُ. جُشُوءَ و جُشْأً و جَشَأً): شوێنەکە هەموو ڕووەکەکەی سەر دەرهێنا/ تیایدا ڕرواند.
(- مِنَ المَكانِ): لە شوێنەکە هاتەدەرێ/ دەرچوو.
جشب: (جَشُبَ و جَشِبَ- وجَشُبَ- الطَعامُ جَشَباً و جَشابَةً): خواردنەکە قورسو توندبوو.
(جَشْب وجَشِبْ و جَشيب ومِجشابِ و مجشوب): خواردنی توندو قورس.
(جَشُبَ- الرَجُلُ): خواردنی پیاوەکە خراپو قورس بوو.
(ألمِجشَب) ١-(کەتە ٢-ئازا/ دلێر.
جشر: ١-(جَشَرَ- المَواشِيَ. جَشْراً): ئاژەڵەکەی بۆ لەوەر دەرکرد.
(- الرَجُلُ. جُشوراً): بۆ گوزار چوو/ سەفەریکرد.
(جَشَّرَ- المَواشِيَ): ئاژەڵەکەی بۆ لەوەڕاندن دەرکرد.
(ألجَشَر والجُشار): ١-ئاژەڵ لە لەوەڕگادا دەمێنێتەوە ٢-خوێشگەل بە دیار حوشترەوە لە لەوەڕگاکاندا شەو بەکێو دەبن شەو دەمێننەوەو نایەنەوە ماڵەوە.
(الجُشارِيّ): شوانی شەو بەکێو.
٢-(جَشَرَ- الصُبحُ. جشوراً): سپیدەیدا/ شەبەقیدا.
٣-(جَشِرَ. وجُشِرَ. جَشَراً): ١-دەنگی نووسا ٢-تووشی کۆکە بوو.
(أَجْشَر (م) جَشْراء (ج) جُشْر): ١-دەنگنووساو ٢-کۆکەگرتوو.

(اَلجُشرَة)دەنگنووسان ٢ـكۆكە.

٤-(جَشَّـرَ- الإِنـاءَ)دەفرەكـەی/ قاپەكەی بەتاڵكرد.

(اَلمِجشَرُ (ج) مَجاشِرُ)گۆل/ حەوز.

جشـع: (جَشِـعَ و تَجَشَّـعَ. جَشَـعاً): بەرچاوتەنگییكـردو چاوچنـۆك بـوو/ زۆر تەماعكار بوو.

(جَشِـعٌ (ج) جَشِعُون و جَشَـاعی و جُشَعَاء وجَشَـاع)زۆر چاوچنـۆكو بەرچاوتەنگ/ زۆر تەماعكار كەبە هیچ داناكەوێت.

(تَجاشَعا- الماءَ)لەسەر ئاو (لە یەك توندبوونو شەڕەشانیانكرد/ یەكتریان تەنگەتاوكرد).

جشم: ١-(جَشِـمَ- الأَمرَ. جَشْماً وجَشامَةً): كارەكـەی بـە زەحمـەتو گرانییـەوە گرتەئەستۆی خۆی.

(جَشَّـمَ وأَجْشَـمَ – هُ الأَمـرُ):كارەكـە ماندوویكردو نارەحەتیكرد.

(تَجَشَّم- الرَّملُ)بەسەر لمەكەدا بە شەڕەشەق سەركەوت.

(تَجَشَّمَ- الأمرَ)گرانییو زەحمەتی كارەكەی لە ئەستۆگرت.

(اَلجَشَـم والجُشُـم)گرانیـیو زەحمـەتو قورسیو كاری گران.

(اَلقى عَلَيَ جِشْمَهُ)گرانییو زەحمەتی خۆی بەسەر مندادا.

(اَلجَشَم والجُشمُ- مِنَ البَعیرِ)سنگی حوشتر.

(اَلجَشِـم والجشِـیم)ئەسـتووری (گـران/ قورس/ سەنگین).

٢-(تَجَشَّـمَ- فُلاناً مِن بَینِ القَومِ)فیساری لەنـاو خوێشـكەلدا هەڵبـژاردو شـوێن ئەو كەوت/ ڕێی ئەویگرت.

جشـن: (الجَوْشَن)١ـسـنگ ٢ـزرێی سنگ ٣ـ قەڵغان.

(الجَوْشَن- مِنَ اللَّیلِ)نیوەشەو.

جصّ: ١-(جَـصَّ. جَصّاً و جَصیصاً)هاوارو ناڵەی توندی بەستنەوەكەی كرد.

٢-(جَصَّـصَ- الجَـروُ)توتكەكـە چـاوی (ترووكاند/ هەڵهێنا).

(- العُنقودُ)هێشووەكە لە دەركەوتندا بوو.

٣-(جَصَّصَ- على العَدُوِّ)پەلاماری دوژمنیدا.

٤-(جَصَّصَ البِناءَ): (ب)خانەكەی گەچكاریكرد.

(اَلجَـصّ والجِـصّ) (ب)گـەچ (مادەیەكە، بەردیگـەچ لـە كـوورەدا دەسـووتێنرێتو دەهاڕرێت).

(الجفضین) (عامیة) (یونانیة)گەچ.

(اَلجَصَّاص)١ـخاوەنگەچ ٢ـگەچفرۆش.

(اَلجَصَّاصَة)كارگەی گەچ/ كوورەی گەچ.

٥-(إِجْتَـصَّ و تَجـاصَّ- القَـومُ)لـە یەك نزیكبوونـەوەو كۆبوونەوە.. (اَلجَصیصَـة): كۆمەڵـە خەڵكێـك هـەوار نزیكـنو كۆبوونەتەوە.

جَضّ: (جَـضَّ- علیه بِالسَّـیفِ جَضّاً)بە

شمشێر هێرشی بردەسەر.

جع: ١-(جَعْجَعَ- البَعيرَ)حوشترەكەی بزواند یان بۆ پخدانی یان بۆ هەستانی.

(- البَعيرُ):ئەژنۆی بـۆ كەوتن بە زەویدادا/ چۆكی بۆ پخوون دادا.

(تَجَعْجَعَ- البَعيرُ أَو نَحْوُهُ):حوشـترەكە یان هیـوا. لەتاو ئـازار یان ژانی لێـدان خۆی بە زەویدادا.

(اَلجَعْجَعَةُ) (مص)١-بۆرەی حوشـترگەل كە پێكەوەبن و یەكبگرن ٢-چەقچەقەی ئاش.

(«أَسْـمَعُ جَعْجَعَـةً ولا أَرى طَحْناً»)گوێم لە چەقچەقەیەو هیچ نابینم. بهارێت. بە هاشەو هووشەكەرێكی هیچ لە باردا نەبوو دەڵێن. یان بە چروكێك دەڵێن كە گفتی بەخشین بداتو هیچ نەدات.

٢-(جَعْجَـعَ- بِالغَريمِ)هاواری بە قەرزارەكە خستو تەنگی پێهەڵچنیو داوای وامەكەیكرد.

٣-(جَعْجَـعَ- فِي المَكانِ)لە شـوێنەكەدا هەر قنگەجووڵێی بوو/ بێسرەوتبوو.

(- بِالقَـومِ):خەڵكەكـەی لـە شـوێنێكی تەنگەبەردا گیردا.

(اَلجَعْجَاع)١-شـوێنی تەنگەبـەری رەقەنو ناخـۆش ٢-بەگژداچوونێكی جەنگ ٣-وشـكە چۆڵەوانییەك/ خاكێكی وشكی بێبەر.

جعب:١-(جَعَبَ- الجَعْبَةَ. جَعْباً)تیردانەكەی دروستكرد.

(اَلجَعْبَةُ (ج) جِعَاب)تیردان.

(اَلجَعَّاب)تیردانگەر.

(اَلجِعابَة)تیردانگەریی.

٢-(جَعَبَ- هُ و جَعَّبَ- هُ و جَعْبَاً – هُ. جَعْباً و تَجْعيباً و جَعْبَاةً و جِعْبَاءً)سەرەوخواریكردەوە، بە زەویدادا، هەڵیگێڕایەوە.

(تَجَعَّبَ وانجَعَبَ)پشتی بە زەویدادرا.

(تَجَعبى = تَجَعَّبَ)بە زەویدادرا.

(- الجَيـشُ): سوپاكەدابەبەسـەریەكداو بەیەكداچوو.

(اَلجَعْبَاء)بنچینە، بن.

٣-(الأَجْعَـبُ (م) جَعْبَاء (ج) جُعْب)١-ورگن ٢-لە كاردا مردەلۆخە/ سست/ خاو.

اَلجُعْبُـوب (ج) جَعابيـب):كورتەبنـەی ناشیرین.

جعد: ١-(جَعُدَ الشَـعَرُ جَعَـادَةً و جُعُودَةً): قژەكە لوولو گڕ بوو.

(جَعَّدَ- الشَعَرَ)قژەكەی گرژو لوولكرد.

(تَجَعَّـدَ- الشَـيءُ):شـتەكە چوومیـەكو كرژبوو.

(-الشَعَرُ):نقژەكە لوولبوو.

(اَلجَعْد (ج) جِعَاد- مِنَ الشَعَر)قژی لوولو گرژ.

٢-(اَلجَعْدَ (ج) جِعَاد)پیسكەی بەد.

(«رَجُلٌ جَعْدٌ»)پیاوی چرووكی بەد.

(«جَعْدُ اليَدِ»)دەستقووچاو/ رژد.

(«رَجُـلٌ جَعدُ القَفـا»): پیاوی نارەسـەن/ بەدرەسەن.
(«تُراب جَعدٌ»): خاکێکی کۆمەڵبووی بەرز.
(«وَجـهٌ جَعْـد»): دەموچاوێکـی گـردی کەمجوانیی.
(«زبـدٌ جَعْدٌ»): کـەف دەریای لەسـەریەك نیشتوو.
(اَلجَعْـدَة) (ن): سـیرەمارانە ڕووەکێکـی بۆنخۆشە بەهارییەو زوو وشکدەبێت.
(أبُو جَعدَة وأبُو جَعادَة أو جُعادَة): ناسناوی گورگە.
جعر: ١-(جَعَـرَ وانجَعَرَ- السـبعُ. جَعْراً): درندەکە پیسایکرد/ ڕیا.
(اَلجَعْر (مص) (ج) جُعُور): پیسایی درندە.
(جَعـارِ وأبُـو جَعار وأُمّ جَعـارِ):١-کەمتیار (لەبەرئەوەی زۆر دەرییەو بای لێبەردەبێتەوە بۆیە وای پێدەڵێن).
(اَلجَعْراء والجعَر): پاشـەوە/ دواوە/ پشتەوە ٢-قنگ/ کۆم.
(أبُو جعران):گوخیلنکە/ قالۆنچە.
(أُمّ جُعْران = الرَّخمَة): سیسـارك، کەرگەز/ داڵ (باڵندیەکی گۆشتخۆرە).
٢-(تَجعَّـرَ):ناوقەدی بە پەتێك بەسـت بۆ داهێلان بۆ ناو چاڵاو/ بیر.
(اَلجِعَـرا):پەتـی خۆداهێـلان بۆ نـاو بیر، سەرێکی بەسنگێکەوە دەبەسترێت و سەرەکەی تری بەخۆداهێڵەکەوە.
(اَلجاعِرَتان): شـوێنی بەرکەوتنی کلکی وڵاخ کاتی ڕاوەشاندنی کە بە ڕانیدا دەدات.
(کوی دابَّتَهُ علی جاعِرَتَها): شوێنی پێداداني کلکی وڵاخەکەی داخکرد.
(جعس: جَعَسَ- الرَّجُل. جَعْساً): پیسایکرد/ گوویکرد.
(تَجَعَّس):١-پیسبوو ٢-قسەی ناشیرین و پیس (لە دەم هاتەدەریٚ/ کرد).
جعـظ: (جَعَـظَ وأجْعَـظَ- هُ. جَعْظـاً): دووریخستەوە/ پاڵی پێوەنا.
(جَعِظ. جَعَظاً): بەدرەوشـت و قیناوی بوو/ قینلەدڵ بوو و ناقایلبوو.
(جَعـظٌ و جَعِظ): بەدرەفتـارو قین لە دڵ و ناقایل.
جعف: ١-(جَعَفَ- هُ. جَعفاً): دایبەزەویدا.
(- الشَّجَرَةَ): درەختەکەی لە بن هەڵکەند.
(أجْعَفَ- هُ): دایبەزەویدا.
(اِجْتَعَـفَ الشَّـجَرَةَ): درەختەکـەی لە بێخ دەرهێنا.
إنجعفت: لە بنهات. (اَلجاعِف والجُعاف- مِنَ السُّيُول): لێشاوێك هەموو شـتێك ڕامالێت و درەخت لە بن هەڵکەنێت.
(اَلجَعْف) (مص): نانی بێمنەت.
٢-(اَلجَعْفَر): ڕووبار ٢-مێحوشـتری فرەشـیر/ بەشیر.

٣-(ألجَعْفيل) (ن): گیاکەڵە/ جۆرە رووەکێکە مشەخۆرە بە لاسکەکەیەوە گوڵی هەمەرەنگ دەگرێت، لە زۆر شوێنی گێتیدا بڵاوە، خوی لەسەر رەگی کشت دەچەسپێنێت و شیلەکەی هەڵدەمژێت بەوە دەژی، مادەی کلۆرۆفیلی نییە.

جعل: ١-(جَعَلَ- هُ. جَعْلاً): ١-هێنایەدی، دروستیکرد.

«جَعَلَ الله الظُلُماتِ» (خودا تاریسکتانەکانی هێنایە بوون) ٢-داینا ٣-کردی بە سەردار. بە دادوەر.

(«جَعَلَهُ حاکِماً»): کردی بە سەردار. بە دادوەر ٤-گۆری.

(«جَعَلَ الحُسنَ قَبیحاً»): جوانیەکەی تێکداو ناشیرینیکرد.

(تَجاعَلوا- الشيءَ): شتەکەیان بەناو کۆییکرد.

(إجْتَعَلَ- ه): پێکیهێنا/ دروستیکرد/ بەدیهێنا.

(- إجْتَعَلَ- الشيءَ): شتەکەی دروستکرد.

٢-(جَعَلَ- هُ. جَعْلاً): وایزانی/ وا تێگەیشت/ وایبۆچوو.

(«جَعَلَ الحَقَّ باطلاً»): وایزانی راستییەکە ناراستییە.

٣-(جَعَلَ. جَعَلاً): دەستی پێکرد.

(جَعَلَ یَکتُبُ): دەستی بە نووسینکرد.

٤-(جَعَلَ. جَعْلاً): دایە.

(«إجْعَلْ لي لِسانَ صِدقٍ»): زمانی راستگۆیم بدەرێ واتا وابێت بڕوام پێبکەنم لێم تێبگەن و بە قسەم بکەن.

(-جَعَلَ لَهُ کذا علی کذا): مەرجی ئەوەو ئەوەی لەگەڵدا بەست.

(جاعَلَ- هُ. مُجاعَلَةً و جِعالاً): بەرتیلیدایە یان کرێیدایە.

(أجْعَلَحَ- لَهُ): کرێی کارێکی بۆ دانا کە بیکات.

(- هُ جَعْلاً): کرێکەی دایە.

(إجْتَعَلَ- الشيءَ): شتەکەی وەرگرت.

(«جَعَلَهُ الشيءَ فاجتَعَلَهُ»): شتەکەی دایەو ئەویش وەریگرت.

(الجِعال (ج) جُعُل و الجِعالَة والجُعالَة والجَعالَة والجُعْلُ (ج) أجْعال و الجَعیلَة) (ج) جَعائِل): ١-کرێی کرێکار/ کرێی کارکردن ٢-ئەوەی بە شەرکەرێك دەدرێت کە بچێتە شەرەوە.

(ألجَعالة): بەرتیل.

٥-(جَعِلَ- الغُلامُ): مێردمنداڵەکە کورت و قەڵەو بوو.

٦-(جَعِلَ الرَجُلُ جَعَلاً): پیاوەکە وێرەویکەرو لەسەر شت رۆیشتوو بوو.

(جُعَل): وێرەویکەرو زۆر لەسەر شت رۆیشتوو.

٧-(جَعِلَ- الماءُ. جَعَلاً): ئاوەکە پڕبوو لە ئاورونکەرە.

(أَجْعَلَ- الماءُ): ئاوەكە پڕبوو لە ئاوڕوونكەرە.

(ماءٌ جِعْلٌ و جَعِلٌ): ئاوی پڕ لە ئاوەڕوونكەرە.

(جُعَل (ج) جِعلان (ح):١-ئاووڕوونكەرە ٢- زەلامی ڕەشی ناشیرین كە بە ئاوڕوونكەرە چوێنراوە.

٨-(أَلجُعْلُ): چاوتێبڕ/ چاودێر.

أَلجعال: پەڕۆی دەستگرە (بۆ داگرتنی مەنجەڵو شتی سەر ئاگر).

جعم: ١-(جَعَمَ- هُ. جَعْماً):شتێكی ئاخنیە دەمیەوە كە نە بخواتو نە گازیش بگرێت.

(جَعِمَ. جَعَماً) (ضد):١-دڵی زۆر چووە سەر خواردن ٢-دڵی خواردنی نەبرد.

(«جَعِمَ إِلى اللَّحم»):زۆر حەزی لە گۆشت كردو دڵی چووە سەری ٢-دڵی نەچووە سەری.

(جَعِمَ و تَجَعَّمَ- في الشَيءِ):چاوی بڕییە شتەكەو دڵی ویستی.

(جَعْمٌ و جَعِمٌ):چاوبرسی/ بە تەماع.

(أَلجعْم):برسێتی.

(أَلجَيْعَم):چاوبرسی/ چاوچنۆك كە چاوی بە هەرچی بكەوێت دڵی بچێتە سەریو بیەوێت بیخوات.

٢-(أَجْعَمَ- الشَيء):شتەكەی لەبنهێنا.

(- الشَّجَرَ):گەڵای بەدرەختەوە نەهێشت خواردی تا لاسكەكەیشی خوارد.

٢-(أَلمَجْعَم):پەناگا/ ژێرزەمین.

جعا: (جَعَا – البَعْرَ ونَحْوَهُ جَعْواً): پشقلی حوشترو هیتری كۆكردەوەو كۆمەڵیكرد.

(أَلجَعْوُ) (مص): ١-هەر شتێك بە دەست كۆبكرێتەوەو كۆمەڵ بكرێت ٢-بنچینە/ بێخ/ بن ٣-كۆم/ قوون ٤-قوڕ.

(أَلجِعَة=أَلبيرَة):ئاوجۆ/ بیرە.

جغر: (أَلجغرافِيَّة والجغْرافِيا) (یونانیة): جوگرافیا. زانستی نیشانەكردنی زەویو بەشەكانی.

(- الإقْتِصادِيَّة): زانستی بەروبوومی كشتوكاڵو بەرهەمی ئابوریی.

(- الطَّبيعِيَّة):زانستیی باری گۆی زەوی هی هەواو وشكاییو دەریایی.

(- الرِّياضِيَّة)زانستیی گۆی زەویو شوێنی لە نێوان ئەستێرەكانو هەسارەكان گەردووندا.

(التَّأريخِيَّة):زانست دەربارەی ڕەگەزەكانی مرۆڤو زمانو سنوری وڵاتانو دامەزراوەكان.

(- البَشَرِيَّة):زانستی دانیشتوانی سەرزەوی.

(أَلجغرافِيّ):زانای جوگرافیا/ جوگرافیاناس.

جف: (جَفَّ: جَفافاً و جُفوفاً):وشك بوو، وشكبووەوە.

(جاف و جَفيف):وشكو برنگ، وشكبوو/ وشك.

جَفَّفَ- هُ. تَجْفِيفاً و تَجْفافاً):وشكيكردەوە.

(تَجَفَّفَ):وشكبووەوە.

(إِجْتَفَّ- مافي الإِناءِ): قاپەکەی وشککردەوەو هەرچی تێدابوو خواردی.
(ألجُفّ): پیرێکی وشکهەڵاتوو.
(ألجَفَف): زەویی ڕەقەنی وشك.
(ألجَفيف): ڕووەك و گژوگیای وشك بوو.
(ألجُفاف): ئەوەی وشکبۆتەوە. لەو شتەی بۆ وشککردن دانراوە.
(جَفاف): وشکیی.
٢-(جَــفَّ- المالَ. جَفّاً): ســامانی کۆکردەوەو بردی.
(ألجَـفُّ و الجَفَّةُ والجُفّ و الجُفَّةُ): ١-کۆمەڵە خەڵکێك ٢-ژمارەیەکی زۆر.
(«جاءَ القَومُ جُفَّةً»): خوێشــگەل بە کۆمەڵ هاتن یان هەموو هاتن.
٣-(جَفَّفَ – الفَرَسَ): ئەسپەکەی زرێپۆشکرد.
(ألتِّجْفاف والتَجْفاف (ج) تَجافيف): زرێیەکە بە پێشــی ئەســپدا دەبەســترێت یان مرۆڤ دەیپۆشێت.
(ألجُفَيْف (ج) جُفَيفات (ا ع)): قاوغی فیشەك.
٤-(ألجُفّ): ١-چاکســاز/ وەســتای چاککردنی شت.
(«هُوَ جُفُّ مالٍ): ئەو چاکەڵسوورێنی سامانە ٢-هەموو شتێکی ناوبۆش/ لوولەکێك کە وەك لوولەی قامیش بێت.
٥-(جَفجَفَ- الإبلَ): حوشــترەکانی وا توندرا داتانیشتنە سەریەك.

(جَفْجَفَ- الثوبُ): جلە تەڕەکە کزر بووەوە.
(تَجَفْجَــفَ- الطّائِرُ): باڵندەکە بالی بەســەر هێلکەکاندا داو دایپۆشین.
(ألجَفْجَــفُ)- مِنَ الأرضِ (ضــد): ١-هەڵەت ٢-نشێویی.
(ألجَفْجَفَةُ): ورشەی بەرگی تازە.
(«جَفجَفَةُ الموكِبِ»): ترپەی پێی ڕۆیشــتنی گەلە خەڵك پیادە بن یا سوارە.
(الجَفاجف): سەرو قەڵافەت و پۆشاك.
جفأ: (جَفَــأَ- الرَجُلَ و بِــهِ الأرضَ. جَفْأً): پیاوەکەی بە زەویدا کوتا.
(أَجْفَــأَ- بِــهِ): ئەوی بــە زەویــدا کوتا/ بە زەویدادا.
٢-جَفَــأَ- النَّهــرُ. جَفْــأً): ڕووبارەکە کەف و پیسیی ناوی لادایە قەراغی
(- تِ القِدرُ): مەنجەڵەکە هەڵچوو.
(- القِدرَ): مەنجەڵەکەی لاداو ڕۆکرد.
(إجتَفَأَ- الشــيءَ): شتەکەی لە بن هەڵکەندو فرێیدا.
(ألجُفَاء): ١-ئــەوەی لافاو بەمبەرو بەوبەریدا دەدات ٢-ناراست/ نارەواو بێکەڵك.
(«ذَهَبَ جُفــاءً»): بە ناڕاســتیی و ناڕەوایی ڕۆیشت.
٣-(أَجْفَأَ – البابَ): دەرگاکەی داخست.
٤-(أَجْفَأَ- الناقَةَ): مێحوشترەکەی بە ڕۆیشتن (ماندوو کرد/ لە پەلوپۆیخست).

٥-(أَجْفَأَ- ت وتَجَفَّأَ- تِ البِلادُ): فەرو بێری وڵاتەکە ڕۆیشتو نەما.

جفت: ١-((جفت): جووت یان دوان وشەیەکی (تورکییە).

جفت: تفەنگی جووتلولە/ تفەنگی دوو لوولە.

٢-(جِفْتِلِك (ترکیة): زەوی چێنراو، بە ماڵی جوتیارەکانو زەویو زاری دەوروپشتیان دەوترێت.

جفخ: (جَفَخَ: جَفخاً): لووتبەرزیی نواند/ فیزی نواند.

(جَفّاخ): لووتبەرز/ بەفیزو دەعیە.

(جافَخَ- هُ): خۆی بەسەردا بادا/ فیزی بەسەردا لێدا/ فیزی بەسەردا کرد.

جفر: ١-(جَفَرَ و تَجفَّرَ واسْتَجْفَرَ- وَلَدُ الشاةِ. جَفْراً): بەرخەکە خەپەرە بوو ورگی پەیدا کرد.

(- الشَّيءُ): شتەکە فراوان بوو.

(الجَفْر (مص (ج) جِفار): چاڵاوی فراوان.

(الجُفْرَةُ (ج) جُفَر وجِفار – مِنَ الشَيءِ): ناوەڕاستی شت.

(- مِنَ الأرضِ): دەشتاییەکی پانو فراوانی خڕ شێوە.

٢-(جَفَرَ- مِنَ المَرَضِ. جَفْراً): لە نەخۆشییە چاك بووەوە.

(- ماكانَ فيهِ): وازی لەوە هێنا کە تیایدا بوو.

(- صاحِبَهُ): پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ دۆستەکەی پچڕیو توخنی نەکەوت.

٣-(أَجَفَر): وازلێهێنان، بەجێهێشتن.

٣-(الجَفْر): لەبەر/ بۆ ئەوە.

«فَعَلْتُ ذلك مِن جَفْراً ومِن جَفَرِ كذا»): لەبەر ئەو ئەوەمکرد.

(«فُلان مُنَهدِمُ الجَفْر»): فیسار بێراپەو حولحولییە.

(عِلمُ الجَفْرِ): زانستی پیتەکان. خاوەنەکانی دەڵێن گوایا بە هۆیەوە هەموو قەوماوێك پێدەزانن تا کۆتایی جیهان دێت.

(ألجَفير): تیردانێکە لە دارو بێچەرم یان لە چەرمو بێدار دروستکرابێت.

جفس (جَفِسَ. جَفَساً و جَفاسَةً): ئینتەلایکرد/ گرفتیکرد.

(ألجِفْس والجَفْس و الجَفيس): ١-لاوازو بێتوانا ٢-بەدخواز/ زمانبەد.

جفظ: (جَفَظَ- الإناءَ. جَفْظاً): قاپەکەی پڕکرد.

(إجفاظَّ واجْفَأَظَّ المَقْتولُ إجْفِئْظاظاً): کوژراوەکە هەڵاوسا.

جَفيظ: لاشەی کوژراوێکی هەڵاوساو.

جفع: (جَفَعَ- هُ جَفْعاً): دایبەزەوییدا.

جفل: ١-(جَفَلَ- البَعيرُ. جُفولاً و جَفَلاً): حوشترەکە ڕاچەنی/ هەڵسڵەمییەوەو هەڵێتیزاندو دایە دەشت/ تەرە بوو.

(جافِل وجَفّال): راچلەکیو/ هەڵسلەمسیوو تەرە بوو/ بەلەسە بوو.

(- تِ النَّعامَةُ): وشترمرخەکە هەڵات.

(جَفَلَ- الطائِرَ جَفْلاً): باڵندەکەی هەڵفراندو تەرمیکرد.

(«جَفَـلَ القَنّاصُ الوَحـشَ عَن مَراعیها»): راوچییەکـە زیندەوەرە دەشـتەکییەکەی لە لەوەرگاکەی تەرە کردو رایفراند.

(جَفَـلَ و تَجَفَّلَ وانْجَفَلَ- القَومُ): خەڵکەکە بە پەلەو لە ترساندا هەڵاتن.

(جَفَّـلَ- هُ): هەڵیسـڵەماندوەو تەرمیکـرد/ تۆقاندی.

(أجْفَلَ- البَعیرُ): حوشترەکە سڵەمیەوەو دایە دەشتو تەرە بوو/ بەلەسە بوو.

(تَجَفَّـلَ- الدِّیـكُ): کەڵەشـێرەکە راپەڕیو پەڕی ملو پۆپنەی بەرزو فشکردەوە.

(ألجَفْل (ج) جُفُول)٢-هەڵسلەمیو/ راچلەکیوو بەلەســە بوو ٢-نێرە وشترمرخەکە لە هەموو شتێك دەسلەمێتەوەو رادەکات.

(ألإجفیل): زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك.

٢-(جَفَـلَ- تِ الریحُ.جُفُـولاً وجَفْلاً): باکە تیژیکرد/ خێرا بوو.

(تِ الریـحُ السَّـحابَ): باکـە هەڵیکـردو هەورەکەی رافراند.

(أجْفَلَتِ الریحُ= جَفَلَت): باکە تیژ بوو.

(ألجَفَـل (مـص) (ج) جُفُـول): هەورێکە بارانددوویەتیو تیژ تێدەپەڕێت.

(ریحٌ جَفُول: (ج) جُفْل و مَجْفِل و مِجْفال): بایەکی تیژی هەور رافرێن.

٣-(جَفَلَ و جَفَّلَ – الطِینَ. جَفْلاً): قوڕەکەو لیتەکەی راماڵی.

٤-(جَفَـلَ- البَحرُ السَـمَكَ. جَفْلاً): دەریاکە ماسیی فڕێدایە سەر ڕۆخەکەی.

(- هُ): دایبەزەویدا.

(- المَتاعَ): کەلوپەلەکەی بەسەریەکدادا.

(ألجُفـال): ئـەوەی لافـاو بەمـلاو ئەولای ڕۆخەکەیدا دەدات.

(ألجُفالَة- مِنَ القِدرِ): کەفو پیسی مەنجەڵ کە بە کەوگیر دەگیرێت.

٥-(ألجَفْـل (ج) جُفُـول): ١-تەرسـی فیـل ٢-پاپۆر.

(ألجُفْلَةُ): خوریی برراوە.

(ألجَفْلَـةُ – مِنَ الشَّـجَر): درەختی پڕگەڵاو لقو پۆپ.

(ألجَفال): ١-کەفی شیر ٢-خوریی زۆر.

(ألجَفیـل): ١-زۆر/ فـرە ٢-سـەرقرتی رووەکێـك کە درێژ بووبێت بۆ سـووککردنی سەرقرتدەکرێت.

(ألجَفَلـی): ناندانێکی گشـتی کـە بە خەڵك بدرێت.

(«دُعِـيَ فُـلانٌ في النَّقَـری لا في الجَفلی»): فیسار بۆ نانخواردنێکی تایبەتی بانگکرا نەك

بۆ نانێکی گشتی.

٦-(اَلجَفْلَق): پیرێکی قەڵەو.

فجن: ١-(جَفَنَ- نَفْسَهُ. جَفْناً): خۆی لە خراپە گێڕایەوە.

٢-(جَفَنَ- الناقَةَ. جَفْناً): مێحوشترەکەی سەربڕیو لە لەگەنی گەورە گەورەدا گۆشتەکەی دەرخوارد دان.

(اَلجَفْنَة (ج) جِفَن جِفان و جَفَنات): ١-(لەگەنی/ تەشتی) گەورە ٢-چاڵاوێکی بچووك کە بە لەگەنی خواردن چوێنراوە.

٣-(جَفَنَ و تَجَفَّنَ- الكَرْمُ): مێوەکە بنیکردو پەلی پەیدا کرد.

(اَلجَفْن (ج) اَجْفان و جُفُون وأَجْفُن): بنیمێوو پەلەکانی.

(جَفْنَة): بنێکی مێوو پەلەکانی.

اَلجَفْنَةُ (ج) جِفَن و جِفان و جَفَنات: مەی.

٤-(اَلجَفْن (ج) اَجْفان و جُفون و اَجْفُن): ١-کێلانی شمشێر ٢-پێڵووی چاو هی سەروخواری.

جفا: (جفا يَجفُو. جَفَاءً و جَفَاءَةً): جێی بە خۆی نەگرت/ ستارەی نەبوو.

(-جَنبُهُ عَنِ الفَراش): لەسەر نوێنەکەی هەر تەپاوتلی بوو.

(أَجفى- الجَبْلَ): نەسپەکەی ماندوو کردو نەیهێشت بخوات.

(تَجافى): لاکەوتو لە جێی خۆی ستارەی نەگرت.

(«تَجافى السَّرْجَ عَن ظَهرِ الفَرَس»): زینەکە لەسەر پشتی چارەوێکە بزواو لەقەلەقی پێکەوت.

(«تَجافى جَنْبُهُ عَنِ الفراش»): لەسەر نوێنەکە تەپاوتلیکرد/ ستارەی نەگرت.

(- عَن مَكانِهِ): لە شوێنەکەیدا ستارەی نەگرت.

(إجْتَفى – الشيءَ): شتەکەی لە جێی خۆی لابرد.

٢-(جَفَا. يَجْفُو- الثَّوْبُ جَفاءً و جَفَاءَةً): جلەکە ئەستوورو زبر بوو.

(إِسْتَجْفى- الشيءَ. إِسْتِجْفاءً): شتەکەی بە زبر یان ئەستوور زانیو هاتە بەرچاو.

جاف: ئەستوور، زبر.

٣-(جَفَا. يَجْفُو- عَلَيه كَذا جَفاءً و جَفَاءَةً): ئەوەی لەسەرشان گرانبوو/ لا گرانبوو.

(- صاحِبَهُ): لەگەڵ دۆستەکەیدا وشكو لووتەلا بوو، ڕووی لێوەرگێڕا.

(جَفَّا- هُ): ڕووی پێ لێوەرگێڕا پەیوەندیی پێپچڕی.

(جافى- الرَجُلَ): لەگەڵ پیاوەکەدا لووتەلا بوو، پەیوەندیی لەگەڵدا پچڕی.

(أَجْفى- فُلاناً): دووریخستەوە.

(إِسْتَجفى- هُ إِسْتِجْفاءً): داوای لێکرد توخنی نەکەوێتو لێی دووربکەوێتەوە.

(اَلجَفْوَة والجِفوَة): لالووتیی/ بە تنگەوە

نەهاتن، ڕەقڕەفتاریی/ وشکیی ڕەفتار.
(ألجـافِي (ج) جُفَاة (م) جافِيَةُ (ج) جافِيات و جَوافٍ): ڕەق‌و وشك ڕەفتار/ بێدەربەست/ لووتەلا.
جافِيُ الخُلْق): تورەو تڕۆ، توندڕەفتار/ وشـك ڕەوشت/ شرودر.
جفی: (جَفی- الرَجُلَ. جَفْياً): پیاوەکەی بە زەویدادا.
(جَفَـى و اجتَفـى- النَّبـاتَ): ڕووەکەکەی ڕیشەکێشکرد/ لە بنەوە هەڵیکەند.
جقّ: (جَقَّ- الطائِرُ): باڵندەکە ڕیقنەیکرد.
جکر: (جَکِرَ و أَجْکَرَ. جَکْراً): لەفرۆشتنەکەدا زۆریکردو هەتەر بوو.
جـل: ١-(جَلَّ. جَـلالاً و جَلالَةً): بە سـاڵدا چوو. مەزن بوو- شکۆدار بوو.
(جَليـل (ج) أَجلاَّء و أَجِلَّـة وجِلَّة و جِلّ و جَلّ و جَلال وجُـلّال ألجَل = الجليل): ١-بە تەمەن/ پیر/ ئیختیار ٢-خاوەن شـکۆ/ مەزن، پایەدار.
(رَجُلٌ جـلٌ): پیاوێکی بە تەمـەن- مەزن/ شکۆدار.
٢-(جَلَّ و تَجالَّ- عَن کذا): خۆی لە نەنگیی‌و ناشیرینی ئەوە پاراست.
(أَجَـلَّ- هُ عَـنِ العَيبِ. إجْـلالاً): خەوش‌و نەنگیی لێ بەدوورگرت.
٣-(جَلَّ. جَلالاً و جَلالَـةً): ١-قەبارەدار بوو
٢-گەورەو دیاربوو.
(«جَلَّ فُلانٌ في عَينَيَّ»): فیسـار لەبەرچاوم مەزن‌و پایدار بوو.
(جَلَّـلَ الرَجُلَ): پیاوەکـەی بە گەورە گرت/ بەرزو پایەداریکرد.
(أَجَـلَّ- هُ. إجـلالاً): بـە گەورەیگـرت- شکۆداریکرد.
(تَجـالَّ- عَلَيهِ): خۆی لەو بـە مەزنتر داناو فیزی بەسەردا لێدا.
(تَجَلَّـلَ): گـەورەو پایـەدارو شـکۆدار بوو/ مەزنبوو.
(ألجِلّ): درشت.
(ألجَلَـلُ- مِنَ الأُمور) (ضـد): ١-کاری مەزن ٢-کاری ئاسان‌و سووکەڵە.
(«فَعَلْتُـهُ مِـنْ جَلَلِكَ و مِـنْ إجْلالِكَ و من تَجَلَّتِـكَ): بـۆ ڕێزلێنانی تـۆو گەورەیی تۆو خاتری تۆ ئەوەمکرد.
(ألجُلَّـةُ (ج) جِـلال و جُلَـل): قوڵینەیەکی گەورەی قیرین.
(جِلَّة): کۆی وشەی جَلِيل): مەزن‌و سەردارو پایەدار.
(«قَومٌ جِلَّة»): خوێشکەلێکی ڕێزدارو مەزن‌و سەردار.
(الجُلَّـي (ج) جُلَـل): مێی وشـەی (ألأَجَل): ١-مەزنترین ٢-کاری سەخت‌و دژوار ٣-چورتومی گران‌و ترسناك/ لێقەومانی سەخت.

(ألتَجلَّة): گەورەیی، مەزنیی، شکۆیی.

(ألمَجلَّة): گۆڤار، پەڕاوێکە دانایی تێدابێت.

٤-(جَـلَّ و اجتَـلَّ- الشـيءَ جَـلاً و جَلَّةً): زۆرینەی شتەکەی برد.

(جُلُّ الشـيءِ): زۆرینەی/ زۆربەی شـتەکە/ بەشی هەرە زۆری.

(جُـلُّ - البَيـتِ): ئـەو شـوێنەی خانووی لەسەر دروسـت دەکرێت یان هەواری لەسەر هەڵدەدرێت.

ألجَـل- مِـنَ الأرض (ج) جَلالـي): پارچە زەوییەکی سنوردارو دیوارکراو.

٥-(جَـلَّ. جُلُـولاً و جَلاً): لە شـارەکەی بۆ یەکێکیتر باریکرد/ کۆچیکرد/ ڕەویکرد.

(جـالّ (ج) جالَّة): کۆچکـردوو/ بارکردوو/ ڕەوکردوو.

(ألجالَّـةُ): کۆمەڵـە خەڵکـی ڕەوکـردوو/ کۆچکـردوو بۆ وڵاتێکیترو تیایدا نیشـتەجێ بوو.

٦-(جَلَّ واجتَلَّ- البَعْرَ جَلاً و جَلَّةً): پشقلی حوشتری هەڵچنی/ کۆیکردەوە.

(ألجَلَّـةُ والجِلَّـةُ ولجُلَّة): پشـقل/ پشـقلی حوشتر.

٧-(جَلَّ- الفَرَسَ) جلـلاً: کورتانی/ جلی لە چارەوێکەکرد.

(جَلَّـلَ- الشـيُ): شـتەکە تەشـەنەیکرد/ گشتیبوو.

(- الشيءَ): شتەکەی داپۆشی.

(«جَلَّلَ المَطَرُ الأَرضَ»): باران هەموو زەویی گرتەوە.

(جَلَّلَ- الفَرَسَ): جلی/ کورتانی لە چارەوێکە کرد.

(تَجَلَّـلَ- بالثَّـوبِ): بـە بەرگەکـە خـۆی داپۆشی.

(تَجَلَّلَ- هُ): سەریکەوت.

(ألجُلّ (ج) جلال وأَجْلال- للدابَّة): جل یان کورتانی وڵاخ بۆ پاراستنی.

(ألجِلّ (ج) جُلُول): چارۆکەی پاپۆڕ.

(ألجِلّ (ج) جِـلال و أجلال): جل/ کورتانی وڵاخ.

(ألجِلّ- مِنَ المَتاع): ١-هەموو ڕایەخێك، فەرش بەڕە، کلیم.. هتـد ٢-پێخەف لێفەو بەتانیە.. هتد.

(ألمُجَلِّل) (فا): گشتلاگرەوە.

(«سَـحابٌ مُجَلِّل»): هەورێـك کە بارانەکەی گشت لایەك بگرێتەوە.

٨-(أجَـلَّ- عَمْرٌ زَيداً. إجلالاً): عەمر شـتی زۆری بە زەیددا.

(«أَتَيْتُ فُلاناً فَما أَجَلَّني ولا أَدقَني»): هاتمە لای فیسار نە کەمو نە زۆری نەدامێ.

٩-(أجَلَّ- الرَّجُلُ. إجلالاً) (ضد): ١-پیاوەکە بەهێز بوو ٢-بێهێز بوو.

١٠-(ألجَل (ج) جُلُول): ١-گوڵە یاسەمین.

أَلجَلَّـةُ: تاكە گوڵێکی یاســەمین ٢ـگوڵەباخی زەردو سوورو سپی.

(جَلأَ- ـَ) جَلأً وجَلأً وجَلاءَةً: زۆرانی لەگەڵدا گرت و کوتای بە زەویدا.

(- ـَ بِالثَّــوبِ): جلەکــەی/ بەرگەکــەی بــۆ هەڵدا.

جلــب: ١-(جَلَــبَ- الرجُلُ. جَلْبــاً و جَلَباً): خۆی دایە پێش و بەکێشکرد.

(جَلَبَ- ـُ): دایە پێش خۆی و هێنای.

(جَلَــبَ و أَجْلَــبَ- لأَهْلِهِ): بــۆ خێزانەکەی رەنجیــداو کاســبیکردو نانی بــۆ پەیداکرد/ شوێنکەوت.

(إنجَلَبَ): درایە پێش/ بەکێش کرا/ رادرا.

(إجْتَلَبَ- ـُ): هێنای.

(إسْتَجْلَبَ- ـُ): بوو بە هۆی هێنانی یان داوای هێنانیکرد.

(جُلْــبُ الرَّحــلِ وجِلْبتُــهُ): داری کورتانی حوشتر.

(أَلجَلَب (ج) أَجْلاب): ئەو شتەی لە ولاتێکەوە بــۆ ولاتێکی تــر دەهێنرێت/ شــتی هێنراو/ هاوردە.

(أَلجُلْبَةُ (ج) جُلَب): چەرمی سەرزین.

(أَلجَلوبَــةُ): (یەکێك یان چەند حوشــترێك) ١ـحوشــتری بارهەڵگری خوێشــگەل ٢ـشــتی هێنراو لە ولاتێکی ترەوە.

(أَلجَليــب (ج) جَلْبی و جُلَبــاء = أَلمَجلُوب): هێنراو/ بەکێشکراو.

(«عَبْدٌ جَليــب وامرأةٌ جَليب و جَليبَة (ج) جَلْبــی و جَلائِــب): کۆیلەیەکــی هێنــراو/ بەکێشکراو.

(أَلجَليب (ج) جَلائِيب): بەکێشکراو هێنراو/ هاتوو.

(أَلجَــلَّاب): کۆیلەهێنــن کە لــە ولاتێکەوە بۆ فرۆشتنیان بۆ ولاتێکیتر دەیانهێنێت.

(أَلمَجْلَبَــةُ): ١ـهــۆی هێنان/ هانــدەری هێنان ٢ـئەوەی شتێك بهێنێت.

(أَلجُلُبّان): هەمانە.

٢-(جَلَــبَ و أَجْلَــبَ- القَــومَ): خوێشــگەلی کۆکردەوە.

(جَلَبَ و أَجْلَبَ- القَومُ): ١ـخوێشگەل لە هەموو لایەکەوە بــۆ جەنگ خرۆشــان و کۆبوونەوە ٢ـکردیان بە ژاوەژاو هات و هاوار.

(- على الفَرَسِ): دەنگی لە ئەســپەکە کردو هانیدا پێشبکەوێت.

(جَلِبَ- جَلَباً): کۆبووەوە.

(جَلَّــبَ- القَــومُ): خوێشــگەل کەوتنــە هاتووهاوارو ژاوەژاو.

(جَلَّبَ – عَلى الفَرَسِ): توند لە چارەوێکەی خوری و هانیدا.

(أَلجَلَب والجَلَبَةُ): ژاوەژاوو هات و هاوار.

(أَلجَــلّاب والمُجَلِّــب): گرمەگرمکــەرو شاتەشاتکەری بێناموس بێنابروو.

(رَجُلٌ جُلَّبان و جَلَبَّان): پیاوی گرمەگرمکەرو شیرەشیرکەر.

٣-(جَلَــبَ وأَجْلَــبَ- هُ): هەڕەشـــەی خراپی لێکرد.

٤-(جَلَــبَ- الدَّمُ. جَلْباً و جَلَبــاً): خوێنەکە وشك بووەوە.

(- الجــرحُ): برینەکــە خۆشــبووەوە/ گۆشتەوزوونیکرد.

(اَلجُلْبَةُ (ج) جُلَب): قەتماغەی سەربرین کە رووەو چاکبوون بێت.

٥-(جَلَــبَ- عَلَيهِ. جَلْبــاً): تاوانی بەرامبەر کرد.

(اَلجَلْب): گوناه/ تاوان. سووچ.

٦-(اَلجُلْب): ١-هــەوری بێباران یان هەورێکی کەڵەکەبوو وەك شاخ ٢-ڕەشیی شەو.

(اَلجُلْبَــةُ (ج) جُلَب): ١-کۆمەڵە بەردی ســەر ڕێگا، کەرێ لە ولاخ ببەستێتەوە ٢-پەڵەپەڵەی گیــا ٣-درەختــی گــەورەی دڕکاوی ٤-گەواڵە هەور.

(«جُلْبَــةُ الشِّــتاء»): توندوتیژیی زســتانو سەرماوسۆڵەی.

(اَلجَلَبَــة) (طب): ماڵەوێنچــە. ڕووەکێکە لە لاولاو دەچێت لە ڕەگەکــەی دەرمانی ڕەوانی دەردەهێنرێت.

(اَلجُلاب والجُلاَّب): هەنگوین یان شــەکر کە بە ئاوی گوڵاو پەروەردە کرابێت.

(اَلجُلاب) (فارسية): گوڵاو.

(اَلجُلْبــان والجُلُّبــان) (ن): گلێنــە جــۆرە ڕووەکێکە وەك ماش بۆ مەبەســتی خواردنی ئــاژەڵ بەکاردێــت. ٢-گیایەکە بــۆ گوڵەکەی دەروێنرێت کە زۆر ڕەنگە.

٧-(جَلْبَــبَ و تَجَلْبَبَ- هُ): جبەی لەبەر ئەو کرد.

(تَجَلْبَبَ): جبەی لەبەر کرد.

(اَلجِلْباب والجِلِّباب (ج) جَلابيب): جبە یان پۆشاکی پانوپۆری وەك جبە.

جلــت: (جَلَــتَ- هُ وأَجْلَــتَ- هُ جَلْتــاً): قامچیکاریکرد/ دارکاریکرد/ لێیدا.

(جلجــل: ١-(جَلْجَلَ- الرَجُــلُ): ١-نەڕاندی/ گرماندی/ توند هاواریکرد.

(السَّحابُ): هەورەکە گرماندی.

(- البَعيرَ): زەنگۆڵەی کردە ملی حوشترەکە.

(جِئلْجُل (ج) أَلجَلاجل): زەنگۆڵە.

(اَلجَلْجَلَــةُ) (مص): گرمــە/ گرمەی هەور، زەنگی زەنگۆڵە/ زەنگ‌وقۆر.

(اَلمُجَلْجِل): ١-گەورەی بەهێزی خاوەن هەرەو گــوڕەو بەبڕشــت ٢-گرمەی دوور ڕۆیشــتوو ٣-هەورە گرمەی بە تۆف‌و بروسکەو باران.

٢-(جَلْجَلَ- الوَتَرَ): ژێکەی توند کرژ کرد.

٣-(جَلْجَلَ- هُ): بزواندی.

(تَجَلْجَلَ): بزوا/ جووڵا.

(- في الأَرضِ): بە ناخی زەویدا چوو.

(- ت قَواعِــدُ البَيــتِ): بنچينەی خانووەکە لێکترازاو شلۆقبوو.
(- الأمرُ في نَفسِهِ): کارەکەی بەدڵدا هات.
(جَلاجِلُ النَّفسِ): مەراقیدڵ/ ئەوەی دەروون گینگڵی پێوە دەدات.
(بَثّتُهُ جلاجِلَ نَفْســي): مەراقو زوو خاوی دەروونم هەموو بۆ هەڵرشت.
٤-(الجُلاجِــل والجُلْجُــل): ١-زۆرســووك ٢-لەشسووك/ لەکارکردندا چابوك.
(ألجُلْجُلَة) (عبرانیة) و (الجُمْجُمَة): کەللەسەر (ناوی ئەو کێوەیە کە حەزرەتی عیسای لەسەر هەڵواسرا.
(المُجَلْجِــل): ١-دەنگــدەرەوە ٢-ژمارەیەکــی زۆر ٣-زۆر ڕێکوپێــك ناســكو بێخــەوشو کەموکووڕیی.
(ألجُلْجُلان) (ن): تۆوی گژنیژ ٢-کونجی.
(جُلْجُلانُ الشَيء): گەوهەری شت.
(«جُلْجُلانُ القَلب»): ناخیدڵ توێیدڵ.
(«خَرَجَ مِن جُلْجُلانِ القَلبِ الى قَمعِ الأُذُن»): لــە ناخــی دڵەوە دەرهــاتو دای بــە پەرەی گوێدا.
جلح: (جَلِــحَ. جَلَحاً): قژی ڕووتایەوە تەنها ئەملاولای سەری تووکی هەبوو.
(أجْلَــح (ج) جُلْــح وأجْــلاح وجُلْحان (م) جَلْحاء): کەســێکە تووك تەنهــا بەملاو لای سەریەوە مابێت/ سەرڕووتاوە.

(جَلِحَ- الثَّورُ): گاکە کۆڵ بوو.
(- تِ القُرى): ئاواییەکان بێشووراو قەڵابوون.
(بَقَرَةٌ جَلْجاء): مانگایەکی کۆڵ/ بێشۆق.
(سطوحٌ جَلْحاء): سەربانێکی بێستارە.
(ألجَلْحَــةُ): شــوێنی کۆتایــی قــژی ســەر لەملاولایەوە.
٢-(جَلِــحَ- تِ الأَرضُ جَلَحــاً): زەویەکــە ڕووتبــوو/ گیاکەی (قرت کراو لە بنە کۆتەرە درا).
(- تِ الشَّجَرَةُ): پەلی درەختەکە خورا.
(جَلَــحَ و جَلَّــحَ- تِ الماشِــيَةُ — الشَــجَرَ): ئاژەڵەکە لەســەر پۆپەی لقەکانی درەختەکە لەوەڕاو توێکڵی دارەکەیشی خوارد.
(أرضٌ جَلْحاء): زەوییەکی بێدارو درەخت.
(جالِحَة (ج) جَوالِح): ڕەشەوشکە ساڵ.
(ألمَجْلَحَة): زۆرخۆر.
(ألمَجالِح والمِجْــلاح والمُجَلَّحَة (ج) مَجاليح): مێحوشــتری بەرگەگری بەشــیر لە زستانداو وشکەساڵیش بێت.
(ألمَجاليح): ســاڵانی قاتو قڕی وشکەساڵ کە ئاژەڵ ماڵیاتی تێدا دەڕوات.
٣-(جَلَّــحَ- على الشَــيءِ): تونــد پەلاماری شتەکەیدا/ خێرا نیشتە سەری.
(- في الأَمرِ): کەللەڕەقانەو کوێرانە نیشــتە سەر کارەکە، بێبیرکردنەوە.
(- السَّــبعُ على القَــومِ): دڕندەکە پەلاماری

خوێشگەلیدا.
(جالَحَ – الشـيءَ): شـتەكەی ئاشـكرا كردو جاریدا.
(-ەُ): دوژمنایەتـی خـۆی بەرووییـداداو ئاشكرایكرد.
(أَلجُلاح): لێشاوی بە خوری رامالٚ.
(أَلمُجالِح) (فا): شێر.
٤-(أَلجَوالِح) (ز): ١-بـەرە پەپوولەی قامیش كە وەك لۆكەوایە ٢-كولووی بەفری باریو.
جلـخ: ١-جَلَـخَ- السَّـيلُ الـوادِي. جَلْخاً): ١-لافاوەكـە دۆلەكـەی پركـرد ٢-لافاوەكـە ئەملاولای دۆلەكەی دری.
أَلجُلاخ: ١-لافاوێكی/ لێشاوێكی گەروە ٢-(دەرە/ دۆڵێكی) قووڵ.
٢-(جَلَخَ – الشـيءَ. جَلْخاً): شـتەكەی درێژ كردو رایخست.
(- بِهِ): دایبەزەویدا.
٣-(جَلَـخَ- ەُ بِالسَّـيفِ): بە شمشـێر پارچە گۆشتێكی لە لەشی كردەوە.
٤-(جَلَـخَ و جَلَّخَ- المُوسـى): گوێزانەكە یان تیغەكەی تیژو تەنك و لووسكرد.
(مَجلَخ) (مي): چەرخی تیغ تیژكردن و مس پێ لووسكردن و بریقە پێهێنانی.
٥-(أَجْلَخَّ- الشَّيخُ): پیرەكە پەككەوتەو لاوازو بێهێز بوو.
جلد: (جَلَدَ- ەُ بِالسِّـياط جَلْـداً): دایە بەر قامچی/ قامچیكاریكرد.
(جَلَّد): بە قامچی لێدان.
(جالَدَ- ەُ بِالسَّـيفِ): شەرەشمشێری لەگەڵدا كرد.
(تَجالَدواواجْتَلَدوابِالسُّيوفِ): شەرەشمشێریان لەگەڵ یەككرد.
(أَلجَلّاد): ١-قامچیوەشـێن ٢-شمشێروەشـێن ٣-ئەشـكەنجەدەر ٤-ئەوەی بریاری لە داردانی تاوانبار پیادە دەكات/ جێبەجێدەكات.
المِجْلَـدُ والمِجْـلاد (ج) مَجالِـد ومَجاليـد): ١-قامچی ٢-پارچە چەرمێك بوو شیوەنكەر بە رووی خویدا دەكێشاو پێی لە خۆی دەدا.
(أَلمِجْلَدَة): قامچی.
(فَرَسٌ مُجَلَّد): ئەسـپێكی چەقاوەسـوو كە سوێی لە قامچی هاتبێتەوەو سڵی لێنەكات.
٢-(جَلِدَ وجُلِدَ وأَجْلَدَ- المَكانُ جَلَداً): جێگەكە سەهۆڵیگرت.
(مَجلود): شوێنی بەستوو.
(أَلجَلَد) (مص): ئاسمان یان گومەزە شینەكەی ئاسمان.
(أَلجَليد (ج) جُلَداء وجِلاد و جِلْد): سەهۆڵ/ ئاوی بەستوو.
(أَلجَلاّدَة): سەهۆڵی/ ئاوی بەستوو.
(أَلجَـلّادَة): سـەهۆڵی كەڵەكەبـووی نـاو شاخ/ سـەهۆڵبەندانی ناو شـاخە بەرزەكان/ بەستەڵەك.

٣-(جَلُـدَ- الرَّجُلُ. جَـلادَةً وجُلُوداً و جَلَداً و مَجلُـوداً): قايـمو بـه ئـارامو بەرگەگر/ خۆراگربوو.

(تَجَلَّدَ): دانی به خۆیـدا گرتو ئارامیگرت/ خۆی به قایمو بەرگەگر پیشانداو نواند.

(اَلجَلْـد (ج) أجـلاد (م) جَلْـدَة): قایـمو خۆراگرو بەهێز.

(اَلجَلَد والجَلادَة): ١- قایمی/ توانای خۆراگریی ٢-زەبــرو زەنگ/ هێزو تین ٣-ئـارام ٤-زەویی رەقەن.

(اَلجَليد (ج) جُلَداء و جِلاد و جِلْد): ١-خاوەن هێزو ئارام/ بەتوانای خۆراگری ٢-هوشــیارو زیرەك.

(اَلجـلاد): ١-دار خورمـا گـەورەو پتەوەکان ٢-مێحوشتری قایمو بەهێزو بەشیرەکان.

٤-(جَلَدَ- بِهِ الأرضَ. جَلْداً): دایبەزەویدا.

(- هُ عَلى الأمرِ): ناچاری ئەو کارەی کرد/ بە زۆر ئەو کارەی پێکرد.

(أجْلَـدَ- هُ إلَيهِ): ئاتاجی ئەویکردو پەنای بۆ ئەو پێبرد.

٥-(جَلَّدَ- الكِتابَ): بەرگی گرتە کتێبەکە.

(- الجَزورَ): ئاژەڵە سەربڕراوەکەی کەوڵکرد.

(اَلجِلْد (ج) أجْلاد و جُلُود): پێستە/ کەوڵ.

اَلجِلد والجِلْدَةُ (ج) جِلَد: پارچە پێستێك یان جۆرە پێستێك.

(«هُم مِـن جِلْدَتِنا»): ئەوان لــە خێڵەکەی ئێمەن/ ئێمە لە پێستێکین/ ئەوان لە پێستی ئێمەن.

(«هُـم أبناءُ جِلْدَتِهِ»): ئـەوان لە خێڵەکەی ئەون.

(اَلجَلَد= الجِلْد): ١-پێستە ٢-پێست.

(اَلجَلاّد): پێستەفرۆش.

عَظْـمٌ. مُجَلَّد: ئێسـقانێك کە پێسـتەکەی بەسەردا وشك بووبێتەوە/ ئێسکی پێستاوی.

(أجلاد و تَجاليدُ الإنسان): لەشو ئەندامانی مرۆڤ.

٦-(إجْتَلَدَ- الإناءَ): قاپەکەی نا بەسەریەوەو هەمووی (هەڵقوراند/ خواردەوە).

الملحق

جلـد: (اَلتَّجليـد): ١-بەسـتنی ئـاو بـە ساردکردنەوەو بە سەهۆڵکردنی ٢-بەرگتێگرتنی شـێتك ٣-جزوبەنـدی کتێـب/ بەرگتێگرتنی کتێب/ چەرم تێگرتنی کتێب.

---

جلذ: ١-(إجْلَوَذَّ. إجْلِوّاذاً): بە پرتاو دەرچووو/ خێرا ڕۆیشت.

(-اللَّيلُ): شەو تێپەڕی.

(بِهِمُ السَّـيْرُ): ڕۆیشتنەکەیان درێژەی کێشاو بە خێراییش بوو.

٢-(إجْلَـوَذَّ- اللَّيــلُ. إجْلِـوّاذا): شــەو درێژ بووەوەو کۆتای نەهات.

(- المَطَرُ): دواکەوتنو نەبارینی باران درێژەی کێشا.

٢-(أَلجُلْـذ (ج) مَناجِـذ (ح) = الخُلـد): مشكەکوێرە.

أَلجُلْذِيُّ والجُـلاذِيّ (ج) جَلاذِيّ: ١-مجێوری پەرسـتگای دیـانو جـوومکان ٢-رەبەنەدیان ٣-وەستای پیشەی دەستی.

أَلجُلْـذِيُّ و الجِلَّـوذ: حوشـتری (چەمـووش/ توندوتیژ) و قەبە.

جلز: جَلَزَ- الرأسَ. جَلْزاً): سەرەکەی پێچا/ بەست.

(- الشَّـيءَ إلى الشيءِ): شـتەکەی خستە پاڵ شتەکەیترو پێکەوە لولییدان.

(جَلَّـزَ- السِـكِّينَ): دەسـکی چەقۆکـەی توندکرد.

(جَلْزُ السِنان): ئەڵقەی دامێنی نووکی نێزە.

(أَلجلاز (ج) جَلائِز): قایشی سەری قامچی.

(أَلمَجلُوز): بەندو چەسپکراو.

(«فُلان مَجلوزٌ العَمَلِ»): فیسار کار کۆکە/ بە کارەکەوە بەسترا.

٢-(جَلَّـزَ- الرَجُـلُ): خێرا بـۆی دەرچوو/ ڕۆیشت.

(«جَلُوزَ بَينَ يَدَى الأَميرِ»): لە بەردەم میردا هێمن دەهاتو دەچوو.

(تَجَلَّـزَ- لِلأَمـرِ): بۆ کارەکە خـۆی ئامادەو گورجکرد.

(أَلجَلْـوَزَة): سـووکەڵەییو چابوکیـی لـە هاتوچۆدا/ چالاکیی.

(أَلجلواز (ج) جلاوِزَة): ١-پیاوی بەردەسـتی مـیر کـە چابوکانە بۆ کار دێـتو دەچێت ٢-پۆلیسی سووکەڵەو چابوك.

٣-(أَلجِلُّوز): کەتەیەکی چالاكو ئازا.

جلـس: ١-(جَلَـسَ. جِلوسـاً و مَجْلَسـاً): دانیشت.

(جالِس (ج) جُلُوس و جُلاَّس): دانیشتوو.

(جَلَّسَ و أَجْلَسَ- هُ): داینیشان.

(مُجالَسَـةَ): پێکـەوە دانیشـتن/ لەگەڵیـدا دانیشت.

(جَليس (ج) جُلَسَـاء و جُلاَّس): هاونشین/ هاودەم.

(إسْـتَجْلَسَ- ه): داوای لێکـرد لەگەڵیـدا داینیشێت.

(أَلجَلْـس): ١-زەویی ڕەقەن ٢-هەڵەت/ هەموو بەرزاییەکی زەوی ٣-گاتاوێرێکی سەختی زل.

(«جَمَلٌ جَلْسٌ»): حوشترێکی قایمو تۆکمەو قەبە.

(«شُـهْدٌ جَلْـسٌ»): هەنگوینێکی خەسـتی توند.

(أَلجِلْـس والجِلِّيس = المُجالِس): هاونشـین/ هاودەم.

(أَلجَلْسَة): دانیشتنێك.

(أَلجِلْسَة): دەستەی دانیشتووان.

(أَلجُلَسَة): زۆر دانیشتە.

أَلمَجلِـس: ١-ڕۆنشـینگە ٢-ئەنجومـەن/ کۆڕ/

کۆمیته.
(اَلمَجْلِسُ النِّيابي): ئەنجومەنی نوێنەران.
(اَلمَجلِسُ القَومِيّ): ئەنجومەنی نەتەوەیی.
(اَلمَجلِسُ البَلَدي): ئەنجومەنی شارەوانیی.
(اَلمَجلِسُ الحَربي): ئەنجەمەنی جەنگ.
(مَجلِسُ الأعيان= مَجلِسُ الشُّيُوخ): ئەنجومەنی پیران.
(مَجلِسُ الشُّورى): ئەنجومەنی راوێژکاران.
(اَلمَجلِسَة): دانیشگە/ نشینگە.
٢-(تَجالَسو- فِي المَحاكِم): لە دانیشتنی دادگادا سکالآیان لە یەکتر کردو خۆپارێزییان لەخۆ کرد.
(اَلجَلْسَة في إصطِلاح المَحاكِم): کاتی دانیشتنێکی دادگاکردن و بریاردان لەسەر ئەنجامی دادگاییەکە.
(اَلمَجْلِس): دادگا/ ئەو شوێنەی بۆ دادگاکردن تەرخانکراوە.
جلط: ١-(جَلَطَ. جَلْطاً): سوێندی درۆیخوارد/ سوێندیخواردو درۆیکرد.
(جالَطَ- هُ): کەڵەکی لێدا.
٢-(جَلَطَ- السَّيفَ): شیرەکەی هەڵکێشا.
(- الجِلْدَ): پێستەکەی داماڵی و کەوڵیکرد.
(- الرَّأسَ): سەری تاشی/ سەری سفر کرد.
(إنْجَلَطَ- البَعيرُ والشَّيءُ): حوشترەکە یان شتەکە رووت بوو.
(إجْتَلَطَ- مافي الإناء): هەرچی لە جاپەکەدا بو هەڵیقوراند/ خواردیەوە.
٣-(جَلَطَ- بِسَلْحِهِ. جَلْطاً): ریقنەکەی/ پیساییەکەی جیفاند/ فرێدا.
٤-(إجتَلَطَ- ه): دەستپێسی لە شتەکەدا کرد/ بە دزییەوە شتەکەیبرد.
٥-(اَلجُلْطَة): کوڵۆماست یان کوڵۆخوێنێکی مەیوی ناو بۆریی خوێن.
٦-(جُلْطَة دَمَوِيَّة): خوێن مەیین و تۆپەڵبوون/ لە بۆریی خوێندا وەستان.
(اَلجَلُوط- مِنَ النِّساءِ): ئافرەتی بێئابڕوو/ رووهەڵماڵراو/ بێحەیا.
ملحق
جلط: (تَجَلَّطَ): ١-بەستی ٢-مەیی.
تَجَلَّطَ الدَّمُ): خوێنەکە مەیی و تۆپەڵ بوو/ تۆپەڵیبەست.

---

جلع: ١-(جَلِعَ. جَلَعاً): لێو کورت بوو دانی دانەدەپۆشی/ یان دەمکراوە بوو.
(جَلِع وأجْلَع (م) جَلِعَة وجَلْعاء): مرۆڤی کورتە لێوو لچ کە دانی هەمیشە بە دەرەوە بێت.
(اَلجَلْعَة): دانریچ/ دانبەدەرەوە.
(«فلان لَطيفُ الجَلَعَة»): فیسار دەمبەخەندەیە.
٢-(جَلَعَ- الرَّجُلُ. ثَوبَهُ. جُلُوعاً): جلەکەی داکەند.
(- تِ المَرأةُ قِناعَها عَن رَأسِها): رووپۆشەکەی

لەسەر خۆی داماڵی.

(إِنْجَلَعَ- الشيءُ): شتەکە کەوتە ڕوو/ دەرکەوت.

(أَلجالِع): ١-دەکەوتوو دیار ٢-ڕوو بەرەڵاو بێپەچە ٣-ئافرەتی بێئابڕوو/ چەرداوەڕوو.

٣-(جَلِعَ- تِ المَرأةُ. جُلُوعاً): ژنەکە بێئابڕو بوو قسەی بێئابڕووانەیکرد.

(جالِع و جالِعَة): ژنی (بێئابڕووی زمانپیس/ بێحەیای چەرداوە ڕوو).

(جالَعَ- القَومُ): خویشگەل بێشەرمانە بەگژ یەکداچوون و قسەی سووک و ناشیرینیان بە یەك وت.

(أَلجالِع والجَلْعَم): بێئابڕو/ ئابرو تکاو/ بێحەیا/ بێشەرم و شکۆ.

٤-(إِجْلَعَبَّ= إِجْلَعَدَّ): کەوت بە زەویداو تەخت بوو.

٥-(إِجْلَعَدَّ): کەوت بە زەویداو تەختبوو.

(أَلْجَلْعَد): زۆر ڕەق و پتەو.

(أَلجُلاعِد (ج) جَلاعِد- مِنَ الإِبِلِ): حوشتری قایم و بەهێز.

جلغ: (جَلَغَ- هُ بِالسَّيفِ جَلْغاً): بە شمشێر. پارچەپارچەیکرد/ لەتیکرد.

جالَغَ: بە شمشێر خەباتیکردو بەرەنگار بوو.

جلف: ١-(جَلَفَ- هُ جَلْفاً): توێکڵەکەی لێکردەوەو دایماڵی.

(«جَلَفَ الطِّينَ عَنِ الحَجَرِ): قوڕەکەی لە بەردەکە کردەوەو پاکیکردەوە.

-(الشيءَ): شتەکەی (لەتکرد/ بڕی).

(- الظِفرَ): نینۆکەکەی لە بن دەرهێنا.

(- هُ بِالسَّيفِ): پارچە گۆشتێکی بە شمشێر لێکردەوە.

(إِجْتَلَفَ- هُ): هەڵیکەند/ لە بن و پێخ دەریهێنا.

(أَلجِلْف (ج) أَجْلاف و جُلُوف): لاشەی بێسەر.

(أَلجِلْف- مِنَ الغَنَم): ١-کەلاکی مەڕی کەوڵکراوی بێسەرو پەل و ناوسك ٢-کووپەی بۆش و بەتاڵ ٣-دەفر/ قاپ ٤-فەراغە کولێرە ٥-گەوج (کە بە کەلاکی بێسەرو پەل و ناوسك چوێنراوە).

(أَلجَلِيف (م) جَلِيفَة (ج) جَلائِف و جُلُف= المَجلوف): کەوڵکراو.

(أَلجُلبُفَة): پێستەی داتاشراو یان هەر شتێکی داتاشراویتر.

(أَلجِلْفَة (ج) جِلَف): لەتە نانێکی وشك و ڕەق.

(أَلجِلْفَةو و الجُلْفَة- مِنَ القَلَم): شوێنی داهێنانی پێنووس تا نووکەکەی یان شوێنی داهێنانی.

(أَلجُلاف): قوڕ.

٢-(جَلَفَ- هُ الدَّهرُ): جَلْفاً: ڕۆژگار نابووت و ڕووتیکرد/ سامان و دارایی لەدەستدا.

(«جُلِفَ فِي مالِهِ جَلْفَةً»): شتێك له سامانو ماڵەكەی لەدەستچوو.

(جَلَّفَ- الوَيْلَ أَحْوالَهُمْ): ساڵی نەهامەتیو لێقەومانی خراپ سامانەكەی لەدەستدان.

(إجْتَلَفَ – هُ الدَّهرُ): ڕۆژگار سامانەكەی بردو لەدەستدا.

(ألجَليف (م) جَليفَة (ج) جَلائِف وجُلُف و جُلْف): ١-وشكە ساڵ ٢-دڵڕەقو بێبەزەیی ٣-زۆر وشك.

(«أصابَتْهُم جَليفَةَ عَظيمة»): تووشی وشكە ساڵێكی سەخت بوون هەرچییان هەبوو بردی.

(اَلْمُجَلَّف): ١-لالێخوراو ٢-ئەوەی شتێكی لێمابێتەوە.

(ألجَلائِف): لێشا/ لافاو.

٣-(جَلِفَ: جَلَفاً و جَلافَةً): ڕەقیو وشكیی نواند/ ڕەفتار ناشیرین بوو/ نەزاندو بوو.

(ألجِلْف (ج) أجْلاف و جُلُوف): ١-ڕەقی نەزاندوو/ وشكی دڵڕەق ٢-ستەمكار.

(ألجَليف (م) جَليفَة (ج) جَلائِف و جُلْف): ١-زۆردار ٢-نەزاندووی وشكی ڕەق/ توند سرۆشت.

٤-(تَجَلَّفَ): وشكبوومومو لاوازو بێهێز بوو.

٥-(جَلْفَطَ و جَلْفَطَ- السَفينَةَ): پاپۆڕەكەی كونبڕ كرد (بە پەرۆو شتیتر درزەكانی گرتو قیروزفتی تێهەڵسوو) - قَلْفَطَ (عامية)

= جَلْفَطَ. (ألجِلْفاط و الجِلْفاظ): ئەو كەسەی كە كونبڕی پاپۆڕەكە دەكاتو قیری تێهەڵدەسوێت.

جلق: (جَلَقَ- الرَّأسَ. جَلَقَاً): سەرەكەی تاشی.

(- القَومَ بِالمَنجَنيقِ): خوێشكەلی دایە بەر مەنجەنیق.

(تَجَلَّقَ): وا پێكەنیو دەمیكردەوە تا خرێكانی دواویش دەركەوت.

(ألجُلاقَة): پلە گۆشت.

«رَجُلٌ جُلاقَة»: پیاوێكی لەشنابووت/ لاواز.

(ألجُوالِق والجوالِق (ج) جَوَالِق و جَوالِيق) (فارسية): جەواڵ كە لە خوری یا موو دەبێت.

(جِلَّق و جِلَّق): شام یان شوێنە ئاودارو پڕ درەختەكەی شام.

جلك: (ألجَلْكي والجَلَكي) (ح) (أعجَمِيَّة): جۆرە ماسییەكی كرکراگەییە وەك ماسی جوری وایە. بێخوێنە ئێسكو گۆشتەكەی پێكەوە دەخورێت.

جلم: ١-(جَلَمَ واجْتَلَمَ- هُ جَلْماً): بڕی (- الصوفَ): خوریەكەی بڕییەوە.

(ألجَلَم والجَلَمان): برنگ كە خوریی مەڕی پێدەبڕرێتەوە.

(جَلَمان): بۆ تاكو جووت بەكاردێت. دەڵێیت (شَرَيتُ الجَلَمَين) أو جَلَمانَ (ألجَلَم): ١-مانگی

یەکشەوە/ داسە مانگ ٢-(ح) تورمتە/ هەڵەکە باڵندەیەکــی گۆشــتخۆرە لە واشــە دەچێتو کەمەکێك لەو بچووکترە دەنوکی وەك قەوچی وایە پێشــی دەڵێن: (أَلبُؤْبُــؤْ وأبي رياح): لە بەر سووکەڵەیی‌و خێرایی وایپێدەڵێن.

(أَلجَلَم (ج) جِلام): ١-سابرێن‌و نێرەی ئاسك‌و بەرانەکێوی ٢-کارژۆلە.

(أَلجُلامَة): خوریی برراوە.

(أَلجَیْلَم): مانگی پر/ مانگی چواردە.

٢-(جَلَمَ واجْتَلَمَ – الجَزُورَ. جَلْماً): گۆشــتی بە ئێسقانی ئاژەڵە سەربرراوەکەوە نەهێشتو دایماڵی/ ئێسقانەکەی رووتکرد.

(أَلجَلْمَةُ والجُلْمَةُ والجَلَمَة): هەموو شــتەکە/ سەراپای شتەکە.

(«أَخَذتُ الشيءَ بِجَبلَمَتِهِ»): شتەکەم (تێکرا/ سەراپا/ هەموو/ گشت) برد.

(«هذه جَلْمَةُ الجَزورِ»): ئەمە هەموو گۆشتی سەربرراوەکەیە.

٢-(أَلجَلْمَــدُ (ج) جَلامِــد والجُلْمــود (ج) جَلامِيد): ١-تاوێری گەورەو سەخت.

(«رَجلٌ جَلْمَد»): پیاوی توندو قایم/ پتەو/ رەق.

(«أَرضٌ جَلْمَدَة»): زەوییەکی بەردەڵانی.

(«رَشَحَ أَو بَضَّ جَلْمَدُهُ»): بە چروك دەڵێن: شتێکی لەدەســت بووەوە ٢-حوشــتر گەلێکی گەورە/ رەوە حوشترێکی گەورە.

٤-(جَلْمَــقَ – القَوسَ): شــتی گرتە شــوێن دەستی داری کەوانەکە.

(أَلجلماق): شتی/ شوێندەستی داری کەوان.

جلن ١-(أَلجُلَّنار (فارسية): گوڵنار/ گوڵەمناری فارسی.

٢-(جَلَنْجَبين) (فارســية): مرەبــای گوڵ‌و هەنگوین.

جلــه: (جَلَــهَ- الشــيءَ. جَلْهاً): شــتەکەی دەرخستو لایخست/ لایدا.

(- المَرْءَ): گێرایە دواوەو بەریگرت.

(- العَمامَةَ): مێزەرەکەی/ سەروبەســتەکەی لەسەر ناوچەوانی لادا.

(جَلِهَ جَلَهــاً): قژەکەی لەســەر ناوچەوانی لاچوو و ناوچەوامانی دەرکەوت.

(أَجْلَه): ناوچەواندەرکەوتوو.

(أَلجَلْهَةُ (ج) جِلاه- مِنَ الوادي): ١-(لێواری/ قەراغــی/ ناوچەوانــی) دۆڵ ٢-ئەو لایەی کە لەبەر دەمتدایە.

(بَیْتٌ مَجلُوه): خانوویەکی بەرەڵای بێدیواری حەوشەو بێدەرگا.

٣-(جَلاهِق) (فارســية): ١-تەنێکی بچووکە/ قــورە یــان قورقوشــمە خــرە دەگیرێتــە شــتو بۆی هەڵدەدرێت. ٢-ئــەو کەوانەیەی پێیەهەڵدەدرێت.

جلا: ١-(جَلا- عَن بَلَدِهِ ومِنهُ): لە شارەکەی یــان وڵاتەکــەی باریکــرد/ دەرچــوو/ بــۆ

شوێنێکیتر چوو.

(جَلاء): لەو شوێنە دەرچوونو بارکردن.

(جَـلا- الرَجُلَ عَن بَلَدِهِ): لە شـارەکەی یان وڵاتەکەی دەریکرد دەریپەراند.

(أَجْلَـی- عَـن بَلَدِهِ): لە شـارەکەی دەرچوو باریکرد.

(- هُ عَن بَلَدِهِ): لە وڵاتەکەی دەریپەراند.

(- الرَجُلُ مَنزِلَهُ): پیاوەکە لە ترساماڵەکەی خۆی بەجێهێشتو تەرە بوو.

(إِجْلَـولی – الرَجُـلُ إِجْليـلاءً): پیاوەکـە شارەوشار، یان وڵاتەو وڵاتیکرد.

(اَلجالِيَة ٠ج) جَوالِ): مێی وشەی (الجالي)یەـ ئەو ئاوارەو نامۆیانەن کە نیشـتمانی خۆیان بەجێهێشـتووە وڵاتێکـی تریان کـردووە بە نیشتمان بۆ خۆیان.

(أَهـلُ الذِمَّة): ئەوانەن کە حەزرەتی عومەر دەریپەرانـدنو لـە نیوەدورگـەی عـەرەب دووریخسـتنەوە، بەوە ئەو ناوەیان بەسەردا برا پاشـان بـە هەمـوو یەکێـك دەوترا کە سەرانەی بدایە.

٢-(جَـلا= الأمــرَ جَلْواً و جَـلاءً): کارەکەی دەرخستو روونکردەوە/ ئاشکرایکرد.

(- عَنهُ الهَمَّ): مـەراقو خەفەتەکەی لە دڵ دەرکردو لایبرد.

(- السَّيفَ): شمشێرەکەی سافو لووسکرد.

(جَلا. جَلاءً): دەرکەوتو روونبووەوە.

(جَلّی فُلاناً و عَن فُلانٍ- الأَمرَ): کارەکەی لە فیسار ئاشکرا کردو بۆی دەرخست.

(- عَــن ضَميرِهِ): ئەوەی لە ویـژدانو دڵیدا بوو دەریبڕی.

(جالي- فُلانــاً بِالأَمرِ): کارەکەی لە فیسـار ئاشکرا کرد.

(أَجْلَــی- القَومُ عَنِ القَتيــلِ): لە کوژراوەکە دوورکەوتنەوەو بڵاوەیان لێکرد.

(أَجلــی اللهُ الهَمُــومَ عَنــهُ): خـودا پەژارەو مەراقی لە دڵ دەرکرد.

(تَجَلّی – الشـيءُ تَجَلِّياً): شتەکە دەرکەوتو ئاشکراو رونبووەوە.

(تَجَلّــي): ئاشــکرابوونو دەرکەوتــن/ روونبوونەوە.

(تَجالی القَومُ): لە یەکتری ئاشکرابوون.

(إِنْجَلی): دەرکەوتو ئاشکرا بوو.

(«إِنْجَلی الهَمُّ عَن قَبلي»): مەراقەکەم لە دڵ دەرچوو.

(إجتَلــی – العَمامــةً): مێزەرەکەی لەســەر ناوچەوانی لابرد.

إِسْــتَجْلی- الشَــيءَ): بۆ دەرکەوتنی شتەکەو زانینیو دەرخستنی پشکنیو گەڕا.

(اَلجلا): ئاشکرا/ روونو دیار.

(«إبِــنُ جَلا»): ١ـکاری ئاشــکراو روون/ دیار ٢ـبەیان ٣ـمانگ.

(اَلجَلاً= الأَمرُ الجَلِيّ) (مص): کاری ئاشــکرا/

ڕوون/ دیار.

(أَلجَلــيّ (م) الجَلِيَّة): ١-دیار/ ڕوون ٢-لووس‌و سافکراو.

(جَلِيَّـــةُ الأمر): ١-ڕوونییو ڕاســتیی کارەکە دەرکەوتـــووە: ئەوەی لە کارەکە دەرکەوتووەو ڕوونبۆتەوە ٢-هەواڵی ڕاست‌و تەواو.

(الأَجْلی (م) جَلواء): ڕووجوان‌و شێوە شیرین- کەســێکە قژی لەســەر ناوچەوانــی نەبێت‌و ناوچەوانی دەرکەوتبێت.

(«إبنُ أَجْلی»): بەیان.

٣-(جَلا- النَّحلَ. جَلواً و جَلاءً): هەنگەکەی فانگدا تا هەنگوینەکەی دەربهێنێت.

(إِجْتَلــی- النَّحــلَ): هەنگەکــەی فانگــداو دەرپەڕاندە دەرەوە بۆ هەنگوینەکەی.

٤-(جَلا- البَصَــرَ بِالكُحلِ جَلْــواً و جَلاءً): چاوی بە کل ڕشت‌و نواندی.

(أَلجَلا): کل. چونکە بە کل چاودەنوێنرێت.

٥-(جَلا- الشَّيءَ) جَلاءً: شتەکە بەرزبووەوە.

الجلاء: کل.

(تَجَلّــی- المَــكانَ تَجَلّياً): ســەرکەوتە ســەر شوێنەکە.

(- الشَيءَ): لە سەرەوە بە شتەکەیدا ڕوانی.

٦-(جَلا و جِلا و جُلا واجتَلی- العَروسَ علی زَوجِها. جَلْوَةً و جَلاءً): بووکەکە ئارایشتکراو ڕازێنرایەوەو دەستی بە دەستی زاوا درا.

(جَلا و جَلّی- الزَوجُ عَروسَــهُ هَدِيَّةً): زاوا شەوی پەردەو زاوایەتی خەڵاتی چاوڕۆشنیی بووکێیکرد.

(إِستَجلَتِ- العَروسُ): بووکیی ڕازاوەو جوان خۆی پیشانی زاوادا.

(أَلجِلوَة): خەڵاتی شــەوی پــەردە کە زاوا بە بووکێیدەدات.

٧-(جَلِــيَ. جَلــىً): قــژی ســەر ناوچەوانی لاچوو/ ناوچەوانی دەرکەوت.

أَجْلی (م) جَلْواء: ناوچەوان دەرکەوتوو.

(جَبهَةٌ جَلواء): ناوچەوانی ڕووت‌و پان.

(أَلجَلا): سەرەتای قژ ڕووتانەوە.

(أَلمَجْلی (ج) مَجالِ): پێشی سەر.

(الأَجْلــی (م) جَلْواء): ڕووجــوان ٢-لاجانگ داماڵراو.

(أَجــلاك = مِن أَجلِكَ فَعَلْتُــهُ مِن أَجْلاكَ): لەبەر خاتری تۆ ئەوەمکرد.

٨-(جَلّی= بِنَظَرِه): چاوی گێڕا.

(إِجْتَلی – الشَيءَ): چاوی بڕییە شتەکە.

(عَينٌ جَلِيَّة): چاوی تیژ.

(أَلمَجلوُّ): تەماشاکراو/ لەبەرچاوگیراو.

٩-(الجَلاتــين: جلاتــين (ك) (لاتينيــة): مادەیەکی لینجە لە پێســت‌و ئێســک‌و شــانە ڕیشاڵییەکانی گیاندار دەردەهێنرێت.

جلی: ١-جَلی- السَّــيفَ. جَلْياً: شمشێرەکەی ساف‌و لووسکرد.

جَلّی – الأَمرَ: کارەکەی ڕوونکردەوەو دەرخست.

الجِلي: كلاورۆژنه/ كونێكه له سەربانەوەیە بۆ رووناكیدان.

أَلجِليان: دەرخستنو روونكردنەوە.

أَلجِلِيَّان: كۆچی بە دڵی یۆحەنا.

٢-(جَلَّى- الفَرَسُ): ئەسپەكە پێشبڕكێكەی بردەوە/ پێشكەوتنە لە پێشبڕكێدا.

المَجَلِّي: براوەی پێشبڕكێ.

الملحق

جلو: (أَلتَّجَلِّي): دەركەوتن.

(- عِندَ المَسيحيين): ئەو رەوشە زۆر جوانەیە كە حەزرەتی عیسا لە كێوی تووردا بۆ سێ قوتابییەكەی دەركەوتو شەوقیدایەوە.

(عيد التَّجَلِّي): جەژنی دەركەوتنی حەزرەتی عیسا.

(أَلتَّجَلِّـي- في التَّصَـوف): لە سۆفیگەریدا ئەوەیە كە سۆفی نهێنیی غەیبی لە دڵدا بۆ دەردەكەوێت و بە دڵ دەرك بەو نهێنییە دەكات.

---

جم: (جَمَّ- الشَّـيءُ. جَمّاً وجُموماً): شتەكە زۆر بوو/ فرەبوو.

(- العَظمُ جُمُوما): ئێسكەكە گۆشتی زۆر گرت و زۆری بەسەرەوە بوو.

(جَمَّـمَ و تَجَمَّمَ- النَبتُ): رووەكەكە/ گیاكە زۆر بوو زەوییەكەی داپۆشی.

(جَمِيـم (ج) أَجِمّـاء): گیای زۆرو چڕی پەلهاوێژ.

(إِسْـتَجَمَّ- تِ الأَرضُ): گیای زەوییەكە دەرهات و رووا.

(أَلجَـمُّ (مـص): هەموو شتێكی زۆرو كەڵەكەبوو.

(جاؤوا جَمّاً غَفيراً و جَمَّ الغَفيرِ و جَمَّ الغَفيرَةِ والجَمَّ الغَفيرِ): هەموو هاتن بە كۆمەڵ، بە چاك و خراپیانەوە كەس دوانەكەوت، زۆریش بوون.

(أَلجَمَمْ): زۆرو كەڵەكەبووی هەموو شتێك/ هەموو شتێكی زۆرو كۆمەڵ.

(أَلجُمَّةُ (ج) جُمَم): تۆپەڵەی قژی سەر.

(أَلجُمَّـةُ والجَمَّةُ): بەشی هەرە زۆری یان زۆربەی ئەو شتەیان زۆری ئەو شتە.

(«جاؤُوا في جَمَّةٍ. كَثيرَةٍ»: بە كۆمەڵێكی زۆر گەورە هاتن.

(أَلجَمّاء): ١-پڕوچڕ ٢-لێوانلێو.

(«إِمْرَأَةٌ جَمّاءُ العِطام»): ئافرەتێكی قەڵەوی خرپن.

(«جـاؤوا جَمـاءَ الغَفـيرِ و جَمّـاءَ الغَفيرَةِ والجَمّـاءَ الغَفـيرَةَ و جَمّاءَ غَفـيرَةً و بِجَمّاءِ الغَفيرِ): بە كۆمەڵ هەموو هاتن.

(أَلجَميـم): ١-رووەكێكی زۆری پڕو چڕ ٢-هەموو شتێكی زۆری كۆ ٣-رووەكی نیمچە درێژەوەبوو.

(أَلجُمّانِـيّ والمُجَنَّم): خاوەنی قژێكی زۆری چڕوپڕ.

٢-(جَـمَّ- المـاءُ جُمُومـاً): ئاوێکـی زۆر کۆبووەوە.
(- تِ البئـرُ): ئاوێکـی زۆر لـە چاڵاوەکەدا کۆبووەوە/ بیرەکە ئاوی زۆر بوو.
(جَمُوم): چاڵاوێکی/ بیرێکی فرە ئاو.
(جَـمَّ- المـاءَ. جَمّـاً و جماماً و جُماماً و جَماماً): لە ئاوەکە گەڕا کۆببێتەوە.
(أَجَمَّ- الماءَ): لە ئاوەکە گەڕا کۆببێتەوە.
(إسْتَجَمَّ- الماءُ): ئاوێکی زۆر کۆبووەوە.
(- البئْرَ): وازی لە بیرەکە هێنا پڕببێت.
(أَلجَمُّ (ج) جِمام و جُمُوم- مِنَ الماءِ): بەشی هەرە زۆری ئاوەکە.
(إستَجَمَّ –الماءُ): ئاوەکە زۆر کۆبووەوە.
(أَلجَمَّة (ج) جِمام): چاڵاوی ئاو زۆر- نێرینەی ئاوی چاڵاوەکە/ بیرکە.
(«إسْـتَقِ مِن جَمَّةِ البئرِ): لە نێرینەی ئاوی چاڵاوەکەوە هەڵییەنجێنە.
(أَلمَجَمّ والجَمَمُ): سنگ.
هُوَ رَحْبُ الجَم: سنگفراوانە.
٣-(جَمَّ- الكَيـلَ جَمّاً و جِمامـاً وجُماماً و جَماماً): لێوانلێوی پێوانەکەی پێوا.
(- المِكيـالَ): پێوەرەکـەی لێوانلێـو کرد تا لێبڕژا.
جَمَّمَ- المِكيالَ: پێوەرەکەی لێوانلێو پێوا.
(أَلجَمـام والجِمـام والجُمـام والجَمَـم): قەڵاپەچنی پێوەرەکە.

(«جمـامُ القَـدَحِ مـاءً»): ئـاوی لێوانلێوی پەرداخەکە/ لێوانرێژی.
(أَلجَمّـام و الجَمّـان): پڕپـڕ/ لێوانرێـژی پێوەرەکە.
٤-(جَـمَّ- الفَرَسُ. جَمّاً و جَماماً): پشـووی ئەسپەکە دراو سواری نەبوون.
(- القَـومُ جُمُوماً): خوێشـگەل حەوانەوەو پشوویاندا.
(أَجَـمَّ- الفَـرَسَ): پشـووی چارەوێکەیـدا حەواندیەوەو سواری نەبوو.
(-الفُؤادَ): سرەوتی بە دڵیداو حەواندیەوە.
(«أَجْمِـمْ نَفسَـكَ يوماً أَو يَومَين»): یەك دوو ڕۆژ پشـوو بە خۆت بـدەو بحەوێرەوەو مەجووڵێرەوە.
(أَجَمَّ و أُجِمَّ- الفرسُ): پشـوو بە چارەوێکە درا بحەوێتەوە/ حەوێنرایەوە.
(إسْتَجَمَّ): پشوویداو حەوایەوە/ حەسایەوە.
(إسْتِجْمام): پشوودانو حەوانەوە/ حەسانەوە.
(«إني لأَسـتَجِمَ قَلى بِشَـيءٍ مِنَ اللَّهوِ): بە کەمێك ڕابواردنو یاریو گەمە ستارە بە دڵم دەدەمو دەیحەوێنمەوە/ دەیحەسێنمەوە.
٥-(جَـمَّ- الفِراقُ. جُمومـاً): لێکپچڕانو لە یەك دوورکەوتنەوە نزیکەو کاتی هات.
(أَجَمَّ- الفِراقُ): کاتی لە یەك دوورکەوتنەوە هات.
(- الأَمـرُ): کارەکـە کاتیەتـی یـان نزیـك

بۆتەوە.

٦-(جَمَّ- الكَبْـشُ. جَمَمـاً): بەرانەكە كۆڵ بوو/ بێقۆچ بوو.

(ألأَجَمّ (م) جَمّاء (ج) جُم): ١-بێشاخ/ بێقۆچ ٢-جەنگاوەری بێنێزە.

(ألحُصنُ الأَجَم): قەڵای بێتارمە.

(أرضٌ جَمَّاء): زەویی (لووس/ خز).

(شاةٌ جَمّاء): مەری كۆڵ/ بێقۆچ.

٧-(جَمْجَمَ وتَجَمْجَـمَ- الكَلامَ جَمْجَمَةً): بە منجەمنج قسەیكردو باش دەرینەبڕی.

(«تَجَمْجَـمَ عَـنَ الأَمرِ»): بـەلای كارەكەدا نەچوو.

(«جَمْجَمَ شـيئاً في صَدرِهِ»): شتێكی لە دڵدا شاردەوەو دەرینەخست/ دەرینەبڕی.

(ألجُمْجُمَة (ج) جَماجِم) (ع ا): ١-كاسەی سەر كە هەشـت پارچەیەو یەكیگرتووەو مێشكی تێدایە.

ألجُمْجُمَــةُ): ١-پیاڵەی دارین ٢-چاڵاوێك كە لە زەوییەكی شۆرەكاتدا هەڵبكەنرێت.

جمیء- (جَمِــيءَ- عَلَيه. جَمَــأً): لێیتووڕە بوو.

(تَجَمَّــأَ في ثيابِـهِ): جلەكـەی لـە خۆیەوە ئاڵاند.

(- القَومُ): خوێشگەل كۆبوونەوە.

(ألجَمأُ والجَماءُ): كەس.

جمـع: (جَمَـعَ- الفَـرَسُ: جَمْحـاً و جِماحـاً و جُمُوحـاً): ١-چارەوێكـە سـەری هەڵگرت/ سـوارەكەی هەڵگـرتو یاخی بوو ٢-سەركێشییكرد.

(جامِــح (ج) جَوامِح): ١-سـەركێش ٢-كۆتی هـەوەس/ چمووش/ لە جلەو بەربوو ٣-تۆراو (بۆ نێرو مێ)یە.

(- جَمَـحَ – تِ المَـرْأَةُ زَوجَهـا): ژنەكـە لە مێردەكەی تۆراو یاخیبوو چووە ماڵی باوكی.

(جَمَـحَ- الرَجُـلُ): دوای ئارەزوو هەوەسـی خۆی كـەوتو بە كـەس نەگێڕرایـەوە/ لە هەواو هەوەسـەكەی نەكەوت (لە سەركێشی چارەوێوە وەرگیراوە).

(«جَمَحَـتِ المَفـازَةُ بالقَـومِ»): بیابانەكـە ونیكردنو فەوتاندنی.

(«جَمَـعَ بِفُلان مُـرادُهُ»): نـاكام بوو/ بە ئامانج نەگەیشت.

(ألجُمــاح (ج) جَمامِــح و جَمامِيــح): ١-هەڵاتـووە/ بەزیـوە/ تۆقیوەكانـی جەنگ ٢-ڕمێكی بێنووك.

جمخ: (جَمَــخَ. جَمْخــاً): لووتبەرزییكرد/ فیزینوواند.

(جامِخ (ج) جُمَّــخ و جَمُوخ و جمِيِّخ): بە فیزو دەعیە/ لووتبەرز.

(جامَخَ- هُ): خۆی بەسـەردا بادا/ شـانازیی بەسـەردا كرد/ یان شـانازییان بەسەریەكدا كرد.

جمد: (جَمَدَ- الماءُ. جَمْداً و جُمُوداً): ئاوەكە بەستیو بوو بە سەهۆڵ.
(- الدَّمُ): خوێنەكە مەیی/ وشكبوو.
(- جَمَّـدَ- الأَموالَ المَنقولَـةَ (ت) تَجميداً): دەستی بەسەر ماڵە وەگوێزەكەدا گرتو ناوی ماڵی نەگوێزراوەی لێنا.
(جَمَّدَ وأَجْمَـدَ- هُ): مەیاندی بەسـتیو بە سەهۆڵیكرد.
(أَلجَمَد والجَمْد): ئاوی بەسـتوو/ سـەهۆڵ/ بەفر.
(أَلجَمَـدَ والجُمْـد والجُمُد): زەویـی بەرزو سەخت.
(أَلجَماد (ج) أَلجُمُد): بووم/ زەوی.
(الجَماد (ج) جَمادات والجامِد (ج) جَوامِد): هەموو شـتێكی بێگیان كە ژیانی تێدا نەبێت وەك بەرد.
(أَلفِعْلُ الجامِد): فرمانێكە كە پلەی كردەكانی نەبێت وەك (لَیسَ وعَسى).
٢-(جَمَدَ- تْ عَنُهُ): فرمێسكی وشكیكرد یان وەستا.
(جَمـادُ و جَمـودُ و جَمِیـدُ العَـینِ): چاو بێفرمێسك فرمێسك وشكبوو.
(جَمُـود): چـاوی بێفرمێسـك/ فرمێسـك وشكبوو.
(أَلجَماد (ج) جُمُد): تەرایی تێدا نەماو.
(«أَلنَّاقَةُ الجَماد»): مێحوشتری سستی بێشیر.
(سَنَةٌ جَماد): ساڵی بێباران/ وشكە ساڵ.
(أَرضٌ جَمـاد): زەوییەكـی برنـگو بارانی لێنەبارێت.
٣-(جَمَـدَ- ت یَـدُهُ: جُمـوداً و جَمْـداً): پیسكەییكرد.
(أَجْمَدَ): رژدو بێفەر بوو/ بێخێر بوو.
(أَلجَمـاد (ج) جُمُـد): دەستوشـك/ رژد/ چرووك.
(«فلانٌ جَمادُ الكَفِّ»): فیسـار دەستوشـكە/ هیچی لەدەست هەڵناوەرێت/ رژدە.
(«جَمادٍ لَه»): دۆعایەكە لە چرووك دەكرێت. واتا هیچی نەبێتو داماو بێت.
٤-(جَمَدَ- حَقُّهُ على فُلان. جُمُوداً و جَمْداً): مافەكەی لەسـەر فیسار سـاغبووەو پێویست بوو كە بیدات.
(أَجْمَدَ- حَقَّهُ عَلَیهِ): مافەكەی خۆی لەسەر ئەو پێویستكرد كە بیداتەوە.
٥-(أَجمَدَ): چووە مانگی جمادەوە.
(جُمـادِي (ج) جُمادَیـات الأول والآخـر: جەمـادی یەكـەمو دووەم مانگـی پێنجەمو شەشـەمی مانگەكانـی عەرەبـی. (بۆیـە وا ناونراون چونكە ئاوتیایدا دەیبەستێت).
٦-(جامَـدَ- هُ. مُجامَـدَةً): لـە پاڵیدا بوو/ هاوسایەی بوو.
(«هُوَ مُجامِـدي»): ئەو دراوسـێمە ماڵ بە ماڵەوە.

٦-(حَرَدَ. حُرُوداً): له خوێشـان تەریکبوو/ گۆشەگیر بوو.

(حَـرْدٌ و حَـرِدٌ (ج) حِـراد و حَرِيد (ج) حُرَداء): گۆشەگیر/ تەریك.

(حَرَّدَ- الشَّعرُ): تووکەکە تاکەتاکە دەرهات.

(أَحْرَدَ- هُ): تاکیکردەوە.

(إِنْحَرَدَ): تاکبووەوە.

٧-(حَرَّدَ- الشـيءَ): شـتەکەی خوارکردەوە/ لاریکرد/ کەچیکرد/ گێڕیکرد.

٨-(حَرَّدَ- الحَبْلَ): گوریسـەکەی/ پەتەکەی باداو لوولیخوارد.

٩-(حَـرَّدَ): خۆیکوتایـە نـاو زنجەکـەوە/ کۆختەکەوە.

(أَلمُحَرَّد) (ا ع): زنجی پاسەوان.

١٠-(حارَدَ- تِ الناقَةُ): شـیری مێحوشترەکە کزیکرد.

(حَرود ومُحارِد): مێحوشتری شیر کز بوو.

(- تِ السَّنَةُ): ساڵەکەی کەمباران بوو.

(- الرَّجُلُ): پیاوەکە بەخشندە بوو دەستی لە بەخشین گرتەوە.

(أَلحَرِيـد): هەموو کەمبوونێکی لە شـتێکی زۆر.

(ألأحْرَد (ج) حُـرْد): چرووکیی بەد/ ڕژدی ناجسن.

١١-(أَحْـرَدَ- في المَشـي): لـە ڕۆیشـتنەکەدا پەلەیکرد/ پێیهەڵگرت/ گورجییکرد.

(إِنْحَرَدَ- النَّجْمُ): ئەستێرەکە کشاو داکەوت.

١٢-(تَحَـرَّدَ- الأَدِيـمُ): پێسـتەکە ڕووتبوو/ تووکەکەی هەموو هەڵوەری.

١٣-(أَلحَرَد (مص): شـلبوونی دەماری دەستی حوشتر/ شەلکە تووشبوون.

(ألأَحْرَد (ج) حُرْد): ١-حوشـتری تووشبووی شەلکە ٢-کەسـێکی پێقورس بە هۆی گرانیی زرێکەیەوە.

(أَلحَرِيد): ١-دوور ٢-ماسیی سوورەوەکراو.

حـرذ: (أَلحِـرْذَون (ج) حَرانِيـن) (ح): مارمێلکە (جۆرە خشۆکێکە).

حـرز: ١-(حَـرَزَ- المـالَ حَـرْزاً): ١-دارایی کۆکـردەوە سـامانەکەی پاراسـتو هەڵگرت ٢-دارایـی (کۆکـردەوە/ نایـە سـەریەكو هەڵیگرت).

(حَرَزَ- الشَـيءَ): توند چنگی بە شـتەکەدا گرتو پاراستیو هەڵیگرت.

(أَحْرَزَ- الشَـيءَ): ١-شـتەکەی دەسـتکەوت/ دەسـتگیر بـوو ٢-پاراسـتیو عەماریکـردو نیگایدا.

(أَلحِـرَز (ج) أَحـراز): ١-هەرچی دەسـتگیر بووبێت ٢-کۆکرابێتەوەو نیگا درابێت.

(أَلحِـرْز): ١-تێـدا پارێـزراو. وەك قوتـوو و سنووق/ تێگلدانەوە بۆ نەفەوتان ٢-بەش.

("أَخَذَ حِرزَهُ"): بەشی خۆی برد.

(أَلحَرِيـز): ١-دەسـتگیر بـوو/ پەیداکـراو

٢-قایمكراو/ توندهەڵگیراو.

(أَلْمَحْرَز والمُحْوَز): دەستگیركراو/ پەیداكراو/ دەستگیر بوو.

(«لاحَريزَ من بَيعٍ»): هیچ ڕێگرێك نییە بۆ فرۆشتنی ئەگەر نرخی باش بدرێت.

(أَلحَريـزَةُ (ج) حَرائِـز- مِنَ الإبِـلِ): ئەو حوشـترەی كـە لەبـەر باشـیو ناوێزەیـی نافرۆشرێت.

٢-(حَرِزَ. حَرَزاً): خۆی لە گوناحو ڕێی خراپ پاراستو خواپەرستیی تەواویكرد.

(حَـرُزَ- المَكانُ. حَرَزاً و حَرازَةً): شـوێنەكە قایمو پارێزراو بوو/ ڕێی تێچوونی نەبوو.

(حَرَّزَ وأَحْرَزَ- المَكانُ الرَجُلَ): شوێنەكە بوو بە پەناگای قایمی پیاوەكەو پاراستی.

(تَحَـرَّزَ واحتَـرَزَ- مِنـهُ): ١-خـۆی لـێ بەدووورگرتو پاراست ٢-خۆی لێ پەنادا.

(إستَحْرَزَ): لە شوێنێكی قایمدا بوو.

(أَلحِرز): شـوێنی قایـم/ پارێزگـە. (قەڵاو سەنگەر).

(«حِرزٌ حَريزٌ وحارِزٌ»): قەڵایەكی سەختی قایم كە ڕێی تێچوونی نەبێت.

(أَلحِـرز): نوشـتەو دۆعـای پاراسـتن لـە نەخۆشیو هەموو ومیەك، وەك دەڵێن.

٣-(أَلحَرَز (ج) أَحـراز): گوێزۆكێكە منداڵان یاری پێدەكەن.

حرس: (حَـرَسَ- هُ. حَرَسـاً): پاسـیكرد/ ئێشكیگرت/ پاراستی.

(حـارِس (ج) حُـرّاس و حَرَسَـة و حَرَسْ وأَحراس): پاسەوان/ پاساوڵ.

(أَحْرَسَ- بالمَكانِ): لە شـوێنەكەدا پاسیكرد/ پاساوڵ بوو.

(تَحَرَّسَ واحْتَرَسَ- مِنهُ): خۆی لێپاراستو لادا.

(أَلحَرَس): پاسەوانەكان/ پاساوڵەكان.

(حَـرَسُ المَلِكِ): ١-پشـتیوانو پیاوانی شـاو ئەوانەی سەر بە شان ٢-پاسەوانانی شا.

(أَلحَرَسِيّ): یەك پاسەوانی شا.

(أَلحَراسَـةُ): پاسـەوانیی/ پاسـاوڵیی/ پارێزگاریی/ پاراستن.

(أَلحَريسَة (ح) حَرائِس): دیوار كە بۆ شوێنی ئاژەڵ دەكرێتو تیایدا دەپارێزرێت.

٢-(حَرَسَ- الشيءَ): شتەكەی دزی.

(أَلحَريسَة (ج) حَرائِس): ١-مەڕی شەو دزراو ٢-بەشەو مەڕ دزین.

٣-(حَرِسَ. حَرَسـاً): زۆر ژیـا/ تەمەندرێژ بوو.

(أَلحَرْس (ج) أَحْراس): ڕۆژگار.

(«مَضى عَلَيه حَرْسٌ»): ڕۆژگارێكی بەسەردا تێپەری.

(أَلأَحرَس): زۆر كۆن كە ڕۆژگارێكی بەسەردا تێپەریبێت.

٤-(حارِسُ السَماءِ وحارِسُ السِماكِ): (فلك):

دوو تیرئەندازە. هەسارەن.
(ألحَرسانِ): شەوو رۆژ.
حرش: ١-(حَرَشَ- الضَبَّ حَرْشاً و تَحْراشاً):
قۆرییەکەی راوکرد.
(تَحَــرَّشَ- الضَــبَ وبِالضَــبِّ): قۆرییەکەی
راوکرد.
(إِحْتَرَشَ- الضَبَّ): گرتی/ راویکرد.
(- لِعیالِهِ): رەنجی بۆ خێزانەکەیداو شتی بۆ
پەیداکردن.
(ألحَــرَّاش- مِــنَ الحَیّات) (ح): رەشــمار کە
هەموو ساڵێك کاژەکەی فڕێدەدات و مارمێلکە
راودەکات.
٢-(حَرَشَ- البَعیرَ. حَرشــاً و تَحْراشــاً): لە
حوشترەکەوەی ژەند تا خێرا بڕوات.
٣-(حَــرَشَ- الرَجُــلَ. حَرْشــاً وتَحْراشــاً):
پیاوەکەی رووشاند.
٤-(حَرِشَ. حَرَشاً): زبر بوو.
(أَحْرَشَ): زبر.
(ألحَرِش): زبر.
(ألحُرشَــةُ والحَــرَش) زبــری (الأَحــرَش):
زبریی. (ج) حُرْش
"دینارٌ أَحْرَش": دینارێکی زبر (لەبەر تازەیی)
٢-قۆریی زبرو رەق.
٥-(حَرِشَ- الرَجُلُ. حَرَشاً): فێڵیکرد.
(حَــرَّشَ- بَینَ القَوم): خوێشــگەلی لە یەك
هاندا/ بەگژ یەکیدا کردن. هەروەها سەگەکانی
بە گژ یەکدا کردن/ لەیەك تیژیکردن.
(إِحْتَرَشَ- الرَجُلُ): فێڵیکرد/ فریویدا.
(ألحَــرْش (ج) حَــراش): فێــڵ/ فریودان/
تەڵەکەبازیی.
٦-(تَحَــرَّشَ- بِــهِ): بەرۆکیگــرت- شــەڕی
پێفرۆشت/ ڕێی پێگرت.
٧-(إِحْتَرَشَ- الشيءَ): شــتەکەی تۆپەڵکرد/
کۆکردەوە.
(- القَومُ): خوێشگەل کۆبوونەوە.
(ألحَرْش (ج) حِراش): کۆمەڵ/ گەلە/ پۆل.
٨-(ألحَــرش (ج) حِــراش): شــوێنکار/
شوێنەوار/ ئاسەوار.
(ألحَرِش): بێدار.
(ألحَریــش (ج) حُــرُش (ج) = أُمُ أَربعــه
وأَربَعین): ١-هەزارپــێ (لەناوچە گەرمەکاندا
زۆرە لەوانەیــە درێژیی بگاتە ســی ســانتیم
ژەهرداریشە.
(ألحَریش) (ح): زیندەوەرێکی دەریاییە.
٢-(ح): الكركدن: کەرکەدەن/ یەککەڵەشاخ.
(ألحَریشَةُ) (ن): رووەکێکە.
("أَخرجتُ لَهُ حَریشَــتي): هەرچیم هەبوو
دامێ.
٩-(ألحُرْشُفُ): زەویی رەقەن.
(ألحَرْشَــف (ج) حَراشِف ( ا ع)١-پوولەکەی
ماســی ٢-(ح) پێکورە/ کوڵلەی باڵنەگرتوو ٣-
(ح) زەرنەقووتــەی باڵنــدە/ بەچکەی باڵندە

٤-قايشبەستی زری ٥-پیرو پەککەوتەو لاوازەکان.

(«لیس ثَمَّ غیرَ حَرشَفِ رجال»): تەنها پیاوی پیرو پەککەوتەو لاوازی لێهەیە ٦-کۆمەڵێك/ دەستەیەك پیادە.

(ألحَرْشَف) (ن): چاوبازەڵە/ چاوبازە ٢-بەردی گوێدەریا.

حرص: ١-(حَرَصَ الجلدَ. حَرْصاً): پێستەکەی داماڵی.

(- القَصّارُ الثَّوبَ): جلشۆرەکە بە شتن و کوتان بەرگەکەی پۆرتکاندو دری.

(«حُرِصَ المَرعى»): لەوەڕگاکە ڕووتکرا/ قرتکرا.

(ألحَرْصَةُ والحارِصَةُ والحَريصَةُ): ١-قلیشی پێست ٢-هەوری توندی بە لێزمە باران کە ڕووی زەوی بشواتەوەو ڕامالێت.

٢-(حَرَصَ وحَرِصَ واحتَرَصَ على الشَّيءِ. حِرصاً): بە تەنگ شتەکەوە زۆر هات و شتەکەی لا خۆشەویستبوو. چنگی لێگیرکردو ڕژدی لە شتەکەدا کرد.

(حَرِص (ج) حُرَصاء و حِراص وحُرّاص (م) حَريصَة و (ج) حِراص وحَرائِص): شت لا خۆشەویست و چرووك/ بەرچاوتەنگ.

(حَرَّصَ- ه على الشيءِ): هانیدا بەرچاوتەنگبێت/ ڕژدو شت خۆشەویست بێت.

(تَحَرَّصَ): خۆی بە بەتەنگەوەهاتوو بەرچاو تەنگ و ڕژد نواند

(ألحِرص (مص): چاوچنۆکیی و پیسکەیی/ بەرچاوتەنگی/ شت خۆشەویستیی.

٢-(تَحَرَّصَ): چاوەڕێی هەلبوو/ چاوەچاوی دەمبوو.

(«هُوَ يَتَحَرَّصُ غذاءَهُم و عَشاءَهُم»): ئەو چاوە چاوی بەشداریی نیوەڕۆژەو شێوانیانە.

حرض: ١-(حَرَضَ وحَرِضَ وحَرُضَ. حُرُوضاً و حَرَضاً وحَراضَةً): (کەنەفت و زەبوون/ پەککەوتە)ی نەخۆشی بوو.

(حَرِضٌ و حَرَضٌ و حارِضٌ و حارِضَةٌ): (پەککەوتە/ کەنەفت/ زەبوونی) نەخۆشی/ تێکچووی نەخۆشیی.

(«ناقَةٌ حَرِضٌ»): مێحوشترێکی لەڕو تێقوچاوی بێهێز.

(حَرَضَ- نَفْسَهُ. حَرْضاً): خۆی پەکخست و تێکدا.

(حَرَّضَ- الشيءَ): شتەکەی گەنکرد/ تێکدا/ لەکەڵك خست.

(حَرَّضَ- فُلاناً) (ضد): ١-فیساری پەکخست و زەبوونیکرد ٢-گومڕایکرد ٣-مێشکی تێکدا ٢-فیساری لە دەردو نەخۆشی ڕزگار کردو خستیەوە سەر ڕای ڕاست و مێشکی چاککردەوە/ تەندروستیکرد.

(أَحْرَضَ- هُ الحُزن أو المَرَضُ): مەراق و

خەفەت یان نەخۆشیی زەبوونیکردو پەکیخست/ تێکیدا.

(اَلحَـرَض) (مـص): لـە شتێکچوون یان گومڕابوون یان مێشکتێکچوون.

(اَلحِرضَـةُ (ج) حِـرَض): پیاوی پووشت/ ڕسوای ناو خەڵك.

(اَلُمحَـرَّضِ): کەسێکە خەفەت لـە برەوی خستبێت/ توانبێتیەوە.

٢-(حَرِضَ حَرَضاً): کەنەفتبوو/ لەپێکەوت.

(أحْرَضَ-ه): کەنەفتیکرد/ لەپێیخست.

(اَلُمحَـرَّض والحَریـض): پەککەوتە کـە نەتوانێت هەستێت.

٣-حَـرَّضَ-هُ علـی الأَمـرِ: هانیکردنـی کارەکەیدا/ تیژیکرد.

(أحْرَضَ- هُ علی الشيءِ): بۆ شتەکە هانیدا/ تیژیکرد.

(تَحارَضوا- علـی العَمَلِ): بۆ کردنی کارەکە هانـی یەکتریانـداو یەکتریـان تیژکـردو وورووژاند.

٤-(حـارَضَ- علـی العَمَلَ): لەسـەرکردنی کارەکە هەتەرو سەرومڕ بوو.

٥-(حارَضَ-فُلاناً): گرەوی تیربازیی لەگەڵدا کرد.

٦-(اَلحُـرْض والحُـرُض): ئەسـپۆن یـان خۆڵەمێشی ترۆشکە کە دەستی پێدەشۆرێت.

(حَـرَضُ – الثَّـوبِ): داوێنـی (قەراغـی/ پەراوێزی) بەرگ.

حرف: ١-(حَرَفَ- الشَيءَ عَن وَجْهِهِ حَرفاً): ڕووی شتەکەی وەرگێڕا/ لایدا.

(- عَنِ الشـيءِ): ڕووی لە شـتەکە وەرگێڕا/ لایدا.

(حَرَّفَ- الشـيءَ): ١-شـتەکەی خوارکردەوە/ لادا ٢-لێواری بۆ شتەکە کرد، دەمی بۆ کرد.

(- القَلَمَ): بە خواریی پێنووسەکەی داهێنا.

(- القَوْلَ): قسـەکەی (هەڵگێڕایەوە/ گۆڕی/ لایدا).

(تَحَرَّفَ- عَنهُ وانْحَـرَفَ واحرَورَفَ): خۆی لێلاداو لابەلا بوو و خۆی کەنار گرت.

(اَلحَرْف (ج) حَرف): کەنار/ قەراغ/ تەنشت/ لێوار یان نووك.

حَرْفُ الجَبَلِ: پۆپەی شاخ.

(«فُـلانٌ علی حَرفٍ مِن أمرِهِ»): فیسـار لە سەرەتای کارەکەیدایە ئەگەر کارەکەی بە دڵ نەبوو لێیلادەداتو وازی لێدەهێنێت.

(حَرْفُ النَّهر): تەنشـتی ڕووبارەکە/ کەناری ڕووبارەکە.

٢-(حَرَفَ- لِعِیالِـهِ. حَرْفاً): بۆ خێزانەکەی لەملاولا ڕەنجیداو کاسبیکرد.

(أحْرَفَ): ڕەنجی بۆ خێزانەکەیدا.

(تَحَرَّفَ- لِعیالِهِ): هەموو جۆرە پیشـەیەکی بۆ ڕۆژیی خێزانەکەی کرد.

(إحْتَرَفَ): پیشەیەکی گرت.

(- لأهلِه): بـۆ ماڵو منداڵەکـەی ڕەنجیداو نانی پەیداکرد.

(الحِرْفَةُ (ج) حِرَف): ١-پیشـە ٢-پیشەسازیی ٣-ڕەنجدانو شێوەی کاسبیی.

(المَحْـرِف والمُحْتَـرَف): پیشـەگا/ شـوێنی بژێویی پەیداکردن/ شوێنی پیشەی دەستییو هەڵسوکەوتی پیشەکە.

(حریـفُ- الرَجُـلِ (ج) حُرَفاء): شـاگردو بەردەستی وەستا/ هاوپیشە.

(المُحْتَـرِف): خـاوەن پیشـەکە/ وەسـتای پیشەکە/ پیشەکار.

٣-(حُرِفَ- في مالِه. حَرفَةً): شتێکی داراکەی لەدەستچوو.

(المُحَرَّف): دارا لەدەستچوو.

٤-(حـارَفَ- الجـرحَ): بە میلەکـە قووڵیی برینەکەی ئەندازەکرد.

(المِحْـرَف والمِحْراف): میل یان هەر شـتێك قووڵیی برینەکەی پێئەندازە بکرێت.

٥-(حـارَفَ- الرَجُـلَ): پاداشـتی چاکە یان خراپەکەیدایەوە.

(- هُ): لەگەڵیدا ڕەفتاریکرد/ هەڵسـوکەوتی لەگەڵدا کرد.

(قولُ الشـاعِر: «لَقد عَلِمـوا في الغَزو كيفَ نُحارِف»): تێگەیشـتن لە داگیرکردندا چۆن لەگەڵیاندا دەجووڵاینەوە.

(أَحْـرَفَ- الرَجُـلَ): پاداشـتی چاکـە یان خراپەکەی پیاوەکەیدایەوە.

٦-(أَحْرَفَ): پاش نەبوونی دەوڵەمەند بوو.

٧-(أَحْرَفَ- الناقَةَ): مێحوشترەکەی لاوازکرد.

٨-(تَحـارَفَ- عليـه في البَيع وغَـيره): لە فرۆشتنەکە یان شتێتردا فێڵی لێکرد.

(إحْتَرَفَ): داوایکردو فێڵیکرد.

٩-(أَلحُـرْف) = (ن) ١-: (حَـبُ الرَّشـاد): تەرەتیزە.

٢-أَلحَردَل (ن): خەرتەلە ٣-بێبەشی.

حُرْفَة: دەنکێك لەو ڕووەکانە.

(أَلحَرْف) (ج) حِرَف): ئاوەرۆگە.

(أَلحَرْف (ج) حُرُوف وأَحْرُف): پیت/ پیتێکی ئەلفوبێ.

(أَلحَـرفُ في النَّحو): لـە ڕێزمانی عەرەبیدا وشـەیەکە نە ناوە نە کردارە ئەوەیە کەوا تا بۆ شتێك بۆ ئامرازێك بدات وەکو (هَلْ) کە بۆ پرسـیارەو دەڵێن پیتی یان ئامرازی پرسیارو پێیدەڵێن پیتی واتا (الحرف) : وشە.

(«هـذا الحَـرْف ليس في القامـوس»): ئەم وشەیە لە قاموسدا/ لە فەرهەنگدا نییە.

(أَلحُرْفَـة): بەشـبڕاویی/ بەدبەختیـی/ چارەڕەشی.

(أَلمُحارَف): بە شبڕاوێکی کەم بەخت.

(أَلحَرافَة): توونێك زمان بچووزێنێتەوە.

(أَلحِرِّيف): دەمو زمان چووزێنەوە.

(«هذا بَصَلٌ حِرِّيف»): ئەم پیاز دەمو زمان

دەچووزێنێتەوە.
حرق: ١-(حَـرَقَ- هُ بِالنَّار. حَرْقاً): بە ئاگر سووتاندی.
(حَـرَّقَ وأَحْـرَقَ- هُ بِالنـارِ): بـە ئاگـر سووتاندی.
(تَحَرَّقَ واحتَرَقَ): بە ئاگر سووتا/ ئاگریگرت و سووتا.
(اَلحَـرْق والحَـرَق) (مـص): ١-سـووتاویی ٢-جێسووتان ٣-سووتان.
(اَلحُرقة والحَرْقَةُ): سووتانەوەو گەرمیی.
(«فِي جَوفِـهِ حُرقَـةٌ»): ناوسـکی گـڕی لێدەبێتەوە/ ناوسـکی دەسـووتێتەوە/ گەرم بووە.
(اَلحُرُوق والحَرُوق): زوو سووت/ خۆشسووت/ پووشوو/ ئەوەی بە بزیسك گڕدەگرێت.
(اَلحَريق (ج) حَرقَى): سـووتان/ ئاگرگرتن ٢-ئاگر ٣-سووتاو ٤-ئاگردان ٥-سووتانی ڕووەك و هەڵپرووکانـی بـە گەرمـا بێت یان سـەرما بێت ٦-ئاگرکردنـەوەو ئاگربەربوونەوە ٧-گڕ ٨-شوێنی ئاگرگرتن و ئاگرتێبەربوون.
(اَلحُراق والحِراق): ئەسـپی ئاگرگرتوو واتا تیژڕەو لە غاردا.
(اَلحَريقَة (ج) حَرائِق. (فِي اصطلاح العامَّة): ١-ئاگرکەوتنەوە ٢-تینی گەرما.
(اَلحَريقَـة والحَروقَـة): پەڵووڵـەی ئـارد. ئاوەکـە کەمێـك گەرمدەکرێـت و ئاردەکەی تێدەچێنرێت.
(اَلحَرَّاقة (ج) حَرَّاقات): ئاگرپرژێنی دوژمن لە پاپۆڕدا دەبێت.
(- عندالعامَّـة): ئـەوەی پێسـتی پـێ پاکدەکرێتەوە.
(اَلمُحْرَقَـة (ج) مُحْرَقـات): قوربانییەك کە بۆ خودا دەیکوژن و دەسـووتێنرێت بۆ ڤایلیی خوداو پێڵێنانی دەسەڵاتی تەواوی خودا.
٢-(حَرَقَ- هُ بِالمِبْرَدِ): بە بربەند ڕنی.
(- الشَّيء): شتەکەی لە یەك خشاند.
(- نابَهُ عَلَيهِ. حَرْقـاً و حَرِيقاً و حُرُوقاً): ١-بـەدان کرانديـەوە ٢-بـە دان کوڕۆشـتیو کیرەکیری بەدانیخست.
(«فُلان يَحْرُقُ عَلَيَّ الأَرَّمَ»): فيسـار لە ڕقدا دانم لێ جیڕدەکاتـەوەو دانم لێدەکوڕۆژێت و حەزدەکات بە دان بمکرۆژێت.
(اَلمِحْرَق = المِبْرَد): بربەند.
٣-(حَرِقَ- شَعرُ هُ. حَرَقاً): قژەکەی کوڕووز کوڕووز بوو/ هەڵکرووزا یان هەڵوەرین.
(حَـرِقَ الشَّـعَرِ): قژهەڵکـوڕووزاو یـان هەڵوەریو.
اَلحَرِق: قژی کوڕووز کوڕووز بوو/ کوڕتبوو.
٤-(حَرَقَ وحُرِقَ): دەماری ڤاچی پچڕا.
(اَلحارِقَـة): دەمـاری هەسـت یـان ڕەگێکی ڤاچە.
(اَلحُرَقَة والحارُوقَةُ والحُرَّاقَةُ- مِنَ السُّيوفِ):

شمشێری زۆر تیژی بڕەر.

٥-(حَــرَّقَ- المَرعــى الإبِــلَ): لەوەڕگاکــە حوشترەکەی تینووکرد.

٦-(ألحَرق): هەوری تونده برووسکه.

(ألحُراق والحُرَّاق): ئاوی زۆر سوێر.

(ألحُراق والحِراق): ئەوەی کە هەموو شتێك گەند بکاتو تێکیبدات.

(حُراق أصبُعه): جۆرە خواردنێکە.

٧-(ألحِرقِد (ج) حَراقِد): بنزمان.

(ألحَرقَدَة= تُفاحَةُ آدَم): قورتوم.

٨-(حَرقَــصَ- فِي المَشــي): لــە ڕۆیشــتندا هەنگاوەکانی کورتکردەوە/ ورد ڕۆیشت.

(- الكَلامَ): قسەکانی کورتو ورد کردەوە.

(- هُ): ســوعبەتی لەگەڵدا کردو پەســتیکرد (عامیە).

(- اللَّحمَ ونَحوَهُ) (عامیة): گۆشــتەکەی یان شتیتری سوورکردەوە.

(ألحُرقــوص (ج) حَراقيــص): ١-(ح) مۆریچەیەکــە لــە کێــچ دەچێــت، لەوانەیە باڵیشی هەبێتو بفڕێت ٢-سەری قامچی.

ألحُرقــوص والحرصــوص: (عامیة): پنکە گۆشتێکی بوچوکی سوورەوەکراو.

٩-(ألحَرقَفَةُ (ج) (حَراقِف وحَراقيف (ع ا): ئێسقانی سەری کولۆت.

(ألحُرقــوف (ح): چوارپێی چرووســێنراو/ لەرکراو.

حــرك: ١-(حَرَكَ. حَــرْكاً): نووکوولیی لەو مافە کرد کە لە لای بوو نەیدایەوە.

٢-(حَرَكَ. حَرْكاً): هاواری سەرشانیکرد.

(- هُ): کێشای بە سەرشانیدا.

(- حارِكَهُ): سەرشانی بڕی.

(حَرَكَ- هُ بِالسَّــيفِ): بە شمشــێر بە ملیدا کێشا.

(حَرِكَ. حَرَكاً): کەمەری شلبوو یان سەرشانی بێهێز بوو.

(حَريك (م) حَريكة): کەمەر شلبوو یان شان بێهێز بوو.

(ألحارِك) (فا): سەرشان.

(ألمُحَــرَك): جونگــەی مــل کە بەســەرەوە دەنووسێت.

٣-(حَرُكَ حَرْكاً و حَرَكَةً): جووڵا/ بزوا.

(حَرَّكَ- هُ): بزواندی/ جووڵاندی.

(تَحَرَّكَ): بزوا/ جووڵا/ کەوتە گەڕ. ڕۆیشت.

(حَــرَّكَ مِنيَّ الأمرُ): کارەکە شــپرزەیکردم/ خستمیە جووڵە.

(ألحَرَكَةُ): جووڵە/ بزوە/ گەڕ/ تەکاندان.

(- أليَومِيَّة الظاهِرِيَّة) (فك): بەبەر چاوەوە جووڵەو ســوورانەوەی گۆی ئاسمان بە دەوری تەوەرەی گەردووندا هۆکەیشــی سوورانەوەی زەویە بــە دەوری تەوەرەکەیدا کە نزیکەی (٢٤) کاتژمێــرو (٣) خولــەك کــەمو (٥٦) چرکەیە.

أَلحَراك = أَلحَرَكة): بزاوتن جووڵه/ بزوه.
(أَلحَرِك): بزێوىو وريا/ سووكەڵەى زيرەكو زيت.
(«غُـلامٌ حَـرِك»): مێردمنداڵێكى بزێوى زيت.
(أَلمِحراك): مەقاش/ شتى ئاگر پێخۆشكردن.
(أَلمُحَرِّك (ج) مُحَرِّكات): گەرخەر/ كارپێكەر/ هەڵسووڕێن. كـە فڕۆكەو ماشێنو ماتۆڕو شتيتر بە هۆى بەنزين يان گازۆيلو شتيترەوە كارپێدەكاتو هەڵدەسووڕێنێت.
حـرم: ١-(حَرَمَ و حَرِمَ – هُ الشـيءَ. حِرماً و حَريمـاً و حِرْمانـاً و حَرِمـاً و حِرمَة و حَرِيمَـةً): شـتەكەى لێگـرتو لە شـتەكە بێبەريكرد.
(«حَرَمَ الأَسقُفُ فُلاناً»): قەشەكە فيسارى لە بەشى برواداران بێبەريكرد.
(مَحروم): بێبەرى/ بێبەش/ شتلێگيراو.
(حَرِمَ وحَـرُمَ- عليه الأَمرُ. حَرَماً و حَراماً و حُرْمـاً و حُرُمـاً و حُرُمَـةً و حَرِمَـةً و حَرَاماً): كارەكەى لـێ (قەدەغە كرا/ لێگيرا/ لێحەرامكرا) كارەكە بۆى دوورە دەستبوو.
(حَرَّمَ): كەوتە مانگى محەرەمەوە.
(- الشَـيءَ): شتەكەى نادروسـتكرد/ ناشياو كرد/ حەرامكرد.
(أَحْـرَمَ): ١-كەوتـە مانگـى محەرەمـەوە ٢-ئيحرامى بەسـت يان كەوتە پيرۆزييەكەوە كە نابێت بشكێنرێت ٣-دەستەبەر بوو.
(- الشَيءَ): شتەكەى حەرامكرد.
(- عَنِ الشـيءِ): خـۆى لە شـتەكە بەدوور گرتو وازى لێهێنا.
(تَحَـرَّمَ- مِنـهُ بِحُرمَةٍ): لـە خراپەى ئەو پەنايبردە بەر لايەك دەسـتەبەرى پاراستنى بێت.
(- بِهِ): تێكەڵى بوو/ دۆسـتايەتيىو ڕێز لە نێوانياندا چەسپو پتەو بوو.
(إِحْتَرَمَ – هُ): بە گەورەيگرتو ڕێزيگرت.
(- الشَّيءَ): لە شتەكە بێبەش بوو/ لێيقەدەغە كرا/ ڕێى شتەكەى لێگيرا.
(إِسـتَحْرَمَ- الشَّـيءَ): شـتەكەى بە حەرامو نادروست دانا.
(أَلحُرْم = الاحرام بِالحَج): ئيحرامبەستن لە حەجدا.
(أَلحَل): ئيحرام شكاندن.
(أَلحُرُم): ١-(ژنانى/ هاوسەرى) پياوێك.
(أَلأَشهُرُ الحُرُم): چوار مانگە حەرامكراوەكان. (ذو القَعيـدَة وذو الحَجَّة ومُحَرَّم و رجب): بوون كە نەدەبوو عەرەب لەو مانگانەدا شـەڕ لەگەڵ يەك بكەن.
(أَلحَـرَم (ج) أَحْـرام): ١-ئـەوەى كـە پياو دەيپارێزێـتو بەرگريى لێـدەكات ٢-ئەوەى كە پـيرۆزە نابێت دەسـتى بۆ ببرێت/ شـتە حەرامەكان.

(«أَلحَرَمْ الأَقصى= بَيتُ المُقَدَّس»): قودس.
(أَلحَرَمان): مەكەو مەدینە.
(أَلحِرم (ج) حُرُم): ١-نەشیاو/ نادروست/ حەرام ٢-دەمی ئیحرامبەستن لە حەجدا ٣-ئەو ئەركەی كە دەشێت بیشكێنیتو وازی لێبهێنیت.
(أَلحِرمان): حەرامكراوەكان.
(أَلحِرمان): پرزەبڕاویی/ بێبەشیی بەشبڕاویی/ بێبەشكردن.
(أَلحُرْمَـة والحُرُمَـةُ والحُرَمَـةُ (ج) حُرَم و حُرَمات وحُرُمات): ١-ئەو ئەركو پێویستیانەی كە خودا لەسەر مرۆڤی داناوەو دەبێت لێیدەرنەچنو ملی بۆ شۆڕبكەن ٢-ئەوەی كە نابێت بشكێنرێت/ فەرمانە پیرۆزەكانە ٣-دەستەبەریی – ترسو سام خۆلێپاراستن.
(حُرمَـةُ الرَجُـلِ): ماڵو منداڵو خێزانی پیاو.
(أَلحَرْمَةُ): پاراستن.
أَلحَرام: حەرام/ نەشیاو.
(«حَرامُ اللهُ لا أَفعَلُ هـذا»): حەرامی خودا بێت ئەوە ناكەمو بەلای ئەوەدا ناچم.
(«يَمينُ اللهِ لا أَفعَلُ هذا»): سوێندم بە خودا بەلای ئەوەدا ناچمو نایكەم.
(«رَجُلٌ حَرام و قَـومٌ حَرام»): پیاوێك یان خوێشگەلێك كە پارێزراو بێت.
(أَلشَّهْرُ الحرامُ): مانگی موحەرڕەم.
(أَلبَلَدُ الحَرام): مەكە.
(أَلمَسْجِدُ الحَرام): كەعبە/ كابە.
(أَلحَريم (ج) حُرُم وأَحْرُم وأَحاريم): ١-ئەوەی كە حەرامكراوەو نابێت دەستی بۆ ببرێت ٢-پانتاییەكی فراوانە كە بە سووری كۆشكی شادایەو نابێت توخنیبكەونو دەپارێزرێت.
(ثَوبُ المُحْـرِم): ٣-بەرگی ئیحرام ٤-هەموو شوێنێك كە پێویستە بپارێزرێتو توخنی نەكەوت.
(حريـمُ الرَجُل): ئەوەی كە پیاو بەرگری لێدەكات بە هاوسەری ژنانی پیاو دەوترێت (حەریم).
(أَلحَريمَةُ): ئەو ئاواتانەی كە لەدەستچووبێت.
(أَلمُحرِم): ئەو كەسانەی كە لەژێر ڕكێفی تۆدا بنو بیانپارێزیت.
(«أَلمُحرِم عَنكَ»): ئەوانەی كە نابێت ئازاریان بدەیتو خراپەت بۆیان هەبێت.
(أَلمَحرَم (ج) مَحارِم): حەرامكراو.
(مَحارِمُ اللَيل): سامی شەو كە زۆر ترسنۆك ناوێرێت توخنبكەوێت.
(أَلحَرامِيّ): دز/ پیاوخراپ.
(أَلمَحرَمَـة والمَحرُمَـة (ج) مَحـارِم): كاری نادروستو نەشیاو- ئەوەی كە نابێت پەرژینی بشكێنیتو توخنیبكەوێت.
(مُحَرَّم): مانگی مەحەرڕەم كە یەكەمین مانگی

عەرەبییەو لە نێوان ( ذي الحجة وسفر)دایەو (٣٠) رۆژە ٢-کەسێکە دەستەبەریبن و رێزی لیبگرن.

(اَلَحروم): ١-بێبەش ٢-نەداراو بێدەرامەت ٣-دەستکورت کە هیچی بە هیچ نەبێت (لە فەرو بێر بێبەش ٤-بەدبەختێك کە رەنجبێوەر بێت.

(اَلْحْتَرَم): بەرێز/ خاوەنرێز.

٢-(حَـرِمَ- في القمار حَرَمـاً و حَراماً): لە قوماردا دۆراندی.

(حَرَّمَ وأَحْرَمَ- هُ في القمارِ): قوماری لەگەڵدا کردو لێیبردەوە.

(اَلْحُرْمَـةُ والحُرُمَـةُ والحُرَمَـةُ (ج) حُرَم وحُرُمات وحُرَمات): بەش/ بەرکەوتە.

٣-(اَلْحْرم): بێوەی.

(مُحَرَّم): دەستبۆنەبراو.

(«جلدٌ مُحَرَّم»): پێستەیەکی خۆشەنەکراو/ دەستبۆنەبراو.

(«سَوطٌ مُحَرَّم»): قامچییەکی چاکنەکراو.

(أَعرابِـيٌّ مُحَـرَّم): عەرەبێکـی کۆچەریی/ دەشتەکی وشك کە شارستانیی نەدیبێت.

(اَلْحْرَمَةُ) (عامية): دەستەسر.

٤-(حَرِمَـدَ- في الأمـرِ): لەسـەر کارەکە بە گژداچوو فرەو چەلەحانێی زۆر لەسەر کرد.

(ألحِرمِـد والحَرمَد): ١-رەنـگ و بۆ گۆڕاوی تێکچوو ٢-قورە رەشی تێر.

٥-(حَرمَـزَ- هُ): نەفرەتـی لێکرد/ لەعنەتی لێکرد.

٦-(اَلْحَرْمَـل) (ن): ئەسـپەندەر/ قانـگ رووەکێکـە گەڵاکانـی بەمـلاولای چڵەکەیدا ریـز دەبێت گوڵەکەی کۆیـەو لە رێکی یەکن تۆوەکەی لەبەری کونجی دەچێت زۆر جۆری هەیە، لە باخچەکاندا دەروێنرێت، رووەکێکی پزیشـکییە کەڵکەکانی بۆ وەستانی رەوانییو خوێن پاککردنەوەو ئازاری جومگەیە.

الملحق:

حـرم: الحِـرام (ج) حِرامـات وأَحرِمَـة: بەرگێکـە خۆتی پـێ لەسـەرما دەپارێزیت/ قاپووت ٢-بەتانیەکە لە خوریی یان شـتیترە بۆ خەو پێیدەنوون.

---

حـرن: (حَـرَنَ وحَـرُنَ – البَغْـلُ. حُرُوناً وحُرانـاً و حِرانـاً): ئێسـترەکە مانیگرت و یاخیبوو/ وەستا.

(بَغلٌ حَرُون (م) حَرُون (ج) حُرُن): ئێستری مانگر/ چمووش/ سەهەند.

(- بالمَكانِ): لە شـوێنەکەدا خـۆی گیرکردو مایەوەو نەرۆیشت.

(- العَسَـلُ في الخَلِيَّـةِ): هەنگوینەکـە بـە شانەکەوە لکاوەو بە گران لێیدەبێتەوە.

(حَـرَنَ- في البَيع): بە نرخێکـەوە لکاو نە کەمیکردو نە زۆرتر/ سەهەندەییکرد.

(- القُطنَ): لۆکەکەی شیکردەوە.

(ألمِحــرَن): چەكوكــەوان/ ئامێــری لۆكــە شیكردنەوە.

حرا: (ألحَــرا (ج) أحْراء: ١-كــۆڕ/ مەیدان/ گۆڕەپان.

(«نَزَلْتُ بِحَراهُ»): دابەزیمە كورەكەی.

(ألحَــرا: ٢-دەنــگ ٣-گــری ٤-لانــەی ئاســك ٥-شایان.

(«بالحَرا أن یكون ذاك»): شــایانیەتی بەوە ببێت یان ئەوە بێت.

(ألحَرْوَةُ): ١-توند بوون و گڕێی قورگ یان سگ یان ســەر كە لە ڕقاندا یان لە ئــازاردا پەیدا دەبێت ٢-بۆگەنێكی تیژی كاسكەر.

(ألحَــراوَة): توونــی و كەســكوونیی/ تیژیی چێژی خەرتەلەو شتی لەو بابەتە.

(حــری: (حَری- الشَــيءُ. حَرْیاً): شــتەكە كەمیكرد.

(أحری- الشــيءَ): شــتەكەی كەمكــرد/ لە شتەكەی دابڕی.

(ألحاریَةُ): ماری كوڵەوەیباب مارێكە لەشــی كورتەو ژەهراویيە.

٢-(أحرِ- بِهِ): شــایانی ئەوە ببــە/ بۆ ئەوە بشێ.

(تَحَرّى): بۆ شایستەترو چاكتر گەڕاو پشكنیی ٢-بۆی گەڕاو پشكنی.

(- الأمــرُ): بە نیازی ئەو ئــەو كارەی كردو ئەوەی بە باشتر زانی و هەڵیبژارد.

(ألحَــريُّ (ج) حَرِیُّون وأحرِیــاء (م) حَرِیَّة (ج) حَرِیَّــات و حَرایا والحَــرِيُ (ج) أحْراء والحَری): (ئەمەیان نە بە دوان دەكرێت و نە بە كۆ): شــایان/ شایستە/ گونجاو/ شیاو_ لە پێشتر.

(إنَّهُ لَحَــرِيٌّ أو حَرٍ أو حَرىً بِكَذا وأن یَفعَلَ كَذا): ئەو شایانی ئەوەیە یان لەو دەوەشێتەوە ئەوە بكات/ شایستەی ئەوەیە.

(ألأحــری): شایســتەتر/ شــیاوتر/ باشــتر/ لەپێشتر/ شایانتر/ گونجاوتر.

(ألمَحری والمَحرْاة): شیاو/ شایستە.

(«هــذا الأمــرُ محــرىً أو مَحــراةٌ لذلك أو بذلــكَ»): ئەم كارە شــیاوی ئەوەیــە/ ئەوە هەڵدەگرێــت/ بــۆ ئەوە باشــە/ شایســتەی ئەوەیە.

٣-(تَحَرَّی- بالمَــكانِ): لە جێگەكەدا مایەوەو خۆی تێداگرت.

٤-(تَحَــرّی- عَنهُ): بۆیگەڕا/ بۆی پشــكنی/ بەدوایدا عەودالبوو.

(رِجالُ التَّحَرِّي): پۆلیسی پشكنێر كە بە دوای تاوانبــارو پیاوخــراپ و خراپــەكارو بەڵگەی تاواندا دەگەڕێت.

حــزَّ ١-(حَــزَّ واحتَــزَّ- هُ. حَــزّاً): بــڕی/ قلیشاندی.

(- العــودَ): هــەردوو ســەری چێوەكــەی تیژكرد.

(تَحَزَّزَ): برراو هەردوو سەری تیژ بوو.
(ألحَزّ): قلیش یان برین داتاشین.
(ألحزَّة): قلیشێك یان داتاشینێك.
(ألحِزَّة): کووزی کاڵەك بە درێژیی/ قاشێك.
(ألمَحَز): ١-شـوێنی کووز کووز کردنو برین/ جێقلیش/ درز.
(«قَطَـعَ فَأصـابَ المَحَـزَّ»): بـڕی برینەکە بەرجێ قلیشەکە کەوت.
(ألمِحَزّ): ئامێری (برینو قلیشاندن/ کووزکووز کردن.
٢-(حَـزَّ- الشَـيءُ في صَدرِه حَزّاً): شـتەکە سەردڵیگرتو کاری تێکرد.
(حَزَّزَ- أسنانَهُ): دانەکانی تیژکرد.
(ألحَـزَّةُ): ١-ژانــەدڵ ٢-کاری پڕ سەریەشــەو خەفەت لە دوا.
(ألحَـزازَة (ج) حَـزازات): ژانەدڵــی ڕقو ناخۆشییو ناکۆکیی نێوان.
(ألحَـزّاز والحُزّاز): مەراقو ئــەوەی ژانەدڵ بهێنێتو دڵ تەنگبکات.
(حَـوازُّ القَلبِ): هەموو ئەو شـتانەی دەبنە هۆی دڵگیرییو ژانەدڵو مەراق.
(حازَّة): یەکێك لەو شـتانەی دڵئازار دەدەنو دەبنە هۆی مەراقو ژانەدڵ.
٣-(حَـزَّ وأحَزَّ- علـى كَرمِ فُـلان): پایەو گەورەیی فیساری بڵندترو زۆرتر کرد.
٤-(حــازَّ- هُ. مُحــازَّةً و حِـزازاً): هەڵگێرو داگێریکردو لێیکۆڵییەوە/ بە دوایدا گەڕا.
٥-(ألحَــزّ (مص): ١-دەم/ کات ٢-پیاوی قســە ڕەقو نەراندوو/ قسەترن.
(ألحَزَّةُ): کاتژمێر/ سات.
("أيَّ حَزَّةٍ أتَيْتَنــي قَضَيْتُ حاجَتَكَ"): هەر کاتژمێرێك/ ساتێك هاتیت پێداویستیەکەت بەجێدەهێنم.
(ألمَحَــز(ج) مَحــاز): پیــاوی قســەڕەق/ نەراندوو.
(ألحَزيز (ج) حُزُز و حُزّان و حِزّان وأحِزَّة): پیاوی کارکردەو بەکار/ بە چنگو هەڵپە.
(ألحَزاز): ١-کرێشی سەر ٢-(طب) = ألقُوباء): قلیشــانی پێستو وشــکهەلاتنی. دەردێکە لە لەشــدا پەیدا دەبێت پێست وشــکدەکاتەوەو دەیقلیشــێنێت، قلیشــەکە گەر چار نەکرێت گەورەتر دەبێت.
(-) ن: جــۆرە قەوزەیەکــە لەســەر تاوێرو دیوارو توێکڵی دارو خاك دەڕوێت زۆر قایمەو بەرگەگــرە بەرامبــەر گۆڕانــی ئاووهەوا بە تایبەتی بەرگەی ســەرما زۆر دەگرێت ڕەنگ سپی یان سەوز دەبێت.
(ألحَزازَة (ج) حَزازات): ١-ســوێ چوونەدڵی (خەفەت/ قســەی بە توێکڵو ناخۆشی ئەمو ئەوو/ بۆرە بنار) ٢-کرێشی سەر.
ثُلاثِيَّــةُ الحَــزّات (ن): گوڵێکــی جوانــە لە کۆمەڵەی زەمبەقە گوڵەکە زەرد یان ســوورە،

دركاويیه له مەدەغەشقەرەوە هاتووە.
أَلحَـــزازِيُّ: پیاوی (بە برشـــتو بە چنگ/ بە هەڵپە لە كارو شەڕدا).
حـــزأ: (حَـــزَأَ- السَّـــرابُ الشَّـــخصَ حَزءً): تراويلكەكــە زەلامەكــەی بەرزكـــردەوە/ هەستاند.
(- الإبلَ): حوشترەكانی كۆكردەوە.
(إحْزَوزَأتِ الإبلُ) حوشترەكان گردبوونەوە.
(- الطائِــرُ): باڵندەكــە باڵەكانــی هێنایەوە يەكو وازی لە هێلكەكانی هێنا.
حـــزب: ١-(حَزَبَ- هُ الوَيْلُ والغَــمُّ. حَزْباً): كارەســاتی گــەورەو خەفەتــی جەرگــبڕ دایبەسەریداو زۆری بۆ هێنا.
(ألحازِب (ج) حَوازِب والحَزِيب (ج) حُزْب و حُزُب): كارەساتو قەوماوی سەختو گران.
("نَزَلت بِهِ حَوازِبُ الخُطوب): بەلای سەختو گرانی بەسەردا باریو هات.
("هـــذا أَمْرٌ حَزِيـــبٌ"): ئەمە بـــارو كارێكی گرانە/ جەرگبڕە.
ألحُزابَـــة: كاری گـــرانو گـــەورەو خەفەتـــی جەرگبڕ.
٢-(حَـــزَبَ- القُـــرآنَ. حَزْبـــاً): قورئانـــی بەشبەشكرد.
(حَـــزَّبَ- القَـــومَ): خوێشـــگەلی كـــرد (بـــە دەستەدەستە/ چەند پارتێك) بوون بە چەند پارتو دەستەيەك.
(تَحَزَّبَ- القَـــومُ): ١-كۆبوونـــەوە ٢-بوون بە چەند پارتێك.
(حـــازَبَ- هُ): ١-بوو بە دەســـتەی ئەو/ چووە پارتەكەيـــەوە ٢-لايەنگيريـــی ئەويكـــردو پشتيگرت.
(ألحِـــزب (ج) أحـــزاب): ١-پـــارت/ دەســـتەو كۆمەڵــە خەڵكێك ٢-هەمـــوو تاقمە خەڵكێك كە دڵيان بە يەكەوە بنووســێتو يەك شـــێوە كار بن ئەوە پارتن گەرچی يەكتريش نەبينن ٣-ســەربازو پياوانو دۆستانی يەكێك كە سەر بەو بنو بیروبڕوای ئەويان هەبێت ٤-بەشێكی قورئان يان شتيتر.
٢-(ألحِـــزب (ج) أحزاب): ١-چـــەك ٢-بەش/ بەركەوت.
(ألحَزابِـــيُّ والحَزابِيَّة – مِنَ الرجال): پياوی تەنگەئەستووری كورتەبنە.
٤-(ألحَيزَبون والحَيزَبور): پير/ ئيختيار.
حزر: ١-(حَزَرَ- الشـــيءَ. حَـــزْراً و مَحْزِرَةً): شتەكەی خەمڵاندو بە بۆچوون قەبلاندی.
(«حَزَرَ قُدومَهُ يَـــومَ كذا»): وای بۆچوو كە ئەو رۆژە دێت.
(ألحَـــزوَرَة= الأحجِيَة) (عاميَّـــة): مەتەڵ/ قسەی بە پێچو پەنا.
٢-(حَـــزَرَ- و حَزُرَ- النَّبيـــذُ أَو اللَّبَنُ. حَزْراً و حُزُوراً): مەيەكە/ شەرابەكە يان ماستەكە ترش بوو.

(حازر): ترشاو/ ترشبوو.

(ألحازِرَة): میّی وشەی (حازر ).

٢-(ألحَــزْوَر والحَزَوَّر (ج) حَــزاوِرَة): میّرد منداڵێك هەڵیدابێتو هێزو گوریگرتبێت.

(ألحَزْرَةُ (ج) حَــزَرات والحَزيـرَةُ — مِن كُلِّ شيءٍ): ناوێزەو هەڵبژاردەی هەموو شتێك.

(ألحازِرَةُ): میّحوشتری بەهێزی چاك.

(ألمُحَزور): توورەكراو.

٤-(حَزيران) (ســريانية): مانگی خەرمانان ٣٠ رۆژە.

حــزف: (حَزْفَــرَ- القَومُ لِلقَوم): بۆ شــەرو بەگژداچوونیــان خوێشــگەل خۆیــان ئامادە كرد.

(- المَتاعَ): كەلوپەلەكەی شەتەكدا/ بەستی.

(- الإناءَ): قاپەكەی پركرد.

حزق: ١-(حَزَقَ- الوَتَرَ أو الرباطَ): ژێكە یان پێبەستەكەی ڕاكێشاو توند كردو بەستی.

(- الشيءَ): شتەكەی گوشیو پەستاوتی.

(- الحِمارُ): كەرەكە تری.

(أحْزَقَ- هُ): بەری لیّگرت/ نەیهێشت.

(تَحَزَّقَ): چووە یەكو كرژ بوو.

(ألحِــزْق والحازِقَــة والحَزاقَــة والحَزيقَة. وجمــع حَزيقَة حَزائِق وحَزيــق وحُزُق): كۆمەڵە خەڵكێك یان كۆمەڵی شتێ.

(ألحِزقَــةُ): ١-كۆمەڵە خەڵكێــك یان كۆمەڵی شتێ ٢-پارچەیەكی هەموو شتێك.

(ألحَــزُقُ والحُزُقَّــةُ والحُــزُق والأُحْزُقَّــةُ والحَزُقَّة): ١-كورتەبنەیەكی هەنگاو كورت.

(ألحَزُقُ والمُتَحَزِّق): ڕژدێكی بەدڕەفتار.

(ألحازُوقَة) (طب) (عامية): پژمین.

(ألمَحْرزُوق- مِن الإبْرِيق ونَحْوُهُ): مەســینە یان سوراحی ملتەسك.

حزك: (حَــزَكَ- هُ. حَزْكاً): پێچاپەوەو توند شەتەكیدا.

(- هُ بِالحَبــلِ): چەپكیكــردو توند بە پەت بەستی.

(إحْتَزَكَ- بِالثَّوبِ): جلەكەی لەناو قەدیەوە پێچا.

حزل: (إحْزَأَلَّ- الشَّيءُ): شتەكە چووە یەك/ گرد بووەوە.

(- القَلْــبُ): لە ترســاندا دڵەكــە چوو/ كرژ بوو.

(- الجَبَلُ): شــاخەكە بەســەر تراویلكەكەوە بەرز بووەوە.

(- البَعيرُ في السَّــيرِ): حوشترەكە لە ڕۆیشتندا پێشكەوت.

(ألحَوْزَل والحَّوْزَلَة): كورت.

حزم: ١-(حَــزُمَ. حَزْمــاً و حَزامَةً): توند/ دامەزراو بە بروا بەخۆوە كارەكەی گرت.

(حــازم (ج) حَزَمَة و حُزَّم وأحزام وحَزيم (ج) حُزَمــاء): بە وریاییــەوە توند قایم كار گرتوو.

(حَزَمَ- ه):گورزەیکرد/ توند بەستی.
(حَــزَمَ- الفــرسَ): تەنگــەی ژێــر ســکی چارەوێکەی بەست.
(حَزَّمَ- هُ):توند بەستی/ شەتەکیدا.
(أَحْــزَمَ- الفَــرسَ):تەنگەی ژێر ســکی بۆ چارەوێکە کرد.
(تَحَزَّمَ واحْتَزَمَ):پشــتێنی بەست/ کەمەری بە پەتێك بە شتێك بەست.
(«تَحَــزَّمَ فِي الأَمــر»):کەمەری بــۆ کارەکە بەست/ بە بڕوابەخۆیەوە لە کارەکەهەڵچوو/ کارەکەی بە توندیی گرت.
(أَلحِــزام (ج) حُزُم والحِزامَــة (ج) حَزائِم والمِحْزَم والمِحْزَمَة)١ـتەنگەی ژێر ســکی وڵاخ ٢ـپشتێن/ کەمەربەست.
(«أَخَذَ حِزامَ الطَّريقِ»): ناوەندی ڕێگەکەی گرت.
(أَلحُزمَة):گورزە/ بەستەك (دار/ یان شتیتر/ دەستەك).
(أَلحَزيــم (ج) حُــزُم وأَحْزِمَــة):١ـکەمەر/ پشــتێنە/ ناوقەد/ شوێنی بەســتنی پشتێن ٢ـناوەڕاستی سنگ.
(«شَدَدْتُ لِهذا الأَمرِ حَزيمي»):خۆم بۆ ئەو کارە ئامــادە کردووەو پشــتێنم بۆ لە کەمەر بەستووە/ خۆم خڕ هەڵدا.
(الأَحْزَم):سنگفراوان.
(أَلحَيزُوم (ج) حَيازِم وحَيازِيم):ناوەڕاستی سنگ.
(«شَدُّ الحَيازِم»):بە ئارامبوونو بەکێشبوون (ئیدیۆمە).
(أَلمَحْزِم- مِنَ الدابَّة):شوێنی بەستنی تەنگەی ژێر سکی وڵاخ.
٢-(حَزِمَ- حَزَماً):مەراقی بە چنیەوە دڵەوە/ دڵی تەنگبوو.
(أَلحَزَم):دڵتەنگیو مەراقی دڵ.
٣-(إِحْزَوزَمَ- الشــيءُ. إِحْزِيزاماً): شــتەکە تۆپەڵ بوو.
(أَلأَحْزام= الأَحزاب):پارت- دەستە- کۆمەڵ.
٤-(إِحْزَوزَمَ- المَكانُ):شوێنەکە ڕەقەنو بەرز بوو.
(أَلحَزم (ج) حزُوم):زەویی هەڵەتو ڕەقەن.
(أَلحَيْزوم (ج) حَيازِم وحَيازِيم):زەوی بڵند بەرز/ هەڵەت.
٥-(أَلحَزَم):خواردن هەرسنەکردن.
(أَلأَحْزَم):ورگن.
(أَلأَهْضَم):ناوقەد باریكو تێقوپاو.
(أَلحُزُمَّة):کورت/ کورتەبالا/ کورتەبنە.
حــزن: ١-(حَــزَنَ- هُ. حُزْناً)داخیدایــە/ خەفەتیدایە/ کەســەری کــردە دڵیەوە/ دڵی تەنگکرد.
(حَــزِنَ- لَهُ و عَلَيهِ. حَزَناً):خەفەت/ داخی بۆ خوارد.
(حَزيــن (ج) حُزَنــاء و حِــزان و حَزانی.

وحَــزَنَ و حَزَنَ ومَحزونَ ومُحْزَنَ مِحْزانَ و حَزنانُ): خەفەتبار/ دڵ پڕ لە کەســەر/ دڵ پــڕ لە پەژارە/ داخڵەدڵ/ خەمبار/ ســوێ لە دڵ.

(حَزَّنَ- الرَجُلَ): داخی کردە دڵی پیاوەکەوە/ خەفەتیدایە/ داخیدایە.

(- القارِيءُ): بە ســۆزو دەنگــی کارتێکەرەوە خوێندیەوە.

(أحْزَنَ- الرَجُلَ): سوێیکردە دڵی پیاوەکەوە/ داخیدایە/ خەفەتباریکرد.

(تَحَــزَّنَ- عَلَيه ولأَمــرِهِ): داخی خوارد بۆی ژان چووە دڵیەوە.

(تَحــازَنَ واحتَــزَنَ): پــەژارە دایگــرت/ داخیخوارد/ خەفەتبار بوو.

(الحُزْن والحَزَن (ج) أحْزان): خەفەت/ خەم، داخ/ پەژارە/ کەســەر/ دڵتەنگیی/ ناســۆر/ جەخار.

(الحُزَن): وەی/ چورتومی گران/ لێقەومان/ ئاپۆرە.

(الحُزانَــةُ): خێــزان/ماڵو منــداڵ کە پیاو خەمیان بۆ دەخوات.

(مالِكُ الحَزين= ألبَلشــون (ح): شینەشــاهۆ مەلێکــی ئاویی قاچو مل درێــژە دەڵێن گوایا کاتێك لــەلای کانیاوو ئــاوەوە دەبێت کاتێك وشکدەبن ئەم خەفەتیان بۆ دەخوات.

٢-(حَزُنَ المَكانُ. حُزُونَةً): شوێنەکە ڕەقەنو زبرو بڵند بوو.

(أحْــزَنَ): بــە زەوییەکــی ســەختی بڵنددا ڕۆیشت، یان تیایدا بوو.

(ألحَــزْن (ج) حُزُن و حُــزُون): زەمینێکی سەخت بە زۆریی دەبێت ئەو زەمینە بڵندیش ببێت.

(ألحُزنَةُ (ج) حُزَن): کێوی سەخت.

(ألحَزَنَــةُ- مِــنَ الأَرضِ): زەویی ســەختو بەرز.

(ألحُزُونَة): سەختیو بەرزیی زەوی.

(ألحَزَنْبَــل) (ن): ڕووەکێکــە بەرتــاڵ/ گیا دووپشکە/ قاپەکەوڵە/ دووبەسەرە.

حــزا: ١-(حَزا- الشــيءَ. حَزْواً): شــتەکەی خەمڵاند/ هەڵەسنگاند.

(- الطَّــيرَ): باڵندەکــەی هەڵفراند تا بزانێت ڕوو لە کوێ دەکات بەوە گەشبین یان ڕەشبین دەبێت.

(حَزَى و تَحَزَّى. حَزْياً): پێشبینیکرد.

(- الشيءَ): شتەکەی خەمڵاند/ هەڵسەنگاند.

(أحْزَى بِالشَّــيءِ. إحْزاءً): هەستی بە شتەکە کرد/ بە شتەکەیزانی.

(ألحازِي) (فا): دەستگرەوە/ ئەوەی تەماشای چرچو لۆچی دەستی ئەندام دەکاتو پێشبینی دەکات/ فاڵگرەوە.

٢-(حَزا و حَزَّى- السَّــرابُ الشــيءَ. حَزواً): تراویلکەکە شتەکەی بەرز بە هەواوە پیشانداو

نواند.
(أَحْزى- الشــيءُ. إحْزاءً): شتەکە بەرزو بالآ بوو.
٢-(ألحَزى والحَزاء) (ن): مەعدەنوس.
(حَزاة و حَزاءَة): يەك چڵ مەعدەنووس.
(حَزى = حَزا): هەڵيسەنگاند/ خەملاندى.
حسّ: ١-(حَسَّ- هُ حَسّاً): كوشتىو لە رەگو ريشەى دەرهێنا.
(إحْتَسَّ- الشيءَ): شتەكەى لە بێخ دەرهێنا/ فەوتاندى.
إنْحَسَّت- أَســنانُهُ: ١-دانى لە بن هەڵكێشرا ٢- دانى (كولۆر بوو هەڵوەرىو شكا/ تەختبوو).
(ألحَسيس): كوژراو/ فەوتاو.
٢-(حَسَّ- الدابَّة. حَسّاً): ولآخەكەى رنەككرد/ بە رنەك تۆزو پيسييەكەى لێكردەوە.
(ألمِحَسَّــة): رنــەك (كــە ولآخــى پــێ رنەكدەكەن).
٣-(حَسَّ- النّارَ) حَسّاً: ئاگرەكەى خۆشكردو بلآوكــردەوە تــا نانەكە يــان كەبابەكە چاك ببرژێنێت.
(- اللَّحْمَ): گۆشتەكەى نايە سەر پشكۆكە.
٤-(حَـسَّ- لِفُلانٍ. حَسَــاً و حِسّــاً): دڵى بە فيسار كەس سووتاو دڵى بۆى نەرم بوو.
(- هُ): هەستى بزواند.
٥-(حَسَّ- الشــيءَ وبالشَّــيءِ): هەســتى بە شتەكە كردو پێيزانى.
(- بالخَبَر: حَسّاً و حِسّاً): هەواڵەكەى لە دڵدا چەسپى/ لاى عايەن بوو بڕواى پێكرد.
(أَحَسَّ- الشَــيءَ وبالشَّيءِ): بە شتەكەيزانى/ هەستى پێكرد/ بۆيچوو.
(«حَـسَّ وأَحسَّ مِنــهُ خَبَـــراً»): هەواڵێكى (لێهەڵێنجا/ لێوە بەرگوێكەوت.
(تَحَسَّسَ): گوێى چاك هەڵخستو باش چاوى گێرا.
(- الخَبَرَ): گوێى بۆ هەواڵەكە هەڵخســت/ بە دوايدا گەڕاو هەوڵى زانينيدا.
(- الشيءَ): بە دەســتكوتانو هەستەكانيترى بۆ شتكە گەڕاو پێيزانى.
(- مِنــهُ): ١-هەواڵــى ئەوى بەدەســتكەوتو زانــى ٢-لەوەوە بە هەواڵەكەيزانىو هەســتى پێكردنو بۆيچوو.
(إحْتَسَّ- الشَيءَ): دەستى لە شتەكە كوتا.
(- الحِــسّ) (مــص): بــزوەو دەنگــى نزمى پەنهانى.
(«ماسَــمِعتُ لَــهُ حَسّــاً»): هەســتم نە بە جووڵەيكــردو نە بــە دەنگى نزمــى/ نە بە جووڵەيمزانىو نە دەنگێكيشى هاتە بەرگوێم ٢-هەســتپێكردنو پێزانين. كەســێك بەلاتدا تێدەپەڕێتو نايبينيت بەلآم دەنگێكى نزمى بەرگوێت دەكەوێت ٣-ئازارێكە كە زەيستانەكە پاش منداڵبوون هەستى پێدەكات.
(حِسُّ الحُمّى): هەست بە سەرەتاى تاگرتن/

لەشداگیرسانو داهێزران کردن.
(اَلحَسيّ): هەستیی/ هەستییانە ئەوەی کە بە ئاشـــکراو دیار پێیبزانیت. ئەمە پێچەوانەی ئاوەزییە.
(اَلَمذهَبُ الحِسيّ أَو الحِسيَّة): هەستە رێبازە/ بـــیرزای ئەوانەیە کە دەڵێن هەموو توانایەکی ئاوەز لە هەستپێکردنەوەیە.
(اَلحَسَّةُ والحِسَّةُ): بار/ رەوش.
("هُوَ فِي حِسَّةِ سوءِ"): ئەو لە بارێکی هەست خراپدایە/ حاڵی شرە.
(حِســاسُ الحُمَّــى): هەســـت بـــە تاڵیهاتنو لەشگرانبوون.
(اَلحَسِيس): دەنگی زۆر نزم. بزوە. جووڵە.
(اَلحاسَّة (ج) حَواس): مێی وشەی (الحاسّ):
١-هەست/ دەروونەهێزی پێزانین/ دەرکپێکەر.
(اَلحَــواس الخَمــس): پێنـــج هەســـتەکە کە بیســـتنو بینـــینو بۆنکـــردنو چەشـــتنو دەستلێدانە.
(حَسّــاس): پێبەنزیـــن/ بەنزینـــدەر لـــە ئوتومبیلـــدا، پێـــی پێدادەنێـــن بەنزیـــن بە ئاگرکـــەرەوەی ئوتومبیلەکـــە دەداتو ئـــەو خێراییە دەدات کە پێویست بێت.
حَسّاســـاتُ الحَياء: لە شتی بیرعەتو ناچیزە شەرمو شکۆکردن هەست بە بێز لێکردنەوەی شتی ناشیرین (ئیدیۆمە).
٦-(حَسَّ-البَردُ الزَرعَ): سەرماکە کشتەکەی بردو سووتاند.
(«أَلبَردُ مَحَسَّةُ لِلنَّبات»): سەرما رووەکبردەیە.
(حَــواسُّ الأَرض خَمْــس): فەوتێنی خاكو زەوی پێنجن.
(اَلبَردُ): سەرما.
(اَلبَرَدُ): تەرزە.
(اَلرِّيح): با.
(اَلجَرادُ): کوللە.
(اَلَمواشي): ئاژەڵ ئەمانە زەویفەوتێنن.
(«مَــرَّت بالقَوم حَواسٌّ»): ســالانی نەهاتو نەهامەتیی بەسەر خوێشگەلدا هات.
(اَلحَســوس): رەشەســاڵ/ ســاڵی نەهــاتو بێدەرامەتی یان کەمدەرامەتیی.
(اَلحُساس): نەحس/ چارەرەشی/ بەدوومیی و تاڵیی ژیان.
(اَلَمحْســوس): چارەرەش/ شـــووم/ بەدووم/ پێرەش.
(«أَرضُ مَحسوسَـــة»): زەوییەکـــی بەدفەرە، کوللە لێدراو یان تەرزەلێدراو.
٧-(اَلحَسّ): فێڵ.
(اَلحُساس): بەدرەوشتیی.
(اَلحُساس): بەردەوردەی شکاو/ تەلاشەبەرد.
(حُساسَة): تەلاشە بەردێکی بچووك.
(-) (ح): وردە ماسیەکە وشکیدەکەنەوە.
٨-(حَسْــحَسَ- لَهُ): بۆی ژان چووە دڵیەوە/ جەرگی بۆی ژانیکرد.

(- اللَّحْمَ): گۆشــتەکەی خســتە سەر پشکۆو هەڵگێڕو داگێڕیکرد.
(تَحَسْحَسَ- لِلقِيام): بۆ هەستان بزوا/ جما.
(- ت أو بارُ الإبِلِ): تووکی حوشترەکە پەرش‌و بڵاوبووەوەو بە ئاسماندا چوو.
الملحق:
حَــسَّ: (ألحَسّاسِــيَّة): ١-دەردە هەســتە ٢-هەستیاریی ٣-خارشــت. تایبەتمەندییەکی لەشــی زیندووە کە کاری تێبکرێت‌و بە هۆی وروژاندنــی شــتی دەرەکی یــان ناوەکییەوە دەبێت.
حَساسِــيَّةُ لِلبَرد: ١-ســەرمازوو کاری تێبکات ٢-دەردە هەستە بەرامبەر دەرمان یان هەڵاڵەی گوڵ یان سەرما.

---

حســـب: ١-(حَسَــبَ- ـُ. حَسْــباً و حَساباً و حِســباناً و حَسْــبَةً و حِســابَةً و حُسْباناً): ١-ژماردی ٢- وایدانا.
(حاسَبَ- ـُ. مُحاسَبَةً و حِساباً): لێپرسیەوە/ لێپرسینەوەی (لەسەر دانا/ لەگەڵدا کرد).
(تَحاسَبا): لە یەکتریان پرسییەوەو شتەکەیان بەسەرکردەوەو بەرچاوخست.
(إحْتَسَــبَ- الأمرَ): کارەکەی ڕەچاو کردو بە سەرکردەوە/ لێکیدایەوە.
(- عِندَ اللهِ خيراً): کاری چاکی بۆ قایلبوونی خــودا ئەنجامــدا/ لــە ڕێــی خــودادا کاری چاکیکرد.
(ألحَسَــب): ژمارەو بە پێی ئەوە/ بە گوێرەی ئەوەو چەندانە.
(«هذا بِحَسَــبِ ذاك»): ئەمە بــە (پێی/ بە گوێرەی) ئەوەیە.
(إعْمَل على حَسَــبِ ما أمَرْتُكَ): بە گوێرەی ئەو فەرمانەی داومیتێ کاربکە.
(«حَسْبَما ذُكِرَ»): وەك چۆن وتراوە ئاوا/ بە پێی ئەوەی وتراوە.
(ألحَسَب= ألمَحسُوب): ١-ژمارەکراو/ ڕەچاوکراو ٢-بەگوێرە/ بە پێی ئەوە.
(ألحِساب (مص): ژمێرە/ ژماردن.
(«يرزُقُ اللهُ مَن يَشــاءُ بِغَيرِ حساب»): خودا بە بێ ژماردە، بە لێشــاو دەیدات بەو کەسەی خۆی دەیەوێت.
(ألحِساب): خەڵکێکی بێشومار.
(«أتانــي حســابٌ مِــنَ النــاس»): کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر/ بێشومار بۆ لام هاتن.
(حِســابُ الجُمَل): ژمێرەی کۆی پیتەکان لە رستەدا.
(يَومُ الحِســاب): ڕۆژی لێپرســینەوە/ ڕۆژی زیندووبوونەوە/ ڕۆژی قیامەت/ حەشر.
(ألحاسِبُ (فا) (ج) حَسَبَة): ژمێریار.
(ألحِسابِيُّ): زانای ژمێرە/ ژمێرەزان.
(ألحِسْبَةُ (ج) حِسَب): چاکەو پاداشت.
(ألحَسيب= ألمُحاسِب): ژمێریار- لێپرسەرەوە.
("كفى باللهِ حســيباً"): هێندە بەســە خودا

لێپرسەرەوە بێت.

(اَلحُسبان= الحِسَاب):ژمێرەکردن/ ژماردن.

(«مُحْتَسِبُ البَلَدِ»)کارمەندیبەسەرکەرەوەی شایەنو شتیتر لە شارەکەدا.

٢-(حَسِبَ- هُ حِسباناً و مَحْسَبَةً ومَحْسِبَةً): وایزانی/ وایبۆچوو.

(إحْتَسَبَ- الأمرَ):بۆ کارەکە واچوو/ وای بە بیردا هات/ وایزانی.

٣-(حَسُبَ. حَسَباً و حَسابَةً):رەسەنبوو/ خانەدانبوو یان جوامێرو بەخشندە بوو.

(حَسِیب (ج) حُسَباء):١-خانەدان/ رەسەن ٢-جوامێر.

(اَلحَسَب (ج) أحساب): ١-خانەدانیی/ رەسەنیی ٢-شکۆو گەورەیی باووباپیر کە شانازیی پێوە دەکەیت.

(اَلحَسیب):بە رەسەن/ خانەدانو بە نەژاد/ وەجاخزادە.

٤-(حَسَّبَ وأَحْسَبَ- ە):بە پێی دڵی خۆی دایەو تەواو تێریکرد/ هێندەی دایە تا وتی بە سمە.

(«أعطی فَأَحْسَبَ»):هێندەی بەخشیو دڵفراوانییکرد تا پێیگوترا بەسە.

(تَحَسَّبَ):بەسیبوو.

(إحْتَسَبَ- بِهِ):پێی بەسبوو/ بەوە داکەوت.

(«فُلانٌ لایُحْتَسَبُ بِهِ»):فیسار بە هیچ نازانرێت/ بێبایەخە.

(«فلان إسْتَعْطانی فاحْتَسَبْتَهُ»):فیسار داوایکرد منیش هێندەم پێبەخشی تا خۆی وتی بەسە.

(إحْتَسَبَ- عَنهُ):کۆتاییهات/ لەوەوە دەستی کێشایەوە.

(اَلحَسْب):بەسبوون، بەوە داکەوتن.

(«بِحَسبِك درهَمٌ»):پەنجاییەکت بەسە.

(«هذا رجُلٌ حَسْبُكَ مِن رَجُلٍ»):ئەمە پیاوێکە بەڵام چۆن پیاوێك، مەردە.

(مُحْسِبُ لَكَ):ئەو بۆ تۆ بەسە.

(«زَیدٌ صدیقي فَحَسبي»):زەید هاورێمەو ئیتر ئەوم بەسە.

(اَلحساب = الکافِي):تەواو/ بەس.

(«أَعطاهُ عِطاءً حِساباً»): بەخشینێکی تەواوی پێبەخشی/ ئەوەندە کە بەسیبێت.

٥-(حَسَّبَ- المَیتَ):مردووەکەی کفنکردو شاردیەوە یان لەناو بەرددا شاردیەوە.

(اَلحِسْبَةُ) (مص):ناشتنی مردوو بە کفنەوە یان لەناو بەرددا شاردنەوەی.

٦-(حَسَّبَ- هُ):سەرینی دایە پاڵی/ بە سەرین پاڵپشتیدا.

(تَحَسَّبَ):سەرینی خستە پاڵ خۆی. پاڵیدا بە سەرینەکەوە.

(اَلحُسبانَة والمِحْسَبَة):سەرینی بچووك/ گۆشەسەرین. پاڵپشتی بچووك.

٧-(تَحَسَّبَ- الخَبَرَ):هەواڵەکەی ساغکردەوەو

چووه بنچ و بناوانی.
(- هُ): ویستی بیزانێت و بە دوایدا گەڕاو ئەوی ویست.
(إحْتَسَبَ- ما عِندَ فُلان): لێکیدایەوە کە ئەوەی فیسار هەیەتی چەندەو تاقیکردەوە.
٨-(إحْتَسَبَ- علیه الأمرَ): کارەکەی ئەوی بە ناتەواوو ناشیرین دانا.
٩-(إحْتَسَبَ- وَلَداً لَهُ): کوڕێکی گەورەی لەدەست چوو. ئەگەر بە بچووکی بمرێت دەڵێت: إفْتَرَطَهُ).
١٠-(اَلحُسبان): تیری بچووك.
(حُسْبانَة): تیرێکی بچووك.
(اَلحُسْبانَة): هەورە تریشقە ٢-هەور ٣-تەرزە.
حسد: (حَسَدَ و حَسَّدَ- فُلاناً نِعْمَتَهُ و علی نِعمَتِهِ حَسَداً وحَسادَةً): ئیرەیی پێبرد/ حەسودیی پێبرد (ئاواتی ئەوەی خواست کە ئەوەی ئەو هەیەتی بۆ ئەو بێت و ئەو هیچی نەمێنێت).
(حاسِد (ج) حُسَّاد و حَسَدَة و حُسَّد): ئیرەخواز/ حەسوود/ لەچەر.
(أَحْسَدَ- هُ): بە حەسوودی دانا/ بەئیرەخوازی هاتە بەرچاو.
(تَحاسَدا): ئیرەییان بە یەکبرد.
(اَلحَسُودُ (ج) حُسَّد: (بۆ نێرو مێیە) سروشت ئیرەباز.
(اَلحَسَّاد): زۆر حەسوود/ فرە ئیرەکێش/ زۆر ئیرەباز.
(اَلمَحْسَدَة): مایەی ئیرەیی/ هۆی ئیرەیی.
حسر: ١-(حَسَرَ- البَصَرُ حُسُوراً): چاوەکە کزوکۆڵ بوو.
(- الرَّجُلُ أَو الدابَّةُ): پیاوەکە یان چوارپێکە ماندوو شەکەت بوو.
(- الدابَّةَ): چوارپێکەی هێندە لێخوڕی تا شەکەتبوو.
(حَسِرَ. حَسَراً): ماندوو و شەکەت بوو/ لەپەلوپۆ کەوت.
(أَحْسَرَ- الدابَّةَ): وڵاخەکەی لێخوڕی تا تەواو شەکەتیکرد.
(إسْتَحْسَرَ): ماندوو و شەکەت بوو.
(اَلحَسِر): شەکەت.
(اَلحَسِیر (ج) حَسْری): ١-لاواز ٢-کزو بێتوانا/ پەککەوتە/ داماو.
(اَلمُحْسُورُ البَصَر): چاوکز/ چاو کەمتین.
٢-(حَسَرَ- الشَّیءَ. حَسْراً): شتەکەی دەرخست/ پەردەی لەسەر لادا.
(«حَسَرَ کُمَّهُ عَن ذِراعِهِ»): بازووی لێهەڵمالّی.
(«حَسَرَتِ الجارِیَةُ خِمارَها عَن وَجْهِها»): کەنیزەکەکە پەچەی سەر ڕووی هەڵماڵی.
(حاسِر (ج) حُسَّر و حَواسِر): ڕووهەڵماڵ/ بێپەچە.
(حَسَرَ- الغُصْنَ): تووڵەکەی ڕووتکرد/

توێکڵەکەی لێکردەوە.

(ـ الشيءُ):شتەکە دەرکەوت و ئاشکرابوو.

(- الماءُ):ئاوەکە لە شوێنی خۆیدا وشکیکردو ڕۆچوو.

(حَسَّرَ- الطَّيرُ):باڵندەکە پەڕەکەی وەری.

(تَحَسَّـــرَ- تِ المَرْأَةُ):ژنەکە دانیشـت و ڕووی خۆی دەرخست و هەڵماڵی.

(- الشَـعَرُ أو الرِّيـــشُ):قژەکەیـان پەڕەکە هەڵوەری.

(- الطائرُ):پەلەوەرەکە پەڕەکەی هەڵوەراند.

(إنْحَسَـــرَ- الشَّـيءُ):شـتەکە کەوتــە ڕوو/ دەرکەوت/ ئاشکرا بوو.

(- تِ الطَّيرُ):مەلەکە پەری تازەی دەرکرد لە جێی پەڕە کۆنە هەڵوەریوەکەی.

(أَلحُسَّــر):پیــادە جەنگـاوەرەکان کە ڕووی خۆیان و سەریان ڕووتکردووە یان بێقەڵغان و بێخودەن.

(ألحاسِر) (فا):١-سـەر ڕووت یان بێقەڵغان و زرێ ٢-ژنی بێرووپۆش.

(أَلمحسِر والمَحْسَر (ج) مَحاسِر):١-ڕوو/ چارە ٢-شێوە ٣-سروشت ٤-بە هەواڵ زانینی شتێك.

("فُلان مَليحُ المَنظَر، كريم المَحْسَر»):فیسار شێوە جوانەو هەواڵی جوانیشی تەواوە.

(«أَرضٌ عارِيَةُ المَحاسِر»):زەوییەکی ڕووتەنە.

٢-(حَسِرَ حَسْرَةً و حَسَراً): بە پەرۆش بوو/ عەزرەتی بوو/ بۆی سوێلەدڵ بوو.

(حَسَّرَ- هُ)داخی بردە دڵیەوە/ عەزرەتیکرد/ ناسۆری پێنۆشی/ سوێی بردە دڵیەوە.

(- تَحَسَّـــرَ- عَلَيـــهِ)بۆی بە پـــەرۆش بوو/ داخی بۆ خوارد/ بۆی سوێ چووە دڵیەوە.

(أَلحَسِر):بە پەرۆش/ سوێلەدڵ- تاسەکردوو.

(أَلحَسير (ج) حَسرى):سوێلەدڵ/ عەزرەتی/ بۆ شپرزە/ بە پەرۆش.

(أَلحَسْـــران):دڵ پـــڕ لە جەخارو ناســۆر بۆ شتێك پەشیمان کە لە دەست چووبێت/ سوێی لە دڵ.

(أَلحَسْرَة):پەژارە/ سوێدڵ/ داخ.

(أَلتَحاسِـــير): نەهامەتیــی/ خاکەســاریی/ چورتوم و بەڵا.

(تَحسِـــير): چورتومێـــك/ خاکەســارییەك/ بەڵایەك.

٤-(حَسَـــرَ- البَيت حَسْراً):(ماڵەکەی. ماڵی) گەسکدا.

(أَلمَحْسَرَة):گەسك.

٥-(حَسَرَ- هُ):١-ئازاریدا ٢-سووك و رسوایکرد/ بە چاوی سووك تەماشایکرد.

حسف: ١-(حَسَفَ- السَّحابُ حَسْفاً):هەورەکە ڕۆیشت.

(- الغَنَمَ):مەڕەکانی ڕادا/ لێخوڕی.

(أَلحَسْفَةُ):تەنکە هەور.

(حَسَفَ و حَسَّفَ- التَمْرَ حَسْفاً): خورماکەی لە هی خراپ و توێکڵی خورماو قنچك و شتیتر

پاككردهوه.
(- القَرْحَة): تویژی سەربرینەکەی لابرد.
(أَحْسَفَ- الثَّمَرَ): خورماکەی تێکەڵ بە خراپەکەیو قنچكو توێکڵەکەیەوە کرد.
(تَحَسَّفَ- الجِلْدُ): پێستەکە توێژی هەڵدا.
(اَلْحُساف): پاشماوەی هەموو شتێك کە خورابێتو کەمەکێکی مابێت.
(اَلْحُسافَة): خورمای بۆگەنو خراپی وەریوو بڵاو بوو یان توێکڵو قنچکەکەیو شتیتری.
(فُلان لا یُعطی مِنَ البُرِّ إلاّ نُسافَتَهُ و مِن الثَّمرِإلا حُسافَتَه): فیسار تەنها بنبێژنگو خورمای خراپو بۆگەن نەبێت نایبەخشێت.
(اَلْحُسافَة): جۆرە ئاوێك.
(حُسافَةُ النـاس): (خوێریو سەرسەری/ هیچو پووچی) ناو خەڵك.
٣-(حَسِفَ- تِ الحَیَّةُ. حَسْفاً و حَسِیفاً): مارەکە فیشکاندی.
(حَسْف و حَسیف الحَیَّةِ): فیشکاندنی مار/ فیشکەی مار.
٤-(حَسَفَ- الزَرعَ. حَسْفاً و حُسافاً): کشتەکەی درووەوەو کۆکردەوە.
٥-(حَسِفَ- لَه. حَسَفاً): ڕقو کینەو دوژمنایەتیی لێ پەچنییە دڵیەوە.
(اَلْحُسافَة والحَسیفَة): دوژمنایەتیو ڕقلێبوون.
(«رَجع بِحَسیفَةِ نفْسه»): دەستبەتاڵو بە ڕقو داخی دڵەوە هاتەوە.

٦-(تَحَسَّفَ- ت أَوبارُ الإبِلِ): تووکی حوشترەکان با بردی.
٧-(إنْحَسَفَ- الشيءُ في يَدي): شتەکە لە دەستمدا ورد بوو.
حسك: ١-(حَسِكَ عَلَيه. حَسَكاً): لێیتووڕە بوو.
(حَسِك): تووڕەو دەمارگرژ.
(اَلْحَسِیکَة والحَسَکَة والحُساکَة): ناحەزییو قینەبەرایەتییو دوژمنایەتیی.
٢-(حَسِكَ- تِ الدابَةُ): چوارپێکە دانەوێڵەکەی کرماند.
(أَحْسَكَ- الدابَّةَ): دانەوێڵەی بە چوارپێکە دا بیکرمێنێتو بیخوات.
(اَلْحَسِیکَة): ئالیکێك کە چوارپێ بیکرمێنێتو بیخوات.
٣-(أَحْسَكَ- النَباتُ): ڕووەکەکە دڕکی دەرکرد.
(حَسَكَ): دڕك/ چقڵ.
(اَلْحَسَك) (ن): ڕووەکی دڕکاوی/ دڕکەزێ.
(حَسَکَة) (ن): ڕووەکێکی دڕکاوی/ دڕکەزێیەك.
(- ( ع ا): دڕکە وردەی ماسی واتا ئێسقانە وردەی ماسی.
(اَلْحَسیکَة) (ح): ژیشك.
٤-(اَلْحَسیك): کورت.
حسل: ١-(حَسَلَ- الدابَّةَ. حَسْلاً): وڵاخەکەی توند لێخوڕی.

٢-(حَسَلَ- الشَيءَ. حَسْلاً): شتەکەی لەبەر پەککەوتوویی لاخست/ فرێدا.
(حُسِلَ- بِهِ): ڕسواو ترۆ کرا.
(حَسَّلَ- بِنَفسِهِ): ١-خۆی سووککرد ٢-خۆی تووشی کاری نزمو ناشیرین کرد.
(اَلحَسيل (ج) حُسُل): گەندەی شت.
(اَلحُسالَة): وردە توێکڵی جۆو شتیترو گەندەی هەموو شتێك.
(اَلحُسالَة والحَسيلَة): ڕسواو سووکی ناو کۆمەڵ.
(اَلمَحْسول): ١-پووشت/ نابرووبراو ٢-بێناموس/ ئەتککراو/ سووکی ناو کۆمەڵ/ بێزراو.
٣-(تَحَسَّلَ واحْتَسَلَ): ڕاوی بەچکە مارمێلکەیکرد.
(اَلحِسْل (ج) حِسْلَ وأحْسال وحُسُول و حِسلان) (ح): بەچکە مارمێلکە.
(«لا آتيكَ سِنَّ الحِسلِ»): تا دانی بەچکە مارمێلکە نەکەوێت نایەم. (دانی بەچکە مارمێلکە هەرگیز ناکەوێت تا دەمرێت): هەرگیز نایەم.
٤-(اَلحَسيل) (ح): گوێرەکە.
(حَسِيلَة): یەك گوێرەکە.
حسم: (حَسَمَ- هُ حَسْماً): کۆتایی پێهێنا/ بنەبڕیکرد.
(اِنْحَسَمَ): بنەبڕ بوو/ کۆتایی پێهات.
(حَسَمَ- العِرقَ): دەمارەکەی بڕیو داخیکرد تا خوێنی لەبەر نەڕوات.
(- الدَّاءَ): دەردەکەی بە دەرمان بنەبڕ کرد.
(- هُ الشَيءَ): نەیهێشت شتەکەی بۆ ببێت/ شتەکەی لێگرت.
(اَلأَحْسَم): پیاوی بە بڕشت/ بەکارو کارساز/ کاربڕەوە.
(اَلحُسام): شمشێری تیژی بڕەر.
(حُسامُ السَّيفِ): دەمی شمشێر.
(اَلحُسُوم): بەدووم/ چارە ڕەش.
(«أيامُ حُسُومٌ وأيامُ حُسوم»): ڕۆژانی بەدووم/ ڕۆژە ڕەش کە خێر لە خەڵکی دەبڕێت.
(اَلمَحْسَمَة): هۆی (بنبڕکردن/ کۆتایی پێهێنان).
(«هذا مَحْسَمَةٌ لِلداءِ»): ئەمە (بنبڕی دەردەکەیە/ کۆتایی پێدەهێنێت).
الملحق:
حسم: (اَلحَسْم): بڕینو لەبنهێنان/ لە بێخ هەڵکەندن.
(حَسْمُ الخِلافِ أَوِ الشَرِّ): نەهێشتنو بنبڕکردنی ناکۆکی یان خراپە.
(حَسْمُ الداءِ): بە دەرمان بنبڕکردنی دەردەکە.
(حَسْمُ العِرقِ): بڕینی دەماری خوێنو داخکردنی سەری دەمارەکە تا خوێنی لەبەر نەڕوات.
(حَسْم: (ت): داشکاندنی بڕێك پارە یان

نرخی شت كە لە نێواندا بە ژمێرە هەیە.
(حَسْمٌ- فِي الإدارة): لێبڕینی پارەی كارمەند لە بەڕێوەبردندا/ بڕینی بڕێك پارەی مووچەی كارمەندێـك بۆ تەمێكردنی یـان لەبەر هەر هۆیەكیتربێت.

---

حســن: ١-(حَسُنَ و حَسَــنَ. حُسْناً): ١-جوان بوو ٢-چاك بوو.
(حَسَنٌ (ج) حِسَــان و حُسَان (ج) حُسانُون وحاسِن و حَســین (م) حَسَنَة وحَسْناء (ج) حَسان و حَسَنات): جوان/ قەشەنگ.
(حُسَّــان) (م) (حُسَّــانَة): زۆر جــوان/ زۆر قەشەنگ.
(حَسَّــنَ- هُ): جوانیكــرد/ قەشــەنگیكردو ڕازاندیەوەو چاكیكرد.
(حاسَــنَ- هُ مُحاسَنَةً): ١-لە جوانیدا بۆڕیداو لەو قەشەنگتر بوو ٢-لاواندیو لەگەڵیدا جوان ڕەفتاریكرد.
(«إنّي لأحاسِنُ بِكَ الناسَ»): من بە جوانیتو كرداری جوانت لەناو خەڵكدا شـانازیت پێوە دەكەم.
(أَحْسَنَ): چاكەیكرد/ كاری باشی ئەنجامدا.
(- الشَّــيءَ): ١-شــتەكەی جــوانو باشــكرد ٢-شتەكەی باشزانی.
(«فُلانٌ يُحْسِنُ القِراءَةَ»): فیسار خوێندنەوەكە باش دەزانیت.
(أحْسَــنَ- إلَيهِ و بِهِ): خێری پێكردو چاكەی لەگەڵدا كرد.
(تَحَسَّــنَ): ١-چاكــتر بــوو/ خۆشــتر بــوو ٢-تەراشیكردو سەری تاشی.
(«دَخَــلَ الحَمّــامَ فَتَحَسَّــنَ»): چــووە گەرماوەكەوەو تەراشیكرد.
(تَحَسَّــنَ- بِكَــذا): بــەوە خــۆی ڕازاندەوەو جوانكرد.
(إسْتَحْسَــنَ- هُ): بە لایەوە چاكو جوان بوو/ بە چاكی لە قەڵەمدا.
(ألحُسْن (ج) مَحاسِن): جوانیی/ قەشەنگیی/ ڕازاوەیی/ چەلەنگیی.
(ألحُسْــن والحَسَــن) (ا ع): نێـسـكی دوای ئانیشك.
(المَحاسِن): شوێنی جوانو ڕێك لە لەشدا.
(حُسْنُ ســاعَةٍ) (ن): گوڵە سەعات ڕووەكێكە گوڵەكــەی كاتژمێرێــك پێــش خۆرهــەڵات دەگەشێتەوەو دوای خۆرهەڵات سیسدەبێت.
(سِتُّ الحُسن) (ن): هەنگوورە تاڵە، ڕووەكێكە دەناڵێتە درەختو گوڵێكی جوانی هەیە.
(ألحَسَــنَةُ (ج) حَسَنات): چاكە/ خێر/ بێر/ كردەوەی چاك/ پیاوەتی.
(ألأحْسَن (ج) أحاسِن (م) حُسْنى): ١-چاكەی زۆرتر ٢-جوانترین.
(«أحاسِــنُ القَوم»): ١-قەشەنگو جوانەكانی خوێشگەل ٢-چاكەكانی نەتەوە.
(الحُسْــنى (ج) حُسْــنَیات وحُسَــن): ١-

ئەوپەڕی چاکیی ٢-سەرکەوتن. دەستگیربوون
٣-پاشـــەڕۆژی ڕووناكو چاك/ ئەنجامی چاك
٤-شەهیدبوون، چونکە پاشەڕۆژ ڕوونو چاکە
٥-ڕووکردنە پەروەردگار.
٦-الاسماءُ الحُسنى: ناوە پیرۆزەکانی خودا کە
نـــەوەدو نۆن ڕێکخراونو یـــەك لە دوای یەك
دەوترێت.
(اَلحُسْنَیان): شـــەهیدبوونو دەستگیربوونی
سەرکەوتن.
("حُسَـــیناهُ و حُسَـــیناؤُهُ أن یَفعَـــلَ كـــذا):
ئەوپەڕی تواناییو باشـــترین شت ئەوەیە کە
ئەوە بکاتو ئەنجام بهێنێت.
(اَلحَسُّـــون) (ح): حەوتڕەنگیلە (باڵندەیەکی
بچووکی دەنگخۆشی ڕەنگینە پێشی دەوترێت
«الشّویکی».
(اَلمحسان): خێرخواز/ جوامێر/ خێرومەند.
(اَلمَحْسَنَةُ): کەڵکدار/ بەکەڵك/ جوانکار.
(«هـــذا طَعـــامٌ مُحْسَـــنَةٌ لِلجسـم»): ئەمە
خواردنێکە کەڵکدارە بۆ لەش جوانیدەکات.
(اَلتَّحاسین): شتی باشو جوان.
(«ما أَبْدَعَ تَحاسینَ الطاووسِ وتَزایینُهُ»): ئای
کە تاوس شـــتی جوانو باشی خۆرازاندنەوەی
پێوەیە.
٢-(أَحْسَـــنَ- الرَجُـــلُ): پیاوەکـــە لەســـەر
گردەڵێکی بەرز دانیشت.
(اَلحَسَن): گردە لی بەرز.

٣-(اَلحَسَنان): حەزرەتی حەسەنو حسەینی
کوڕانی حەزرەتی ئیمامی عەلی.
حسا: (حَسا و تَحَسَّى واحْتَسى المَرَقَ حَسواً):
شۆرباکەی وردە وردە هەڵقوڕاند.
(- الطائِـــرُ- المـــاءَ): باڵندەکـــە ئاوەکەی بە
دەنووك خواردەوە.
(حَسَّى واحتَســـى وحاسَى – الرَجُلَ المَرَقَ):
هێـــواش هێـــواش شـــۆرباکەی بـــە پیاوەکـــە
هەڵقوڕاند.
(اَلحَسو والحَسا والحَساء (ط): شۆرباو ئەوەی
هەڵدەقوڕێنرێت.
(تَحاسَیا): شۆربایان بە یەك هەڵقوڕاند.
(«یَـــومٌ کَحَســـو الطَّـــیرِ»): ڕۆژێکـــی کورت
هێندەی دەنووکە نـــاوی باڵندەیەك ئێمەیش
دەڵێین: (ڕۆژ کورتە کەرە زەرێکە).
(اَلحَســـوَ= الحَسْـــوُ): زۆر/ فـــرە شـــۆربا
هەڵقوڕێن.
(اَلحُســـوَة (ج) أَحسْـــیَته وأَحسُوَة) (جج)
أَحـــاس): فرێـــك/ فرێکـــی هەڵقوڕاندن یان
هەڵلووشین/ قومێك.
(«فِي الإنـــاءِ حُسْـــوَة»): قاپەکـــە قومێکـــی
تێدایە.
(اَلحَسْوَة (ج) حَسَوات): قومێك/ فرێك.
اَلحَسِیَّة: هەڵقوڕاندن.
حســـی: (حَسی واحْتَسى. حَسْـــیاً): چاڵێکی
هەڵکەند.

(اَلحِســى أَو الحَسْــيَ أَو الحِسْــيَ (ج) أَحْساء وحِســاء): زەوییەكــی تەخت كە نــاوی تێدا كۆدەبێتەوەو دەبێتە زەلكاو.

(حَسِــيَ واحْتَسی- مافي نَفسِــهِ): دەروونی جوڵاندو تاقیكردەوە بزانێت چی تێدایە.

حشّ: ١-(حَشَّ- تِ اليَدُ. حَشّــاً): دەستە كە وشكبوو/ لاكەوت یان تووشی گۆجیی بوو.

(- الوَلَدُ في بَطنِ الناقة): بەچكەكە لە ســكی مێحوشترەكەدا وشكبووەوە.

(أَحَــشَّ- تِ اليَــدُ): دەســتەكە ئیفلیج بوو لاكەوتو وشكبوو/ گۆجبوو.

(أَحَــشَّ- تِ الناقَةُ أَو المَــرْأَةُ): بەچكەكە لە سكی مێحوشــترەكەدا یان كورپەلەكە لە سكی ژنەكەدا وشكبووەوە.

مُحِــشٌّ: ژنێك یان مێناژەڵێك كە لە ســكیدا بەچكەكەیو كۆرپەلەكەی وشكبووبێتەوە.

اَلأُحْشُوش والمَحشُــوش): كۆرپەلەو بەچكەی وشكەوەبوو لە سكی دایكیدا.

(إِسْتَحَشَّ- تِ اليَدُ): دەستەكە وشكبوو.

٢-(حَــشَّ- الحَــربَ. حَشّــاً): شــەرەكەی ورووژاند/ ئاگری جەنگی كردەوە.

(- النــارَ): ئاگرەكەیكــردەوەو بــە مەقــاش تێژیكرد.

(- الفَرَسُ): ئەسپەكە وا خێرا غاریكرد وەك ئاگری گرتبێت وابوو.

(اَلمِحَش والمِحَشَّــة): مەقاش/ ئاسنێكە ئاگری پێخۆشدەكرێت.

٣-(حَــشَّ- المــالَ. حَشّــاً): ســامانو دارایی هەڵچنی/ زۆریكرد/ كەڵەكەیكرد.

٤-(حَشَّ- الصَّيدَ. حَشّاً): نێچیرە كوژراوەكانی بەملاولادا بەردایەوەو كەڵەكەیكردن.

(اَلحِشاش (ج) أَحِشَّة): (ئەملاولای/ تەنشتی) هەموو شتێك.

٥-(حَشَّ- العُشْــبَ. حَشّــاً): گیاكەی پاكۆدا/ دروێنەیكرد/ بڕیو كۆیكردەوە.

(الفَــرَسَ): گیا وشــكەكەی كــردە بەردەمی چارەوێكە.

(أَحَشَّ- الكَلأُ): گیاكە كاتی دروونەوەی هات.

(- تِ الأَرضُ): زەوییەكــە پــاوەنو گژوگیای زۆری لێڕوا یان تێدابوو.

(- هُ): لــە دروونەوەو ڕنینی پووشو گیاكەدا یارمەتیدا.

(إِحْتَشَ- الحَشــيشَ): پووشی ڕنیو بە دوای پووشدا گەڕا.

(اَلحُشّ والحَشّ والحِشّ (ج) حُشُوش): باخو بێستان.

(اَلمَحَــشّ والمَحَشَّــة (ج) مَحــاش): پــاوەن/ شوێنێك پووشو گیای زۆر لێبێت.

(اَلمِحَــش): داســی دروێنــەی پــووشو گیا/ كەرەنتوو/ داسی گەورە.

(اَلحَشيش): پووش.

(اَلحَشيشَة): چڵەپووشێك.

(حَانِيّ وحَانَوِيّ): (بە مێو بە نێر دەکرێت):
١ـمەیخانە ٢ـدوکاندار.
حنث: ١-(حَنِثَ. حَنْثاً): لە ڕێراست لایدا/ ڕووی کردە نارەوایی.
(- فِي يَمِينِهِ): سوێندەکەی شکاند/ سوێندەکەی نەبردە سەر/ لایدا.
(أَحْنَثَ- هُ): سوێندەکەی پێشکاند.
(تَحَنَّثَ- مِن كَذا): لەو گوناهە دوورکەوتەوە.
(اَلحِنْث (ج) أَحْناث) (مص): ١ـگوناه و تاوان/ خراپەکردن ٢ـهەستپێکردن/ پێزانین.
("بَلَغَ الغُلامُ الحِنثَ"): ١ـکورەکە هەستی بە گوناه پەیداکرد ٢ـبالّق بوو/ پێگەیشت.
٢-(تَحَنَّثَ): ١-(بێزی لە گوناهکردن هاتەوە لێیدوورکەوتەوە ٢ـکەوتە خوداپەرستیی ٣ـلە بت دوورکەوتەوەو ئیتر نەیپەرستن.
حنج: ١-(حَنَجَ- هُ حَنجاً): خواریکردەوە/ لایدا/ لاریکردەوە/ کەچیکرد.
(- الحَبْلَ): پەتەکەی توند بادا.
(أَحْنَجَ- الشيءُ): شتەکە لاربووەوە/ کەچبوو/ خواربووەوە.
(- الشيءَ): شتەکەی خوارکردەوە/ کەچیکرد.
(- الخَبَرَ): هەواڵەکەی شاردەوە.
(- الكَلامَ): قسەکەی وەرگێڕا تا تێینەگەن.
(- الرَّجُلُ): پیاوەکە بە هەڵەداوانو ئاوردانەوەوە ڕۆیشت.
(إِحْتَنَجَ- الشيءُ): شتەکە خواربووەوە/ کەچ بوو/ لاربووەوە.
٢-(حَنَجَ- تْ حاجَةٌ حَنجاً): پێداویستییەك بەرچاو کەوت/ هاتە بەردەم.
٣-(حَنْجَرَ- تِ العَينُ): چاوەکە بە قووڵداچوو.
(- هُ): قوڕقوڕاگەی هەڵهێنایەوە/ سەریبڕی.
(اَلحَنْجَرَة (ج) حَناجِر) (ع ا): قوڕقوڕاگە.
(اَلحُنْجُور (ج) حَناجِير): ١ـقورگ/ گەروو قوڕقوڕاگە ـسوراحیی ملباریك ٣ـبووڵەکەی بچووکی ماسی.
(اَلحَنْجور (ج) حَناجِير) (عامية): قاپولکەی شووشە بۆ مەرەکەب یان مەرهەم.
حنح: (حَنْحَنَ- البُنْدُقُ أَو الجَوزُ ونَحوَهما) (عامية): کاکڵەی گوێزەکە یان ناوی بندقەکە گەنی.
(حَمِتَ): گەنی.
(- عَلَيهِ): بەزەیی پێداهاتەوە.
حند: ١-(حَنْدَسَ و تَحَنْدَسَ- اللَّيلُ): شەوتاریکبوو.
(اَلحِنْدِس (ج) حَنادِس): ١ـشەوەزەنگ/ شەوی نەموستەچاو ٢ـتاریکیی.
(اَلحَنادِس): سێشەوەی کۆتایی مانگ کە زۆر تاریك دەبێت.
٢-(اَلحِنْدَقُوق والحَنْدَقُوق والحَنْدَقُوقى

والحِنْدَقُوقـى (نبطِيَّة): پياوى درێژداهۆڵى شێتۆكه.

(-) (ن) = (الـذُرَق): سـێپەره. له دەشـتو كێڵگەكاندا دەروێت.

حنـذ: ١-(حَنَـذَ- اللَّحْمَ حَنْـذاً و تَحْناذاً): گۆشتەكەى تەواو برژاندو پێگەياند.

(حَنيذ): گۆشتى باش برژاو.

(حَنَذَ- الفَرَسَ): ئەسـپەكەى تاودا تا ئارەق بكاتەوه.

(فـرسٌ مَحْنوذ وحَنيذ): ئەسـپى تاودراوى ئاودەرداو.

(حَنَذَ- هُ الشَّـمسُ): تيشكى خۆر تواندیەوه. سووتاندى.

(أَحْنَذَ- اللَّحمَ): گۆشتەكەى پێگەياند.

(إستَحْنَذَ): خۆى دايه بەر خۆرو خۆى داپۆشى تا ئاو دەردات/ ئارەق بكاتەوه.

(الحُنْذَةُ): گەرماى بەتين.

(حَناذِ): خۆر.

(الحَنيذ): ئاوى گەرم.

(-) جلى شۆراوى بۆندراو.

(الحِنذيـذ): چارەوێ يان مرۆڤێك كه ئەرەق زۆر بكاتەوه.

٢-(أَحْنَذَ): شـەربەتەكەى زۆر روونكرد يان زۆر ئاوى تێكرد دەيشڵێن كەمى تێكرد.

حنر(حَنَـرَ- الحَنـيرَة. حَنْـراً): تاقەكەى دروستكرد.

(الحَنـيرَة) (ج) حَنْـير و حَنائِـر) (ب): ١-كەوانـەى تاقـى دروسـتكراو ٢-كەوانـه ٣-هەرچى شێوه كەوانه بێت ٤-چەك و كەوانەى لۆكه شيكردنەوه.

حنس: (حَنِسَ. حَنَساً): ئازايانه له ناوەندى مەيدانى جەنگەكەدا مايەوه.

(الحُنُـس): لـه خـودا ترسـانى لـه گوناح دوورەپەرێز.

(حَنَـشَ- حَنَـشَ- ه حَنْشـاً): ١-دەريكرد/ دەريپەراند ٢-له شـوێنێكەوه بۆ شـوێنێكيتر راوەدووينا ٣-لايدا.

(- الصَّيدَ): نێچيرەكەى راوكرد.

(-تِ الحَيَّةُ فُلاناً): مارەكه به فيساريەوەدا.

(أَحْنَشَ- هُ): راويكرد.

(- عَنِ الأمر): له كارەكەيدا.

(الحَنَش (ج) أحناش و حُنْشان) (ح): ١-جۆره رەشـمارێكه ٢-هەرچى سـەرى وەكو سـەرى ماربێت وەكو بزنمژو قۆرييو هيترى وا.

حنط: ١-(حَنَط و أَحْنَطَ- الزَرعُ حُنُوطاً): كشتەكه دەمى دروێنەو كۆكردنەوەى هات.

(الحانِط) (فا): ١ گەنمى زۆر ٢-خاوەن گەنم.

الحِنْطَـة (ج) حِنَـط (ن): گەنـم جـۆره رووەكێكـه دانـدار بەناوبانگترينيان ئەوەيه كه بـه نـان دەكرێتو لـه ولاتـه ئاووهەوا مامناوەندیەكانـدا دەروێنرێـتو باشـترين خواردنى رەگەز سپيەكانه.

(حِنطَـةُ سـوداء) (ن): گەنمـە ڕەشـگوڵ: ڕووەکێکـە لـە کۆمەڵەی گوچانە شـوانەیە سـالآنەیە گەڵاکـەی سێگۆشـەییە ڕاسـت هەڵدەچێـت. چەنـد گوڵێك دەگرێـت ئاڵە. تۆوێکی ڕەشی سێگۆشەیی بەرهەمدەهێنێت. بۆ ئالیکی ولاخ بەکاردێت هەندێك حەڵوایشی لێدروسـتدەکرێت. ئەم ڕووەکـە نە لە ولاتی گەرمەسێرو نە لە ناوچەی ناوەڕاستدا نیە.

(الحِنطِيّ): ١ فرە گەنمخۆر ٢-هەڵاوساو.

(حِنطِيّ اللّون): گەنمرەنگ.

(الحَنّاطِيّ): دانەوێڵـە فرۆش/ گەنمفرۆش/ عەلاف.

٢-(حَنَـطَ- أَحْنَـطَ- الشَـجَرُ): درەختەکە بەرەکەی گەیاند.

(الحانِط): درەخت و گیای بەر پێگەیشتوو.

٣-(حَنَـطَ- الجِلْـدُ. حَنْطـاً): پێسـتەکە سوورهەڵگەڕا.

حانِط: پێستی سوورهەڵگەڕاو.

(الحانِط): سووری تێر/ تۆخ.

(أَحْمَرٌ حانِط): سووری تێر/ تۆخ.

٤-(حَنَّـطَ وأَحْنَـطَ – المَيِّـتَ): لاشـەی مردووەکەی مۆمیاکرد/ ناوسـك و هەناوی لە مۆمیا ئاخنی تا بۆگەن نەکات.

(تَحَنَّطَ): مۆمیای پێوەکرد.

(الحَنُوط والحِنـاط): هەموو بۆنێکی خۆش کە نەهێڵێت لاشە بۆ گەنبکات پاش دەرهێنانی ناوسك و هەناو لاشەکە لە دارزان بۆ ماوەیەکی زۆر بپارێزێت.

(ألحِناطَة): مومیاکردن.

(الحَنّاط): کەسـێکە کە مردوو مۆمیا بکات/ مۆمیاکار.

٥-(إسْـتَحْنَطَ): ئاواتی بە مردنی خواسـت و وەك مـردووی لێهـات و ژیانـی لەبەرچـاو تاریکبوو.

٦-(ألأَحْنَط): پیاوی تۆپەڵە ڕیش/ ڕیشن.

٧-(ألحِنطِيّ): ١-ئەوەی خواردنەکەی گەنمبێت ٢-کورتەبنە.

ألحِنْطَـأْ والحِنْطَـأْوَة): ١-کـورت/ کورتەبنە ٢-ورگن.

حنـظ: ١-(ألحُنْظُبـاء والحُنْظَبـاء (ح): ١-نێرەکوللە ٢-قالۆنچە نێرە.

(ألحِنظاب): کورتەبنەی درو شەڕانی.

(ألحُنْظُوب): ژنە کەتەی بێکارە/ خراپ.

(حَنْظَـلَ- تِ الشَـجَرَةُ): درەختەکە بەرتاڵ بوو.

(الحَنظَـل) (ن): گوژاڵـك/ کاڵەکەمارانـە. ڕووەکێکـە وەك کاڵـەك بەسـەر زەویـدا درێژدەبێـت سـەرچاوەکەی لێـواری دەریای سـپییە، بەرەکەی وەك بـەری کاڵەکە بەلام زۆر بچووکترە، زۆر ژەهراوییە لە پزیشـکیدا بەکاردێت. بە نموونە دەیهێننەوە دەڵێن.

(«أَمَرُّ مِـنَ الحَنظَل»): کارێکـە لە گوژاڵك

تاڵترە.

حنف: ١-(حَنَفَ. حَنْفاً): خوار بوو/ لار بوو/ گێڕ بوو.

(- رِجْلَهُ): قاچی بۆ ناوەوە خوارکردەوە.

(حَنِفَ و حَنُفَ. حَنَفاً و حَنافَةً): قاچی گێڕ بوو بۆ ناوەوە نوشتایەوە.

(حَنفاء)": قاچی گۆج/ گێڕ بۆ ناوەوە.

(أَحْنَف): پیاوی قاچ گۆج/ گێڕ.

(حَنَّفَ- هُ): قاچی گۆجکرد/ گێڕکرد.

(تَحَنَّـفَ): بوو بـە حەنەفی/ هەڵسـوکەوتی حەنەفیانەی کرد.

("شـافِعِيٌ تَحَنَّـفَ"): شـافیعیەك بـوو بە حەنەفی.

(تَحَنَّفَ- إلَيهِ): بەلای ئەودا لایدا.

(ألحَنيف (ج) حُنَفاء): ١-موسـڵمانی سـاغو ڕاست یان تەواو لەسەری جێگیرو لایەنگیر ٢-ئەوانەن کە لە پێش ئیسـلامدا لەسەر دینی حەزرەتـی ئیبراهیـم بوون ٣-ئـەوەی بڕوای بە تـاكو تەنهایی خودایە ٤-مرۆڤی ڕاسـتو دروست.

ألحَفاء: کەوان.

(ألحَنيفـيّ (ج) أحْنـاف وحَنَفِيَّـة): شوێنکەوتووانی ڕێڕەوی ئیمامی حەنیفە.

(ألحَنَفِيَّـةُ- فِي الأسـلام أوِ الديـن): ڕوو لە ئیسلامو پێوە بەندبوونیو زۆر پێوەلکانی.

٢-(ألحَنْفاء): ١-گوێزان ٢-(ح) خۆرپەرسـت/ ترترە ٣-کیسەڵ.

(ألحَنَفِيَّة) (حي): بەلووعە.

٣-(ألحِنفِـش والحِنفيـش (ج) حَنافِـش و حَنافيش) (ح): مارێکی گەورەیە سەری زۆر زلە. ملباریکە. زۆر پیسـەو ژەهرداره هەرکە تووڕە بوو دەماری ملی هەڵدەسێت.

حنـق: ١-(حَنِقَ- مِنهُ و عَلَيهِ. حَنَقاً): ڕقی لێهەستا/ لێیەکەوتە پڕژو غار.

(حِنِق و حَنيـق (ج) حُنُق): قینهەسـتاو/ ڕقهەستاو.

(أحْنَقَ- هُ): تووڕەیکرد/ ڕقیهەستاند.

(- الرَجُلُ): پیاوەکە قین وا چووە دڵیەوە کە دەرنەچێت.

(ألحَنَق والحَنِق): قینو ڕقی توند.

٢-(أحْنَقَ- الدابَّةَ): وڵاخەکەی (چرووساند/ پووکاندیەوە/ لەڕیکرد.

(إحْتَنَقَ): قەڵەو بوو.

(ألحُنَـق والمَحانِيق — مِنَ الإبل): حوشـترە قەڵەوەکان.

حنك: ١-(حَنَكَ- الشيءَ حَنْكاً): ١-لە شتەکە گەیشـت/ چووە بنجو بناوانی شتەکەوە ٢-لە شتەکەدا قاڵ بوو.

(حَنَـكَ وأحْنَكَ واحْتَنَكَ- الدَّهـرُ الرَجُلَ. حَنْـكاً و حَنَـكاً): ڕۆژگار پیاوەکـەی (قاڵ/ دەرهاتوو و داناکرد).

(حَنِيك (ج) حُنُك): قاڵو دەرهاتووی ژیان/

دانا.
(حَنَّـكَ- الصَبِـيَّ):کورەکەی جوانڕەوشـت پەروەردە کرد.
(- الدَّهــرُ الرَجُلَ):ئەزموونو بەسـەرهاتی ژیانو ڕۆژگـار پیاوەکـەی (دەرهاتوو/ ڤاڵو دانا) کرد.
(اَلحُنْـك والحِنْـك والحُنكَـة): دانایـیو ڤاڵبوویی/ دەرهاتوویی‌و کارزانیی.
(اَلحُنُك (م) حُنْكة):داناو دەرهاتوو/ ڤاڵ کە ڕۆژگارو ئەزمون کارزانی‌و لێزانی کردووە.
(اَلمُحَنَّـكَ):کارامەو خاوەن ئەزموون/ لێزان/ دنیادیدە/ چاوکراوە.
٢-(حَنَـكَ. حَنْـكاً):شـتی جـوو/ کاکیلەی جووڵاند.
(حَنَكَ واحْتَنَكَ- الفَرَسَ): چارەوێکەی لغاو کرد.
(حَنَّـكَ- تِ القابلـةُ الطِفـلَ) (عامیَّـة): مامانەکە پێش مەمکدانی کۆرپەکە مەلاشووی کۆرپەکـەی بـە ڕۆنـی بـادامو ڕبەهەنـار چەورکرد.
(تَحنیـكُ المَیِّـت):ئەوەیـە ژێـر کاکیلەی مردووەکە بە پەڕۆ بسڕرێت (عامیە).
(تَحَنَّكَ- في الكَلام):گوستاغانە قسەیکرد.
(اَلحَنَك (ج) أَحْناك) (ع ا):١-مەلاشوو ٢-ژێر چەناگە.
(اَلحِناك (ج) حُنُك و المِحنَك):پەتی ڕەشمەی ولاخ.
٣-(إحْتَنَـكَ- هُ): دەسـتی بەسـەردا گرت/ داگیریکرد.
(- الجرادُ الأَرضَ):کولله ڕووەکی زەویەکەی (بنەبرکرد/ ڤرتکرد).
(إستَحْنَكَ):ژەمبوردە بوو/ گەدەی کرایەوە کە لەوەپێش نەیدەخوارد یان کەمی دەخوارد.
٤-(اَلحَنَك):١-گردووڵکەی بەرز کە بەردەکەی سپی‌و خاوە.
(حَنَكَة):گردێکی بچوکی بەردینی بەرد خاوو سـپی ٢-خەڵکانێك کە بۆ لەوەڕی ئاژەڵیان بە وڵاتدا بگەڕێن.
(حَنَـكُ الغرابِ (ج) أَحْنـاك):دەنووکی یان ڕەشیی ڤەڵەڕەشکە.
(«أَسـوَدُ مِن حَنكِ الغُـرابِ»):لە دەنووکی ڤەڵەڕەش یان لە ڕەشیی ڤەڵەڕەش ڕەشترە.
(اَلحانِك= الحالِك):ڕەش تاریك.
(«أَسـوَدُ حانِك»):ڕەشی تاریك/ ڕەشی تێر/ زۆر ڕەش.
٥-(اَلحَنكَلیـس) (ح) (أَعجمیة) = (الجِرِّی): ماسیی نقە.
حنا: ١-(حَنا-الشَيءَ. حَنْواً): چەماندیەوەو پێچی پێدا/ بایدا.
(حَنا- الحِنیَّة):کەوانەکەی دروستکرد.
(حَنـى – الشـيءَ: حِنایَـةً): شـتەکەی چەماندەوەو پێچی پێدادا.

(حَنَّى- الشَيءَ تَحْنِيَةً): شتەکەی نوشتانەوە/ پێچی پێدا.
(تَحَنَّى): خواربووەوەو پێچیخوارد.
(اَلحِنْو والحَنْو) (ج) أَحْناء وحُنِيٌّ و حِنِيٌّ): ١-هەموو ئەندامێکی لەش کە کەچی تێدابێت وەك دانە پەراسوو ٢-هەموو چێوێکی خوار/ کەچ.
(اَلحَنِيَّة (ج) حَنايا و حِنِيّ): کەوانە (ب): ئەوەی کەوانە شێوە بێت وەك کەوانە تاق.
(حِنيَّةُ الكَنيسةِ): تاقی کڵێسە کە بەسەر پەیکەرەکەوەیەو پێشی کڵێسەکەیە.
(اَلمَحْنِيَّة والمَحْنُوة والمَحْناة (ج) مَحانٍ- مِن الوادي): پێچی دۆڵ/ دەرە.
(اَلحانِيَّةُ (ج) حَوانٍ والحَانَاة والحانُوت): دوکان/ فرۆشگا/ کۆگا.
(اَلحانَوِيّ والحانِيُّ): دووکاندار/ فرۆشگادار/ کۆگادار.
(اَلحَوانِي) (ع ا): دوو دانە پەراسووە درێژەکەی هەردوو لای پەراسوو (لەبەر خوارییان وایان ناوناون).
(اَلمُنحنى): پێچی دۆڵ.
(اَلحانِيَة): ١-مێی وشەی (اَلحانِي): ٢-مەی کە لە مەیخانەدا دەخورێتەوە.
(اَلخَمّارون): مەینۆشەکان/ مەیخۆرەکان.
(اَلأَحْنى (م) حَنْواء): قەموور/ کۆم.
٢-(حَنى وأَحنى عَلَيهِ. حُنُوّاً): لاواندی/ سۆزی دایە/ لەگەڵیدا میهرەبان بوو.
(تَحَنَّى- عَلَيهِ): سۆزی بۆی جوولا/ میهرەبانییدایە.
(اَلأَحنى): بەبەزەییترین/ میهرەبانترین.
("فُلان أَحْنى النَاسِ ضُلُوعاً عَلَيْكَ"): فیسار لە هەموو کەسێك پتر سۆزی لەگەڵتدایەو دڵی پێتدەسووتێت/ میهرەبانتە.
٣-(اَلحِنْوُ- مِنَ الشيءِ): لای تەنشتی شتەکە.
(-مِنَ السَّرجِ): هەردوو قەڵپوزی زین هی پێش و پاشی.
(أَحناءُ الأُمورِ): کارە لێکچووەکان.
(حنى= حَنا): بایدا/ چەماندییەوە.
حاب: ١-(حابَ- بِكَذا حَوْباً و حُوْباً و حَوْبَةً و حاباً و حِيابَةً): بەوە گوناهبار بوو تووشی خراپە بوو.
(أَحْوَبَ. إِحْواباً): رووی کردە خراپەو گوناهکردن.
(تَحَوَّبَ): خۆی لە گوناه و خراپە پاراست/ لادا.
(اَلحَرْب والحابُ والحابَة والحَوْبَة والحُوبَة): گوناه/ خراپە.
(اَلأَحْوَب (م) حَوباء): گوناهبار/ خراپەکار/ گوناهکار.
٢-(تَحَوَّبَ- مِنهُ): ئازاری لێچێشت و داخی بەدەستەوە خوارد.
(- في دُعائِهِ): لە نزاکەیدا کرووسکایەوە/

پارایەوە.

(إِسْتَحْوَبَ): هاواری ژانیکرد.

(الحَوْب والحُوب): ١-پەژارە/ جەخار/ خەفەت ٢-ترس و دڵتەنگیی/ تەریکیی.

(الحَوْبَـةُ): ١-دایك و باوك ٢-خوشـك و دۆت/ کەنیشك.

(الحَوبَةُ والحَيبَةُ): ١-خزمی دایکان.

("لي فيهم حَوبَة"): لە دایکەوە خزمایەتیمان لەگەڵیاندا هەیە ٢-پێداویستی ٣-بار/ رەوش.

("بـاتَ بِحَوبَةِ سـوءٍ"): لە بارێکـی خراپدا مایەوە.

(الحُوبَـةُ= الحِيبَةُ): ١-خزمی دایکان ٢-پیاوی دەستەپاچەو بێکەڵك.

(«إِنَّ لـي حُوْبَةً أَعُولُهـا»): تاقمێکی داماوو لاکەوتـەم بەسـەردا کەوتـووە بەخێویـان دەکەم.

(«إِنَّمـا فلان حُوبَـةٌ»): فیسـار بوودەڵەیە بێکەڵکە/ نە خێرو نەخراپەی هەیە.

(الحَوْبـاء (ج) حَوباوات): دەروون (دەڵێن لە (حَوبَة)وە وەرگیراوە کە پێداویسـتییە گوایا دەروون کانگای پێداویستییە.

حات: (حاتَ- الطَيْرُ أَو الوَحْشُ على الشيءِ. حَوْتاً و حَوَتاناً): باڵندەکە یان دڕندەکە گڕو خولی شتەکەیدا.

(حـاوَتَ- هُ): وەك نەهەنـگ فێڵێڵێکـرد/ دەستیبڕی/ لە خشتەیبرد/ تەفرەیدا.

(- هُ عَـن كـذا): بەری ئەو شـتەی لێگرت و نەیهێشت دەستی بیگاتێ.

(اَلحوت (ج) حِيتان وأَحْوات و حِوَتَةُ) (ح): ١-ماسی گەورە ٢-نەهەنگ ٣-(فك) (یەکێکە لە برجەکانی ئاسمان.

حاث: ١-(أَحاثَ- الأَرضَ. إِحاثَةً): زەویەکەی هەڵکۆڵی/ هەڵدڕی.

(إِسْـتَحاثَ- الأَرضَ إِسـتِحاثَةً): زەویەکـەی هەڵکۆڵی و بۆ شتی ناوی گەڕا.

(- الشَيءَ): شـتەکەی دەرهێنا شتی ناوسکی زەوی کە بە ژێرەوە بووە.

٢-(أَحاثَ- الشَـيءَ): شـتەکەی پەرت و بڵاو کردەوە.

(«تَرَكْتُهم حَوْثَ بَوْثَ أَو حَيْثَ بَيْثَ أَو حاثِ بـاثِ أَو حَوْثـاً بَوْثاً»): بە پـەرش و بڵاویی بەجێمهێشتن.

٣-(اَلحَوْثاء): ١-ئافرەتی قەڵەو ٢-(اع): جگەرو خوار جگەر.

حـاج: ١-(حاجَ. حَوجـاً): نەبووبوو/ هەژار بوو/ پێویستیی هەبوو.

(أَحْوَجَ- إِلَيهِ): نەبوو بوو/ پێویستی بەو یان بەوە هەبوو.

(- هُ): خوازیاریکـرد/ کەمدەسـتیکرد/ نەبوویکرد.

(تَحَوَّجَ): پێداویستیەکەی ویست/ داوایکردو بۆیچوو.

("خَرَجَ فـلان يَتَحَوَّجُ"): فيسـار بۆ كرينى پێداويستيەكانى دەرچوو.
(إحتاجَ- إلَيهِ): ئەوەى پێويست بوو.
(ألحاجَـة (ج) حـاج و حِـوَج و حاجـات وحَوائِـج): ١-پێداويسـتى/ نياز پێويسـتى/ خواست/ شتى نەبووى پێويست.
(حائجة): زۆر پێويست.
("حاجة حائِجَـة"): پێداويسـتييەكى زۆر پێويست ٢-سوال/ دەرۆزەكردن.
(ألحَوجاء): پێداويستيى.
("ماكان فِي نَفسِـهِ حَوْجـاءُ ولا لَوجاءُ"): لە دەروونـدا هيچى نەدەويسـتو نيازى هيچى نەبوو (بە بچووككردنەوەى).
(حُوَيجـاء ولا لُوَيْجـاء): پێداويسـتيەكى كەميشى نەدەويست.
(«كَلَّمْتُهُ فَما رَدَّ حَوْجاءَ ولا لَوجاءَ»): دواندم نە بە چاكو نە بە خراپ وەلامينەدايەوە.
(ألمَحاويـج): نەبـووەكان/ هـەژارەكان/ دەستكورتەكان- پێويستخوازەكان.
٢-(حَوَّجَ- بِهِ عَنِ الشَـيءِ): ئەوى لە شتەكە لادا/ واى لێكرد نەيەوێتو داواينەكات.
٣-(الحاج) (ن): ١-وشـترخوار جۆرە درکێکە وشتر دەيخوات ٢-(ن) جۆرە رووەكێكە ترش.
(ألحَوْج): بێوەيى.
(«حَوْجاً لَكَ»): بێوەى بيت.
حاد: (حادَ- عنهُ. حَوداً): خۆى لێلادا.
(حاوَدَ- هُ بالزِّيارَة): ناوبەناو سەريدا.
(- تَهُ): ناوبەناو سەريدا.
(- تَـهُ الحُمَّـى): جـارە ناجارێـك تـا بۆى دەهاتەوە.
حاذ: (حـاذَ- هُ حَوذاً): ١-خوليـدا/ دەوريدا ٢-پاراستىو بەتەنگيەوە هات.
(- الدابَّـةَ): ولاخەكـەى خێـرا (لێخـوڕى/ ئاژووت).
(- على الشَـيءِ): پاراسـتىو بەدەربەسـتى شـتەكەوە هات (لە كۆكردنـەوەو لێخوڕينى حوشترەوە وەرگيراوە).
(أحْـوَذَ- الدابَّةَ): چوارپێكـەى دايە پێشو خێرا لێيخوڕى.
(- السَّيرَ): زۆر گورج ڕۆيشت/ توند ڕۆيشت.
(- ثَوبَهُ): جلەكەى (گرمۆڵەكرد/ كۆكردەوە).
(- الشَاعِرُ قصيدَتَهُ): شاعيرەكە هەڵبەستەكەى تۆكمە هۆنييەوە.
(إسـتَحْوَذَ- عليه): ١-دەسـتى بەسەرداگرت/ داگيريكرد ٢-بەسەريدا زاڵ بوو.
(ألحُـوذِيّ): گاليسـەكەوان/ عەرەبانچـى- لێخوڕى- ولاخلێخوڕ.
(ألأحْـوَذِيّ): ١-چابوك لە هەموو كارێكدا/ بە دەستوبرد ٢-كارامە.
٢-(الحاذ) (ن): درەختێكە.
حاذَة (ج) آحاذ (ن): يەكێكە لەو درەختە كە خەڵكە ڕەشۆكييەكە پێيدەڵێن: (ألحَوز).

(ألحاذ): پشت/ پاڵ.

("فلانٌ خَفيفُ الحاذ أو خَفيفُ الظَّهر): فیسار ١-بێپاڵو پشته ٢-کەمدەستە/ دەستکورتە.

(ألحِواذ): ١-دووریی ٢-لەیەکپچڕان/ لەیەك بڕان/ لەیەك دوورکەوتنەوە.

٣-(ألحَـوْذان) (ن): کلاوەسـووره/ چونـگ/ گوڵەبەهارەلەوڵاتەئاووهەوا مامناوەندییەکاندا زۆرە گوڵەکەی جوانە بە زۆریی زەردە لە یونانو ئێـران زۆرە جۆرێکـی گوڵەکـەی گەورەترەو سوورێکی تێرە.

حـار: ١-(حارَ. حَـؤُراً و حُـؤُراً و مَحاراً و مَحارَةً): گەڕایەوە.

(حـاوَرَ- هُ. مُحـاوَرَةً و حِـواراً و حَواراً): لەگەڵیدا قسەی هێناو برد/ دواو وەڵامیدایەوە/ شەرە بەڵگەیکرد.

(أحارَ- الجَوابَ. إحارَةً): وەڵامیدایەوە.

(«لـم يُحْـرِ الجَـوابَ»): وەڵامــی نەبــوو/ نقەینەکرد/ وەڵامی نەدایەوە.

(«طَحَنَــتِ الطاحِنَةُ فَما أحارَت شَـيئاً»): بەرداشـەکە سـووڕیخوارد، بەڵام ئاردی هیچ نەدا.

(تَحاوَرَ- القَومُ): خوێشگەل وەڵامی یەکتریان دایـەوەو لەگەڵ یەك قسـەیان هێنـاو برد/ دوان/ وتووێژیانکرد.

(المَحارَة): ١-گەڕانەوە ٢-شـوێنی بۆ گەڕانەوە یان لێوەی گەڕانەوە.

(إستَحارَ- هُ): هێنایە دواندن.

(ألمَحْوَرَة والمَحُوْرَة): وەڵام.

٢-(حــارَ. تَحَيَّرَ حَوْراً و حُـؤُوراً و مَحاراً و مَحارَةً): حەپەساو/ سەرسامبوو/ سەریسوڕما/ واقیوڕما.

(الحائِـر (فـا): سەرسـام/ سەرسـوڕماو/ حەپەساو/ واقوڕماو.

(ألحائِرَة): ژنی سەرسوڕماو/ حەپەساو.

٣-(حــارَ- الثَّوبَ. حَوراً): بەرگەکەی شـتو سپیکردەوە/ گازریکرد.

(حَوَّرَ- الثَّوبَ): پۆشاکەکەی سپیکردەوە.

(إحْوَرَّ. إحوِراراً): سپیبووەوە.

(ألحَوَر (ج) أحْوار): ١-پێسـتەی سـپی تەنك ٢-مانگای سپی.

(ألحَـوارِيُّ): ١-ڕەنگپەڕێـن/ هەرچـی ڕەنگ سـپیبکاتەوە ٢-یارو دۆستی دڵسۆز ٣-ئامۆژگار ٤-پشتگیر (وتراوە) پشتگیرانی پێغەمبەران.

(ألحَوارِيّــون): پشــتگیرانو پەیامبەرەکانــی حەزرەتی عیسا (دەڵێن: لەبەر دەروونپاکییانو ڕاستو دروستیی بڕوایان وا ناونراون).

(ألحَوارِيَّــةُ (ج) حَوارِيّــات): مێــی وشــەی (ألحَــوارِيّ): ئافرەتــی شارســتانیی (لەبــەر سپێتی ئافرەتی شارستانیی وایپێوتراوە).

(ألأحْوَرِيُّ): سپیی نەرمو نۆڵ.

(ألحُوّارى): ١-ئاردی زۆر وردو سپی ٢- (طا): گڵەسـپی کە دیواری پـێ سـپیدەکەنەوە ٣-

هەرچی سـپیاوی پێ بکەن‌و شـتی پێ سپی بکەنەوە.
٤-(حارَ. حَوْراً): کەمیکرد، کورتیهێنا.
("حـارَ بَعد ماکارَ"): پاش ئـەوەی زۆر بوو کەمیکرد.
(حارَ- الشَيءُ): شتەکە کەوت/ بازاری شکا.
(حَـوَّرَ- هُ اللهُ): خودا نائومێدیکرد/ ئومێدی بری.
(أحارَ- البَعيرَ): حوشترەکەی سەربری.
(الحُوْر): ١-کەمبوون/ کەموکوریی.
("إنَّـهُ في حَـورٍ و بَـورٍ"): لەکەمبـوون‌و شکستیدایە.
٢-(الحُوْر): فەوتان/ لەناوچوون.
(الحَوْر): کەمیی.
(«ما أصَبْتُ حَوْراً»): هیچیم دەستگیر نەبوو.
(الحائـر (م) الحائِرَةُ): لاواز بـوو/ بێتوانا/ بێتین.
(«ماهو إلاّ حائِرَةٌ مِنَ الحَوائِر»): بێخێرێکە لە بێفەرەکان.
(المَحارَة): کەم‌و کورتیی/ کەمبوون.
٥-(حَورَ- تِ العَينُ): چاوەکە بەلەکبوو جوان بوو سپێتییەکەی زۆر سپی‌و رەشێنییەکەیشی زۆر رەشبوو.
(حَوراء): مێینەی چاو بەلەك چاوەمەست.
(أحْوَر (ج) حُور): نێرینەی چاوبەلەك.
(إحوَرَّ- ت العَينُ إحْـوِراراً): چاوەکە بەلەك بوو/ مەستبوو.
٦-(حَوَّرَ- القُرصَ): خەپلەکەی بە تیرۆکەکە گێرا - تیرۆکەکەی بەسەر خەپلەکەدا گێرا.
(المِحـوَر (ج) مَحـاور): ١-تـیرۆك ٢-(حَي): تـەوەرە کە بەکرەی لەسـەر دەسـوورێتەوە ٣-گرێژەنـەی دەرگا ٤-ئەو پارچەیەی شـتی لەسەر دەسوورێتەوە.
(«قَلِقَـت مَحاوِرُهُ»): تـەوەرەی کارەکانی لە گرێژەنە چوو/ تێکچوو.
(المِحْـوَر) (هـ): راسـتەهێڵێکە کـە هەردوو جەمسەری گۆکە بە یەك دەگەیەنێت.
(مِحـوَر الأرض) (فك): تەوەرەی گۆی زەوی کە زەوی بە دەوریدا دەسـوورێتەوە. ئێمە وا دەزانین کـە هەموو گۆی ئاسـمان بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە.
(الحارَة): بۆشایی ئاسمان کە خڕ دەنوێنێت.
٧-(حَوَّرَ- الأديمَ): چەرمەکەی سوور کرد.
(الحَوَر (ج) أحوار): چەرمی سوورکراو.
(المُحَـوَّر): بـە چەرمـی سـوور ناوتێگیراو/ ناواخنکراو.
(خُفٌّ مُحَوَّر): پێلاوێکە ناواخنەکەی چەرمی سوورە.
٨-(أحارَ- تِ النَّاقَةُ): مێحوشترەکە بەچکەی هەیە کە هێشتا لەشیر نەبراوەتەوە.
(الحُـوار والحِـوار (ج) أحْـوِرَة و حِـيران) (ج): بەچکـەی حوشـتر کە هێشـتا لە شـیر

نەبرابێتەوە.
٩-(ألحَور): قوولایی‌و قوولیی بن‌و بێخ.
(«بَعیدُ الحَوْر»): ژیرمو بیری قووڵە.
(ألحَوَر (ن): سوورەچنار لە رەگەزی درەختی بییەو لە شـوێنی ئاوەنیـادا زۆرە زوو گەورە دەبێت‌و دارێکی سپی دەدات بۆ گەلێك ئامانج بەکاردێت.
(ألحـارَة): ١-گـەرەك کـە خانووەکانی نزیك یەکن ٢-کۆڵان.
(«نَزَلْنـا في حـارة بنی فـلان»): چووینە گەرەکی بەرەی فیسار.
(ألحَـوراء) (ح): لـە زانسـتیی مۆریاندا بە گوێزانەوەی کرمۆکە بۆ مۆریانی تەواو دەڵێن متبوو بە هی پەپوولە دەڵێن سر بوو بە مێش‌و مێشوولەو لەو بابەتانە دەڵێن کرمۆکە.
(ألمَحـارَة): ١-نووکـی پێـی حوشـتر کە وەك نینۆکی مرۆڤە ٢- مەلاشـوو ٣-گوێچکە ماسی یان سەدەف‌و هەر شتێك وەك ئەوە بێت.
(مَحارَةُ الأُذُن): ناوەوەی گوێ/ قوولایی گوێ.
حـاز: ١-(حازَ واحْتـازَ – الشَـيءَ حَوزاً و حیازَةً و احتِیازاً»): ١-شـتەکەی یەکخست‌و کۆیکردەوە/ هەڵیگرت ٢-دەستیکەوت.
(ألحَـوز): شـوێنی بەندکـراو/ دیوارکراو/ چوارلا گیراو.
(حَوزُ الدار):ئەو بەشانەی کە لە خانووەکەدان وەك ئاودەست‌و گەرماوو گەنجینەو شوێنیتر.
(ألحَوْزَةُ): کەنار/ لا.
(حَـوزَةُ المَلْکَـةِ): هەرچـی لـە سـنووری وڵاتەکەدا هەیە/ قەڵەمڕەوی وڵات.
(ألحَوّاز): بە چنگ/ بە هەڵپە/ پەیاکوندە.
(«الإثْـمُ حَـوّازُ القُلُـوب): خراپــەو گوناح دڵ رادەکێشـێت‌و بەسـەریدا زاڵ دەبێـت تا پێیدەقەومێنێت.
(ألحَـوزاء): جەنـگ کـە سـوپای قـورس‌و پێویستیی زۆری دەوێت‌و کۆیدەکاتەوە.
(ألحُوَیـزاء): ئازووخــە کە لە دۆسـتەکەتی دەشاریتەوەو بۆ خۆتی هەڵدەگریت.
(ألحَیْز والحَیِّز): شـوێن/ جێ کە لە وشـەی (الحَوز)ەوە وەرگیراوە.
٢-حــازَ- الرَجُلُ. حَوزاً): کابرا بە شـێنەیی رۆیشت.
(حازَ واحْتازَ- الإبِلَ إحْتیازاً): حوشترەکانی لەسەرخۆ/ هێواش لێخوڕی.
(حَوَّزَ- الإبِلَ. تَحْویزاً): یەکەمشەوی ئاودان حوشترەکانی بردەسەر ئاو بۆ ئاودانیان.
(لَیلَةَ الحَوْز): یەکەمشەوی بردنی حوشتر بۆ ئاودانی.
(ألحُوزِيُّ): شوانی حوشتر/ لێخوڕی حوشتر.
(ألأَحْـوَزِيُّ): ١-لێخـوڕی ١-چـاك‌و کارامــە ٢-کارامــەو لێزان/ شـارەزا ٣-چابوك‌و خێراو چالاك لە هەموو کارێکدا.
٣-(حـاوَزَ- هُ): مُحـاوَزَةً: ١-گرتیە ژێر خۆی

٢-هەڵسوكەوتی لەگەڵدا كردو تێكەڵیبوو.
(إنحـازَ- إلَيـهِ) (ضـد): ١-چـووە پاڵـی/ لایەنگیرییكـرد ٢-دژی وەسـتاو لێیـلادا/ لێیدابرا.
(ألحَوْزَةُ): سروشت.
٤-(حاوَزَ- هُ. مُحاوَزَة): راوەدووینا/ راوینا.
(تَحَـوَّزَ): جێگەكـەی بۆ جوڵكـرد/ لاچوو/ كەلاكەوت.
(«دَخَـلَ عَلَيهِ فَما تَحَوَّزَ لَـهُ»): چووە لای كەچـی جێگەكەی خـۆی بۆ چـوڵ نەكرد/ كەلانەكەوت.
(تَحَوَّزَ- تِ الحَيَّةُ): مارەكە پێچپێچخوارد.
(تَحـاوَزَ- الفَريقـان): دوو تیپەكە لە یەك دووركەوتنـەوەو هەریەكـە جێگـەی خۆی چۆڵكرد.
(إنْحازَ- القَومُ إنْحِيازاً): ١-خوێشگەل جێمۆڵی خۆیان بەجێهێشت ٢-هەڵاتن.
(إنحازَ- عَنهُ) (ضـد): ١-لێیدووركەوتەوە ٢-لایەنگیریكرد/ چووە پاڵی/ لایەنی ئەویگرت.
(ألحُـوزي): ١-لە كۆمەڵدابراو/ گۆشـەگیر ٢-رەشهەڵگەڕاو/ رەش.
الملحق:
حوز: (الإنْحياز): لایەنداریی‌و بەنیازبوون/ لایەنگیریی.
(أتُهِـمَ بِالتَّحِيـاز): بـەوە گومانباركراوە كە لایانگیرە.

(ألإنحِيـاز- في السِّياسـة): لایەنگیریـی لـە رامیاریـدا ئەوەیـە لایەنی یەكێـك لە دوو ناحەزەكە بگرێت.
(عَدَمُ الإنحِياز): بێلایەنیی لە نێوان كۆمەڵە دەوڵەتە ناحەزەكاندا.
(سياسـة عدم الإنْحِياز): رامیاریی بێلایەنی دەوڵەت.

---

حـاس: ١-(حـاسَ- القَـومَ حَوسـاً): ١-پێشێلیكردن‌و سووكیكردن ٢-تێكەڵیان بوو.
(- الذِئـبُ- الغَنَـمَ): گورگەكـە دزەی كردە نـاو مـەڕەكان‌و هەریەكـەی بـە لایەكـدا پەرەوازەكردن.
(- الجَـزّارُ الإهـابَ): قەسـابەكە پێسـتی سەربڕاوەكەی گوروو.
(- تِ المَـرأةُ ذَيلَهـا): ژنەكـە داوێنەكـەی بەكێشكردو پێیلێنا.
(ألأحْوَس ج حُوس): گورگ.
(ألحواسَة): تالانیی/ دەستكەوت.
٢-(حَوِسَ. حَوَساً): دلێریی نواند/ بێباكبوو/ ئازا بوو.
تَحَوَّسَ: وێرای/ ئازا بوو.
(- في الـكَلام): خۆی بـۆ ئاخاوتنەكە ئامادە كرد.
(ألأحْوَس (ج) حُوس): ئازای بوێر/ نەبەرد.
(ألحَوُوس): جەربەزەیەكی جەنگاوەری كەس خۆ لە بەردانەگرتوو.

٣-(تَحَوَّسَ- لِلشَّــيءِ): ژانی بۆ شتەکە چووە دڵ/ داخی بۆ خوارد.
(أَلأَحوَس (ج) حُوْس): کەسـێکە کە بە هیچ شــتێك داناکەوێــتو تێر لە هیـــچ ناخوات/ تێرنەخۆر/ دانەکەوت.
(أَلحُواسَةُ): پێداویستیی.
(أَلحُواسَــة والحُوَیســاء): خزمایەتیــی/ خوێشایەتی/ کەسایەتیی.
٤-(إسْــتَحْوَسَ. إستِحواساً): هەڵوێستەیکردو هێواشیکرد/ سستییکرد/ خۆیگرت.
(حـــاش: ١-(حـــاشَ- الإبِــلَ. حَوْشـــاً): حوشترەکانی کۆکردەوەو دانیە پێش خۆسی/ لێیخورین.
(حَوَّشَ- هُ): کۆیکردەوە.
(تَحاوَشُوا – عَلَیهِ): لێیکۆبوونەوەو گرتیانە ناوخۆیان،/ گەمارۆیاندا.
(إحْتَوَشَ- القَومُ الرَجُلَ و عَلیهِ): چوارلایان لێگرتو خستیانە ناوەراستیانەوە.
(إنْحاشَ): کۆبووەوە.
(أَلحَــوش): ١-حەوشــە ئــەوەی بـــە دەوری خانووەکەدایە ٢-کۆز/ نیمچە گەور- چەپەر.
(حائِــشُ – الشَّــجَرِ): پەلــی بەیەکداچووی خولی درەختەکە.
(أَلحُواشة): خزمایەتی/ خوێشایەتیی.
٢-(حاشَ وأَحاشَ وأَحْوَشَ- الصَّید حَوشاً و إحاشَةً و إحْواشاً): ڕاوەدووی نێچیرەکەیدا تا بە داوەکەوە ببێت.
(- علیــه الصَیدَ وأحْوَشَــهُ إیّــاهُ): یاریدەی ڕاوکردنـــی نێچیرەکەیـــداو ڕاوەدووی نێچیرەکەیدا بۆ ناو داوەکە.
(إنْحاشَ- لَهُ الصَّیدُ): نێچیرەکە ملیداو بەلای داوەکەدا هات.
(إحْتَــوَشَ- القَــومُ الصَّیــدَ): خوێشــگەل نێچیرەکەیـــان بـــۆ لای یەکـــتر ڕاونـــا. تـــا ڕاویبکەن.
(إسْــتَحْوَشَ الصَّیدَ. إسْتِحْواشــاً): ڕاوەدووی نێچیرەکەیدا تا بە داوەکەوە ببێت.
٣-(حَـــوَّشَ- الرَجُلُ): ١-خـــۆی ئامادە/ گورج کـــردەوە ٢-زاتی نایـــە بەر خۆی/ ئـــازا بوو/ ورەی هاتەبەر.
(حاوَشَ- هُ عَلی الأَمرِ): بۆ کارەکە تێزیکرد/ هانیدا.
رَجُلٌ (حُــوشُ الفُــؤاد): پیاوێکــی دڵپۆڵا/ دڵقایم.
٤-(تَحَوَّشَ- عَنــهُ): لێیدوروکەوتەوە/ وازی لێهێنا/ لاچوو/ لێیلادا.
(- مِنهُ): شەرمی لێکرد.
إنْحــاشَ- عَنــهُ): لێیتـــەرە بـــوو/ لێیدوورکەوتەوە.
(أَلحُوشِيُّ): ١-شەرمنو گۆشەگیر/ تەریك.
(- مِنَ الکَلام): قســەی ســەیرو ســەمەرە/ نەبیستراو.

(- مِنَ اللَّيالي): شەوانی تاریك/ نووتەك.

حاص: ١-(حاصَ- حَولَهُ. حَوْصاً و حِياصَةً): بە خولیدا گریخوارد/ بەدەوریدا سوورایەوە.

٢-(حاصَ- الثَّوبَ. حَوْصاً و حِياصَةً): بەرگەکەی شاش دروو.

(- بَيْنَهُما): نێوانیانی تەسك کردەوە/ نێوانیانی هێنایەوە یەك.

(حَوِصَ. حَوَصاً): قنچکی چاوی هاتەوەیەك وەك دوورابێت.

(أَحْوَص (م) حَوْصاء (ج) حُوْص وأَحاوِص): کەسێك قنچکی چاوی هاتبێتەوە یەكو چاوی تەسکبێت.

(حاوَصَ- هُ): بەدزییەوە لە ژێرەوە بەتیلەیچاو تەماشایکرد/ تێبڕوانی.

(إِحْتاصَ- في أَمرِهِ- إِحْتِياصاً): لە کاروباریدا کارقایمیکرد.

(أَلحَوص): ئازاری ناوسكو ریخۆڵە.

(«دَخَلَ في حَوصِ الناسِ»): خۆی کێشایە ناو کاروبارو هەواڵی خەڵکەوە.

(«ماطَعَنْتَ في حوصِهِ»): ئامانجەکەت نەپێکا.

(«لَأَطْعَنَنَّ في حوصِكَ»): دەبێت هەرچیت ڕەنگ دارشتووەو دامەزراندووە بۆت تێکبدەمو بۆت هەڵبوەشێنمەوە/ خراپیبکەم.

(أَلحَوَص): چاو وردیلە/ چاوکونەشووژن.

(أَلحِواص): دەرزیی دار/ سوژنی دار.

(أَلحِياصَة): تەنگەی وڵاخ.

٣-(إِحْتاصَ- في أَمْرِهِ. إِحتِياصاً): لە کارەکەیدا بە پارێز بوو.

٤-(حَوْصَلَ- الطائِرُ): باڵندەکە چیکڵدانەی پڕکرد.

(- الحِنطَةَ): گەنمەکەی کۆکردەوە.

(الحَوصَل): چیکڵدانەی باڵندەکە (لە بری گەدەی مرۆڤە).

(أَلحَوْصَلَةُ والحَوْصَلَّةُ والحَوصَلاء): چیکڵدانەی باڵندە.

حاض: (حاضَ. حَوْضاً): گۆلێکی دروستکرد.

(- الماءَ): ئاوەکەی کۆکردەوە/ ئاوەکەی گرت.

(حَوَّضَ): گۆلێکی دروستکرد.

(- حَولَ الأَمرِ): گرو خولی کارەکەیدا.

(تَحَوَّضَ واحْتاضَ): گۆلێکی پێکەوەنا/ دروستکرد.

(إِسْتَحْوَضَ – الماءُ): ئاوەکە کۆبووەوەو گۆلێکی دروستکرد.

(أَلحَوْض (ج) أَحْواض و حِياض و حِيضان): گۆل/ حەوز.

(حَوضُ الأُذُنِ): گوێی دەرەوەو کرکڕاگەکەی.

(أَلمُحَوَّض): (قووڵگەی/ چاڵی) بندرەخت.

٢-(أَلحَوْضِيَّة) (ن): گوڵە گۆلەیی جۆرە گوڵێکە لە کۆمەڵەی گوڵاڵەیە لەناوچە فێنکەکاندا دەڕوێت گوڵەکانی گەورەنو ڕەنگیان زۆرە پێنج گەڵای ڕەنگینی هەیە

کە لە شێوەی ئەستێرەدا دەبێت بۆ جوانیی دەروێنرێت.

حـاط: ١-(حـاطَ- هُ. حَوْطـاً و حیطَةً و حِیاطَـةً): ١-پاراسـتیو ئاگاداریکـردو بـە تەنگیەوە هات ٢-دەستەبەریبوو.

(حَوَّط- هُ): پاراستیو دەستەبەری بوو.

(إحتاطَ- الرَجُلُ): پیاوەکـە لە کاروبارییدا کار قایمو وریاو بەپارێز بوو/ بۆ پاراسـتنی خۆی پێشبینیکرد.

(- علی الشَيءِ): شتەکەی پاراست.

(لِنَفسِهِ): پشـتی بە خـۆی بەستو بە پارێز بوو.

(تَحَوَّطَ- هُ): پاراستیو چاودێریکرد.

(فُلان یَتَحَوَّط أخاهُ حِیطَةً حَسَنَة»): فیسار باش ئاگاداریی براکـەی دەکاتو دەیپارێزیو بە تەنگ کاروباریەوە دێت.

(إسْـتحاطَ فِي أمرِهِ أو تِجارَتِهِ): بە پەرۆشو وریاییـەوە بـە تەنـگ کاروبارەکـەی یـان بازرگانیەکەیـەوە هـات/ زۆر دووربینـی/ پێشبینیکرد.

(الَحـوْط): ملوانکەی چـاوەزار/ کووژەکەی شین کە بۆ لە چاوی پیس پاراستنە.

(الَحوْطَـة والحیطَـةُ): بـە پارێـز بوون/ پارێزەوەرگرتنو پێشبینیکردن.

(الَحیطَـةُ= (الَحْوطَـة): ١-پارێزەوەرگرتـن/ پێشبینیکردن ٢-ئافرەتی داوێنپاك/ سەربەرزو خانەدان.

(الَحائِــط) (ج) حیطــان و حِیــاط) (فا): پارێزەوەرگـرو پێشـبین. پارێزەوەرگـرو پێشـبین.(الَحوَّاط): زۆر بـە پارێـز/ زۆر پێشبینو دووربین زۆر بە تەنگەوەهاتوو.

(الأَحْـوَط): بە بڕوابەخۆوە پێشـبینیترینو بەئاگاترین.

٢-(حــاطَ- بِهِ. حَوْطاً و حیطَةً و حِیاطَةً): هەر چوارلای لێگرت/ خولیگرت/ گەمارۆیدا/ دەوریگرت.

(حَوَّط- السـاحَةَ): دیواری بـە چواردەوری مەیدانەکەدا کرد.

(- الحائِطَ): دیواری دروستکرد.

(- حَولَ الأمرِ): گڕو خولی کارەکەیداو چووە بنجو بناوانیەوە.

(حاوَطَ- هُ): گڕو خولیدا کارێکی پێبکات کە ئەو نەیەوێتو پێیناخۆش بێت.

(أحـاطَ واحْتــاطَ- بِـهِ): هەمـوو لایەکی لێگرت.

(«أحــاطَ بالأمــرِ عِلمــاً»): بـە هەمــوو کاروبارەکەی زانیو ئاگاداریبوو.

(الَحائِــط (ج) حِیطان و حِیاط): ١-دیوار ٢-باخ.

(الُمحِیط): ١-خولدەر/ دەورەدەر ٢-(هـ) چێوەی بازنە ٣-ژینگە.

(الَبحرُ الُمحِیط): ئۆقیانووس کە خولی هەموو

وشكايى دەدات.

(ألَمحــاط): دەورەگر، دیوار کــە بە چوارلای مرۆڤ یان ئاژەڵدا هەبێت‌و بیپارێزێت.

(حُــوَّط الأَمــرِ): کار راگــران- کاررێخەران/ راستیی کارەکە.

(ألحُواطة): گەنجینەی پاراســتنی خواردن/ خۆراك.

(ألتَّحویطَة): هەڵبەســت لە شــێوەی بازنەدا ریزکرابێت‌و نووسرابێتەوە.

٣-(ألحَوْط): (مانگە یەکشەوەی/ داسەمانگی) زیوینی ملی منداڵ.

(ألحِوَط): ئەو شتەی کە لە بری ئەو پارەیەی کەمدەبێت دەدرێت.

الملحق:

حوط: (ألاحْتیاط): پێشبینی‌و خۆپاراستن‌و ئاگاردابوون.

(ألإحتیــاط لِلمَــرَض): خۆلــە نەخۆشــیی پاراستن.

(«تَدابیر إحْتیــاط»): تەگبیری چۆنییەتیی پاراستن‌و خۆپاراستن.

(«على سبیل الإحْتِیاط»): رێگەی چۆنیەتی ئاگاداربوون.

(ألحَذَر والإحْتِراز): ســڵکردن‌و خۆپاراستن‌و وریابوون.

أَخَذَ إحتیاطاتِهِ: پێشــبینی کــردوە ئاگادار بووە/ تەگبیری پارێزگارییکرد.

(ألإحتِیــاط- علــى الشَــيء): ئاگاداربوون‌و پاراستنی شتەکە.

(ألإحتیاط بفُلان أَو بشَيء): ١-گەمارۆی فیسار یا شتێك بدرێت ٢-(ع ١)؛ هێزێك گل بدرێتەوە بۆ بەرەنگاریی قەوماوی چاوەرێنەکراو.

یقال: (فِي الإحتیاط): رەوشــێکی سەربازە لە کاتی سەربازیی زۆرەملێدا مەشقی پێکراوە کە پێویســت بوو دەبێتەوە بە سەربازو خزمەت دەکاتەوە.

(مالُ الإحتیاط): ئەو داراییەیە کە پاشەکەوتی دەرامەتــەو زیــادەی خەرجکردنیەتــی لــە بودجەیەکــدا، بۆ پرکردنــەوەی کورتهێنانی بودجەیەك بەکاردەهێنرێت یان بۆ ئەو کارە تازانەی کە دەهێنرێتــە کایەوەو پارەی تری پێویستدەبێت.

---

حاف: ١-(حافَ- الشــيءَ حَوْفاً): شــتەکەی خست سەرکەنار/ لێوار.

(حَوَّفَ- الشَّيء): شتەکەی خستە سەر لێوار/ کەنار/ تەنشت.

(- المَكانَ): لە شوێنەکەدا سوورایەوە.

(تَحَوَّفَ- الشَــيءَ): ١-لە لێواری شتەکەیگرت/ بری ٢-لە قەراغی شتەکەیکرد.

(ألحَوْف): تەنشت لێوار/ قەراغ/ لا.

(ألحافَةُ): لێوار/ تەنشت/ لا/ کەنار.

(ج) حافات و حِیَف. (حافَتا الوادي): ئەملاو ئەولای دۆڵەکە/ هەردوو تەنشتی/ لاکانی.

٢-(أَلحَوف): پێســته بەرکۆشــی منــداڵ له بەریدەکەن.

(أَلحافَــة (ج) حافات و حِيَف): ١ـســەختی/ تەنگانه ٢ـنەبوونیی/ پێداویستیی.

(أَلحافان): دوو دەماری سەوزی ژێر زمان.

حاق: ١-(حاقَ- الشَــيءَ. حَوْقاً): شــتەکەی هەڵگولۆفتو لووسیکرد.

٢-(حاقَ- البَيت. حَوْقــاً): ماڵەکەی (ماڵی/ گەسکدا).

حَــوَّقَ- عَلَيهِ): قسـەی نارێــکو نابەجێو تێکــەڵو پێکەڵــی بەگوێدادا وەك خاشــاکی ناوماڵ.

(أَلحُواقَة): خۆڵو خاشاکی ناوماڵ.

(أَلمِحْوَقَة) (ج) مَحاوِق): گەسك.

٣-(حاقَ- بِهِ. حَوْقاً): هەر چوارلای لێگرت/ گەمارۆیدا/ ئابڵووقەیدا.

(أَلحُوق): چوارچێوە/ کەمەی شت.

(أَلحَوْق والحَوْقَة): کۆمەڵێکی زۆر/ گەورە.

٤-(حَوقَــلَ. حَوْقَلَةً و حيقالاً): ١ـرۆیشــتو شەکەتبوو/ پەکیکەوت ٢ـپیرو بێتوانا بوو.

(- الشَّــيخُ): پیرەکە دەســتی بە کەمەریەوە گرت ئەوسا توانی بڕوات.

(أَلحَوْقَل): ئیختیار/ پیری بە ساڵداچوو.

٥-(حَوقَلَ.حَوقَلةً وحِيقالاً): لاحەولەوەلایکرد/ وتی: لاحەولە وەلا قوەتە ئیللا بیللاهیلعەزیم.

(أَلحَوقَلَةُ): ســوراحیەکی شووشەی ملدرێژی ملباریك.

حــاك: (حاكَ- الثَّــوبَ. حَــوْكاً و حِياكاً و حِياكَةً): بەرگەکەی چنی.

(حائِــك (ج) حاكَــة وحوكَــة (م) حائِكَة و حائِــك (ج) حائِــكات و حَوائِــك): جۆلاـ بەرگچن.

(«حاكَ الشَــيءُ فــي صَدري»): شــتەکە لە دڵمدا رەگی داکوتا/ بنجبەست بوو.

(حــاكَ الشــاعِرُ القَصيــدَةَ): شــاعیرەکە هەڵبەستەکەی هۆنییەوە.

(ماأَحــاكَ سَــيفُهُ): شمشــێرەکەی نەیبڕی/ کارینەکرد.

(«ضَرَبَهُ فَما أَحاكَ فيه سَيفُهُ»): شمشێرەکەی لێدا، بەڵام کاری تێنەکردو نەیبڕی.

(أَلحَوْك) (ن): ڕێحانە کێویلە.

(«هذا على حَوْكِ هذا»): ئەمە لە تەمەنو قەڵافەتی ئەودایە.

(أَلمَحاكَة): چنینگە/ شوێنی جۆلایی.

(أَلمَحْوَكَة): شەرکردن/ جەنگ.

حــال: ١-(حالَ- الشَّــيءُ حَــوْلاً و حُؤُولاً): شتەکە لە بارێکەوە بۆ بارێکیتر گۆڕا.

(- تِ القَــوْسُ): کەوانەکە باری وەرچەرخاو خواربووەوە.

(- العَهْدُ): پەیمانەکە شکا/ هەڵگەڕایەوە.

(- إلى مَــكانٍ آخَــر= تَحَــوَّلَ): گوێزرایــەوە شوێنێکیتر.

(حَــوَّلَ- هُ): ١-لايــبرد ٢-لــه شــوێنێكەوە بۆ شوێنێكيترى گوێزايەوە.

حَوَّلَ (- الرَجُلُ): پياوەكە شــوێنەكەى خۆى گوێزايەوە.

(- هُ إلَيــهِ): ڕووى شــتەكەى كــردە ئەو بۆ ئەوينارد.

(أَحالَ- الغريمُ بدَينِهِ على آخر): وامەكەى خــۆى بــەرەو ڕووى يەكێكيــتر كــردەوە كە وەريگرت.

(مُحيل): ئــەو ڕووبەڕووكەرەوەى وەرگرتنى وامەكەيەتى.

مُحال: ئەوەى قەرزارەو بەرەوڕوو كراوە.

(مُحــالٌ عليــه): ئەو كەســەى شــتى بەرەو ڕووكراوەتەوە.

(مالٌ مُحالٌ بِهِ): داراى بەرەو ڕووكراو.

حَوالَة: پــارەى بەرەو ڕووكــراو وامى بەرەو ڕووكراو لە يەكێكەوە بۆ يەكێكيتر.

(أَحالَ- الأَمرَ على فُلان): كارەكەى بە تايبەتى بە فيسار سپاردو بەرەو ڕووى ئەويكردەوە.

(تَحَوَّلَ- الرَجُلُ): پياوەكە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكيتر گواستيەوە.

(- عَنــهُ): لاى ئەو بۆ لايەكيــتر گوێزايەوە/ وازى لەو هێنا.

(إحتالَ- بالدَّين إحْتِيالاً): وامەكەى خســتە ئەستۆى خۆى.

(إسْــتَحالَ. إســتِحالَةً): لە بارێكــەوە چووە بارێكيتر.

(- تِ القَــوسُ): كەوانەكــە ڕاســتبوو خوار بووەوە.

(ألحائِــل (ج) حُــوْل و حُــوَّل و حِيــال و حَوائِل): ١-ڕەنگگۆڕاو.

(ألحــال (ج) أحوال و أحوِلَة): ١-بار ٢-دۆخ ٣-گوزەران ٤-چۆنيەتى ٥-نيشانەو خەسڵەتى ئەو شتە (بە مێ دەكرێت و بە نێريش).

(حالَةُ الشيءِ): بارو ڕەوشى ئەو شتە.

(حالاتُ الدَّهرِ): هاتوبرد/ گۆڕان و قەوماوى ڕۆژگار/ چەرخى ڕۆژگار.

(ألحِوَل): ١-نەمان ٢-بارگۆڕان و گوێزانەوە.

(«لاحِوَلَ عَنهُ»): بار ناگۆڕێت و لێيلانادات.

(ألحَــوال والحَــوَلان والحُــولان): گــۆڕان و هەڵگەڕانەوە/ لەسەر بارێك نەمان.

(ألحُولَة): سەيروسەمەرە/ سەرسوڕهێن.

(«هذا مِــن حُولَةِ الدَّهرِ»): ئەمە لە شــتە سەيرو سەمەرەكانى ڕۆژگارە.

(ألحَوالَــة) (ت): گوێزانــەوەو بــەرەو ڕوو كردنــەوەى وام يان پارە لــە وامدەرێكەوە بۆ وامەرگرێك/ پارە گوێزە/ پارە گوێزەكەيش/ حەواڵەكەيــش جــۆرى زۆرە بازرگانــەكان پێيدەڵێن: چەك.

(ألحوالَة المُسَــطَّرَة): چەكێك كــە دوو هێڵى تەريبى بە ڕووى چەكەكەدا دەكێشرێت، ئەوە هەر ئەو كەســەى كە بۆى نێرراوە دەبێت لە

بانقدا پــارەی هەبێتو لە بانقــدا دەخرێتە سەر پارەکەی.
(أَلحَوالَــة المُعتَمَــدَة): چەکــی باوەرپێکراو چەکی پشتدار، ئەو چەکەیە کە مۆری واژۆی خاوەنەکەی پێوەبێت، بــە ڕووی چەکەکەوە بێت ئەوە هەر جەخت لەســەر بوونی پارەی بانقەکەی ناکات بەڵکو پارەکەیش ڕادەگرێت.
(ألحوالة لأمرٍ): ئەو چەکەیە کە هەڵگرەکەی دەتوانێــت بــەرەو ڕووی یەکێکیتری بکاتەوە بەوەی کە خۆی پشــتی چەکەکــە واژۆ/ مۆر بکات.
(أَلحَوالَــة لِمُسَــمّى): حەواڵەی ناونــراو ئەو حەواڵەیە کە ناتوانرێت ڕەوانەی کەســێکیتر بکرێت، مەگەر بە وازهێنان بۆ قەرزارەکە.
(أَلحَوالَــة الموقعة على بَيــاض): چەکی بە سپێتی واژە کراو: چەکێکە ناوی وەرگرەکەی لەسەر نەنوســرابێت تەنها نوسرابێت بەرەو ڕووکردنەوەی، دەستەواژەی ئاڵوگۆڕی لەسەر بێت.
(أَلحَوالَــة لأمــرِ حامِلِهــا): چەکێکــە ڕووبەڕوودەکرێتەوەو هەڵگری هەر کەســێك بێت دەتوانێت وەریبگرێت، پاش مۆرکردنی/ واژەکردنی.
(أَلمُحال): ١-خوار/ گێر/ کەچ.
(أَلمَحالَة (ج) مَحال و مَحاوِل): چەرخ.
(أَلمُســتَحالَة- مِنَ القِسِيّ): کەمانی ژێ (گێر/ لوولخواردوو).
٢-(حــالَ- الحَــوْلُ حَــوْلاً و حُؤُولاً): ســاڵ ڕۆیشتو بەسەرچوو/ تێپەری.
(«حالَتِ الدّارُ وحِيلَ بها»): خانووەکە گۆڕاو بارەهای بەسەردا هات.
(حــالَ- عَلَيهِ الحَوْلُ): ســاڵێکی بەســەردا تێپەری.
(- تِ النَّخلَــةُ) (ز): دارخورماکــە ســاڵە نا ساڵێك بەریگرت.
(- تِ الأُنثــى: حُــؤُولاً و حِيــالاً): مێکــە ئاوسنەبوو.
(حَوَّلَ- الأَرضَ) (ز): زەویەکەی ســاڵەو ساڵ چاند.
(أَحالَ اللهُ الحَوْلَ): خودا ساڵەکەی تەواوکرد.
(- بِالمَكان): لە شــوێنەکەدا ســاڵێك مایەوەو تیایدا دانیشت.
(- الشــيءُ): چەندین ســاڵ بەسەر شتەکەدا تێپەری.
(أَحْوَلَ- الصَبِيُ): منداڵەکە ساڵێکی تەمەنی تەواوکرد.
(إحْتالَ- الشَــيءُ. إحْتِيالاً): ســاڵێك بەسەر شتەکەدا هات.
(أَلحَــوْل (ج) حُــؤُول وأَحْــوال): ســاڵ (ج) ساڵان.
(أَلحَولِــيُّ (ج) حَوالِيّ): ســاڵەوەختینە/ ئەو ولاخو چوارپێیانەی ساڵەوەختینەبن.

(«حَولَياتُ زُهَير»): هەڵبەستەکانی زوهەیر کە ساڵێك خەریکی دانانو ڕێکخستنو بەرچاوخستنی دەبوو.

(اَلحائِل (ج) حُوْل و حُوَّل وحِيال و حَوائِل): ١-یەکساڵە/ ئەوەی تەمەنی ساڵێك بێت ٢-هەموو مێینەیەکی نەزۆك.

(«إمرَأَةٌ حائِل و نَخلَةٌ حائِل»): ئافرەتی نەزۆكو دارخورمای زڕ.

(اَلحائِلَةُ): مێی وشەی (الحائِل ).

(اَلمُحوِل): منداڵی یەکساڵە/ یەکساڵانە.

(اَلمُستَحالَة- مِنَ الأَرضِ (ز): زەویی بوورە/ زەوییەك کە ساڵێك یان چەند ساڵێك نەکێڵراوەو نەکراوە بە هیچ.

٣-(حالَ. حِيلَةً و مَحالاً): فێڵیکرد/ کەڵەکی لێدا.

(حاوَلَ- هُ. مُحاوَلَةً و حِوالاً): ویستی بە فێڵ شتێکی لێببیسێت/ بە فێڵ داوای شتێکی لێکرد.

(- الشَيءَ): شتەکەی ویستو نیازی بوو بە فێڵ دەستگیری ببێت.

(تَحَوَّلَ- فِي الأَمرِ): لە کارەکەدا زۆرزانییو فێڵی خستەکار.

(إحْتالَ. إحْتِيالاً): فێڵیکرد/ کەڵەكو کولەکیلێدا/ تەلەکەبازییکرد.

(اَلحَوْل (ج) حُؤول و أَحْوال): کارامەیی/ وردبینیو کارزانیی.

(اَلحِوَل): ١-توانا باشی کاروبار هەڵسووڕاندن ٢-کارامەییو وردبینیو کارزانی.

(اَلحِيلَة والحَوْلَةُ (ج) حِيَل): ١-بە بڕشتیی/ توانای کار هەڵسوڕاندن ٢-کارامەییو کارزانییو وردبینیی.

(اَلحَوالِيّ والحُوَّل والحُوَّلِيّ): ١-فێڵباز/ زۆرزان/ کەڵەکباز ٢-زۆرفێڵباز/ کەڵەکبازی بە پێچو پەنا کە کار بەلای خۆیدا دەبات.

(أَحْوَل): فێڵبازترین/ زۆرزانترین.

(«هُوَ أَحْوَلُ مِنْك وأَحْيَلُ مِنكَ»): ئەو لە تۆ فێڵبازترو کەڵەکبازترە ٢-زۆر زۆرزانترە.

(«ماأَحْوَله وما أَحْيَله»): ئای کە فێڵباز/ کەڵەکباز/ بە پێچو پەنایە.

(اَلحُولَة): ١-زۆر کەڵەکبازو بە پێچو پەنا/ بەفریو.

(هذا رَجُلٌ حُولَةٌ): ئەمە پیاوێکە زۆر کەڵەکبازەو بەفێڵە ٢-پیاوی زۆرزانو فێڵاوی.

الحَول: زۆر فێڵباز/ زۆر بە فێڵو فەرەج.

الحائِلَة= الحِيلَةُ: فێڵ/ فەرەج/ پێچو پەنا.

(اَلمَحالَة (ج) مَحال و مَحاوِل): لێزانیی/ شارەزاییو توانای کار هەڵسوڕاندن.

(لا مَحالَةَ مِنَ الأَمرِ): چار نییە کارەکە هەر دەبێت ببێت/ یان گومانی تێدا نییە کە دەبێ بکرێت.

٤-(حالَ- فِي ظَهْرِ الدابَّةِ. حَوْلاً و حُؤولاً): خۆی هەڵدایە سەرپشتی ولاخەکەو ڕێك

دانیشت.

(أَحالَ- فِي ظَهرِ الدابَّةِ): خۆی هەڵدایە سەر ولاخەکەو ڕێك دانیشت.

(«أحالَ عَلَیهِ بالسَّوطِ یَضرِبُهُ): بە قامچی کەوتە لێدانی/ بە قامچی هاتە وێزەی.

(إحْوالَّ- تِ الأَرضُ): زەویەکە شین بوو گیاکەی هەستا.

(حالُ مَتنِ الفَرَسِ): ناوەڕاستی پشتی چارەوێکە.

(اَلمَحالَة (ج) مَحال و مَحاوِل): ناوەڕاستی پشتو بڕبڕەی پشت.

٥-(حالَ- الشَّخصُ. حَوْلاً و حُؤولاً): کەسەکە بزوا/ جوولا/ تەکانیدایە خۆی.

(حاوَلَ — البَصَرَ. مُحاوَلَةً و حِوالاً): چاوی لەسەر دانا/ چاوی تێبڕیو نەیتروکاند.

(إِحْتَوَلَ- هُ القَومُ): خوێشگەل (تێیمرووکانو چواردەوریان لێگرت/ ئابلۆقەیانداو خستیانە ناوەڕاستی خۆیانەوە).

(إِسْتَحالَ- فُلانٌ الشیءَ. إستِحالَةً): فیسار چاوبڕییە شتەکە بزانێت ئایا دەجوولێتەوە.

(عِلْمُ الحِیَلِ (حی)= میکانیك): زانستیی هاوسەنگکردنو بزواندنی تەنەکان.

٦-(حالَ بَینَهُما. حَولاً و حُؤولاً و حَیلولَةً): بەری لە یەکتری لێگرتن/ لەیەکیکردنو کەوتە نێوانیانەوە.

(حائِل (ج) حُوْل و حُوَّل و حِیَال و حَوائِل): ١-نێوانبڕ ٢-کۆسپ/ لەمپەر/ تەگەرە.

(اَلحِوال): نێوانبڕ/ هەرچی دوو شت (لە یەك ببچڕێت/ لە یەك بکات) لەمپەر.

٧-(حَولَ- ت عِینُهُ. حَوَلاً): چاوی تیلبوو/ خێلبوو.

(أَحْوَل (م) حَوْلاء (ج) حُوْل): چاو (خێل/ تیل).

(أَحالَ- العَینَ): چاوی خێلکرد/ تیلکرد.

(إِحْوَلَّ- ت عَینُهُ): چاوی خێلبوو/ تیلبوو.

(اَلحَوَل (طب): چاوخێلیی/ ئەومیە گلێنەیەکی چاو بە لای لووتدا خواربێتو ئەویتریان بەلای لاجانگدا.

(اَلحَول): خێل/ چاوتیل.

٨-(حَوَّلَ- الشيءَ): شتەکەی ستەمکرد کە هەر نەکرێتو نەبێت.

(أَحالَ- الرَجُلُ): کاری نەکردەی ئەنجامداو باسیکرد.

(إِستَحالَ. إِستِحالَةً): بوو بە کاری نەکردەوو نەشیاو/ کاری ستەم.

(اَلمُحال): کاری نەکردە/ نەکراوو ستەم/ هەر نابێت.

اَلمُحْوَال: هەر نابێت/ زۆر ستەم/ نەکراو.

(اَلمُستَحیل- مِنَ الکَلامِ= المُحال: قسەی خۆڕاییو بێکەڵك/ قسەیەك کە هەر نەیەتە دیو ستەمبێت.

٩-(اَلحال (ج) أَحْوال و أَحْوِلَة): ١-خۆڵەمێشی

گەرم ٢-قورە ڕەش.

(حَوْل وحَولَى و حَوَال و حَوَالَى- الشــيءِ أو الشَّــخصِ): ئەملاولای ئەو شــتە ئەو کەسە/ دەورو بەری.

(«قَعَدَ حَوْلَهُ و حَولَيهِ و حَوَالَهُ و حَوالَيهِ»): بە هەر چوار لایدا دانیشت.

(حَيالُ الشيءِ): بەرامبەر شتەکە.

(«قَعَــدَ حِيالَــهُ و بِحيالِــهِ»): بەرامبەری دانیشت/ ڕووبەڕووی دانیشت.

(«أعطــى كُلاً على حِيالِــهِ»): ڕووبەڕوو و دەست بە دەست بە تەنیا بەهەر یەکیانیدا.

(الحُولَــة): کاری بیدعــەت/ کاری خــراپو ناشیرین/ دزێو.

(المُحَــال): ١-کاری نــاڕەواو نادروســت ٢-خواروخێــچ ٣-هەر شــتێك هی ئــەوە بێت تێکبچێتو هەڵبوەشێتەوە.

(المُحيل= مِنَ النِّســاء): ژنێك کە کوڕێکی لە پاش کچێکــەوە بووبێت یان کچێکی بەســەر کوڕێکدا بووبێت.

(المُسْــتَحيل): ١-ئاخاوتنی ناڕەواو نادروست/ نەشیاو ٢-پڕ.

١٠-(الحَوْلَقَــة= الحَوقَلَة= لا حَولَ ولا قُوَّةَ إلاّ باللهِ): دەسەڵات هەر دەسەڵاتی خودایەو بەبێ ئەو کەس دەسەڵاتی نییە.

الملحق:

حول (الإحالَة) (مص): بەرەو ڕووکردنەوە.

(إحالَةُ الغريم): خــاوەن وامەکە قەرزەکەی بەرەو ڕووی یەکێکیتر بکات.

(«إحالَــةُ الدَّيــن الى شــخص»): قەرزەکە/ وامەکە بــەرەو ڕووی یەکێکیتر بکرێتو ئەو کەسە وەریبگرێت.

(الإحالَة إلى أو على التَقاعُد): خانەنشینکردن.

(الإحالَــة إلى القضــاء): بەدادگــادان/ داوای دادگاکردن.

(قاضــي الإحالَــة): دادوەری لێکۆڵینــەوە/ دادوەرێکــە گومانبارەکان بــەرەو ڕووی ئەو دەکرێتەوە لێیاندەپرســێتو لە گوناهەکەیان دەکۆڵێتەوە ســا یان بەندیــان دەکات یان بە کەفالەت/ بە دەستەبەری یەکێك بەریاندەدات یان بەرەڵایاندەکات

(إحالَة مشــروع قانون إلى لجنة مختصة): بــەرەو ڕووکردنــەوەی یاســای پرۆژەیەك/ پرۆژەی یاســایەك بــەرەو ڕووی لیژنەیەکی پســپۆڕ دەکرێت تا لێیبکۆڵێتەوەو ڕای خۆی لەسەر بدات.

(الإحالَــة في الادارة): بەرەوڕووکردنــەوە لە بەڕێوە بەرێتیــدا/ گێڕانــی کارنامەیەك لە یەکەیەکی بەڕێوەبەر بنێتەوە بۆ یەکەیەکیتر تا بە ئەنجام دەکات.

(الاحالــة في عِلــم الطبيعَــة): گۆڕیــن لە زانستیی سروشتیدا: گۆڕینی سروشتی شتێك وەك گەرمکردن ساردکردنەوە.

(الإستحالَة):١ـگۆڕان له بارێکەوه بۆ بارێکیتر وەك گۆڕانی سرکەو بەمەی بوونی.
(ألإســتحالة): ٢: عــدم الإمــكان والقدرة، الإمتِنــاع والتَّعذُّر):له توانــاو وزەدا نەبێت كارێك بكرێت. نەكردنو ستەمبوون.
(إستحالَة القِيام بِعَمَل): ستەمبوونی كردنی كارێك.
(الإســتحالَة في عِلــم الطبيعَــة):گۆڕینــی سروشتی شــتێك لەگەڵ مانەوەی جۆرەكەیدا وەك گەرمیــیو ســاردیی لەش له زانســتیی سروشتدا.

---

حام: ١-حامَ - على الشــيءِ و حَولَهُ حَوماً و حَوَماناً):گوڕو خولی شــتەكەیدا/ بەخولیدا (سووڕایەوە/ چەرخەلەیكرد).
(- حَــولَ غَرَضِهِ و عَلَيه):ســەرقاڵو وێڵی نیازەكەی بوو/ گڕو خولی ئامانجەكەیبوو.
(حَوَّمَ في الأمرِ):ســەرومڕ به كارەكەوە گلا/ لەگەڵیدا خەریك بوو.
(ألحُــوم): مەی كه ســەر دەســووڕێنێتەوەو گەرمیدەكات.
(حَومَة (ج) حَوماتُ القِتال):جەرگەی كۆڕی گەرمی شەڕ.
١-(البَحر أو الرَّمــل أو غير ذلك): نێرینەی ئاوی دەریا یان قووڵایی لمــستان یان جەرگەی هەر شتێكیتر.
(- المَوتِ): شالآوی مەرگ.

٢-(حامَ- الرَّجُلُ. حَوْماً و حَوَماناً):پیاوەكه تینوویبوو.
(حائِــم (ج) حُوَّم (م) حائِمَة (ج) حَوائِم و حُوَّم):تینوو.
٣-(حَوْمَلَة. حَومَلَةً):ناوی هەڵگرت.
(ألحَوْمَــل):١ـهەوری ڕەش/ تــاڵ كه بارانی زۆری پێوەیه ٢-(لێشاوی/ لافاوی) ڕوون.
حــون: (تَحَــوَّنَ- الرَّجُــلُ): ١ـزەبــوونو سەرشۆڕبوو ٢ـمرد/ فەوتا.
حــوي: (حَــوِيَ و أحْــوَوى أحــواوَى حَوَىً وإحويواءً و إحْوِواءً):ڕەشــی مەیلەو شینبوو یان سووری تۆخی مەیلەو ڕەشبوو.
(أحْوى):مەیلەو ڕەش بوو.
(أحْوى (م) حَوّاء (ج) حُوّ):یەكێكی ڕەشــی مەیلــەو شــین/ شــینباو یان ســووری تێری مەیلەو ڕەش/ ڕەشباو.
(ألحُوَّة):ڕەشییەكی مەیلەو شین/ شینباو یان سوورییەكی مەیلەو ڕەش/ ڕەشباو.
حوى: ١-(حَوى- الشَّــيءَ. حَوَايَــةً و حَيّاً): شــتەكەی گردكــردەوە/ كۆكــردەوەو بوو به خاوەنی.
(حَوَّى- هُ تَحْوِيَةً): چنگی لێگیركردو گرتی.
(تَحَوَّى- الشَّيءَ):شتەكەیگرت.
(إحتَوى- الشَّيءَ وعليه. إحتِواءً):١ـشتەكەی دەستكەوت/ بەرچنگكەوت ٢ـشتەكەیگرت.
(ألحــاوي (م) حاوِيَة (ج) حاوِيات و حَوَاوٍ)

(فا): ١-شتگرتوو ٢-چنگکەوتوو/ دەستگیربوو ٣-کۆکەرەوە.

(اَلحَويّ): خاوەنی شـتێك کە هی خۆی بێتو هەڵبگرێت هی خۆی بێت.

(اَلحَويَّةُ (ج) حَوايا): مێی وشەی (اَلحَويّ).

٢-(حَوى- الشَــيءَ. حَوايَةً و حَيّاً): شتەکەی کۆکردەوە.

(تَحَوّى): چووە یەك/ کرژو گرمۆڵە بوو.

(اَلحَويّ): گۆلی/ حەوزی بچووکی ئاو.

(اَلحَويَّةُ (ج) حَوايا): ١-ریخۆڵەی پێچخواردوو یان چەوریی ریخۆڵە ٢-گۆلی بچووك ٣-جلێکی حوشترەکە ناواخنەکەی پووشەو لە کۆپارەی حوشتر دەنرێت بۆ سواربوون.

(«اَلَمنايـا على الحَوايا»): بە پێی خۆی خۆی دەهاوێتە باوەشی مەرگەوە.

(اَلحِــواء (ج) اَحْوِيَــة): کۆمەڵــە خانــووی بەیەکەوە نووساو یان بەیەك نزیك.

(اَلحَواء والحَواة): دەنگ.

(اَلحَاوِياء (ج) حاوِياءات و حَواوٍ): ریخۆڵەی پێچخواردوو کرژ بوو.

٣-(تَحَــوّتِ- الحَيَّةُ): مارەکــە گرمۆڵە بوو/ پەپکەیخوارد/ خۆی پێچدا.

(اَلحــاوي (م) حاوِيَة (ج) حاوِيات و حَواوٍ): ئــەوەی ئەفســوون لــە مــار دەکاتو مارەکە بەکێشدەکاتو نەرمیدەکات.

(اَلحَوّاء): مارگر/ مارباز/ مارکۆکەرەوە.

الملحق:

حوي: (اَلُمحتَوى): ناوەرۆك/ ئاخنە/ ناواخن.

(مايَشتَمِلُ عليه الشَيءُ): ئەوەی لە شتەکەدا ئاخنراوەو هەیە.

(مُحتَــوى الخزانــة): ئــەوەی خراوەتــە دۆڵابەکەوە/ گەنجینەکەوە.

(محتويات كتاب أو عَــدَد مَجَلّةٍ): ناوخان/ ناوەرۆك/ ئەو بــاسو بابەتانەی لە کتێبەکە یان گۆڤارەکەدا هەیە.

---

(حيث): ١-لەو شــوێنەی ٢-چونکە ٣-لە کوێ ٤-لــەو رووەوە ٥-لەبەرئــەوەی ٦-هەرچۆنێك بێت/ بووبێت.

(مِن هٰذِهِ الحَيثِيَّة): لەو رووەوە/ بەوپێیە.

(حيث) (ظرف زمان): ئاوەڵفرمانی کاتیش دەبێت: لەو دەمەوە/ لەو کاتەوە/ لە کاتێکدا.

ملحق:

حيــث: (اَلحَيْثِيّات في القَــرارات والأَحْكام): هۆی بریارو ســەپاندنەکانی بریارەکان کە بە (لەبەرئەوەی) دەستپێدەکرێت.

---

حاج: (حاجَ. حَجيجاً): نەبووبوو/ ئاتاجبوو/ نەدارابوو/ دەستکورتبوو.

(اَحــاج واَحْيَجَ- المَكانُ): شــوێنەکە (حاج)ی لێروا.

اَلحــاج (ن): وشــترخوار رووەکێکی درکاوییە وشتر دەیخوات یان رووەکێکی ترشۆکە.

حاد: (حادَ- عَنِ الطَريقِ): لە رێگەکە لایدا.

(حـادَ- عَن الطَّريـق. حَيْـداً و حَيَداناً و مَحيـداً و حَيْدَةً و حُيُـوداً و حَيدودَةً): له ڕێگەكه لایدا/ لاڕێیگرت.

(حَيَّدَ- هُ): خستیه لاوه- لابەلایكرد/ لایخست.

(- السَّيرَ): لكی له ڕێگەكه كردهوه- تەگەرەی خسته ڕێگەكەوه.

(حايَـدَ- هُ. مُحايَدَةً و حياداً): ١-تریسـكەی لێبەست/ خۆی لێلادا/ لای لێبەست.

(-مُحايَدَة و حياداً): بێلایەنیی/ لالێبەستن/ لابەلابوون.

(ألحَيْـد (ج) حُيُـود و حِيَـد وأحْيـاد): ١-زمانه/ دەرپەڕینێك كه له شتدا پەیدابێتو دەركەوێـت/ شـاخكردن ٢-لووتی شـاخێك/ نوتكەیەك كه له كێوەكه ڕەتبێت.

(ألحَيْدُ والحَيْدَةُ): بـه تایبەتی گرێی قۆچی كەڵەكێوی.

(ألمَحيد): لادانگه.

(ألحَيـدى): ڕۆیشـتنی بەلارولەنجـه/ بـه خۆبادانو فیز.

(ألحَيْدان): زیخو چـەوی پەڕیوی پێی وڵاخ كه دەڕوات یان غاردەكات.

٢-(ألحَيْـد والحِيد): وەك ئـەو/ لەو چوو/ وێنـەی ئـەو/ نموونـەی ئـەو/ هاوشـێوه، هاوچەشن.

الملحق:

حيد: (ألحِيـاد): ١-دوورەپەرێز بونو خۆ له شت لادان ٢-بێلایەنیی له نێوان دو ناحەزدا.

(وَقَـفَ على الحياد): وەرگرتنی هەڵوێسـتی بێلایەنیی.

(الحياد الإيجابـي): ڕێڕەوێكـی ڕامیارییه. نەدانـه پاڵی هیـچ كۆمەڵـه دەوڵەتانێك كه ناحەزبن بەوانیتر/ بێلایەنبوون له نێواندا.

---

حـار: ١-(حـارَ- الرَّجُل. حَيْـراً و حَيَراً و حَيْـرَةً و حَيَراناً): ١-پیاوەكـه تیاما/ ڕاماو ڕەشكەوپێشـكەیكرد ٢-ڕێیلێهەڵـه بـوو/ نەچووەوه سەر ڕێگەكه.

(- في أمرِهِ): له كارەكەدا سـەری لێتێكچوو/ چەواشه بوو/ له كارەكەدا ڕاما.

(حَيْـران) م حَيْرى (ج) حَيَارى و حُيَارى): سەرسـام/ واقوڕمـاو/ حەپەسـاو/ ڕامـاو/ دۆشداماو.

(حَيَّرَ- هُ): سەرسـامیكرد/ سەرگەردانیكرد. حەپەساندی/ دۆشیداماند.

(تَحَيَّر واسْـتَحارَ): سەرسامبوو/ واقی وڕما- داما/ سەری لێتێكچوو.

(ألحائِر (ج) حُوران و حيران (فا)): حەپەساو/ سەرسام/ واقوڕماو/ دۆشداماو/ چەواشەبوو.

(ألمِحيـار): زۆر سەرسـام/ زۆر حەپەسـاو/ چەواشەی تەواو/ دۆشداماوی تەواو.

(ألمُسْـتَحير): ڕێگەی بێدەروو/ ڕێگەیەكه له ناوەراستی بیاباندا كه نەزانرێت ئەوسەری له كوێوه دەردەچێت.

(اَلْمُتَحَيِّرَةُ (ج) مُتَحَيِّرات) (فك): هەسارەی گەڕۆك.

٢-(حارَ- الماءُ. حَيْراً و حَيَراً و حَيْرَةً و حَيَراناً): ئاوەکە پێچپێخوارد وەك ڕێدەرنەکاتو کۆبووەوە.

(تَحَيَّرَ- الماءُ): ئاوەکە پێچپێخواردو پاشان کۆبووەوە سەری دەرنەچوو.

(- المَكانُ بالماءِ): شوێنەکە پڕبوو لە ئاو.

(إسْتَحارَ- السَّحابُ): هەورەکە بە ئاسمانەوە گیریخواردو بە هیچ لایەکدا نەڕۆیشت.

اَلحائِر (ج) حُوران وحِيران): ١-گۆماو/ ئەستێل ٢-زەویی نزم/ نشێو کە چواردەورەکەی بەرزبێت.

(اَلحَيْر): باخو بێستان.

(اَلحَيَر والحِيَر): کەسوکاری زۆرو دارایی چاك.

(«لا آتيهِ حِيَرَ دَهْرٍ»): هەرگیزاوهەرگیز نایەمە لای.

(اَلْمَحارَة): ئاوگر/ ئەستێل/ گۆماو.

(اَلْمُسْتَحِير): هەوری متی قورس کە بایەك نەبێت ڕاپێچیکات.

٣-(إسْتَحارَ- المَكانَ و بِالمَكانِ): چەند ڕۆژێك لە شوێنەکەدا مایەوە.

(اَلحَير): بەرگریلێکراو/ پارێزراو.

(اَلحارَة): گەڕەك.

٤-(اَلْمَحارَة (ج) مَحار): گوێچکەماسی.

(اَلْمَحارَتان): کاسەو تۆپی ئێسقانی کۆڵۆت.

حاز: (حازَ- الإبِلَ حَيْزاً): حوشترەکانی ڕادا/ لێخوڕی.

(تَحَيَّزَ- الشَّيءُ): شتەکە شوێنێکی گرتو جێگیر بوو.

(- تِ الحَيَّةُ): مارەکە پەپکەیخوارد.

(اَلحَيِّز): جێگە/ شوێن کە شت بگرێت.

حاس: ١-(حاسَ- الشَّيءَ حَيساً): شتەکەی تێکەڵکرد.

(حاسَ و حَيَّسَ- الحَيْسَ): خورماو ڕۆنی بە ئاردکرد.

(اَلحَيس) (ط): خورماو ڕۆنی بە ئارد.

(اَلْمَحيُوس): کۆیلەزادە/ کەسێکە باوکی کۆیلەو دایکی کەنیزەك کۆیلە بێت (لە وشەی (حيس)ەوە وەرگیراوە واتا: تێکەڵ/ ئاوێتە.

٢-(حاسَ- الحَبْلَ. حَيساً): پەتەکەی بادا.

(اَلحَيْس): کاری جەڵغەم/ ناتەواو/ شلو شێواو دانەمەزراو.

٣-(حِيسَ- حَيْسُهُمْ): فەوتانیان نزیکبۆتەوە.

حاش: (حاشَ- هُ حَيشاً): تۆقاندی.

(- مِنهُ): لێیتۆقی.

(- الرَّجُلُ): کابرا لە ترساندا لوولبوو تۆقیو تێیتەقاند/ کرژ بوو و قووچاندی.

(تَحَيَّشَ): تۆقی.

(اَلحَيْشان): تۆقنۆك.

٢-(حاشَ- الوادِي. حَيْشاً): دۆڵەکە درێژبووەوە.

حـــاص: (حـــاصَ وانحَـــاصَ وتَحايَـــصَ- عَن كـــذا. حَيْصـــاً و حَيْصَـــةً و حيُوصاً و مَحِيصاً و حَيَصانـــاً): خۆی لەوەلا داو خۆی دوورەپەرێزگرت.

(«مَن حاصَ عنِ الشرِّ سَلِمَ»): هەرچی خۆی لە خراپە لابداتو بسڵەمێتەوە بێومیدەبێت.

(حايَـــصَ- هُ): فێڵیان لە یەككردو ویـــستیان بەسەریەكدا زاڵبن.

(حَيْـــصَ بَيْـــصَ): ١-تەنگانـــەو داماویـــی/ چەواشەیی.

(«وَقَعَ في حَيْصَ بَيْصَ أو في حِيْصَ بيْصَ»): كەوتە تەنگانەو داماوی/ چەواشەبوونێكەوە كە لێبرزگار نەبێت.

(اَلمَحِيص= اَلمَحيد): دەرفەت/ دەروو/ رزگارگە/ هەڵاتنگە.

(«لا مَحيصَ لَهُ مِن هـــذا الأمر»): لەم كارە دەرفەتی رزگاربوونی نییـــە/ چاری ناچارەو بێدەرووە.

(«اَلحَيوص- مِنَ الدَّواب): وڵاخی/ چوراپێی چمـــووش/ ســـرك كە مـــل بـــۆ خاوەنەكەی نەدات.

حاضی: (حاضَ- تِ المَرأةُ و تَحَيَّضَت حَيْضاً و مَحِيْضـــاً و مَحاضاً): ژنەكـــە بێنوێژ بوو/ كەوتە حەیزەوە.

(حائِض و حائِضَة (ج) حُيَّض و حَوائِض): ئافرەتی بێنوێژ/ حەیزدار.

(حَيَّـــضَ- المـــاءَ): ئاوەكـــەی بەردا بـــروات/ رەواند.

(اَلحِيَاض): خوێنی بێنوێژیی.

(اَلحِيضَةُ و المَحيْضَةُ): پەرۆی بێنوێژیی.

حيـــع: (حَيْعَلَ- المُـــؤَذِّنُ): بانگدەرەكە وتی: «حَيَّ على الصلاة حَيَّ على الفَلاح».

حاف: ١-(حافَ- عَلَيهِ. حَيفاً): زۆرو ستەمی لێكرد.

(حائِف (ج) حُيَّف و حُيُف و حافَة): زۆردار/ ستەمكار/ زاڵم.

٢-(تَحَيَّفَ الشَيءَ): شـــتەكەی كەلوكۆمكرد/ لەملاو لای بری.

(حائِفُ الجَبَل): (كەنار/ تەنشت)ی شاخ.

(اَلحِيْفَـــة (ج) حِيَـــف): كەنـــار/ ســـووچ/ تەنشت.

٣-(اَلحِيفَةُ): پارچە پینە كە داوێنی كراســـی پێ پینەدەكەن ٢-راونراو.

(اَلأحْيَف (م) حَيْفاء- مِنَ الأمْكِنَة): وشكانیی كە بارانی بەرنەكەوتبێت.

حـــاق: ١-(حـــاقَ- بـــهِ حَيْقـــاً و حُيُوقاً و حَيَقاناً): دەورەیدا/ گەمارۆیدا/ ئابڵووقەیدا/ ئەملاولای لێگرت.

(-بِهِمُ العَذابُ): سزاو دەردیان بەسەردا باری/ گریدان.

(أحاقَ- بِهِ): دەوریگرت.

(-الشـــيءَ بِكَذا): ئەوەی بە دەوری شتەكەدا

گرت/ بەوە دەوری شتەکەیگرت.
(إحْتاقَ- على الشـيءَ): شـتەکەی پاراستو نیگایدا.
٢-(حـاقَ- فيه السَّـيفُ حَيْقـاً و حُيُوقاً و حَيَقاناً): شمشێرەکە کاری خۆی تێکرد.
٣-(حـاقَ- بهـمُ الأمْـرُ. حَيْقـاً و حُيُوقاً وحَيَقانـاً): کارەکە داوێنگیریانبـوو بوو بە ئەرکو پێویست بەسەریانەوە.
(ألحَيْق): گرفتاریی/ کـە بە هۆی کردارێکی خراپی خۆیەوە مرۆڤ تووشیدەبێت.
٤-(حايَـقَ- هُ. مُحايَقَـةً): ١-(ئێرەیـی/ حەسوودی) پێبرد ٢-رقی لێبوو.
(ألحَيْقَل): بێفەر/ بێکەڵك/ خوێریی.
حاك: ١-(حاكَ. حَيْـكاً و حَيَكاناً): بەفیزو خۆبادانەوە ڕۆیشت.
(حائِـك و حَيَّاك (م) حَيَاكـه و حَيْكانَة و حَيْكى): خۆبادەرو بەفیزو دەعیە ڕۆیشتوو.
(مَشْيَةُ حَيْكى): ڕۆیشتنی بە خۆبادانەوەو بە فیزەوە.
٢-(حاكَ و أحاكَ- السَّيفُ. حَيْكاً و حَيَكاناً): شمشێرەکە بری.
(- السَّـيفُ أوِ الـكَلامُ فيه): شـمێرەکە یان قسەکە کاری خۆیکردو جێکاری بەجێهێشت.
٣-(إحتـاكَ- بِثَوبِـهِ إحْتيـاكاً): خـۆی لە بەرگەکەوە ئاڵاندو خۆی تێدا شاردەوە.
حـال: ١-(حالَ- الشَـيءُ. حُيُولاً): شـتەکە گۆڕا.
٢-(حالَ- المـاءُ. حُيُولاً): ئاوەکە گەرایەوە لە دۆڵەکەدا بوو بە زەلکاو.
(ألحَيْـل (ج) أحْيـال و حُيُـول): زەلکاو لە نشێویی دۆڵەکەدا.
٣-(ألحَيْل (ج) أحْيال و حُيُول): توانا/ هێز/ تین.
(ألحَيْلَةُ): فێڵ ٢-ڕەوەمەڕ یان بزن.
(ألحِيْلَةُ (ج) حِيَل): ١-بڕشـت/ دەسەڵاتی کار هەڵسوراندن ٢-کارامەیی/ وردبینیو لێزانیی.
(ألأحْيَل والأحْوَل): ١-زۆرزانترین/ فێڵبازترین/ تەڵەکەبازترین ٢-لەبڕشتترین.
(ألحَيلان) (ز): جەنجەڕ کە دەغڵی دورواوی پێدەکوترێت.
حان: ١-(حانَ الشَـيءُ. حَيْنـاً و حَيْنُونَةً): دەمی شـتەکە هاتووە/ نزیکبۆتـەوە/ هات/ نزیکبووەوە.
(- لَهُ أن يَفْعَلَ كذا): کاتی ئەوە هاتووە ئەوە ئەنجام بدات/ ئەوە بکات.
(- السُـنبُلُ): گوڵە گەنمەکە گەیوەو وشـك بووە کاتی دروێنەکردنیەتی.
(حَيَّنَ- هُ): کاتی بۆ دیاریکرد/ کاتی بۆ دانا.
(حايَنَ- هُ): لەکاتی دیاریکراودا کاری لەگەڵدا کرد.
(أحْيَنَ- الرَجُلُ أوَ الشيءُ. إحْياناً): ڕۆژانێك یان دەمانێك بەسـەر پیاوەکەدا یان شتەکەدا

تێپەری.

(- بالمَكانِ): دەمێك/ ماوەیەك لە شوێنەكەدا نیشتەنی بوو.

(تَحَيَّـنَ- مِنهُ غَفلَـةً): چاومڕێی كاتێك بوو بێئاگا بێت.

(«هُوَ يَتَحَيَّـنُ طَعامَ الناسِ»): ئەو چاوی لە خواردنی خەڵكە بۆ هەلی ئەوە دەگەڕێت.

(إسْتَحْيَنَ): چاوە چاوی هەلێكی لەبار بوو.

(ألحيْـن (ج) أحيان (جـج) أحايين): دەم/ كات/ ماوە. چاخ/ هەل، بوار، سەردەم.

(ألحينَةُ وأحايين): ناوبەناو/ جارەجارە.

(ألمِحْيان= ألحين): دەم/ كات/ ماوە/ سەردەم. بوار. چاخ.

٢-(حانَ- فُلانٌ حَيْناً و حَيْنونَةً): فیسار مرد یان تووشی (چورتوم/ مەینەتییەك) بوو.

«أحانَه اللهُ»: خودا فەوتاندی/ مراندی.

ألحين: ١ـ هەوتان ٢ـ چورتوم.

ألحـان والحانَة: مەیخانە (هەردوو وشـەكە لـە (حَين)ەوە هاتووە واتا لەناوچوونی پارەو سامان.

(ألحائِنَةُ (ج) حَوائِن): وەی/ چورتوم، بەڵا/ ئاپۆرە.

(أحـانَ- هُ اللهُ): خودا فەوتاندی/ لەناویبرد/ مراندی.

٣-(حانَ-الرَجُـلُ. حَيْنـاً و حَينُونَةً):ڕێی ڕاستی نەدۆزییەوەو سەری لێشێوا.

(حَيَّـنَ- اللهُ فُلانـاً): خـودا بـۆ ڕێڕاسـت سەرینەخست.

(تَحَيَّـنَ): بێبەشـی ڕێی سـەركەوتنو ڕێی ڕاسـتیی بـوو/ دەسـتگیری ڕێی ڕاسـتییو سەركەوتن نەبوو.

(ألحائِن): گەوج.

حيي: ١-(حَيِيَ. حَياةً): ژیا/ زیندوو بوو.

(حَيَّ. يَحيى): ژیا/ زیندوو بوو.

(حَيّا- هُ. تَحِيَّةً): سڵاوی لێكرد وتی: سڵاوی خودات لێبێت واتاتەمەنت درێژ بكات.

(- هُ اللهُ): خودا هێشتیەوە تەمەنی درێژكرد.

(حايـا- الصَبِـيَّ. مُحايـاةً): خواردنـی دەرخواردی منداڵەكە دا.

(- النارَ): ئاگرەكەیكردەوە.

(أحيا- هُ): زیندوویكـردەوە/ ژیاندیەوە یان ژیاندی.

(- النـارَ): ئاگرەكـەی خۆشـكرد/ فووی بە ئاگرەكەدا كرد تا كڵپە بسێنێت.

(- الأرضَ): زەویەكەی ژیاندەوەو پەینیكرد/ بەپیتیكرد.

(- الرائِـدُ الأرضَ): ڕانوماكـە زەوییەكـەی بەپیت هاتە بەرچاو.

(أحْيـا واسـتَحْيا- هُ): بـە زیندوێتیـی بەرەڵایكرد/ بەجێیهێشت.

(ألحَيّ): زیندوو.

(حَيَوِيّ): زیندوێتیی.

(«لايَعرِفُ الحَيَّ مِنَ اللّي»): گەوجە (ئێمەیش دەڵێین: گێــزەرو گونــی لێکجیاناکاتەوە واتا گەوجە.

(أَلحَيّ): ١-گەرەك ٢-تیرەی هۆزێکی عەرەب.

(أَلحَيا والحَياء): ١-سەوزاییو کشتوکاڵ ٢-باران چونکە زەویو خەڵك دەژیەنێتەوە ٣-رووەك.

الحیاة: ژین/ ژیان.

(أَلحَيَّةُ): مێی وشەی (أَلحَي)؛ زیندوو.

(أَلحيَّــةُ (ج) حَیَّات و حَیَــوات) (ح): ماری نێرو مێ لە وشەی (الحیاة)ەوە وەرگیراوە.

(أَرضٌ حَيَّة): زەوییەکی سەوزو بە پیت/ پڕ فەروبێر.

(أَلحَیُّوت): نێرەمار.

(أَلمحیــا (ج) مَحاي): ١-شــوێنی تێــدا ژیان/ ژینگە ٢-ژیان.

(أَلحَیَــوان (ج) حَیَوانــات) (ح): گیانەوەر. زیندەوەرێکە کــە دەجووڵێتو هەســتیارەو دخوات لەســەر زیندەوەریتر دەژی یان لەسەر رووەك.

(أَلحَیَوانــات): هەمــوو ئــەو زینــدەوەرو گیانەوەرانــەی کــە لە کێتیــدا دەژین یان لە وڵاتێکدا یان لە چاخێکدا ژیاون.

(حَیَوانــات العَصــر الحَجَــري أَو حَیَوانات أَفریقیــا): گیانەوەرانی چاخــی بەردین یان گیانەوەرانی ئەفەریقا.

٢-(حَییَ- مِنهُ. حَیاءً): شەرمی لێکرد/ خۆی بەرامبەری پێچایەوە.

(حَیاء): شەرمکردن/ شەرمو شکۆ.

(حایا- زَیداً. مُحایاةً): شەرمی بەزەید کرد.

(إِســتَحیا- هُ مِنــهُ): لــە شــەرماندا خــۆی لێشــاردەوەو خۆی کەنارگرت/ لە شــەرماندا چوو.

(إِستَحیا واسْــتَحی – مِنهُ): شەرمی لێکرد/ تەریق بووەوەو خۆی لێپێچایەوە/ بەرامبەری کەمروو بوو/ شەرمنبوو.

(أَلحَیا) ١-شەرم/ شکۆو خۆپێچانەوە ٢-تۆبەکردنو پەشــیمانبوونەوە ٣-چوون/ دڵتەنگبــوونو سڵکردنەوە لە ترسی تەشەرو توانج.

(أَلحَییّ والحَیِيّ): شــەرمن/ بە شەرمو شکۆ/ کەمروو.

(أَلمُسْــتَحِیَة) (ن): گیاشــەرمە. رووەکێکــە ئەگــەر دەســتی لێبدەیت گەڵاکانــی پێکەوە دەلکێن باشــتر وایە پێی بوترێت (حَساسة): هەستیار.

٣-(حَییَ- الطَریقُ. حَیاءً): رێگەکە دیاربوو.

٤-(حَیّا هُ تَحِیَّةً): ســڵاوی لێکرد/ رۆژباشــی لێکرد.

(تَحِیَّة): سڵاوکردن/ رۆژباشکردن.

(أَلمُحَیّا): روو/ چارە/ روخسار.

(«حَیَّ اللهُ وَجهَكَ»): خودا رووی میهرەبانیت تێبکات.

٥-(حَیّا): نزیکبووەوە.

(«حَيا الخَمســينَ مِــن عُمُــرِهِ»): خۆی له تەمەنی پەنجاداوە/ نزیکی پەنجا بۆتەوە.

٦-(أَحْيا- اللَّيلَ): شــەوی بە رابوردنو کەیف (بەسەربرد/ رۆژکردەوە).

٧-(حَيَّ و حَيَّ هَلاَ وحَيَّهْلَ): وەرەو خێراکە/ وەرە بەرەوەو پەلەکە.

(«حَيَّ على الصَّــلاةِ»): وەرەو پەلە بکە/ بۆ نوێژکردن گورجبە.

(حَيَّهل بِفُلان): بانگی فیسار بکە.

الملحق:

حیی: (الحَيَوي): پێویستو گرنگ بۆ ژیان.

(«وظائِــف حَيَويَّــة»): ١-کــردەی گرنــگو پێویست ٢-فرمانی زیندەوەریی.

(أَلقُوة الحَيَويَّة): هێز/ توانای (زیندەوەرییو پێوستو گرنگ) بۆ ژیان.

(أَلحَيَويَ): بۆ ژیان پێویست.

(«مَــوردُ حَيَــوي»): دەرامەتێکــی گرنگو پێویستی ژیان.

(أَلحَيَــويُّ- مِــن الأُمــور): کارە بایەخدارو گرنگەکان.

(أَلمَجال الحَيَــوِيّ): (کایە/ بوار)ی بایەخدارو گرنگ.

(أَلمَجــال الحَيَــوِيّ في الجغرافيــة الطَبيعِيَّة والسياســة): بــوارو مــاوەی پڕبایەخــی جوگرافیــای سروشــتییو رامیاریــی، بــۆ گەشــەکردنو ژیانو پەرەسەندنی دەوڵەتێك زەوییو دەروویەکی دەریایی زۆر پێویستە.

(أَلحَيَويَّــة): زیندوێتیــیو گورجوگۆڵیــی/ چابوکیی.

(حَيَويَّــة ديدان مِجهَرِيَّة): چابووکیی کرمە میکرۆسکۆبییەکان.

(أَلحَيَويَّة): گورجوگۆڵیی/ چابوکیی/ چالاکیی.

(«مُفعَــمٌ بالحَيَويَّــة»): زۆر گورجوگۆڵــە/ چالاکە/ چابوکە/ بەتوانایە.



(خ) (الخاء): حەوتەمـین پیتی ئەلفو بێی عەرەبییە. لە ژمێرەی کۆی پیتەکاندا بریتییە لە (٦٠٠).

خبَ: ١-(خَـبَّ- النَّباتُ. خبَّـاً): ڕووەکەکە خۆی کێشا/ درێژبوو و بەرزبووەوە.

٢-(خَـبَّ- الرَّجُـلُ خبَّـاً): شـتەکەی خۆی وەشـاند/ بەکەسـینەدا ٢ لــە ڕژدیـدا خۆی لەژێرزەمیندا شـاردەوە، تا کەس نەزانێت لە کوێیە.

(ألخَبّ (ج) خُبُوب): تێکچوون/ شێتبوون.

٣-(خـبَّ واخْتَـبَّ- الفَرَسُ في عَـدْوه خَبّاً وخَبيبـاً وخَبَبـاً): چارەوێکـە کەوتە چوار ناڵە.

(أخَـبَّ- الفَرَس): چوارناڵـەی بە چارەوێکە کرد.

(ألخَبَـب) (مـص): جـۆرە غارکردنێکـە/ چوارناڵە.

(- مَشـى خَبَباً): بە چوارناڵە ڕۆیشت/ خێرا ڕۆیشت.

٤-(خَـبَّ- البَحْـرُ. خِبّاً و خَبَبـاً): دەریاکە خرۆشا/ هەستاو هەڵچوو.

(ألخَبُّ): خرۆشانو هەستانی دەریا.

(أصابهُم خَبٌّ): باگێژێداو تووشـی هەستانو خرۆشانی دەریا بوون.

٥-(خَـبَّ. خَبّاً و خِبّـاً): فێڵبـاز دەرچوو/ کەڵەکباز بوو/ تەڵەکەباز بوو.

(خَبَّـب- هُ): فێڵیـی لێکـرد/ فریویـدا/ هەڵیخەڵەتاندو تێکیدا.

(«خَبَّب على فلان صَديقَهُ): دۆستەکەی لە فیسار هەڵگێڕایەوە/ لێیکردو تێکیدا.

(ألخَبّ (ج) خُبُوب) (مص): فێڵباز/ فریودەر/ کەڵەکباز.

(ألخَبّ): فێڵ/ کەڵەکبازیی/ فریودان.

(ألخَبّـاب= الخَـدّاع): فێڵبـاز/ فریـودەر/

کەڵەکباز.
٦-(خَبَّبَ- لَحْمَهُ): گۆشـــتەکەی پووکایەوەو چرچ و لۆچیی کەوتە پێستەکەیەوە.
(اَلخُبَّةُ): پلە گۆشتێك.
(اَلخَبِيبَــة (ج) خَبائِــب): پلــە گۆشــتێکی درێژکۆلەو نادیار.
٧-(اَلخُبّ (ج) خُبُوب وأَخبَاب): ١-زەوی چاڵ/ نزمو تەخت ٢-تویکڵی درەخت.
(اَلخَــبّ (ج) خُبُــوب: ١-ڕێگایەکــی ناولم ٢-تەختایی/ دەشتێکی نێوان دوو بەرزایی.
(اَلخُبَّةُ): زەلکاو.
(اَلخُبَّةُ والمَخَبَّةُ): ناو دۆڵ.
(اَلخَبَّةُ والخُبَّةُ والخِبَّــةِ): ١-ڕێگایەکی ناولم یان ڕێی ناو هــەور ٢-پارچە پەڕۆیەکی درێژ کە دەستی پێببەستن.
(اَلخَبَب): کێشێکی شیعر.
(ثَوبٌ خِبَبٌ و خَبائِــبٌ وأَخبابٌ): بەرگێکی چەند پارچەیی یان بەرگێکی لێکدراو (لەبەر زۆریی پارچەکانی).
(اَلخَبِيبَة (ج) خَبائِب): ناوی دۆڵ.
اَلخَبَبُ: کێشێکی شیعری عەرەبییە.
٨-(خبخَبَ- ه): ناپاکیی لەگەڵدا کرد.
(- الرَجُلُ): پیاوەکە ورگی پەیداکردو ورگی شۆڕبووەوە.
(تَخَبخَــبَ- بَدَنُهُ): لەشــی پــاش قەڵەویی پووکایەوە/ لەڕ بوو.

(- الشـــيءُ المُضطَــرِبُ): شــتە هەڵچووەکــە خاوبووەوەو دامرکایەوە.
(- الحَرُّ): گەرماکە کەوت/ نیشتەوە.
خبأ: ١-(خَبَأَ وخَبَّأَ- الشَيءَ. خَبْأً): شتەکەی داپۆشیو شاردیەوە.
(اِخْتَبَأَ- مِنهُ): خۆی لێشاردەوە/ لێونکرد.
(- الشَّيءَ): شتەکەی داپۆشیو شاردەوە.
(«اِخْتَبَــأَ لَهُ خَبِيئاً»): شــتێکی لێشــاردەوەو پاشان دەربارەی لێیپرسی.
(اَلخَبْءُ والخَبِيءُ): شتی شاردراوەکە.
(اَلخَبْءُ- مِنَ الأَرضِ): ڕووەکی زەوی.
(- مِن السَّماءِ): بارانی ئاسمان.
(«أَخْــرَجَ خَــبْءُ السَّــماءِ خَــبْءَ الأَرضِ): بارانەکە ڕووەکەکەی سەرپێدەرهێنا.
(اَلخِبَــاء (ج) أَخْبِيَة): دەوار/ ڕەشــماڵ، کە لــە تووکــی حوشــترو خورییو مــووی بزن دروســتدەکرێت ٢-هێلکەدان لە گوڵدا یەکێکە یــان زیاتر کە بەرگەهێشــت هێلکەدان گەشــە دەســێنێتو گــەورە دەبێــتو بەپێــی بــار بەرهەدەسێنێت.
(اَلخَبِيئَــة (ج) خَبايــا): ئــەوەی کــە شاردراوەیە.
(اَلخُبْــأَةُ): کچ/ دۆت/ کیــژ (چونکە هەر لە ماڵەوە دەبێت).
(اَلمَخْبَــأ (ج) مَخابِــئ): پەناگــا/ شــوێنی خۆشاردنەوە/ پەنا.

(اَلخابِئَــة والخابِيَة (ج) خَــوابٍ وخَوابئ): كووپەی گەورە.
(بنتُ الخابِيَة): مەی- ئارەق- شەراب.
٢-(خابَأَهُ): مەتەڵی لێداهێنا.
خبت: (خَبَتَ- ذكرُهُ. خَبْتاً): ناوی کوژایەوە/ ناوی کوێربووەوە/ ناوی ونبوو.
(أَخبَتَ- القَومُ): خوێشــگەل چوونە دەشــتە تەختە پانو بەرینەکە نیشتەنی بوون.
(- إلى اللهِ): بە برواو ملکەچییەوە رووی کردە بەزەیی خوداو دڵنیا لە میهرەبانی ئەو.
(اَلخَبْــت (ج) أَخبــات و خُبُوت): دەشــتی تەختو پانو بەرین.
(اَلخَبْتَةُ والخَبتَةُ): بێفیزیی/ بێهەوایی.
(اَلخَبيت): ١-شکاو.
(«هو خَبيتُ القَلب»): ئەو دڵشکاوە/ دڵشکستە ٢-رسواو سووکی ناپاك/ موخەنەت.
خبث: ١-(خَبُثَ- خُبْثاً و خَباثَةً و خَباثِيَةً): گەند بوو/ خراپبوو/ ڤێزەونبوو/ ناخۆشبوو- پیسبوو.
(خبيــث (ج) خُبَثــاء و خُبُــث وأَخْباث و خَبَثَةُ): ١-گەند/ پیس/ پۆخڵ ٢-بەد/ خراپ/ گلاو.
(خَبَّثَ- الطَّعامَ): خواردنەکەی ناخۆشــکرد/ ڤێزەونکرد.
(اَلخَبيــث (ج) خُبُــث و خُبَثــاء وأَخْباث و خَبَثَة (م) خَبيثَةُ (ج) خَبيثات و خَبائِث): ١-ڤێــزەون ٢-گلاو ٣-بۆگەن ٤-هەموو شــتێکی خراپ ٥-هەموو شتێکی حەرام.
(اَلخَبائِث): ڤێزەونەکان، ئەوەی کە عەرەب لە کاتیخۆیدا بێــزی لێدەکردەوەو نەیدەخواوَرد وەك مارو قالۆنچە.
(اَلخَبَث): ١-خڵتەو پیســیی ناو ئاســنو زێڕ کــە کاری دەغەڵییە ٢-ئەوەی کــە بێکەڵکە/ بێفەرە.
(- مِــنَ الحَديد ونَحوَهُ): ئەوەی کە بە تینی ئاگرەکە لە ئاســنەکە هەڵدەوەرێت کاتێك بۆ دروستکردن ئاسنەکە بەکاردەهێنرێت.
(اَلأَخْبَثان): دوو پیســیەکە کە گوو میزە کە بۆگەنن.
٢-(خَبُــثَ- ت نَفْسُــهُ): گــەدەی (تێکچوو/ قورسبوو و دڵی تێکەڵهات).
٣-(خَبَــثَ. خُبْثاً): ١-ناپەســەندو تەڵەکەباز بوو/ فێڵباز بوو ٢-هاورێی ناپەسەندیگرت.
(خَبَّثَ- هُ): ناپەسەندو تەڵەکەبازیکرد.
(أَخْبَثَ): هاورێی ناپەسەندو بەدیگرت.
(-هُ): ١-فێری‌دەروونپیسیی‌وتەڵەکەبازییکرد/ تێکیدا ٢-بەناپەسەندو تەڵەکەبازیدانا.
(تَخَبَّــث): خــۆی بــە فێڵبــازو بەدنوانــدو پیشاندا.
(تَخابَثَ): بەدخویی نواند/ رێی کەڵەکبازیی‌و ناپەسەندییگرت. بەدبوو.
(إستَخبَثَ): بەدییکردو فێڵیکرد.

(- هُ): ئەوی بە ناپەسەند/ نالەبارو پیس دانا وا هاتە بەرچاوی.

(خُبُث): هەی پیسی کەڵەکباز/ بەدرەسەن (ئەم وشەیە تەنها بۆ جنێو بەکاردێت و بۆ بانگکردن).

«یا خُبَث»: هۆ پیسی کەڵەکباز/ هۆ بەدپیاوی بەدرەسەن/ هەی ناپەسەند.

(ألخَبيث (ج) خُبُث وخُبَثاء وأخْباث وخَبَثَة (م) خَبيثَة (ج) خَبيثات وخَبائِث): ١-خراپ/ بەد/ نالەبار/ ناپەسەند ٢-زۆر خراپ/ کەڵەکباز/ نالەبار/ ناجسن.

(خَباثِ): بۆ جنێودان بە ئافرەت و بانگکردنی.

«یاخَباثِ»: هەی پیسی ناجسن/ نالەبار/ بەد.

(ألمَخبَثَة): مایەی بەدیی/ خراپ/ پیسبون/ تێکدەر/ گەنکار.

(ألخَبائِث): کرداری بەد/ کرداری پیس و قێزەون/ کرداری ناپەسەندانە.

(ألخِبِّثى= ألخُبْث): ١-گڵاویی ٢-گەنیی ٣-خراپیی/ بەدیی ٤-پیسیی ٥-حەرام- فێڵ ٧-نەگریسیی.

خبج: (خَبَجَ- هُ بِالعَصا خَبْجاً): بەدارلێیدا.

(- الرَجُلُ): کابرا تری/ تریکەند.

(ألخَبَج والخُباج): ترکەن/ تریو.

ألخبيج والخَباجاء: گەوج.

حبر: ١-(خَبَرَ- الشيءَ خُبْراً و خِبْرَةً): بەتاقیکردنەوە لە شتکە گەیشت و زانی.

(تَخابَرا): هەریەکە لەو دوانە یەکتریان تاقیکردەوە لە یەکتری گەیشتن.

(إخْتَبَرَ- الشيءَ): شتەکەی تاقیکردەوەو خستیە بەر ئەزموون.

(ألخُبر): تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندن/ ئەزموونکردن.

(«صَدَّقَ الخَبَرَ الخُبْرُ»): بە بینین هەواڵە بیستراوەکە سەلمێنراو ساغ بووەوە.

(ألمُختَبَر): تاقیگە.

(ألخَبير (ج) خُبَراء- في إصْطِلاح المَحاكِم): لە دادگاکاندایە. کار ئاشناو بەلەد/ شارەزا/ پسپۆر دەوترێت کە دادەنرێت بۆ لێوردبوونەوەو ساغکردنەوەی کێشەکان کە دێتە پێشەوە.

(ألمَخْبَر والمَخْبَرَة والمَخْبُرَة): زانینی شت بە تاقیکردنەوە نەك بە چاو.

٢-(خَبُرَ و خَبَرَ الشَيءَ وبِهِ. خُبراً و خِبْراً و خُبْرَةً وخِبْرَةً و مَخْبُرَةً ومَخْبَرَةً): لە راستیی و کورۆکی شتەکە گەیشت و بۆی ساغبووەوە.

(خَبَّرَ وأَخْبَرَ- هُ الشَّيءُ و بِالشَّيءِ): پێیراگەیاندو تێیگەیاند.

(«أَخْبَرَهُ خُبُورَةً»): ئەوەی کە دەیزانی پێیراگەیاند.

(خابَرَ- هُ): قسەی لەگەڵدا کرد/ دواندی.

پێکەوە لێکۆڵینەوەیانکرد.

(تَخَبَّرَ- الأَمرَ): لە ڕاستیی کارەکە گەیشتو زانی.

(- هُ): هەواڵەکەی لێپرسی.

(تَخابَرا): یەکتریان دواند/ پێکەوە لێکۆڵینەوەیانکردو لە یەکیانگەیاند.

(إختَبَرَ- الشيءَ): شتەکەی تاقیکردەوەو بۆی ساغبووەوەو ڕاستیەکەی زانی.

(إستَخْبَرَ- هُ): هەواڵەکەی لێپرسی.

(أَلخُبر (مص): ١-بەشتزانین ٢-تاقیکردنەوە ٣-هەواڵزانین.

(أَلخَبْر والخَبِر- مِنَ الرجال): پیاوی هەواڵزان/ بەئاگا/ شارەزا.

(أَلخَبَر (ج) أَخْبار وأَخابیر): هەواڵ/ دەنگوباس.

(أَلأَخباريُّ): ١-هەواڵگەیەن ٢-هەواڵیار ٣-پەیامنێر.

(أَلخَبير (ج) خُبَراء): ١-پسپۆڕ ٢-هەواڵزان ٣-زانا لە بوارێکدا.

(أَلمَخْبَر والمَخْبَرَة والمَخْبُرَة): زانینی شتێك بە وەرگرتنی هەواڵی نەك بە بینینی.

٣-(خَبَرَ- الأَرْضَ. خُبْراً): زەویەکەی بۆ کشتوکاڵ کێڵا.

(خابَرَ- هُ): لەگەڵیدا نیوەکارییکرد/ هاوبەشی کشتەکەیکرد بە سێیەك یان چواریەك.

(أَلخَبْر): کشتوکاڵ.

(خَبْرَة): کشتێك.

(ج) (خُبور. الخَبير (ج) خُبَراء): ١-جوتیار/ کێڵەر ٢-کشتوکاڵ.

٤-(خَبَرَ- الطَّعامَ): خواردنەکەی چەورکرد.

(إختَبَرَ- لأَهلِهِ): پێخۆری بۆ خێزانەکەی پەیداکرد/ هێنا.

(أَلخُبْرَة): ١-پێخۆر ٢-تێکۆشینێکی زۆر/ تریتێکی زۆر ٣-خۆراکێك کە نانو جۆرە خواردنێك بۆ خێزان بکرڕێت.

(«إجْتَمَعوا علی خُبْرَتِهِ»): لە خوارنەکەی مرووکان.

(- الخُبْرَةُ) (ح): مەڕێك کە خوێشگەل دەیکڕنو بەشیدەکەنو هەریەکە پارەی خۆی دەدات.

٥-(خابَرَ- هُ): بەتەنگیەوە هاتو پێیەوە خەریکبوو.

٦-(أَلخَبْر. الواحِدَةُ خَبْرَة (ج) خُبُور): ١-کوندەیەکی گەورە/ کوندەی گاوەست ٢- (ح) مێحوشترێکی زۆر بەشیر ٣-گۆلاوێکی ناوشاخ ٤-(ن) داری سیواكو مۆردو گژوگیای دەوروپشتی.

(أَلخِبر): ١-کوندەی گەورەی گاوەست ٢-(ح) مێحوشتری زۆربەشیر.

(أَلخَبیر): تووکی حوشترو مووی هەڵوەریوی کاتی برینەوەی.

(خَبیرَة (ج) خَبائِر): مووی وەریوی کاتی

برینەوەی حوشتر.
(ألخَبْراء (ج) خَباری و خَبار و خَبْراوات): ١-کونـدەی گـەورە ٢-زەوییەکـی نشـێو کە درەختی سیواكو مۆردی لێدەروێت.
(ألخَبار): زەویی نەرمانو سستەك.
ألخَبارَة: میکرۆب.
ألخابُور (ن): ١-جۆرە درەختێکە/ داری بۆن/ درەختی دیاریی ٢-ڕووباری خابور کە دەڕژێتە دیجلەوەو لە کوردستاندایە.
الملحق:
خـبر: (ألإسـتِخْبار): هەوڵـی هەواڵزانینی شتێكو بەدوایدا گەرانو لێپرسینی.
(ألإستِخْبار عَن صِحَّةِ فلان): هەوڵی زانینی تەندروسـتیی فیسـارم لە تەندروستی فیسار پرسینەوە.
(ألإستِخْبارات): دەزگای زانیاریی: دەزگایەکی میرییە کاری سووسـە لەدوژمنکردنەو شـت زانینە دەربارەی، هەروەهـا ئەوە بدۆزێتەوە کە ئاسـایشو هێمنی دەرەوەو ناوەوەی وڵات تێکدەداتو پشێویی و ئاشوبی تێدەخات.

خبز: ١-(خَبَزَ- الخُبْزَ خَبْزاً): نانی کردەوە.
(- القَومَ): نانی دەرخواردی خوێشاندا.
(«خَبَزَتهُـم و تَمَرَتْهُـم»): نـانو خورمای دەرخوارد دان.
(إختَبَزَ- الخُبزَ): نانیکردەوە.
(ألخُبز): نان.
(خُبزَة): نانێك.
(خُبْـزُ الغُراب) (ن): قارچکـی ژەهردار کە وەك نان خرە/ قارچەمارانە.
(ألخابِز): نانەوا/ نانکەر/ خاوەن نان.
(ألخَبیـز): ١-نانیکراوە/ نانیتیریی ٢-تریت.
(ألخَبَّاز): نانکەر/ نانەوا.
(ألخِبازَة): نانەوایی/ نانکەریی.
٢-(خَبَـزَ و تَخَبَّـزَ- هُ. خَبـزاً): لێیـدا/ پانیکردەوە.
٣-(إنْخَبَـزَ- المَـکانُ): شـوێنەکە نیشـتو تەختبوو.
(ألخَبَز): شوێنی نزمی تەخت.
٤-(ألخُبَّـازی والخُبَّاز والخُبَّیْـزَة والخُبَّازَة) (ن): تۆڵەکە (گیایەکی گەڵاخڕە) لینجییەکی تێدایـە ڕەوانە بـە کـوڵاوی دەخورێتو بۆ دەرمانیش بەکاردێت.
خبـس: ١-(خَبَـسَ واخْتَبَـسَ وتَخَبَّـسَ- الشَّـيءَ. خَبْسـاً): بردی، چنگی بە شتەکەدا گرت/ تاڵانیکرد.
(ألخابِس والخَبُوس والخَبَّـاس والمُخْتَبِس): شێر (چونکە چنگ لە نێچیرەکەی گیردەکاتو بە چنگە).
(ألخُباسَة والخُباساء): دەستکەوت/ تاڵانیی.
٢-(خَبَسَ- فُلاناً حَقَّهُ. خَبْساً): مافی فیساری (خوارد/ زەوتکرد لە خشـتەیبرد) و سـتەمی لێکرد.

(إِخْتَبَسَ- مالُهُ): ماڵەکەی لەدەستچوو.

(اَلْخَبـــوس): زۆر ســـتەمکار/ زۆرداری بێبەزەیی.

(اَلْخُباسة): زۆرداریی/ ستەمکاریی.

خبش: (خَبَشَ و تَخَبَّشَ- الأَشياءَ مِن هاهُنا و هاهُنـــا. خَبْشـــاً): شـــتەکانی لەملاو لەولا پەیداکردو کۆکردەوە.

(اَلْخَبّـــاش): پەیداکـــەر/ بەدەســـتهێنەر/ پەیداکوندە.

(خُباشـــاتُ العَيـــشِ): خـــۆراك‌و شـــتیتر کە پێویستی ژیانبێت.

(خُباشاتُ الناس): خەڵکێکی لە هەمەچیزەو تێکەل/ لە خێڵی تێکەڵ.

خبص: (خَبَصَ- الشـــيءَ بالشَّيءِ. خَبْصاً): شتەکەی تێکەڵی شتەکەیتر کرد.

(خَبَّـــصَ وتَخَبَّـــصَ واخْتَبَـــصَ): خورمـــاو رۆنیکرد.

(إِخْتَبَـــصَ- الرَجُـــلُ): کابرا خورمـــاو رۆنی پۆخیکرد یان خواردی.

(الخَبيص والخَبيصَة (ط): خورماورۆن.

اَلمِخْبَصَـــة: کەوچکێکـــە خورمـــاو رۆنەکەی پێهەڵگێڕو داگێڕ دەکرێت.

خبط: ١-(خَبَـــطَ- هُ. خَبطـــاً): تێر کوتای زۆری لێدا.

(- الشَـــجَرَةَ): درەختەکـــەی بەســـتەوەو تەکانیدایە راپوەشاند گەڵاکەی وەراند.

(تَخَبَّطَ- هُ): توند لێیدا.

اَلخَبَـــط (ز): گەڵای وەریـــوی درەخت کە بە گەڵاتەکێن‌و شتیتر دەوەرێنرێت.

(اَلْخَبيط): تێکەڵە-شیر ماستی تێکەڵدەکرێت‌و تێکهەڵدەدرێت تا ئاوێتە بێت.

(اَلمِخْبَـــط والمِخْبَطَـــة (ج) مَخابِط والمِخْباط

(ج) مَخابيـــط): ١-گەڵاکوتك ٢-ئـــەوەی پێی تێکەڵدەدرێت.

٢-(خَبَطَ- الشيءَ. خَبْطاً): توند شتەکەی بە پێی شێلا/ توند پێی پێدانا.

(- اللَّيلَ): بێرانوما/ بێشـــارەزایی رۆیشـــت‌و شەوی بە کوێلەوە گرت.

(- هُ بخَيرٍ): بە بێناســـینی چاکـــەی لەگەڵدا کردو شتی پێبەخشی.

(تَخَبَّطَ- الشَيءِ): شتەکەی پێشێلکرد.

(اَلخابِط) (فا): پێشـــێلکەر- بەشـــەو بێنیازو شارەزایی رۆیشتوو.

(«يَخبُـــطُ خَبْـــطَ عَشـــواء»): کوێرانـــەو بێلێکدانـــەوە (پەلدەکوتێـــت/ دەنیشـــێتە سەرکار).

(«ومـــا أدري أَيُّ خابِطِ لَيلٍ هوَ»): نازانم چ رێکەوتێکی شـــەوی نەشـــارەزایە وا لە دەرگا دەدا.

(اَلخَبيط): گۆلێکە بە پێی حوشتر تێکدرابێت. پێشێلکرابێت.

(اَلخَبيـــط والخَبُوط والأَخْبَط- مِنَ الخَيلِ):

چارەویٚ کە بە پیٚ زەوی بکوتیٚتەوە.

٣-(خَبَطَ- الشَّيطانُ زيداً. خَبْطاً): شەیتان دەستی لە زەید وەشاندووەو زیانی پیٚگەیاندووە.

(تَخَبَّطَ – الشَّيطانُ زَيداً):شەیتان دەستی لە زەید وەشاندو زیانی پیٚگەیاندووە.

(ألخَبْطَةُ (ج) خِبَط وخُبَط): دەست لیٚوەشاندنی شەیتان/ تیٚکچوون و شیٚتبوون.

(ألخُبَاط):نیمچە (تیٚکچوون/ شیٚتی).

٤-(خَبَطَ- البَعيرَ. خَبْطاً):حوشترەکەی بە داخ نیشانەکرد.

(ألخِباط (ج) خُبُط):داخنیشانەی دریٚژ بە رووەوەو لە باری پانیی.

٥-(خُبِطَ):هەلاٚمەتیگرت.

(مَخْبوط):هەلاٚمەتگرتوو.

(ألخَبْطَةُ (ج) خِبَط وخُبَط):هەلاٚمەت.

٦-(تَخَبَّطَ- تِ البِلادُ): ولاٚتەکە پشیٚویی و ئاشوب و ئاژاوەی تیٚکەوت/ تیٚکچوو.

(إختَبَطَ- تِ البِلادُ): ولاٚتەکە ئاشووب و پشیٚویی تیٚکەوت/ تیٚکچوو.

٧-(ألخَبْطَةُ (ج) خِبَط و خُبَط):١-پاشاوی ئاوی ناو گۆم یان قاپ ٢-ماستی ماوەی بنمەشکە ٣-شتیٚکی کەم.

(«عَليهِ خَبْطَةٌ مِنَ الجَمال»): جوانییەکی کەمی پیٚوە ماوە.

(ألخِبْطَة (ج) خِبَط): پارچەیەك/ بەشیٚك/ هەندیٚك لەو شتە/ بڕیٚك.

(«خِبطَةٌ مِنَ اللَّيل»):بەشیٚکی شەو.

«كان ذلك بعدَ خِبطَةٍ مِنَ اللَّيل»:ئەوە پاش تیٚپەڕبوونی بەشیکی شەو بوو.

(خِبْطَةٌ مِنَ الماءِ):جۆریٚك ئاو/ قومە ئاویٚك.

(ألخَبَاط):تۆز/ گەرد.

خبع: (خَبَعَ- فِي المَكانِ. خَبْعاً):خۆی کوتایە شویٚنەکەوە/ چووە شویٚنەکەوە.

(- الشَّيءَ):شتەکەی شاردەوە/ شتەکەی تیٚداونکرد.

(«جارِيَةٌ خُبَعَةٌ طُلَعَةٌ»): کەنیزەکیٚکە جاریٚك خۆی دەشاریٚتەوەو جاریٚکیش خۆی دەنویٚنیٚت.

(خَبَعَ- الصَّبيُّ خُبُوعاً): منداڵەکە لە تك و تاسەوە چو/ هیٚندە گریاو هەناسەی بڕا رەشداگەرا.

خبق: (خَبَقَ. خَبْقاً):١-دروٚیکرد ٢-هەڵەشە بوو.

(- هُ): بچوکیکردەوە.

تَخَبَّقَ- الشَّيءُ):شتەکە هەڵبەزییەوەو بەرزبووەوە.

(ألخِبَق):١-پیاوی بە هەڵپەو لۆقن ٢-ئەسپی بە پرتاو/ خیٚرا.

خبل: ١-(خَبَلَ وخَبَّلَ- هُ. خَبْلاً):تیٚکیدا/ شیٚواندی.

(- هُ الحُـــزنُ أَو الدَّهرُ أَو الدّاءُ): خەفەت یان ڕۆژگار یان دەرد هۆشی لێبڕیو شێتیکرد یان ئەندامێکی پەکخست.

(- يَدَهُ): دەستی ئیفلیجکرد/ گۆجکرد.

(خَبِلَ. خَبَلاً و خَبالاً): شێتبوو/ تێکچوو.

(خَبِلَ و أَخْبَلَ): شێت/ تێکچوو.

(خَبِلَ- تِ اليَدُ): دەستەکە ئیفلیج بوو/ گۆج بوو.

(إِخْتَبَــلَ- هُ الحُــزْنُ أو الداءُ): پــەژارە یان نەخۆشیی شێتیکرد/ تێکیدا.

(أَلخَبْل والخَبَــل (ج) خُبُول): ١-پەککەوتنی ئەندامــی لــەش ٢-ئیفلیجبــوون/ گۆجبوون ٣-برینی دەستو قاچ.

(أَلخَبلُ – مِنَ الدَّهر): ڕۆژگاری (ڕەشو تاڵ/ نەهات) کە خەڵك خۆشی تێدا نەبینێت.

(أَلخَبــال): ١-گەنیی/ تێکچوون ٢-کەموکوریی ٣-زەحمــەتو ماندوێتیــیو باریگــران/ کوێرەوەریی/ دەردەسەریی ٤-کەموکووریی لە لەشو مێشــكو ئەندامانی لەشدا ٥-مردن ٦-ژەهری کوشندە.

(«هُــوَ خَبالٌ علــى أَهلِهِ»): ئــەو باریگرانە بەسەر شانی خێزانەکەیەوەو کەسوکاریەوە.

(أَلخابِــل): ١-تێکــدەر/ گەنــکار ٢-شــەیتان ٣-جنۆکە.

(«مَسَّــهُ الخابِــل»): جنۆکــە دەســتی لێوەشاندووە.

(الخابلان): شەوو ڕۆژ.

(مُخَبِّل): بە بێ أل): ناوێکی ڕۆژگارە.

(أَلمُخَبَّل): ١-تێچوو/ شــێت/ دێوانە/ شــەیدا ٢-بێدڵو دەروون/ شپرزەو شڵەژاو.

٢-(خَبَــلَ- هُ): گرفتــارو شــەیدایکرد/ دێوانەیکرد.

(«خَبَــلَ- الحُبُّ قَلْبَــهُ»): حــەزو دڵداریی خۆشی لێبڕیو گرفتاریکرد/ دێوانەیکرد.

(أَلخَبْل): پشێویی گۆبەند/ ئاشووب.

٣-(خَبَــلَ و خَبَّلَ- هُ عَــن كذا. خَبْلاً): ڕێی ئەوەی لێگرتو نەیهێشت بیگاتێ.

(خَبْل): ڕێلێگرتنو نەهێشتن.

(«خَبَــلَ عَن فِعلِ أَبيه»): بــاش ڕێی باوکی نەگرتو کەموکوڕیکرد.

(أَلمُخَبَّل): ١-سستەپێی ژانو ئازار.

٤-(إِسْــتَخْبَلَ- هُ الإِبِــلَ): حوشــترەکەی بەدەستیاو دایە.

(أَلخَبْل): دەستیاو.

٥-(الخَبَــل (ج): (باڵندەیــە) کەڵکەڵــەوان/ کوندەگایانــە (باڵندەیەکــە شــەوتا بەیــان دەخوێنێــت) ٢-ئازنــاوی هەندێــك لە میرە گەورەکانە.

خــبن: ١-(خَبَــنَ- الثَّوبَ خَبْنــاً و خِباناً): جلەکەی تیکوبنتیککردو درووی.

(خَبَنَ وأَخْبَــنَ – الطَّعام): خواردنەکەی لە توێی کراسەکەیدا شاردەوە.

(إِخْتَبَنَ- الشيءَ): شتەکەی لە تویی کراسەکەیدا برد.

(اَلْخُبنَةُ (ج) خُبَن):١-لۆچی کراس/ تویی جل ٢-ئەو خواردنەی لە (لۆچی/ تویی) جلدا دەبریت و هەڵدەگیریت.

(رَجُلٌ خُبَنٌ): پیاوێکی داخراوی گرژی نەدوو.

٢-(خَبَنَ- الشَّاعِرُ. خَبْناً و خِباناً):شاعیرەکە لە شیعرەکەیدا شێوە کورتکردنەوەیەکی بەکارهێنا.

(اَلْخَبْن فِي الشِّعر): لابردنی دووەم بەشی زەنەداری وشەکە وەکو ( فاعِلُن.. ئەلفەکەی لادەبردێت دەبێت بە فَعِلُن(ئەوە ئەو شێوە کورتکردنەوەیەیە).

خبا: خَبَا- تِ النارُ أَو الحِدَّةُ خَبْواً و خُبُوّاً): ئاگرەکەیان ڕقەکە دامرکایەوە/ نیشتەوەو کوژایەوە.

(«خَبا لَهَبُهُ»): گڕی ڕقەکەی/ تووڕەییەکەی نیشتەوە.

(أَخبى- النارَ): ئاگرەکەی (دامرکانەوە/ کوژاندەوە).

خبی: (خَبَى- الشيءَ): شتەکەی شاردەوە/ حەشاردا.

(خَبَّى وأَخْبى وتَخَبَى- الخِباءَ): (ڕەشماڵەکەی/ دەوارەکەی) هەڵدا.

إِسْتَخْبى — الخِباءَ): ١-(دەوارەکەی/ ڕەشماڵەکەی) هەڵدا ٢-چووە دەوارەکەوە.

(اَلخِباء (ج) أَخْبِيَة):١-ڕەشماڵ/ چادر/ دەوار (کە لە موو یان خوریی یان تووکیی حوشتر دروستدەکرێت) ٢-بەرگی گەنمو جۆ لە گوڵەکەیدا ٣-بەرگی گوڵ.

خت: (خَتَّ- السِنانَ إِلَيهِ. خَتّاً): دایە بەر نووکی نێزە.

(أَخَتَّ- الرَجُلُ): ناوی باوکیان هێنا تەریقبووەوەو سەری شۆڕکرد.

(- هُ): بەشەکەی کەمکرد.

(اَلْخَتَت): بێهێزیی و زەبوونیی لەش.

(اَلْخَتيت): دەیووس و ڕسوا/ سووک.

ختأ: (خَتَأَ- هُ. عَن كذا. خَتْأً): ڕێی ئەو شتەی لێگرت و بەریگرت.

(إِخْتَتَأَ): لە ترساندا یان لەبەر هەر شتێک ڕەنگیپەڕی/ ڕەنگی گۆڕا/ ڕەنگی هەڵبزرکا.

(- مِن فُلان): لە ترساندا یان لە تەریقیو لە شەرمدا یان لە سەرشۆڕیدا خۆی لە فیسار شاردەوە.

(- لَهُ): فریویدا/ لەخشتەیبرد/ فێڵیی لێکرد.

(- الشيءَ): شتەکەی فڕاند.

(مَفازَةٌ مُخْتَتِئَةٌ): بیابانێک کە ڕێی تێدا دەرنەکرێت.

ختر:١-(خَتَرَ- هُ. خَتْراً): پیسترین نامەردیی/ ناپاکیی لەگەڵدا کرد/ کەڵەکی لێدا.

(خاتِــر و خَتَّار و خَتِــير وخَتُور و خِتِّير): نامەردیی ناپاك/ کەڵەکباز.

٢-(خَتَرَ- ت نَفسُــهُ خَتْــراً و خُتوراً): دڵی تێکەڵهاتو تێکچوو.

(خَتِرَ. خَتَراً): لەشــی شــلبوو/ لەسەرخۆی نەما ســڕبوو. بە ژەهرێك یــان دەرمانێك کە چووبێتە لەشیەوە.

(خَتَّــرَ- هُ الشَّــرابُ): خواردنەوەکە لەشــی شلکرد/ دەروونی تێکداو دایبەزەویدا.

(تَخَتَّــرَ): ١-لەشــی خاوبــووەوەو شــلبوو ٢-لەشی بە هۆی نەخۆشییەکەوە یان شتیترەوە سستبوو/ شلبوو.

٣-(خَتْــرَبَ- هُ): لەتوکوتیکــرد/ بــڕیو پارچەپارچەیکرد.

٤-(خَتْرَمَ. خَتْرَمَةً): زمانی بەســترا/ متبوو بە هۆی نەخۆشییەوە یان تۆقینەوە.

ختــع: (خَتَــعَ- الدَّليــلُ بالقَــوم خَتْعاً و خُتُوعاً): ڕێنیشــاندەرەکە بە تاریکیی شــەو خوێشانی بەرەو شوێنەکەو ئامانجەکە برد.

(- على القَوم): پەلاماری خوێشانیدا/ هێرشی کردنە سەر.

(خَتَــعَ وانْخَتَــعَ- فِي الأرضِ): ســەری خۆی هەڵگرت/ ڕۆیشتو دوورکەوتەوە.

(الخَتِع و الخُتَع): کارامە لە ڕانوماکردندا.

(الخَوتَع): ١-کارامە/ شــارەزا لە ڕانومایيدا ٢-(ح)بەچکە کەروێشك.

(الخِتَاع): دەستکێشی چەرمین کە بازەوان لە ترسی چنگی بازەکە لەدەستیدەکات.

(ختل): ١-خَتَلَ و خاتَلَ- هُ. خَتْلاً و خَتَلاناً و مُخاتَلَــةً): فێڵیلێکــرد/ لەخشــتەیبرد/ هەڵیخەڵەتاند/ فریویدا.

(«خاتَلَ الصَيّادُ»): ڕاوچییەکە بە دزەدزە بۆ نێچیرەکە چوو/ فێڵی لە نێچیرەکە کرد.

(خاتِل و خَتُول): هەڵخەڵەتێن/ فریودەر.

(تَخاتَلــوا): فێڵیان لەیەکتریکــرد/ یەکتریان هەڵخەڵەتاند.

(إختَتَــلَ- الرَجُــلَ): پیاوەکــەی فریــودا/ لەخشتەیبرد/ فێڵیلێکرد.

(الخَتّــال (م) خَتَّالَة): فێڵبــاز/ تەڵەکەباز/ فێڵاوی/ فریودەر.

(إختَتَل – لإســرارِ القَوم): گوێی بۆ بیستنی نهێنیی خوێشگەل (شلکرد/ هەڵخست).

(الخِتل): ١-حەشارگە/ کۆڵیت/ پەناگا ٢-کونە کەروێشك.

٢-(الخَوْتَــل): پیاوی ناســك/ زمانشــیرینو بەوێڵ.

ختــم: ١-(خَتَمَ- الشَــيءَ وعَلَيــهِ خَتْماً و خِتاماً): شتەکەی مۆرکرد/ شەقڵکرد.

(خَتَّمَ): چاكو تەواو مۆریکرد/ شەقڵیکرد.

(- هُ): ئەموستیلەی کردە دەستی.

(تَخَتَّمَ- الخاتِمَ وبِهِ): ئەموســتیلەکەی کردە دەستی.

(«تَخَتَّـمَ بالعَقيقِ»): ئەموسـتيلەی یاقوتی کردە پەنجەیەوە.
(ألخاتـام (ج) خَواتيـم): ١ـئەموسـتيلەکە دەکریتـە پەنجـەو نـاوی خاوەنەکـەی یان شـتیتری لەسەر دەنوسـریت ٢ـمۆر کە مۆری پیدەکەن.
ألخاتَـم والخاتِـم (ج) خواتِـم وخُتُم): ١ـ ئەموستیلە کە ناوی خاوەنەکەی یان شتیتری لەسەر دەنوسریت ٢ـمۆر کە مۆری پیدەکەن.
(ألخَتَـم): هەرچـی مـۆری پیبکریـت ٢ـ ئەموستیلە.
(ألخَتْم): مۆر.
(ألخِتـام (ج) خُتُم): لـۆك/ هەرچییەك کە شتی پی قەپاتبکریتو کۆتایی پیبهینریت.
ألخَتَم= الخاتَم: ١ـئەموستیلە ٢ـمۆر.
(ختَـمَ- العَمَلَ: خَتْمـاً وخِتاماً): لە کارەکە بووەوە/ کارەکەی تەواوکرد.
(- الکِتابَ): کتیبەکەی تەواو خوێندەوە.
(- اللهُ لَـهُ بالخَـیرِ): خودا بـۆی تەواوکردو ئەنجامی بە چاك بۆ گەڕاند.
(أختَمَ — الکِتـابُ): خەریکە کتیبەکە تەواو بیت/ نزیکی تەواو بوون بووەتەوە.
(إخْتَتَـمَ- هُ): گەیاندیـە کۆتایـی/ کۆتایی پیهینا.
(ألخاتَم والخاتِم (ج) خَواتِم وخُتُم): پایان/ کۆتایی/ دوایی/ ئەنجامی هەموو شتیك.

ألخاتِمَـةُ (ج) خواتِـم وخاتِمـات): ١ـمێی وشـەی (الخاتم) ٢ـئەوپەڕی شـت/ کۆتاییو سەرئەنجامی دوایی.
٣-(خَتَمَ- على قَلبِهِ. خَتْماً و خِتاماً): خودا وا دڵی بەسـت/ قەپاتکرد کە لە هیچ نەگات/ هەست بە هیچ نەکات.
(«خَتَمَ عَلیكَ بابَهُ»): پشتی تیکردیت/ لیت لووتەلا بوو.
(- الإناءَ): دەمەڵبێنـی قاپەکەی بە قوڕ یان شتیتر بەست/ نایەوە/ گرتی.
(تَخَتَّمَ- بأمرِهِ): کارەکەی پۆشی.
(- عَنْـهُ): گوێی خـۆی لیخەفاند/ خۆی لێ بێئاگاکردو لێ بێدەنگکرد.
(ألخِتـام (ج) خُتُـم): قـوڕ کەشـتی پـێ قەپاتدەکریت/ لۆك.
٤-(خَتَمَ- الـزَّرعَ وعَلَیهِ خَتْمـاً و خِتاماً): یەکەم ناوی کشتەکەیدا.
٥-(تَخَتَّـمَ): سـەرو کلاوی لەسـەرنا/ مێزەریبەست.
(«تَخَتَّـمَ بِعَمامَتِـهِ»): مێزەریبەسـت/ سەروپێچی بەست.
٦-(ألخَتْم): هەنگوین.
(ألخاتَـم والخاتِـم (ج) خواتِـم و خُتُم): ١ـچاڵی پشـتمیل ٢ـکەمترین سپێتیی لە چوار پەلی/ لەدەستو قاچی چوار پێدا.
(ألمُخَتَّـم- مِنَ الخَیل): ئەسـپێك کە کەمێك

سپێتیی لەدەستو قاچیدا ببێت.

ختن: ١-(خَتَنَ- الشَـيءَ خَتْناً): شـتەکەی بری.

(- الصَّبِـيَ): کورەکـەی (خەتەنـە کـرد/ سوونەتکرد).

(خَتِـين ومَخْتُـون): خەتەنەکـراو/ سونەتکراو.

(إخْتَتَنَ الصَّبِيُ): کورەکە خەتەنەکرا.

(ألخِتان): خەتەنەکردن/ سوونەتکردن.

(ألخِتانَـة): خەتەنەکـردن. پیشـەی خەتەنەکردن/ دەلاکیی.

٢-(خَتَنَ وخاتَنَ- هُ. خُتُوناً و خُتُونَةً): ژنی لێهێنانو بوو بە زاوایان.

(ألخَتَـن (ج( أخْتان): کەسـوکاری ژن وەك باوكو برای ژن، خەزورو ژنبرا ٢-زاوا/ مێردی کچ.

(ألخَتَنَةُ): مێی وشـەی (ألخَتَن). خەسـووی زاوا.

٣-(خَتَنَ- الرَجُلَ. خَتْناً): پیاوەکەی فریودا/ لاسیدا.

(خاتَنَ- الرَجُلَ): پیاوەکەی لە خشـتەبرد/ فێلێلێکرد/ لاسیدا.

٤-(الخاتـون (ج) خَواتین (تَتَرِيَّة): خاتوو/ خانم. ئافرەتی خانەدان. عەرەب بە شاژنانیان وا دەڵێن.

(ألمَخْتُون- مِنَ الأعوام): وشکەساڵ.

ختا: (خَتـا. يَخْتُـو. خَتـواً): بـە هـۆی نەخۆشییەوە یان داخو خەفەتەوە شکستیهێناو داماو بوو.

(- هُ): وازی لە کارەکە پێهێنا.

(أختَى- المَتاعَ): کەلوپەلەکەی یەکە یەکە بە هەرزان فرۆشت/ نرخەکەی شکاند.

إخْتـى. إخْتـاءً: بە هۆی نەخۆشـییەوە یان پـەژارەوە دڵشکسـتو دامـاو بـوو کەوتـە پارانەوەو نزاوە.

خثّ: (خَثَّثَ- الشَـيءَ): شتەکەی کۆکردەوەو چاککردەوە.

(إخْتَثَّ): لە شەرماندا خۆی پێچایەوە.

(ألخُث (ج) أخثاث): پووشو پەلاشو قەوزەی وشکەوەبوو/ پۆرتکاو کە لافاو لایدەدا.

(ألخُثَّـةُ والخَثَّـةُ): چنگە چیلکـەو چەواڵی وشکەوە بوو بۆ ئاگرکردنەوە.

خثر: ١-(خَثَرَ وخَثِرَ و خَثُرَ و تَخَثَّرَ- اللَبَنُ. خَثْـراً و خَثراً و خثُوراً و خَثَراناً و خَثراً و خَثارَةً و خُثُورَةً): شـیرەکە توند بووەوەو مەیی بوو بە ماست.

(خاثِر): مەیو.

(أخْثَـرَ- الزُبَدَ): کەرەکـەی نەتواندەوەو بە تۆپەڵیی هێشتیەوە.

(خَثَّرَ و أخْثَرَ- اللبنَ): شیرەکەی مەیاند.

(«مايَـدرى أيُخْثِـر أم يُذيـب»): نازانیت بێمەیەنێت یان بیتونێتەوە واتا: ڕارایە.

(اَلخاثِــرُ – مِنَ اللبن وغيرهُ): شــیری مەیو/ ماست یان شتیتری مەیو.

(«إسْــتَيقظَ- فُلان خاثِرَ النَّفس): له خەو هەســتا لەشــگران/ لەش داهێزراو تاو شــتی نەبوو.

(اَلخُثَارَة): ١-تلپە/ نیشــتووی شیرو ماست ٢- دۆوك.

(«ذَهَــبَ صَفْــوَهُ و بَقِيَــت خُثارَتُــهُ»): پالاوتەکەی ڕۆیشتو خڵتەکەی مایەوە.

٢-(خَثَرَ- ت نَفــسُ الرَجُلِ خَثْراً): پیاوەکە دڵی شێوا/ دڵی تێکچوو ئێلنجیدا.

٣-(اَلخاثِرَةُ): کۆمەڵە خەڵکێك.

(اَلخُثار): پاشماوەی سەرخوان.

(اَلخُثَارَة): پاشماوەی شت.

الملحق:

خثــر: (التَّخَثُّر): مەینی شــیر کــە دەبێتە ماست/ مەین.

تَخَثُّــر الدَّم) (طــب): خوێنمەیــن بە هۆی جیابوونەوەی بەشــە سوورەکەی لە (پلازما/ زەرداو)ەکەی دەبێت.

---

خثع: (تَخَثْعَمَ): خوێناویبوو.

(اَلخَثعَمَــةُ): لەش خەڵتانــی خوێنبوون یان خوێشــگەل کۆببنەوەو ئاژەڵێك ســەربب‌ڕنو بیخــۆنو خوێنەکــەی کۆبکەنــەوەو بۆنــی خۆشــی تێبکەنو هەموو دەســتی تێبخەنو پەیمانبدەن کە پشتی یەکتر بەرنەدەن.

(اَلخَثْعَم والمُخَثْعَم) (ح): شێر.

خثل: (اَلخَثْلَة): کەتە ئافرەت.

(اَلخَثْلَــةُ والخَثَلَــةُ- مِــنَ البَطــنِ) (ع ١): بەرموسڵدان/ نێوان ناوکۆ بانەگا.

طَعُنَــهُ في خثلــة بَطنــه: کــردی بــە بەرموسڵدانیدا.

خثــم: ١-(خَثَــمَ. خَثْمــاً): لووتپانبوو یان لووتزلبوو.

(خَثِــمُ و أَخْثَــم): لووتپــان یــان لووتزلو نەستوور/ قەبە.

(خَثَمَ- أَنْفَهُ): لووتی شکاند.

خَثَّمَ- الشيءَ: شتەکەی پانکرد.

(اَلخُثْمَــةُ): پانیــی لــووت یان نەســتووریی لووت.

٢-(خَثِــمَ- ت أخلافُ النّاقَــةِ. خَثَماً): گۆی گوانی حوشترەکە گیرا.

خجّ: (خَجَّ- هُ. خَجّاً): پاڵیپێوەنا.

(- برِجْلِهِ): خۆڵەکەی بە پێ شێواند.

(- بِسَلْحِهِ): ڕیقنەکەی فرێدا/ کرد.

(- الحَطَبَ): دارەکەی قڵیشاند.

(- ساعِدَهُ): بازووی پێچپێخوارد.

(إختَجَّ- الجَمَلُ): حوشــترەکە خوار ڕۆیشتو خێرایکرد.

(اَلخَجــوج- مِنَ الرِّياح): بــای توند یان بای گێژو بە پێچ.

خجــأ: (خَجَــأَ- الرَجُــلُ. خَجــأً): پیاوەکە

نوشوستی هێناو زەبوون و داماو بوو.
(- اللَّيلُ): شەو سەرەوخوار بووەوە.
(- هُ): لێیدا.
(خَجِئَ. خَجَأً): شەرمی لێکرد.
(أَخْجَأَ- هُ): بە پرسیار سەریکردە سەری/ پرسیاری زۆرلێکرد.
(تَخاجأَ): خاوو بە خۆبادانەوە ڕۆیشت.
(أَلخَجَأَةُ): ١-گۆشتن/ قەڵەو/ لەشقورس ٢-گەوج.
خجف: (أَلخَجْف والخَجِيف): سووکەڵەیی و هەڵەشەیی/ جڕپنیی.
خجل: (خَجِلَ. خَجَلاً): شەرمیکردو لەشەرماندا شڵەژا.
(خَجِلٌ و خَجْلان): شەرمن- شەرمگرتوو.
(خَجِلَ- بأمرِهِ): کارەکەی لێچەواشە بوو/ سەری لە کارەکە دەرنەکرد.
(- البَعيرُ بالحَملِ): بارەکە بۆ حوشترەکە قورس بوو.
(- مِن كذا): لە وشتە وەڕسبوو/ بێزار بوو.
(- في طَلَبِ الرزقِ): سستی لە پەیداکدنی ڕۆژیدا کردو درێخییکرد.
خَجَّلَ- وأخْجَلَ- هُ: شەرمەزاریکرد/ تەریقیکردەوە.
(أَلخَجَل (مص): ١-شەرمو شکۆ تەریقیی ٢-سستییکردن ٣-شەرمەزار بوون.
٢-(خَجِلَ- الثَّوبُ. خَجَلاً): دامێنی کراسەکە دادڕ دادڕ بووو فش و فۆڵبوو.
(خَجِل): کراسی فش و فۆڵ و دامێن دادڕدادڕ.
(خَجِلَ- النَّباتُ): ڕووەکە پەرەیسەندو بەیەکدا چوو.
نباتٌ خَجِلٌ: ڕووەکی پەرەسەندوو بەیەکداچوو.
(أَخْجَلَ- النَّباتُ): ڕووەکە باڵایکردو بە گژ یەکداچوو.
خجی: (خَجَى- التُّرابَ برِجلِهِ خَجْياً): بەپێ گڵەکەی هەڵتەکاند.
(خَجِيَ خَجىً): شەرمیکرد.
خدّ: ١-(خَدَّ- فيهِ الضَّرْبُ خَدّاً): لێدانەکە کاری تێکرد/ لێدانەکە شوێنکاری بەجێهێشت.
(أَلأَخاديد): شوێنکاری قامچی.
(«أَخاديدُ الحِبالِ») في البئرِ: شوێنپەتی چاڵاو کە ڕادەکێشرێت و چاڵی دەکات.
٢-(خَدَّ- الأَرضَ و في الأَرضِ خَدّاً): زەویەکەی دادڕدادڕ کرد/ هەڵیدڕی.
(أَلخَدّ (ج) أَخِدَّة و خِداد و خِدّان): ١-دڕە/ شیو ٢-جۆگەئاو ٣-ڕێگەشیوە.
(أَلخُدَّةُ (ج) خُدَد): دڕە/ چاڵێکی لاکێشەیی.
(أَلأُخْدُود (ج) أخادید): دڕە/ چاڵێکی لاکێشەیی.
(أَلمِخَدَّة (ج) مَخادّ): ئاسن کە زەوی هەڵدەدڕێت.

٣-(خَـدَّدَ- لَحْمُـهُ. تَخْدِيداً): گۆشـتەكەی پووكايەوە/ لەڕ بوو چرچی تێكەوت.
(- لَحْمَهُ): گۆشتەكەی پووكانەوە/ لەڕيكرد.
(تَخَـدَّدَ- لَحْمُـهُ): گۆشـتكەی پووكايەوەو چرچو كرژ بوو.
٤-(خـادَّ- هُ مُخـادَّةً): بەرهەڵستی كارەكەيكرد.
(تَخادَّا): بەرهەڵستی يەكتريانكرد.
(تَخَدَّدَ- القَومُ): خوێنشـگەل برِبرِو دەسـتە دەستە بوون.
٥-(ألخَدّ (ج) أخِدَّة و خِداد و خِدّان): دەستە خەڵكێك.
(ألخَـدّ (ج) خُـدُود- مِـنَ الوَجـه) (ع ا):
١-رووومـەت ٢-ئـەو تەختـە دارانەيـە كە لە تەنشـتی سـوكانی پاپۆرەوەيـەو لـە دوای پاپۆرەكەوەيە بۆ ئاراستەكردن كاردەكەن.
(ألمِخَدَّة (ج) مَخادّ): سەرين/ باليف.
(ألمِخَدّان): دووكەڵبەكە.
خـدب: ١-(خَـدَبَ- هُ بِالسَّـيفِ. خَدْبـاً): شمشـێری پێداكێشـا پێسـتەكەی بـڕیو گۆشتەكەيشی بڕی.
(ألخَـدِب- مِنَ السُّـيوف): شمشـێری تيژی بڕەر.
(طَعْنَـةٌ أو ضَرْبَـة خَدِبَـةٌ و خَدبـاء): نێـزە يـا سـونگی پێداكردنێكـی توند يان دەلاقەتێكردنێكی گەورە/ بڕينێكی سەخت.
٢-(خَـدَبَ- تـهُ الحَيَّـةُ. خَدْبـاً): مارەكە پێوەيدا/ گەستی.
٣-(خَدَبَ. خَدْباً): درۆيكرد.
(ألخَدّاب): درۆزن.
٤-(تَخَدَّبَ): درێژبوو.
(ألخَدَب): درێژيی.
(«فِي لِسانِهِ خَدَبٌ): زماندرێژە/ درێژدادرە.
(ألخَدَب): هەڵەشـەيی/ جرپنيیو گەوجيی يان بەڕندرێژيیو هەڵەشەيیو گەوجيی.
(ألخَـدِب و الأخْدَب): درێژێكيی هەڵەشـەی گەوج.
(ألخُدْبَةُ): درێژيیو گەوجيیو جرپنی.
٥-(تَخَـدَّبَ): ڕۆيشـت نەخێراو نە سسـت/ مامناوەندی ڕۆيشت.
خدج: (خَدَجَ- تِ الدابَّةُ خِداجاً): چوارپێكە بـەر لە كاتـی زانـی زا يـان بەچكەكەی بە نەبەكامی فرێدا/ بەراويتە بوو.
(خادِج و مُخْدِج): مێی بەراويتەبوو.
(خَديـج و خَدُوج و مُخَدج و جمع خَدوج. خُدُوج و خِداج و خَدائِج): بەچكەی فرێدراو يان ناوەخت بوو/ بەراويتە.
(خَدَّجَ- تِ الناقَةُ): مێحوشـترەكە بەرەكەی فرێدا يان پێشوەخت زا.
(أخْدَجَ- تِ الدابَّةُ): چوارپێكە بەراويتە بوو يان پێشوەخت بەچكەكەی بوو.
(- الشيءُ): شتەكە كەميكرد.

(- صَلاتَـهُ): نوێژەکـەی ناتـەواو بـوو/ نادروستبوو.

(ألخِداج): نادروسـتبوو ناتەواویی لە هەموو شتێکدا.

خدر: ١-(خَدِرَ- العُضوُ. خَدَاراً): ئەندامەکە سڕو شل بوو.

(- العَینُ): چاوەکە قورسبوو/ کزبوو.

(خَـدَّرَ وأَخْـدَرَ- العُضـوَ): ئەندامەکـەی سڕکردو شلکرد.

(ألخادِر): ١-سست ٢-تەمەڵ/ تەوەزەل.

(أَلخَـدَر (طـب): ١-سـڕبوون و کرژبوونـی ئەندامێك وەها کە نەبزوێت ٢-خاوو سستیی و تەمەڵیی.

(أَلخَـدِر): سـڕبوون- لـە پەلوپـۆ کەوتنی ئەندامێك.

٢-(خَدِرَ- الحَرُ. خَـدَراً) (ضد): ١-گەرماکە تاویسەند ٢-گەرماکە نیشتەوەو کەمیکرد.

(- النَّهارُ): گەرمای ڕۆژ تاویسـەندو هەوایش کپبوو/ جووڵەی برا.

٣-(خَـدِرَ- البَـرْدُ. خَـدَراً) (ضـد): ١-سەرماسوڵەیکرد ٢-سەرما شکا.

(نَهارٌ خَدِرٌ): ڕۆژێکی ساردی شێدار.

٤-(خَـدَرَ- خَدْراً): حەپەسـا/ سەرسـامبوو واقیوڕما/ حۆلبوو.

(ألخـادِر): سەرسـام/ حەپەسـاو واقوڕماو/ حۆل.

٥-(خَـدَرَ- بِالمَـكانِ خَدْراً): لە شـوێنەکەدا نیشتەنیبوو.

(- الأَسَـدُ فِي عَرِينِهِ): شێرەکە لە لانەکەیدا مایەوەو دەرنەچوو.

(خَدَرَ و خَدَّرَ- البِنتَ): کچەکەی لە ماڵەکەدا گیردا.

(أَخْدَرَ- بِالمَكانِ): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو.

(- مَعَ أَهلِهِ): لەناو خێزانەکەیدا گلیخواردەوە/ ژیا.

(- الأَسَدُ): شێرەکە لە لانەکەیدا مایەوە.

(- البِنـتَ): کچەکەی لە ماڵەوە هێشـتەوە/ گیردا.

(- اللَّیل القَومَ): شەوخوێشـگەلی داپۆشـی و شاردنیەوە.

(تَخَدَّرَ واخْتَدَرَ): خۆی (حەشاردا/ شاردەوە).

(- تِ البِنـتُ): کیژەکـە لـە نەواکەدا خۆی گلدایەوەو دەرنەخست/ پەنایگرت.

(أَلخِـدر (ج) خُـدُور وأَخْـدار و (جـج( أَخادِیـر): هەرچی خـۆی تێـدا ونبکرێت و پەنـای بـۆ ببرێت و پێـی بشـاررێتەوە وەك خانـوو شـتیتر ٢-بێشـەڵان و لانـەی شـێر ٣-پـەردە لـە ماڵـدا هەڵدرێت بـۆ کەنیزەك کە بیشارێتەوە ٤-بەشـێك لە خانووەکەدا بۆ کەنیزەك جیابکرێتەوە ٥-تاریکیی شەو.

(أَلخَـدَر): ١-تاریکایـی ٢-شـوێنی تاریـك و نووتەك.

(أَلخَدِر- مِنَ اللَّيالي): شەوە تاریکەکان.
(- مِنَ الأَمْكِنَةِ): شوێنە تاریکە بەسامەکان.
(أَلخِدار): بێشەڵانو جەنگەڵی لانەی شێر.
(أَلخُدرَةُ): شەوەزەنگ/ تاریکیی ئەموستەچاو.
(ألأَخْدَر): شەوی زۆر تاریك.
(ألأَخْدَر والأَخْدَري) (ج): جۆرە کەرەکێوییەکە.
(أَلخادِرَة) (ح): ئەو شێوەیە کە پەپوولە تێیدا دەبێت لە قۆناغی نێوان مێشوولەو مێرووچەی تەواودا ئەم گەورەبوونەش لەناو چنراوێکدا دەبێت/ قۆزاخەیەکدا دەبێت تا لەم بارەیدا لەناو پەردەیەکدا دەبێت تەواو دەیشارێتەوە.
(أَلمَخدور- مِنَ الهَوادج): کەژاوەی شاردراوە.
(أَلخُدارِيُّ): ١-تاریکەشەو ٢-هەوری تاریكو رەش ٣-جۆرە کەرەکێوییەکە.
(أَلخُدارِيَّةُ): کەرەکێوییەکە.
(أَلخُدارِيَّةُ): هەڵۆ، لەبەر رەشیی وایپێدەڵێن.
٦-(خَدَرَ- الظَّبيُ. خَدْراً): ئاسکەکە لە رەوە ئاسکەکە براو دواکەوت.
٧-(أَلخَدَرْنَق (ج) خَدارِن) (ح): نێرە جاڵجاڵۆکە (وتراویشە جاڵجاڵۆکە هەرە گەورەکان).
الملحق:
خدر: (أَلتَّخدير): ١-خەواندنو بێهۆشکردن (طب) ٢-سڕکردنی کاتیی لەش یان ئەندامێکی بە مادە سڕکەرو بێهۆشکەرە پزیشکییەکان ٣-لە خشتەبردنو خەڵافاندن بە درۆو بەڵێنی ساختە.
(أَلمُخَدِّرات): مادە بێهۆشکەرەکان کە هەندێك مادەی ژەهراوییە لەش سستو خاودەکاتەوەو هەست بێهێز دەکاتو مێشك سستدەکات.

---

خدش: (خَدَشَ وخَدَّشَ- هُ خَدْشاً): ١-رنی/ رووشاندی ٢-تەشەری لێدا ٣-دراندی/ شیتڕشیتڕیکرد.
(أَلخَدْش (ج) خُدُوش و خِداش و أَخْداش): ١-رووشاوی/ جێرنین/ جێرووشاندن ٢-تەشەردان ٤-دراندن.
(أَلخَدوش): ١-فرەرەن ٢-فرە تەشەرلێدەر ٣-فرە دڕ ٤-مێش ٥-کێچ.
(أَلمُخادِش والمُخَدِّش) (ح): پشیلە/ گوربە.
(أَلمُخَدَّش): برگەی ملی مرۆڤ.
خدع: ١-(خَدَعَ- هُ خِدْعاً و خَدْعاً): فریویدا/ لەخشتەیبرد/ ساختەی لێدا/ هەڵیخەڵەتاند/ هەڵیفریواند.
(خادَعَ- هُ مُخادَعَةً و خِداعاً): دەستی بڕی/ فریویدا/ لەخشتەیبرد/ هەڵیخەڵەتاندو فێڵیلێکرد.
(- العَينَ): بڕوای بە چاوی خۆی نەکرد لەوەی کە دەیبینێت. لە سورەتی (نِساء)دا: يُخادِعونَ اللهِ وهُوَ خادِعُهُم: خودا ڕێچاکیان دەنێتە بەرو سزای ئەوە دنیایان لێدووردەخاتەوەو دەشارێتەوە.

(أَخْدَعَ- هُ): بەهەڵەیدابرد/ هەڵیخەڵەتاند/ گزیی لێکرد.
(تَخَـدَّعَ- هُ): گـزی لێکـرد/ سـاختەی لەگەڵـدا کـرد/ فێڵیلێکـرد لە خشـتەیبرد/ هەڵیخەڵەتاند.
(- لَـهُ): خۆی بە فێڵباز نواندو/ دەرخسـت وایش نەبوو.
تَخـادَعَ: خۆی بە فریودراو نیشـانداو وایش نەبوو.
(- القَـومُ): خوێشـگەل یەکتریـان فریودا/ فێڵیان لەیەکتر کرد.
(إنْخَـدَعَ): ١-فریـودرا/ لەخشـتەبرا/ فێڵیانلێکرد/ چاوبەسـتیانلێکرد/ هەڵخەڵەتا ٢-بەفریودانەکە ڤایلوو.
(- بِـهِ): پێیخەڵەتـا/ بەوە فریـوی خوارد/ بەوە لە خشتەبرا/ چاوبەستی لێکرا.
(إخْتَدَعَ- هُ): فێڵیلێکرد/ چاوبەسـتیلێکرد/ فریویدا.
(أَلخَدِیعَةُ (ج) خَدائِـع والخُدْعَةُ والخِداعُ): فێـڵ/ چاوبەسـت/ هەڵخەڵەتانـدن/ لـە خشـتەبردن/ تەفرەدان/ دەسـتخەرۆکردن/ تەڵەکەبازیـی/ سـاختەبازیی/ کەڵەکبازیی: گزیکردن/ دەغەڵیی.
(أَلخُدْعَةُ): فریوخۆر/ ساویلکەیەکە کە خەڵك ئاسان فێڵیلێبکات/ گزیی لێکراو.
(«أَلحَربُ خُدْعَةٌ»): جەنگ بە فێڵە.
(أَلخُدَعَـةُ والخَـدّاعُ): زۆر فێڵبـاز/ زۆر ساختەباز/ زۆر تەڵەکەباز/ زۆر دەستبڕ/ زۆر تەفرەدەر.
(أَلأَخْـدَعِ (ج) أَخـادِعُ): تەڵەکەبازتریـن/ فێڵبازترین/ دەستبڕترین/ تەفرەدەرترین.
(أَلخَیـدَعُ): ١-زۆر فێڵبـاز/ فێـڵاوی/ زۆر بە پێـچو پەنـا/ کەڵەکباز ٢-کەسـێکە کە حەز لە چارەی نەکرێتو پشـتی پێنەبەسترێت ٢- تراویلکە ٣-گورگی نەهێنبرو فێڵباز.
(أَلخَـدُوعُ (ج) خُـدُوعٌ): زۆر فێـڵاوی/ زۆر ساختەباز/ زۆر دەستبڕ/ کەڵەکباز.
(أَلمُخَـدَّعُ): زۆر لـە خشـتەبراوو خـاوەن ئەزموون/ دنیادیدە/ فێڵلێکراو.
٢-(خَدَعَ- الضَبُّ فِي جُحْرِهِ: خِدْعاً و خَدْعاً): ڤومڤومۆکەکە خزایە کونەکەیەوە.
(- تِ الشَّمْسُ): خۆرەکە ئاوا بوو.
(- تِ الطَّریـقُ): ڕێگەکـە نەدۆزرایـەوەو ونبوو.
(- الثَوبَ): پۆشاکەکەی پێچایەوە.
(- الأَمْرَ): کارەکەی شاردەوەو نهێنیکرد.
(أَخْدَعَ- الشيءَ): شتەکەی شاردەوەو پۆشی.
(طَریـقٌ خـادِعٌ و خَـدُوعٌ): ڕێگەیەك کە جارێك دەرکەوێتو جارێکیتر ونبێت.
(أَلخَیْدَعُ): لاڕێ/ ڕێگەیەکە کە هی نیازی تۆ نەبێت.
(أَلخادِعَةُ): ١-خانووی ناو خانوویەکیتر (بۆیە

وا ناونــراوه چونكه شــتی تێدا دهشــارنهوه)
٢-دهرگایهكــی بچــووك دهرگۆكهیــهك لــه دهرگایهكی گهورهدا بێت (خهڵكه ڕهشۆكییهكه پێیدهڵێن: (خوخة).
(اَلمَخـدَع والمُخْــدَع والمَخْـدَع (ج) مَخادِع): خانوچكهیــهك لهنــاو خانوویهكــی گهورهدا بێت.
٣-(خَدَعَ- الشَّــيءُ. خِدْعاً و خَدْعاً): شتهكه بۆگهنبوو/ خراپبوو.
(اَلخادِع مِن الدَّنانير): پارهی قهڵب/ ناتهواو/ نهچوو.
٤-(خَدَعَ- الرَّجُلُ. خِدْعاً و خَدْعاً): ١-دهستی له بهخشــین و چاكهكردن گرتهوهو كێشایهوه ٢-دارایی و دهرامهتی كهمبوو.
(خَدَعَ- المَطَرُ): باران كهمبوو.
(اَلخَدّاعَة- مِن السِّنين): ساڵی كهمبا.
٥-(خَدَعَ- تِ السُّوقُ. خِدْعاً و خَدْعاً) (ضد): ١-بازاڕ كزبوو/ بێبازاڕییبوو ٢-بازاڕ گهرمبوو فرۆخت زۆر بوو بازاڕ ههستایهوه.
(- تِ الأُمورُ): كارهكان جیاجیابوون.
(إنْخَدَعَ- تِ السوقُ): (بازاڕ/ كڕین و فرۆخت) وهستا/ بێبازاڕیبوو.
٦-(خَدَعَ- الرَّجُلَ. خِدْعاً و خَدْعاً): دهماری ملی پیاوهكهی بڕی.
(اَلأَخْدَعــان) (ع ا): دوو دهمــاری لاملــهو شارراوهیه.
(اَلأَخْــدَع (ج) أَخادِع): دهماری لامل كه دیار نین و شاردراوهن.
(«لأُقيمَنَّ أَخْدَعَيْكَ»): دهمارت دهردههێنم/ لووتت دهشكێنم/ فیزت دهبڕم.
(«فُلانٌ شــديدُ الأَخْدَعِ»)»: فیسار (دهماری ئهستووره/ توندوتیژهو بهزهبرهو زهنده).
خدف: (خَدَفَ. خَدْفاً): خێرا ڕۆیشت.
(- تِ السَّماءُ بالثَّلْج): ئاسمان بهفری باراند.
(خَــدَفَ واخْتَــدَفَ- الشــيءَ): شــتهكهی بهدزییهوه برد.
(اَلخَــدْف): ســوكانی پاپــۆڕ كه پێــی ڕووی پاپۆڕهكهی پێدهگۆڕدرێت.
خدل: (خَدِلَ- تِ السّــاقُ. خَدَلاً و خَدَلَةً و خُدُولَةً): لاقی (گۆشتن/ پڕو ئهستوور بوو).
خــدم: ١-(خَــدَمَ- هُ. خِدمَــةً و خَدْمَــةً): كارگوزارییكــرد/ كاری بۆ كرد/ خزمهتیكرد- نۆكهرییكرد.
(خادِم (ج) خُدّام و خَدَم): نۆكهر/ كارگوزار/ خزمهتكار/ پیاوی بهردهست
(خادم و (م) خادِمَة): كارهكهر.
(أَخْدَمَ- ه): نۆكهرێكی دایه.
(إخْتَــدَمَ): خزمهتــی خۆیكــرد/ كاری بــۆ خۆیكردو ههڵسووراند.
(إخْتَدَمَ- هُ): ١-داوای نۆكهرێكی لێكرد ٢-كردی به نۆكهری خۆی/ بهخزمهتكاریی ڕایگرت.
(- إسْتَخْدَمَ- هُ): كردی به نۆكهری خۆی/ به

کارگوزاری خۆی ڕایگرت‌و کاری پێکرد.
(- الرَجُـلَ): داوای لـه پیاوەکـه کـرد کـه نۆکەرێکی بداتێ.
(الخادِمِيَّة): کارگوزاریکردن/ خزمەتکاریی/ نۆکەریی.
(اَلمَخْدُومِيَّة): ئاغایی/ نۆکەر ڕاگریی.
(اَلمَخْدوم): ئاغا/ خزمەتکراو/ گەورەی نۆکەر ڕاگر.
(اَلخَـدّام= الخـادِم): نۆکـەر/ خزمەتـکار/ کارگوزار.
(اَلخَديم): نۆکەرو کۆیله.
(اَلخَديم): نۆکەرو کۆیله.
(اَلمَخدوم) (مفع): خزمەتکراو گەورەو ئاغای نۆکەرەکە.
(- مِـنَ الکُتُـبِ): کتێبێـك کە ئـاوری زۆر لێدرابێتـەوەو لـە سـەری نوسـرابێت‌و لێیدوابن.
(قَـوْمٌ مُخَدَّمون): خوێشـگەلێك کە نۆکەرو دەستوپێوەندیان زۆر بێت.
(اَلخِدْمَة (ج) اَلخِدْمات- عِندَ الإقْتِصادِيين، الصـادرات غـيرَ المَنْظـورَة ويَعِـدُّون منها اَلترانزيـت وإعـادَةُ التَّصديـر والسِّـياحَة والإصْطياف): کارگوزاریـی لای ئابورییەکان شـتە هەناردە نالەبەرچاوەکانە. وەك شـتێ هێنـرا بنێررێتـەوە دەرەوەو ترانزێـت‌و گەشت‌وگوزارە.

٢-(اَلخَدْمَةُ): کاتژمێرێکی ڕۆژ یان شەو.
(اَلخَدَمَـةُ (ج) خَدَم و خِـدام و خَدَمات): ١-پاوانە ٢-لاق ٣-بازنە بەستەی خوێشگەل.
(«فَـضَّ اللهُ خَدَمَتَهُـمْ»): خـودا کۆمەڵـی تێکدان‌و پەرش‌و بڵاویکردن.
(اَلخَدَمَةُ والخِدَمَةُ): قایشی ئەستووری قایمی چەرم کە دەکرێتە بازنەو لە مەچەکی حوشتر دەبەسترێت.
(اَلأَخْـدَم (م) خَدْماء): چارەوێکە کە تووکی سەرسمی بازنەیەکی سپی بێت.
(اَلمُخَدَّم والمُخَدَّمَة): ١-قایش ٢-پزووی دامێنی شەروال ٣-شوێنی پاوانە.
خدن: (خادَنَ- هُ. مُخادَنَةً): بوو بە دۆست‌و هاوڕێی.
(اَلخِدن (ج) أَخدان): دۆست‌و خۆشەویست/ هاوڕێـی گیانـی بـە گیانـی (بۆ نێـرو مێ دەوترێت).
(اَلخَدين= اَلخِدن): ١-یار ٢-هاودەم ٣-دۆسـت‌و خۆشەویست.
(اَلخُدَنَـةُ): ئەوەی دۆسـتایەتیی زۆر لەگەڵ خەڵکـدا دەگرێت‌و خۆشـیدەوێن/ دۆسـت‌و هاودەمی چاك.
خـدی: ١-(خَدَى- الفَـرَسُ أَو البَعيرُ. خَدْياً و خَدَيانـاً): چارەوێکـە یـان حوشـترەکە خێرایکردو کەوتە گورگە لۆقەو پەلهاویشتن.
(أَخدى إِخداءً): وردە وردە ڕۆیشت.

(اَلخَدا (ح): كرمه تەرس/ كرمێكە لە تەرسدا دێتە دەرێ.
(خداة): كرمه تەرسێك.
٢-(اَلخُدَيْوِيّ) (فارســية): ناسناوی عەزیزی میسره واتا: شاو وەزیرو سەرداری گەورە.
خذّ: (خَذَّ وأخَذَّ- الجرحُ. خَذيذاً): برینەكە كێم‌و زووخی لەبەر رۆیشت.
خذا: (خَــذَأَ وخَذِئَ واســتَخْذَأ- لَهُ. خَذْأً و خُــذُوءً و خَــذَاءً): ملی بۆ شـۆڕكردو خۆی بەدەستیەوەدا.
(أخْذَأَ- هُ): سەرشۆڕو كەساس‌و زەبوونیكرد.
(اَلخَذَا): بوودەڵەیی.
خذر: ١-(خَذرَفَ): خێرایكرد.
(اَلخُذْرُوف (ج) خَذاريف): تیژرشەوت.
(اَلخُــذْروف= اَلخَــرَّارَة): ١-گیڤگیڤۆكــە. تەنەكەیەكــی خــڕە دوو كونــی تێدایــە پەتێك لە هەردوو كونەكە هەڵدەكێشــرێت‌و ســەرەكانی پێكەوە دەبەســترێت. پەتەكە بە هــەردوو دەســت دەگیرێــت‌و تەنەكەكــە بە پەتەكــە دەخولێنرێتەوە ٢-مزراح/ یارییەكی منداڵانەیە پێشیدەڵێن (البُلْبُل).
٢-(خَــذْرَفَ- هُ بِالسَّــيفِ): بــە شمشـێر ئەملاولای قرتاند.
(تَخَذْرَفَ- الثَّوبُ): بەرگەكە درا.
(اَلخُذْرُوف (ج) خَذاريف): حوشتر گەلێك كە لە رانە حوشترەكە بڕابن‌و جیابووبنەوە.

(اَلخَذاريف): پارچەكان.
(«تَركَــتِ السُّــيوفُ رأسَــهُ خَذاريــفَ»): شمشـێرەكان ســەریان كــوت كوتكــردن/ پارچەپارچەكرد.
٣-(خَذرَفَ- الإناءَ): دەفرەكەی پڕكرد.
٤-(تَخَذْرَفَ- النَوى): ناوكەكەی فڕێدا.
٥-(اَلمُتَخَذْرِف- مِنَ الرِّجال): پیاوی ناســك/ ڕەوشتجوان‌و ڕەوشت بەرز.
خذع: ١-(خَــذَعَ وخَذَّعَ – اللَّحْــمَ أَو القَرعَ خَذْعــاً): گۆشــتەكە یــان كوولەكەكــەی كوتكوتكرد/ توێتوێی كرد.
(تَخَذَّعَ): بێجیابوونەوە كوتكوتبوو.
(«ذَهَبوا خِذَعَ مِذَعَ»): بڕبڕ رۆیشتن.
(اَلخَذْعَة): بڕە زەوییــەك/ پارچە زەوییەك یان پارچە شتێك.
(اَلخَذيعَــة): خواردنێــك كــە لــە گۆشــتی توێتوێكراو بكرێت.
(اَلمِخْذَعَة): چەقۆ.
٢-(خَذْعَــبَ و خَذْعَلَ- البَطيــخَ ونَحوَهُ): كاڵەكەكــە یان شــتی وەهای جنــی/ كردی بە قاشی بچووك بچووك.
خذف: (خَذَفَ- بالحَصَاة و نحوَها): چەوەكە یــان بــەردە وردەكەی بە پەنجە یــان بە دار لاستیك تەقاندو هاویشت.
(تَخاذَفَ- ت عَينــاهُ بِالدُّموعِ): چاوی زووو/ كەوتە فرمێسكڕشتن.

(اَلمِخذَفَــة): ١-بەردەقانــی/ دارلاســتیك
٢-قۆچەقانی.
(اَلخَذَفان): لوقەی حوشتر.
(اَلخَــذُوف (ج) خُــذُف- مِــنَ الــدَّواب):
١-وڵاخێك كە لە خێراییدا بە پێ چەوفرێدەدات
٢-وڵاخێك لە تاوی خێراییدا پێ نزیكی ورگی دەكاتەوە.
(اَلخَذافَةُ- الإســت): ١-نەڕژاد/ ڕەسەن/ ڕیشە
٢-بن.
خــذق: (خَــذَقَ- الدابَّــةَ. خَذقــاً): لــە وڵاخەكەیەوە ژەند تــا وڵاخەكە خێرا بكات/ گورجبێت.
(- البازي): بازەكە ڕیقنەیكرد.
(اَلخَذْق): ڕیقنە/ جیقنە.
خــذل: ١-(خَــذَلَ- فُلاناً و عَنــهُ. خَذلاً و خَذْلاناً و خِذْلاناً): دەســتی لە فیسار بەردا/ پشتیتێكردو یارمەتی نەدا/ وازیلێهێنا.
(خــاذِل (ج) خُــذَّال): دەســت لێبــەردەر/ وازلێهێن پشتتێكەر.
(مَخــذُول (ج) مَخاذِیــل): وازلێهێنــراو/ پشتتێكراو/ دەست لێبەردراو.
(خَذَلَ- عَنهُ أَصْحابَهُ): دۆســتەكانی لێكردو وازی پێلێهێنان.
(خَــذَّلَ- هُ): وایلێكــرد شكســت بهێنێــتو شەرنەكات.
(خــاذَلَ- هُ مُخاذَلَةً): یارمەتینەداو دەســتی لێبەردا/ پشتیتێكرد.
(تَخــاذَلَ- القَــومُ): خوێشــگەل پشــتیان لە یەكتریكردو كۆمەكی یەكتریان نەكرد/ وازیان لە یەك هێنا.
(- ت رِجــلاهُ): قاچەكانی لە دووی نەهاتن/ بێهێز بوون/ سست بوون.
(اَلخَذَّال): هەمیشە پشتتێكەر/ كۆمەكنەكرد/ وازلێهێن.
(«رَجُلٌ خَــذولُ الرجــلِ»): پیاوێكە قاچی پەكیكەوتووە/ لە دووی نایەت. لە بێهێزیدا یان بە هۆی ناتەواوییەوە یان زۆر سەرخۆشە.
٢-(خَــذَلَ- تِ الظبیَةُ. خَــذْلاً و خَذْلاناً و خِذْلاناً): مامزەكە لــە ڕەوەكە دابڕا/ تەریك بوو.
(خاذِل وخَذُول): لەڕەو دابراوو تەریكبوو.
خــذم: ١-(خَذَمَ وخَــذَّمَ- الشَــيءَ. خَذْماً): شتەكەی گورج بری.
(خَذِم. خَذْماً): پچڕا/ قرتا.
(- خَذَمــاً): ١-بە پەلە ڕۆیشــت/ پێیەهەڵگرت
٢-پارچە پارچە بوو.
(تَخَــذَّمَ- الشَــيءَ): شــتەكەی كوتكوتكرد/ لەتیكرد.
(- الشيءُ): شتەكە پارچە پارچە بوو.
(اِخْتَذَمَ- الشيءَ): شتەكەی لەتكرد.
(اَلخَذُوم (ج) خُذُم والخَذِم والمِخْذَم والمُخَذَّم- مِنَ السُّیوف): شمشێری تیژی بڕەر.

(اَلخُذَامَة): (پارچەی/ كوتی) شتێك.
(اَلمِخذَم): ئامێری بڕین/ بڕەر/ قرتێن.
٢-(خَذِمَ. خَذْماً): سەرخۆشبوو/ مەستبوو.
(خَذِيم): سەرخۆش/ مەست.
(أَخْذَمَ- هُ الشَّــرابُ): خواردنەكە/ شەرابەكە سەرخۆشیكرد/ مەستیكرد.
٣-(أَخْــذَمَ): پێیلەزمبوونــی خــۆی نــاو سەریشۆڕكردو بێدەنگبوو.
٤-(إختَذَمَ- الرَجُلُ): پیاوەكە باش و لێبوردوو بەخشندە بوو/ جوامێر بوو.
(اَلخَــذِم- مِــنَ الرِّجال): لە بەخشــندەییدا دڵفــراوان/ دڵبــاش/ لێبــوردوو بــوو/ جوامێربوو.
خذا: (خَذا و خَذِيَ. خَذْواً و خَذَىً): لەشــی خاوبووەوە راكشا.
(- تِ الأُذُنُ): گوێكە شلبوو شۆڕبووەوە.
(أُذُنٌ خَذواء): گوێی شۆڕەوەبوو/ داكەوتوو.
(أَخْذَى): گوێشۆڕ/ گوێداكەوتوو.
(خَذِيَ- لَحْمُهُ): گۆشتەكەی پتەوو توند بوو/ گۆشتیگرت.
(إِسْــتَخْذَى): سەرشۆڕیی نواندو ملیدا/ خۆی بە دەستەوەدا.
خرّ: ١-(خَرَّ- الماءُ أَو الرِّيحُ خَرِيراً): ئاوەكە خوڕەیهات و باكە وژەیهات.
(خَرَّار):ئاوی بەخوڕ و بای بە گڤەو وژە.
(خَرَّ- النائِمُ): خەوتووەكە پرخەپرخیكرد/ پرخەیهات.
(اَلخُــرّ (ج) خِــرَرَة): ١-دادرپیەك/ شــیوێك كــە لافاو دروســتیبكات ٢-(ا ع) بنیگوێچكە/ بنگوێچكە.
(اَلخُــرِّيّ والخُــرُّ): دەمی بەرداشــی ئاش كە گەنمەكەی تێدەچێت و دەهاڕێت.
(اَلخَــرُور): ١-شــوێنداڕو ئاوتێدابوو/ شــیو ٢-مرخەمرخی پشیلە كە دەنوێت ٣-میاومیاوی پشیلە.
(اَلخَرِير (ج) أَخِــرَّة): ١-تەختاییەكی نێوان دوو بەرزای ٢-پرخەی نوستوو.
(اَلخَرَّار (م) خَرَّارَة): فرە پرخە/ پرخەزۆر.
(اَلخَرَّارَة): ١-گیڤگیڤۆكە ٢-مزراح.
٢-(خَرَّ. خَرّاً و خُرُوراً): بەربووە خوارەوە/ لە بەرزییەوە كەوتە خوارەوە.
(- الرَّجُــلُ): پیاوەكــە ڕماو مــرد/ كەوت و مرد.
(- للهِ ساجِداً): خۆی بە زەویداداو كڕنووشی بۆ خودای مەزن برد.
(- لِوَجهِهِ): (بەدەمدا / بە ڕوودا) كەوت.
(أَخَرَّ- هُ): خستی.
(«ضَرَبَــهُ بالسَّــيف فأَخَرَّهُ»): بە شمشــێر لێیداو خستی.
(إِنْخَرَّ): شلبوو كەوت.
٣-(خَرَّ- عَلَيهِم. خَرّاً و خُرُوراً): لە شوێنێكی نادیارەوە پەلاماریدان/ هێرشیكردنە سەر.

٤-(خَرْخَـرَ- النائِـمُ): نوسـتووەکە کەوتە پرخەپرخ.
(- النَّمِرُ أو السِـنَّورُ): پڵنگەکە یان پشیلەکە مراندی/ مرەمریکرد.
(تَخَرْخَرَ- بَطنُهُ): سکی قۆراندی.
(ألخَرْخَر): ١-گفەی با/ وژەی با ٢-خورەی ئاو ٣-پرخەی نوسـتوو ٤-مرەی پڵنگو پشیلە ٥-قۆرەی سك.
(ألخَرخار): ئاوی زۆری بەخور.
خـرئ: (خرئ. خَـرْأً وخِـراءَةً و خَرَاءَةً و خُرُوءاً): ١-ریا/ پیساییکرد ٢-ریقنەیکرد.
(«خَرِئَت بَينَهُم الضَّبعُ»): کەمتیار گویکردە نێوانیان/ گوبووە نێوانیـان. واتا تێکچوونو ناتەبا بوون.
(ألخُرْء (ج) خُرُوء): ١-گوو/ پیسایی ٢-ریقنە ٣ تەرس ٤-شیاکە.
(ألخِراء= العَذِرَة): گوو/ پیسایی.
(ألخَرا) (عامية): گوو/ پیسایی.
(ألمَخـراةُ والمَخْـرُأة والمَخْـرُأةُ (ج) مَخارئ): ئاودەست/ ئەو شوێنەی تێیدا دەرین.
خـرب: ١-(خَرِبَ- البَيتُ خَرْبـاً و خَرَاباً): خانووەکـە ڕووخـا/ کاولبـوو/ تێکچـوو/ وێرانبوو/ ڕما.
(خَرِب): تێکچـوو/ وێـران/ کاول/ کەلاوە/ ڕماو.
(ألـدارُ الخَرِبَـة): خانـووی وێـران/ کاول/ تێکچوو/ کەلاوە.
(خَـرَبَ- هُ. خَرْباً): کاولیکـرد/ وێرانیکرد/ ڕووخاندی/ ڕماندی.
(خَـرَّبَ- البَيْتَ):ماڵەکەی تێکدا/ خانەکەی (وێرانکرد/ کاولکرد).
(أخْـرَبَ- البَيـتَ): خانووەکەی بـە کاولیی بەجێهێشت.
(- المَكانُ): شوێنەکە چۆڵبوو.
(إسْتَخْرَبَ- الرَجُلُ): پیاوەکە شکستیهێنا/ لە چورتومێکەوە تێشکاو ماڵوێرانیی خواست.
(ألخَرب): وێرانە/ تێشکاو.
(هُوَ خَربُ العِظام): ئەو ئێسقانەکانی وێرانە واتا مۆخی تێدا نەماوە/ پووتە/ تێشکاوە.
(«هُوَ خَـربُ الجَوْفِ»): ناوسـك تێقوپاوە/ برسییە.
(«هُوَ خَـربُ الأمانه»): کەسـێکە متمانەی پێناکرێت/ جێیبڕوا نییە.
(ألخِرْبَة): شوێنی کاولە/ کەلاوە/ وێرانە.
(ألخَرِبَـةُ (ج) خَرِبـات وخِـرَب و خَرِب و خَرائِب): وێرانە/ کاولە/ کەلاوە.
(ألخَراب (ج) أخرِبَة وخِرَب): وێران/ کاول.
٢-(خَـرِبَ- الرَجُـلُ. خَرَباً): کابـرا گوێی کونبوو یان هەڵدرا.
(أخْرَب (م) خَرْباء (ج) خُرْب): گوێ کونکراو یان گوێ هەڵدراو.
(خَـرَبَ- هُ. خَرْبـاً): کونیکرد/ سـمی یان

هەڵیقڵیشاند/ هەڵیدری.

(خَـرَّبَ- المَـزادَةَ): جەوەنـدەی ئاوەكـەی كونكرد.

(تَخَـرَّبَ- الـدودُ الشَـجَرَةَ): كرمەكـە درەختەكەی كونكرد.

(إستَخْرَبَ- السَّقاءُ): مەشكەكە كونبوو.

(ألخُـرْب والخُرَابَـة والخُرْبَـة (ج) خُـرَب وأخْـراب وخُـرُوْب): چـاڵ كۆڵـۆت و كونی دەرزی و هەموو كونێكی خڕ وەك كونی گوێ.

(ألخَرْبَةُ (ج) خَرَبات): بێژنگ.

(خَرَّابة وخُرَّابَة الإبرَة): كونی دەرزی.

(تَخروب (ج) تَخاريب والأَصَح. التَّخاريب): ١-خانەقڵیشـە وەك خانـەی زەردەواڵە/ كونە زەردەواڵـە ٢-ئـەو خانە شـانانەی كە هەنگ هەنگوینی تێدەكات.

٣-(خَـرَبَ. خِرابَـةً وخَرابَـةً و خَرْبـاً و خُروباً): بوو بە دز/ فێرە دزیبوو.

(خارب (ج) خُرَّاب): دز.

٤-(إسْـتَخْرَبَ إليـهِ): تاسـەیكرد/ بـۆی بەپەرۆشبوو.

٥-(ألخَـرِب): لوتـەی دەرپەڕیـوی شـاخ ٢-كەسێكی زیرەكردو/ زۆر ترسنۆك.

(«رَجُلٌ خِرِبَّانٌ»): پیاوێكی زۆر ترسنۆك.

(ألخُرْب والخُرْبَة): ١-توێشەبەرەی نانی شوان ٢-گومڕایی لە دیندا/ لە دین لادان.

(ألخَرْبَـةُ (ج) خَرَبـات): ١-كەموكـووڕی/ خەوش ٢-گوناە ٣-شـوێنی شـەرم لە لەشـدا ٤-دەفری شوان ٥-گومڕایی لە ئایندا/ لادان لە دین.

(«هُـوَ صاحِبُ خَرْبَة»): ئـەو لە ئاینەكەی لایداوە.

«مارأينـا ومـن فـلان خَربَـةً في دينِهِ»: نەماندیوە فیسار لە دینەكەی لابدا.

(ألخَـرُّوب والخُرْنوب) (ن): درەختی كوللە/ سـەرپنج/ حەچەمچە درەختێكی هەمیشـە سـەوزە لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدایە بەرەكەی لە فاسـۆلیای سەوز دەچێت درێژو پانە شیرینە بۆ ئالیك بەكاردەهێنرێت و جۆرە دۆشاوێكیش لێدەگیرێت.

٦-(خَربَـشَ- الكِتابَ أو العَمَـلَ): (كتێبەكە یان كارەكە)ی تێكدا.

(خرابيـشُ الخَـطِّ): نووسـینی تێكـدراو/ چەواشەكراو.

٧-(خَرْبَـصَ- الأشـياءَ): شـتەكانی لە یەك جیاكردنەوە.

(- المالَ): ماڵەكەی هەڵگرت و بردی.

٨-(خَرْبَقَ): پەلەی لە ڕۆیشتنەكەدا كرد.

(- الشيءَ): شتەكەی لەتلەتكرد/ بڕی.

(- الثَوبَ): جلەكەی دادڕی.

(- النَبـتُ): ڕووەكەكـە چنگـی دایە یەك/ بەیەكداچوو.

(إخْرَنْبَق): ١-بەزەویەكەوەنووسا ٢-هەڵگەڕایەوە/

وەرگەڕایەوە ٢-وەك نیازخراپێك خۆی متکرد.
(ألخَرْبَق (ن): خەربەنگ/ خەربەند: جۆرە گوڵێکە گەڵاکەی لە هی زمانە بەنرخ دەچێت. ڕەش‌و سپییە ژەهرە بۆ بەرازو سەگ، بەڵام بۆ مرۆڤ سپییەکەی دەرشێنیتەوە بەڵام ڕەشەکەیشی بۆ ڕەوانی باشە، لە کۆندا دەیانوت شێت چاکدەکاتەوە.
خرت: ١-(خَرتَ- الأُذُنَ. خَرْتاً): گوێکەی سمی/ کونیکرد.
(ألخُرْت والخَرْت (ج) أَخْرات وخُرُوت): کونەدەرزی‌و کونە سوژن‌و شتی وەك ئەوانە.
(«أَضْيَقُ مِن خَرتِ الإبرَة»): لە کونی دەرزی بچووکترە/ تەسکترە.
(ألمَخْرُوت) (مفع): ١-گوێ یان لووت یان لێوی هەڵقڵیشاو ٢ سمراو.
٢-(خَرتَ- الأرضَ. خَرْتاً): بەڵەدی تەواوی زەویەکە بوو، پەی بە هەموو ڕێگەو سوێ‌و سووچێکی برد/ شارەزای زەویەکە بوو.
(خَرتَ): زۆر بە شوێنەکەو ڕێگاو پێچ‌و پەنایەکی شارەزا بوو.
(ألخِرِّيت (ج) خَرارِيت وخَرارِت): چاوساغێکی شارەزایە کە پەی بە هەموو پێچ‌و پەناو کوێرەڕێ‌و ڕێنهێنییەکانی بیابانەکە دەبات.
(ألمَخْرَت): ڕێدیار/ دەرکەوتوو.
٣-(ألخُرْت والخَرْت (ج) أَخْرات وخُرُوت): دانە وردیلەی پەراسووی لای سنگ.
(ألخُرْت- مِنَ الذِّئاب): گورگی چابوك.
خرث: (ألخُرْثاء): ئافرەتی تەنگە ئەستووری گۆشتیی کەمەر داکەوتوو/ کەتەژن.
(ألخُرْثِيُّ): گەندەی کەلوپەلی ماڵ/ پرووپیتاڵ.
(- مِنَ الكلام): قسەی (هیچ‌و پووچ/ بێکەڵك).
خرج: ١-(خَرَجَ- مِن مَوضِعِهِ. خُرُوجاً و مَخْرَجاً): لە شوێنەکەی خۆیەوە دەرکەوت/ هاتەدەرێ.
(- بِهِ): دەریهێنا.
(- عَلَيهِ): بۆی دەرپەری تا لەگەڵیدا بجەنگێت.
(- إلى فُلان مِن دَيْنِهِ): وامەکەی دایەوە/ قەرزەکەی لە کۆڵکەوت.
(خَرَّجَ- هُ مِنَ المكان): لە شوێنەکە دەریپەڕاند/ دەریکرد.
(خَرَّجَ- المَسْأَلَةَ): ڕاستیی پرسە بابەتەکەی دەرخست‌و ڕوونکردەوەو بەڵگەی ڕاستیی پیشاندا.
(أَخْرَجَ- الشيءَ): شتەکەی دەرخست/ دەرهێنا.
(تَخارَجَ- الشُرَكاءُ): هاوبەشەکان شتەکانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردو لە بەشی خۆیان ئیتر دەرچوون. هەریەکە شتێکی برد.

یەکێــك خانوو یەکێــك زەوی وەکو هەریەکە کە لە بەشــەکەی خــۆی دەرچێتو بەویتری بفرۆشێت.

(إِخْتَــرَجَ- الشَّــيءَ): ١-شــتەکەی دەرهێنا/ دەرکرد/ دەریخست.

(- فُلاناً): داوای لە فیسار کرد کە دەرچێت.

(إِسْتَخرَجَ- هُ): داوایلێکرد کە بچێتە دەرەوە/ دەرچێت.

(- الشَّــيءَ): شــتەکەی هەڵێنجــا/ دەرهێنا/ دۆزییەوە.

(- المَسْأَلَةَ): پرسیارەکەی شیتەڵکردو هێنایە ئەنجام/ هەڵیهێنجا.

(اَلخَرْجَة): جارە دەرچوونێك.

(اَلخُراج): ١-دوومەڵ ٢-زیپکە یان هەر شتێکی لەو شێوەیە لە لەشەوە دەرچێت.

(اَلخُراجَة (ج)( خُراجات): دوومەڵێك.

(اَلخــارِج): دەرکەوتــوو/ بــەدەرەوە بــوو/ دەرچوو/ دەرپەریو.

(اَلخارِجَــةُ (ج) خارِجــات): مێــی وشــەی (اَلخارِج)

(الخارِجي): دەرەکیی/ دەرەوەیی.

(اَلخارِجِیَّــة): مێــی وشــەی (الخارِجــي): دەرەوە.

(وزیر الخارِجیَّة): وەزیری دەرەوە.

(اَلخُرَجَة): کەسێکە زۆر بچێتە دەرەوە.

(رَجُلٌ خُرَجَةٌ وُلَجَةٌ): پیاوێکە هاتووچۆ زۆر بکات/ زۆر بچێتە دەرەوەو بچێتەوە ناوەوە.

(اَلخَرّاج): ئەوەی زۆر بچێتە دەرەوە- یەکێکی زرنگی بە پێچو پەناو فێڵبازو چاوکراوە.

(رَجُــلٌ خَــرّاج ولاّج): پیاوێکــە زۆر دێتو دەچێت بە پێچو پەناو زرنگو چاوکراوەیە.

(يَــومُ الخُــرُوج): ١-رۆژی جــەژن ٢-رۆژی زیندووبوونــەوە/ رۆژی دوایــی کە خەڵك لە گۆڕ دێتە دەرێ.

(اَلْمَخْــرَج (ج) مَخــارِج) (مــص): ١-دەروو/ دەرچە/ دەربازگە ٢-کۆم/ شوێنی دەرچوونی پیسایی/ قنگ.

(-عِنْدَ القُرّاءِ والصَرفيــين): لای خوێنەرو تەجویــد خــوازەکان. چۆنیەتــیو شــێوەی دەرکردنی پیتو وشەکان لە دەمەوەو شوێنی ئەو دەرکردنەو جیاکردنەوەیان لە یەکتری.

(اَلْمُخــرَج (مفــع): ١-دەرکــراو ٢-شــوێنی دەرکردن.

٢-(خَرَجَ- فِي العِلم. خُرُوجاً و مَخْرَجاً): لە زانستدا دەرهاتووە/ پێگەیشتووە.

(إِخْتَرَجَ- الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا.

(اَلخارِجِــيّ): ١-دەرهاتــوو/ پێگەیشــتوو/ کەســێکە کە خــۆی خــۆی پێبگەیەنێت یان نــازا دەرچێت هەرچەندە کوری باوکێکی زۆر ترسنۆکیشبێت ٢-ئەسپێکی چاك دەرهاتوو کە دایكو باوکەکەی وا نەبن.

٣-(خَرَجَ- تِ الرَعِيَّةُ على المَلِكِ): میللەتەکەی

شا لێیهەڵگەڕانەوەو یاخیبوون.
(ألخارِجِيّ): ١ـكەسێكە كە سەرپێچیی دەسەڵاتدارو كۆمەڵ بكات ٢ـكەسێكە كە دوای بیروبڕوای (خەواریج) بكات یان كەوتبێت.
(ألخَوارِج): حەوت دەستەن لە كۆمەڵە گەورەكانی ناو ئیسلام پێیاندەڵێن دەستەوەدەركەوتووەكان/ دەرچووەكان.
٤-(خَرَّجَ- الأرضَ): زەویانەی لەسەر زەوی دانا.
(أخْرَجَ- الرَجُلُ): پیاوەكە زەویانەی خۆی دا.
(خارَجَ- السَّيدُ عَبْدَهُ): خاوەنكۆیلەكە لەگەڵ كۆیلەكەیدا ڕێككەوت كە مانگی بڕێك پارەی بداتێ بەرامبەر ئازادكردنی.
(أُستُخْرِجَتِ الأرضُ): زەویەكە بۆ كشتوكاڵ چاككرا.
(ألخَرْج (ج) أخْراج): ١ـسەرانە ٢ـزەویانە.
(ألخَرْج): باجی سەرانە.
(خَراج): باجی خانووبەرە.
ألخَراج والخِراج والخُراج (ج) أخراج وأخْرِجَة (جج) أخاريج: ١ـباجی بەرووبوومی زەویو ماڵ كە هی سەرانەیەو لێیدەردەچێت ٢- پارەیەك كە لەسەر زەوی دانرابێت ٣ـسەرانە كە لە (زیمەكان) وەردەگیرا.
٥-(خَرَّجَ- الوَلَدَ في الأدَبِ): كوڕەكەی باش پەروەردە كردو فێریكردو پێیگەیاند/ دەریچواند.
(فَتَخَرَّجَ): ئەوسا دەرچوو، تەواویكرد/ سەركەوت.
(صار مُخَرَّجاً و خِرِّيجاً و مُتَخَرِّجاً): دەرچوو/ سەركەوتوو/ دەرهاتوو/ فێربوو/ بوو بە خاوەن بڕوانامە.
٦-(خَرَّجَ- العَمَلَ): كارەكەی جۆراوجۆر كردو ڕەنگاوڕەنگكرد كە هەریەكە لەویتر نەچێت.
(إخْرَجَّ وإخْراجَّ- الحَيَوانُ): ئاژەڵەكە یان زیندەوەرەكە بەڵەك بەڵەك بوو سپیو ڕەش بوو.
(أخْرَج (م) خَرجاء): ڕەنگبەڵەك.
٧-(خَرَّجَ- الغُلامُ اللَّوحَ): كوڕەكە تەختەكەی نیوە نووسكرد/ لەسەر هەندێكی نووسیو لایەكی بەجێهێشت.
(خَرَّجَ وأخْرَجَتِ الراعِيَةُ المَرتَعَ): ئاژەڵەكە لایەكی لەوەڕگاكەی خواردو لایەكی بەجێهێشت.
٨-(ألخَرْج (ج) أخْراج): هەور كە تازە دەردەكەوێتو پەیدا دەبێت.
(ألخُرْج (ج) خِرَجَة): خورج/ هۆر كە شتی تێدەكرێتو بەسەر وڵاخدا دەدرێتو دەگوزێرێتەوە.
الملحق:
خرج: (ألإخْراج): دەرپەڕاندن لە ناوەوە بۆ دەرەوە/ دەركردن.
(- في القَضاء): لە دادگاكردندا دوورخستنەوەی یەكێك لە گومانبارەكان لەو داوایەدا.

(- في عِلمُ الأَحياء): له زانستيى زيندەوەردا، دەركردنى پيسايى و زيانبەخش و شتى بێكەڵك لە لەش وەك ئەرەق و باى ناوسك و شتيتر.

(الإخراج- في المَسْرح والسِّنما): دەرهێنان لـە شـانۆگەريى و سـينەمادا، گوێزانـەوەى شـانۆگەريى يان چيرۆك بۆ سەر شانۆ يان بۆ پەردەى سينەما.

(الإخـــراج – في الأَدَب والطِّباعَة): شـێوەى كارە وێژەييەكـە يـان هونەرييەكـە، واتـا چۆنيەتيى دارشتن و كردنى كارەكە و شێوازى و چاپكردنـى و.. هتـد. كارە وێژەييەكـە يان هونەرييەكە.

---

خرد: ١-(خَرِدَ- تِ الجارِيَةُ خَرَداً): كەنيزەكە هەر كچ بوو.

(- الرَجُلُ): پياوەكە بە بێدەنگيى مايەوە يان كەمدوو بوو.

(أَخْرَدَ الغلامُ): كورەكە شەرمى سەركوتكردن و كەسايى بێدەنگيكرد.

(- الرَجُـلُ): پياوەكە بـە بێدەنگى مايەوەو نقەى لێوە نەهات.

(تَخَرَّدَ- تِ الجارِيَـةُ): كەنيزەكەكە هەر بە كچيى مايەوە.

(أَلخَرُود والخَريد (ج) خَرائِد وخُرُد و خُرَّد): ١-كچ كە بـە كچييمابێت ٢-شـتى كوننەكراو ٣-نافرەتى بەشەرم و كەمدوو دەنگنزم.

(صَـوتٌ خَريد): دەنگى نزمـى نەرم كە هى شەرمبێت.

(لُؤلُـؤَةٌ خَريـد): مرواريـى كوننەكـراو/ نەسمراو.

(أَلخَريـدَة (ج) خَرائِـد و خُـرُد و خُرَّد): ١-مرواريـى كوننەكـراو ٢-كچـى بـە كچێنى ٣-نافرەتى بێدەنگى بە شەرم و شكۆ و دەنگنزم.

٢-(أَخْرَدَ- الى اللَهو): ڕوويكردە كارى بێهودەو رابواردن.

٣-(أَلخُرْدَةُ) (فارسية): وردە شت/ وردەواڵە/ كەلوپەلى وردە.

(أَلخُرْدَجي): وردەواڵەفرۆش.

٤-(خَـرْدَقَ- العَمَـل) (عاميـة): كارەكەى (تێكدا/ گەنكرد).

(فَصِيحُهُ خَربَق) (أَلخُردُق) (ا ع) (تركية): ساچمە.

٥-(خَرْدَلَ- الطَّعامَ): باشـترينى خۆراكەكەى خوارد.

(- اللَّحْمَ): گۆشتەكەى كوتەكوتەى وردى كرد يان پارچە پارچەى جياجيايكرد.

(أَلخَـرادِل) ط): پارچـە پارچـەى گۆشـت كوتەكوتەى گۆشت.

(لَحـمٌ خَراديل): گۆشـتى پارچـە پارچەو كوتكوتكراو.

(خَردَلَة) (ن): يەكدانە خەرتەلەى ڕەش.

(أَلخَردَل) (خ): خەرتەلەى ڕەش (ڕووەكێكى گياييە لە دەشت دەروێت، لەگەڵ كشتدا يان لە

قەراغ ڕێگادا، تۆوەکەی زۆر وردو ڕەشــە وەك بەهارات بەکاردێت، کەڵکی پزیشکیشی هەیەو ڕۆنیشی لێدەگیرێت.
(أَلخَرْدَلِيَّــة) (ز): بەرێکــی وشــکی درێــژە دەمدەکاتــەوە دوو توێیــە نێوانێکــی هەیە بەرەکــە کاتــی پێگەیشــتن‌و وشــکبوونی دەمدەکاتەوە.
خــرز: (خَرَزَ- الجِلْدَ. خَرْزاً): پێســتەکەی/ چەرمەکەی بەدرەوشە کونکردو درووی.
(أَلخَرَز): ١-موروو ٢-زەنگیانە.
خَــرَزَة: یەك موروو یــەك زەنگیانەو دەنکە شووشــەو شــتیتر کە دەکرێت بــە ملوانکەو تەزبیح‌و شــتیتر ٢-پارچە شتی بەنرخی وەك مرواری‌و یاقووت‌و ئەڵمــاس کە کوندەکرێت یــان دەکرێت بە ملوانکەو بــۆ خۆڕازاندنەوە دەبێت‌و بۆ ئافرەت دەبێت.
(خَرَزُ الظّهرِ): گرێی بڕبڕاگە.
(خَرَزاتُ المَلِكِ): گەوهەرەکانی تاجی شا.
(أَلخُــرْزَة (ج( خُرَز): کونــی موورووی لەگەڵ دەزوومەکەی.
(أَلخَريــز) (طــب): ئازارێکــە وەك دەرزیی بەلەشدا بکرێت وەکو ئازاری هەوە جومگە.
(أَلمِخْرَز (ج) مَخارِز): کونکەرە/ درەوشە.
(أَلخِرازَة):١-ملوانکە هۆنینەوە ٢-درەوشەکاریی ٣-چەرمەدروویی.
(أَلخَــرَّاز): ١-درەوشــەکار ٢-ملوانکەهــۆن ٣-چەرمەدروو/ سەراج.
(أَلمُخَــرِّز- مِنَ الطّيور): مەلی باڵنەخشــین‌و خاڵخاڵاوی.
٢-(خَرِزَ. خَرَزاً): کارەکەی (قایم دامەزراند/ بنجبەســتکرد) کە لە پێشــدا شلۆق‌و ناتەواو بوو.
خرس: (خَرِسَ. خَرَساً): لاڵ بوو.
(خَرَس): لاڵبوون زمانبەستران.
(أَخْرَسَ- هُ اللهُ): خودا زمانیبەســت‌و دەنگی بڕی/ لاڵیکرد.
(تَخارَسَ): خۆی لاڵکردو لاڵیش نەبوو.
(أَلأَخْرَس (ج) خُرس وخُرْسان وأَخارِس (م) خَرْساء): لاڵ/ زمانبەستراو.
(«وَلاَني عُرْضاً أَخْــرَس أَمْرَس»): لێمتۆراو قسەی لەگەڵ نەکردم.
(أَلخَرساء): ١-ئافرەتی لاڵ ٢-هەوری بێگرمەو برووسکە.
(كَتيبَة خَرســاء): بــرە ســەربازێکی کش‌و بێدەنــگ لەبــەر هێمنی‌و ســەنگینییان یان لەبــەر زۆریی زرێپۆش کــە دەنگی جەنگەکە نەدەبیسترا.
٢-(خَــرَّسَ- على النَّفَســاء): نانــی بۆنەی منداڵبوونیکرد.
(تَخَرَّسَ- تِ النَّفَساءُ): زەیستانەکە پەلوولەی زەیستانیی بۆ خۆیکرد.
(«تَخَرَّسِــي يــا نَفــسُ لامُخَرِّسَــة لَك»):

زمیستانەكە كەس نییە پەلوولەت بۆ بكات هەستە خۆت بیكە واتا خۆت خزمەتی خۆت بكە كە كەسێك نەبێت كارت بۆ بگوزمرێنێت.

(اَلخُرس والخِراس (ط): نانی بۆنەی منداڵبوون.

(اَلخُرسَة والتَّخْرِسَةُ) (ط): پەپوولەی زمیستان.

(اَلخَروس): ١-یەكەم سكی ژن ٢-زمستان كە پەپوولەی بۆ دەكرێت.

٣-(أخْرَسَ واسْتَخْرَسَ- تِ الأرضُ): زمویەكە بە كەڵكی كشتوكاڵ نەهات.

(اَلخِرْس): زموییەكە بەكەڵكی كشتوكاڵ نەهاتوو.

٤-(اَلخَرْس والخِرس (ج) خُروس): كووپەی مەی یان هی ترشیات.

(اَلخَرَّاس): ١-فرۆشیاری كووپەی مەی ٢-دروستكەری كووپەی مەی.

(لَبَن أخْرَس): ماستێك كە خەستبێتو لە قاپەكەیدا نەجوولێت.

(اَلخَرْساء): ١-نافرمتی لاڵ ٢-ومی/ چورتوم ٣-هەوری بێبروسكەو گرمە؟

الملحق:

خرس: (اَلخَرَسانَة): اَلباطُوم: تێكەڵە/ بۆ خانەسازیی لە چەوو لەمو چیمەنتۆ پێكدەهێنرێت.

خرش: ١-(خَرَشَ وخَرَّش- هُ. خَرْشاً): رووشاندی.

(- هُ الذُّبابُ): مێشەكە گەستی.

(خَرْش): ١-گەستن ٢-رووشاندن.

(خارَشَ- الكَلْبُ): سەگەكە تیژ بوو و پەلاماریدا.

(- هُ): رووشاندی/ رنی.

(هُ الذُّبابُ): مێشەكە گەستی.

(تَخارَشَ- تِ الكِلابُ): سەگەكان لەیەك تیژبوون چنگیان دایە یەكو یەكتریان كەلەپاچە كرد.

(إخْتَرَشَ- هُ): رنی/ رووشاندی.

(إخْتَرَشَ-تِ الجِراءُ): تووتكە سەگەكان تیژبوونو پەلاماریاندا.

(- هُ الذُّبابُ): مێشەكە گەستی.

(اَلخَرَش) (ح): مێش.

(خَرَشَة (ج) خُرُوش (ح): مێشێك.

٢-(خَرَشَ- الغُصْنَ. خَرْشاً): چڵەكەی بە قاڵنگ راكێشاو هێنایە خوارێ.

(- لِعِيالِهِ): رمنجی بۆ خێزانەكەیدا.

(خَرَّشَ- الغُصْنَ): لقەكەی بە قاڵنگەكە راكێشاو هێنایە خوارێ.

(خارَشَ- هُ الشيءَ): شتەكەی بە زۆر لێزموتكرد.

(إخْتَرَشَ- لِعِيالِهِ): رمنجی بۆ خێزانەكەیدا/ نانی بۆ خێزانەكەی پەیداكرد.

(-مِنهُ الشيءَ): بەزۆر شتەکەی لێسەند.
(اَلمِخرَش والمِخْراش): قاڵنگ.
(اَلبَعكورَة) (عامية): قاڵنگ.
٣-(اَلخَــرَش (ج) خُرُوش): شــڕکەو پڕکەی ناوماڵ/ شڕو شیواڵی ماڵ.
(اَلخُراشَــةُ): ئاردە مشــارو ئاردی ئەو شتەی دەکرێنرێتو وردە شــت کــە کاتی تەکاندنی شت دەکەوێتە زەویو لێیهەڵدەوەرێت.
(«لي عِنــدَهُ خُراشَــةٌ»): وردە مافێکــم لای هەیە.
(اَلخِرْشــاء (ج) خَرَاشِيُّ): ١-کاژەمار ٢-توێکڵە هێلکە ٣-گەرد/ تۆز.
(خِرشاءُ العَسَــلِ): مێوی هەنگوین ٢-هەنگی مردووی ناوشانەو هەنگوین.
٤-(خَرشَبَ-العَمَلَ):کارەکەیلامسەرلاییگرت/ باش داینەمەزراند.
٥-(اَلخَرْشَــفَةُ): قســەی تێکەڵوپێکــەڵ/ بەیەکداچوونی قسە ٢-جووڵە/ بزاوتن.
(اَلخَرْشَــفَة والخِرْشــاف): زبــرە زەوی کــە ڕۆیشتن تیایدا گرانو ناخۆشبێت.
(اَلخُرْشُوف) (ن): کەرتەشی- کنگر.
أرضــي شــوكي (عاميــة): کەرتەشــی/ شەکرۆکە.
٦-(اَلخَرْشُــوم (ج) خَراشِيم): ١-لووتکە شاخ کــە بەســەر دۆڵ یادەشــتاییەکدا بڕوانێــت ٢-کێوێکی مەزن.

خــرص: (خَــرَصَ. خَرْصــاً): درویفڵتان/ درۆیکرد.
(تَخَــرَّصَ واختَــرَصَ- عَلَيــهِ): درۆی بــۆ هەڵبەستو درۆیکرد.
(اَلخَرَّاص): ١-بوختانکەر ٢-درۆزن.
٢-(خَــرَصَ- فِي الأمرِ. خَرْصاً): وا بۆ کارەکە چوو/ وایزانی.
(- ه): خەملاندیو وایدانا.
(«خَــرَصَ النخْلَةَ»): بــەری دارخورماکەی قەبلاند.
(اَلخِرص): قەبلاندن/ خەملاندن.
(«كَم خِرصُ أَرضِكَ»): زەویەکەت بە چەند خەملێنــراوەو بەرەکەی (بە چەند قەبلاوە/ دانراوە).
٣-(خَــرَصَ- الشَــيء. خِراصَةً): شــتەکەی چاکسازکرد/ چاککردەوە.
٤-(خَرِصَ. خَرَصاً): تووشــی برســیەتییو سەرما بو.
(خَــرِصٌ وخارِصٌ): تووشــبووی ســەرماو برسیەتی.
٥-(تَخَــرَّصَ واختَــرَصَ): ئــەوەی ویســتی خستیە هەمانەکەوە.
(اَلخِرْص): هەمانە.
٦-(اَلخِرْص): ١-نێــزەی نوککورت ٢-کووپەی مەی ٣-سەبەتولکە/ زەمیلە.
(اَلخِرْص والخُرْص (ج) خِرْصَان و خُرْصَان):

ئەڵقەی زێڕ یان زیو یان هی شتیتر.
(اَلخـرْص (ج) خـراص وأَخْـراص): چڵی رووتی دارخورما، کە گەڵای پێوە نەبێت.
(اَلخَرْص والخُرْص (ج) أَخْراص): چیلکەیەکە هەنگوینی پێدەردەهێنرێت.
(اَلخُرْصـةُ): ١ـبـەش ٢ـ(ط) پەڵووڵـەی زەیستان.
(اَلخَریص): ١ـناوی سارد ٢ـناوی چاڵاوی بندار ٣ـ(کەناری/ قەراغی) رووبار.
(اَلمِخْرَص (ج) مَخارِص): نێزە.
خرط: ١ـ(خَرَطَ- العودَ): دارەکەی بە داهێن، تۆرنە داهێناو رێکخست.
(اَلخَـرَّاط): کەسـی دارداهێـن و رێکخـەر/ خەرات.
(اَلخُراطَة): تەڵاش کە لە ئەنجامی داهێنان و تاشین دەوەرێتە زەوی.
(اَلخِراطة): پیشەی دارداهێنی/ خەراتیی.
(اَلمِخرَطَـة (خ) مَخـارِط) (حـي): ئامێری دارداهێنان و رێکخستن/ تۆرنە.
(اَلمَخروط): داری داهێنراو/ تۆرنەکراو.
٢ـ(خَرط- الوَرَقَ. خَرطاً): گەڵاکەی بەدەست لە درەختەکە داماڵی/ رنی.
(- الشَـجَرَةَ): لقـی درەختەکـەی راکێشـاو گەڵاکەی رنی.
(- العُنْقُـودَ): هێشـووی ترێکـەی خسـتە دەمیەوەو بە دەم بۆڵەکانی داماڵی و لاسکەکەی دەرکردە دەرەوە.
(إِخْتَـرَطَ- العُنقودَ): هێشـووی ترێکەی بە دەم داماڵی.
(اَلمَخروط): کەمریش/ نیمچەکۆستە.
٣ـ(خَرَطَ- الحَدیدَ. خَرْطاً): ئاسنەکەی وەك ستوون درێژکرد/ کێشکرد.
(إِنْخَرَطَ- الجِسْمُ): تەنەکە باریکبوو.
(اَلخَـرَطُ): بێهێزیـی هەمـوو تەنەکـە/ لەشەکە.
(اَلمَخروط): روویەك/ دەموچاوێك درێژکۆلە بێت (هـ) ٢ـقووچەیەك.
٤ـ(خَرَطَ- الجَواهِرَ. خَرْطاً): گەوهەرەکانی خستە توورەکەیەکەوە.
(- الرَجُـلَ فِي الأَمـرِ): پیاوەکـەی خسـتە کارەکەوە.
(إِنْخَرَطَ- ت الخَرَزاتُ فِي السِلكِ): مووروەکان لە داوەکەدا ریزبوون/ ریزیانبەست.
(- فِي المَکانِ): زوو خۆی هاویشتە شوێنەکەوە.
(اَلخَریطَةُ): توورەکەی چەرم یان شـتیتر کە شتی تێدەکەن و گرێیدەدەن.
٥ـ(خَرَطَ- البـازِيَ): بازدارەکە بازەکەی بە دوای نێچیرەکەدا نارد/ بازەکەی بۆ نێچیرەکە بەرەڵا کرد.
(تَخَـرَّطَ- فِي الأُمـورِ): هەڵمەتـە کاسـانەو هەڵەشانە نیشتە کارەکەوە.
(إِنْخَـرَطَ- الصَقْرُ): هەڵۆکە بـۆ نێچیرەکە

داپەرپیە خوارەوەو خۆی پێدادا.
(- مِنَ المَكانِ): لە شوێنەکە زوو دەرپەڕی.
(- فِي الأَمرِ): نەزانانەو هەڵەشانە رووی کردە کارەکە.
(«إنْخَرَط عَلَينا بِالقَبيحِ»): ناشیرینانەو بە زمانی پیس بەرەو رووومان هات.
(إخْتَرَطَ- السَّيفَ): شمشێرەکەی هەڵکێشا.
(إسْتَخْرَطَ- فِي البُكاءِ): دایە پرمەی گریانێکی بەکوڵ.
(أَلخُرُوط (ج) (خُرُوط): ١-وڵاخی سەرکێش کە جڵەوگیر نابێت ٢-ئەو کەسەی هەڵەمەتەکاسانەو کوێرانە/ نەزانانە دەست دەداتە کارێك.
٦-(خَــرَطَ- الرَجُــلُ. خَرْطــاً): کابرا درۆو فشەیکرد.
(أَلخَرَّاط): درۆزن/ فشەکەر.
٧-(خَرِطَ- هُ الدَّواءُ): دەرمانەکە رەوانیکرد/ شۆریکرد.
(خَرِطَ وأَخْرَطَ- تِ الشّاةُ أَو النّاقَةُ): مەرەکە یا مێحوشترەکە شۆر بوو.
(خَرَّطَ- هُ الدَّوَاءُ): دەرمانەکە شۆریکرد.
(إنْخَرَطَ – بَطنُ الإنسانِ): مرۆڤەکە تووشی سکچوون بوو.
(أَلخَــرَط) (طــب): دەردێكــی ئاژەڵە ئەگەر گوانی توشیبوو شیرەکەی بە خەستی لێدێتە دەرێ/ دەردی خەستبوونەوەی شیری ئاژەڵ.
(أَلمُخرِط (ج) مَخارِيط): مەر یان مێحوشترێك تووشی دەردی شیر خەسبوونەوە بووبێت.
٨-(خَــرِطَ- بِالطَّعامِ. خَرَطاً): خواردنەکەی لە بینگیرا.
٩-(أَلخَرِيطَةُ والخارِطَةُ= المُصَوَّر والمُخَطَّط): نەخشە- رەنگرشتن بۆ زەوییەك/ خاکێك یان هەرێمێك.
(أَلمَخْروطَــةُ مِــنَ الآبــارِ): (چــاڵاو/ بیر)ی تەسك.
(أَلخِرْطيط (ج) خَراطيط) (ح): پەپوولەیەکە باڵنەخشین.
١٠-(أَلخَرْطــال) (ن): گلێنە/ کزن: رووەکێکە دەدرێت بــە ئــاژەڵ. مرۆڤیش بــە تایبەتی لە ئەمەریــکادا بە کولاویــی بەکاریدەهێنن دەیخۆنەوە.
١١-(خَرْطَمَ- هُ): لە لۆزیدا/ لە خەرتومیدا.
(إخْرَنْطَمَ): ١-لووتی بەرزکردەوە ٢-فیزینواند.
(أَلخُرْطــوم (ج) خَراطيــم والخُرْطُم (ج) خَراطِــم): لــۆز بــە تایبەتی لــۆزی فیل/ خەرتومی فیل.
(«خَراطيــمُ القَومِ»): گەورەی خوێشــگەل/ گەورەی نەتەوە.
١٢-(إخْرَنْطَمَ): لووتی هەڵکرد/ خیشــیکرد/ تووڕە بوو.
(أَلخُرْطــوم والخُرْطُــم): مەیــی کەلەپچە، مەیــەك کــە زوو خەڵــك سەرخۆشــبکاتو بیگرێت.

١٣-(أَلخُرْطُــون (ج) خَراطــين) (ح): كرمی زەوی/ گلْخۆركــه. كرمێكــه زۆر بزێوه لەژێر زەویدایه خۆراكی لێوەردەگرێت. بۆ كشتوكاڵ زۆر بەكەڵكه چونكه هەندێك مەواد فرێدەدات كه بۆ گەورەبوونی ڕووەك باشه.

الملحق:

خرط: خَرطُوَة: فیشەك.

خرع: ١-(خَرَعَ- هُ. خَرْعاً): قڵیشاندی.

(خَرِعَ- الشَيءُ. خَرَعاً): شتەكه قڵیشا/ شكا.

(إنْخَرَعَ- تِ القَناةُ): داردەستەكه یان نێزەكه قڵیشاو لەتو پەتبوو.

(إخْتَرَعَ- الشَــيءَ): شــتەكەی هەڵقڵیشاند/ شكاند.

٢-(خَــرُعَ. خَراعَــةً و خُرْعــاً و خُرُوعاً): جومگەكانی خاوبوونەوەو شل بوون.

(خَرِع وخَرِيْع): جومگە خاوو شل.

(خَرِعَ وانْخَرَعَ وتَخَرَّعَ- الرَجُلَ): ١-پیاوەكه لەشــی ڕووخاو بەلادا هات ٢-لاوازو بێتین بوو ٣-شــلبوو ڕایگۆڕیو ملیدا كه لەوەپێش لەرادا توند بوو.

(أَلخَرِيع مِنَ الرجال): پیاوی بوودەڵه.

(أَلخَرِيْع والخَــرُوع) (ج) خَرائِع و خُرُوع- مِنَ النِّساء): ژنی شلو مل/ نەرمو نۆڵ.

(أَلخِرْوَع): نەرم.

(«عَيــشٌ خِروَع»): ژیانێكــی نەرمو خۆش، بێگیروگرفتو ئاسان.

(أَلخِرْوَع (من) النِّســاءِ): ١-ژنی شــلو ملو نــەرمو بەلەنجــەولار له ڕۆیشــتندا ٢-ژنێك نەرمبێتو زوو خۆی بەدەستەوە بدات.

(أَلخِروَع) (ن): گەرچەك ڕووەكێكه گیایی یان درەختە. هی ئاســیایه گەڵاكەی لووسو پانه له هەندێك شــوێندا له خۆیەوە دەڕوێت، بۆ جوانیش دەڕوێنرێت هەروەها بۆ دەرهێنانو گرتنــی ڕۆنێك له تۆوەكەی كــه زۆر بەكاره بۆ ڕەوانــیو پێیدەڵێن ڕۆنــی گەرچەك (له نەرمییەوە) ناوەكەی وەرگیراوە.

٣-(خَــرَّعَ- الثَّــوبَ): بەرگەكــەی بەزەرتك ڕەنگكرد. أَلخَرِيع:

٤-(إخْتَــرَعَ- الشَــيءَ): شــتەكەی داهێنــا/ هێنایەدی.

(«إخْتَــرَعَ اللهُ الكائِنــات»): خــودا هەموو بوونەوەری له نەبوو هێناوەته دی.

٥-(إخْتَــرَعَ- فُلانــاً): ناپاكیــیو دەغەڵیی لەگەڵدا كرد.

٦-(إخْتَــرَعَ- الدابَّــةَ): وڵاخەكــەی چەنــد ڕۆژێــك به دەســتیاو دا به یەكێكو پاشــان وەریگرتەوە.

٧-(أَلخَراعَــة- الخَلاعَــة): بەدڕەوشــتیی/ قەحبەیی/ بەرەڵایيو ڕووتیینوێن.

(أَلخُرَاع): ١-شــێتبوونی مێحوشــتر ٢-پچڕانی پشتی مێحوشتر.

(أَلخريع والمَخْرُوعَة- مِنَ النِّياق): مێحوشتری

شـێت/ ئەو مێحوشـترەی تووشی شێتی بووە یان برپرەی پشتی پچڕاوە.

خـرف: ١-(خَـرِفَ و خَـرُوفَ. خَرَفـاً): خەڵەفاو. لەبەر پیریی‌و تەمەنی زۆری هۆشی لەبەر برا.

(خَرِف (م) خَرِفَة): خەڵەفاو.

(خَرَّفَ- هُ): بە خەڵەفاوی دانا.

(أخْرَفَ- هُ): تێکیدا/ خراپیکرد/ خەڵەتانی.

(ألخَرافَة): قسەی خەڵەفاوانەی پێکەنیناوی.

(ألمَخْرَفَة): ئاوەزتێکچوون بە هۆی پیرییەوە/ ئەقڵ سوکبوون بە هۆی پیرییەوە/ خەڵەفان.

٢-(خَرَفَ- الثَمَـرَ. خَرْفاً و خِرافاً و خَرَافاً و مَخْرَفاً): بـەری میوەکەی لە پایزدا چنی/ رنی.

(أخْـرَفَ- الثَمَـرُ): بەرەکـە/ میوەکە کاتی چنینی هاتووە.

(إخْتَرَفَ- الثَمَرَ): میوەکەی چنی.

(ألخَراف والخِراف): دەمی (ڕنینی/ چنینی) میوە.

(ألخُرْفَةُ): میوەی (ڕنراو/ چنراو).

(ألخُرافَة): ئەوبەرەی دەرنرێت.

(ألخَرُوفَـةُ): دارخورمایـەک کـە بـەری بچنرێت.

(ألخَرِيـف): فەریکـە خورمـای چنـراو/ لێکراوە.

(ألخَريفَـةُ): دارخورمایەک کـە بەربگرێت‌و لێبکرێتەوە.

(ألمِخْرَف (ج) مَخـارِف): بەرچنۆکەیەک کە خۆشترین خورمای چنراوی تێدەکرێت.

(ألمَخْرَفَـةُ (ج) مَخـارِف): گلەرێـی نێـوان دوو ریـزی دارخورما کە بە هەوەسـی خۆی خورمارنەکـە ریزێکیـان هەڵدەبژێرێـت‌و دەیرنێت.

٣-(خُرِفَ- تِ الأرضُ): زەویەکە بارانی پایزی لێدا.

(مَخروفَـةُ): زەوییـەک بـەر پایزەبـاران بکەوێت/ بەر بارانیپەڵە بکەوێت.

(خُـرِفَ- تِ البَهائِمُ): چوارپێکان بارانیپەڵە لێیـدان/ بارانی پایز لێیـدان ٢-لەوەڕیان بۆ ڕووا.

(خـارَفَ- هُ. مُخَارَفَةً و خِرافاً): ماوەی پایز بەکرێیگرت.

(أخْرَفَ- تِ الشاةُ): لە پایزدا مەرەکە زا.

(- الرَجُلُ): پیاوەکـە کەوتە پایزیتەمەنەوە یان کەوتە پایزەوە.

(إخْتَـرَفَ- فِي مَكانٍ): لە شـوێنەکەدا پایزی بەسەربرد.

(ألخَريف): ١-پایز ٢-بارانیپایز/ پایزەباران.

(خَرِيفِـيّ و خَرْفِـيّ و خَرَفِـيّ): پایـزە/ پایزیی.

٤-(ألخُرافَـة (ج) خُرافـات): قسـەی هیچ‌و پووچ‌و تورەهاتی کۆن/ ئەفسـانە/ داسـتان‌و

حیکایەتی کۆنی درۆو هەڵبەستراو.

(اَلخَرُوف (ج) خِراف وأَخرِفَة وخِرفَان (ح): بەرخ.

(اَلخَروفَة): بەرخەمێچکە.

(اَلمُخَــارَف- مِــنَ الرِّجــال): پیــاوی داماوی بێدەستو قاچ/ پەککەوتە.

٥-(خَرْفَــشَ- الشَّــيءَ): شــتەکەی تێکەڵو پێکەڵکرد/ شتەکەی بەسەریەکدا کرد.

(«خَرفَــشَ في کَلامِــهِ» (عامِیَّة): قســەی هەلەقو مەلەقیکردقســەی بێسەروبەریکرد/ یان قسەی ناشیرینیکرد.

خرق: ١-(خَرَقَ- الثَّــوبَ. خَرْقاً): جلەکەی دراند.

(- البِنَــاءَ وفِي البِنَــاءِ): پەنجــەرەی کــردە خانەکەوە.

(- فُلاناً بِالرِّمحِ): نێزەی بە فیساردا کرد.

(خَــرَّقَ- هُ): درانــدی/ لەتوپەتیکــرد/ شیترشیتریکرد.

(تَخَــرَّقَ وانْخَرَقَ واخْرَورَقَ): درا/ لەتوپەت بوو/ شیترشیتر بوو.

(اَلخَرْق (ج) خُرُوق): ١-کون ٢-دەلاقە ٣-درز.

(اَلخِرْقَة (ج) خِرَق): پەڕۆشر/ سیپاڵ.

(اَلمَخْرَق (ج) مَخارِق (ا ع): کونیلەش/ کونی لەش وەك لووتو دەم.. هتد.

٢-(خَرَقَ- الكَذِبَ. خَرْقاً): درۆیهەڵبەست.

(- الرَّجُلُ): پیاوەکە درۆیکرد.

(خَرَّقَ- الرَّجُلُ): درۆی زۆر کرد.

(تَخَرَّقَ- الكَذِبَ): درۆیهەڵبەست.

(إخْتَرَقَ- الكَذِبَ): درۆیهەڵبەست.

(اَلمَخْرَقَة): درۆکردنو درۆهەڵبەستن.

٣-(خَرَقَ- الأَرضَ. خَرْقاً): زەویەکەی بڕی/ بە زەویەکەدا گەڕا.

(- المَفَــازَةَ): بیابانەکــەی بڕیو تا گەیشــتە ئەوسەری.

(إخْتَــرَقَ- الأَرضَ): بە زەویەکــەدا تێپەڕی بێئەوەی بە ڕێگەکەیدا بڕوات.

(- القَومَ): بە ناوەڕاستی خوێشگەلدا تێپەڕی/ ڕۆیشت.

(اَلخَرْق بِالمَرّ (ز): کێڵانێکی قووڵی زەوی بە ئامێرێکی درێژی دوو گاسن/ دوو دەم.

(مَرُّ الخَرْق): ئامێری دوو دەمی کێڵان.

(اَلخَرِیــق (ج) خُرُق): ئــاوەڕۆ (چونکە بە زەویدا تێدەپەڕێتو دەیبڕێت).

(اَلمُختَرَق): ڕێباز/ ڕێڕەو.

(«مَکانٌ خالِيَ المُخْتَرَق» شوێنێکە: دەرچەی نییە.

٤-(خَرَقَ- العادَةَ. خَرْقاً): لە کاری ئاســاییو نەریت دەرچوو/ باری نەریتی تێکشکاند/ لە رادەبەدەریکرد.

(اَلخارِق): ١-لە ئەندازە بەدەر/ ئاسایشکێن/ کاری نائاسایی ٢-موعجیزە.

٥-(خَــرَقَ- تِ الریحُ): زریانەبــا هەڵیکردو

دایبەیەکدا.
(تَخَــرَّقَ وانْخَــرَقَ- تِ الريــحُ): باکە تەواو توند بوو.
(اَلخَرْق (ج) خُــرُوق): ١-زەویی فراوانو پان کــە هەموو جــۆرە بایەکی تێدا بــە توندیی هەڵــدەکات ٢-بیابــانو چۆڵەوانیــی وشــكو بێئاو.
اَلخَريق): شنەبا.
(اَلخَريق (ج) خُرُق): لای بەرەلای دۆڵ.
(اَلخَريف والخَرُوق): تیژەبای سارد.
(اَلمَخْــرَق (ج) مَخارِق): چۆڵەوانیی وشــك/ بێئاو.
(اَلخَرْقــاء): ١-تیژە با ٢-زەویــی پانو فراوان کە هەمیشــەو هەمــوو جۆرە بایــەك تیایدا هەڵدەکات.
(اَلمُنْخَرق): خێرا/ گورج.
(«ريــحٌ خَريق»): بــای توند/ تیــژو خێرا هەڵکردوو.
(مُختَرَقَ- الرِياح): کونەبا/ شــوێنهەڵکردنی با/ هەڵگەی با.
٦-(خَــرَقَ- الرَجُــلُ): پیاوەکــە ڕەفتــاری منداڵانەیکردو یاری بە واڵاکرد.
(اَلمَخاريــق): واڵاو پەڕۆی بــادراو کە منداڵان یاریپێدەکەن.
٧-(خَرَقَ- فِي البَيــتِ. خُرُوقاً): لە ماڵەکەدا نیشتەنیبوو بەجێینەهێشت.

(خَرِقَ. خَرَقاً): حەپەســا، لە ترساندا یان لە شەرمدا حەپەسا.
(خَرِق): حەپەســاو/ سەرســام/ واقوڕماو لە ترساندا یان لە شەرمدا.
(خَرِقَ- الغَــزالُ أَوِ الطائِرُ): ئاســکەکە یان باڵندەکە حەپەساو هۆشی لەبەر بڕا نەیتوانی هەڵبستێت، یان بفڕێت.
(- فِي البَيتِ): لە ماڵەوە مایەوەو بەجێینەهێشت.
(أَخْرَقَ- هُ): حەپەساندی/ سەرسامیکرد.
(نُومَــةُ الخُرْقِ): نوســتنی چێشــتنەنگاو/ نیوەڕۆخــەو (بۆیــەو واناونــراوە چونکــە نیشانەی تەمەڵیو تەوەزەلییە).
٨-(خَــرِقَ و خَــرُقَ. خَراقَــةً): ١-گەوجبوو ٢-نەزانکردە بوو ٣-بوودەڵەرا بوو.
(أَخْرَق): گەوج ٢-نەزانکردە بوو ٣-بوودەڵەرا.
(اَلخَرقــاء): ١-ئافرەتی گەوج (مێی وشــەی) (الأَخْرَق) ٢-ئافرەتی نەزانکردە.
٩-(تَخَــرَّقَ- فِي الكَرَمِ): دەســتی بەخشــینی (فراوانبوو/ تەواوکردەوە/ واڵاکرد).
(اَلخِــرْق (ج) أَخْــراق وخُــرّاق و خُرُوق): جوامێرێکی بەخشندەو سەغی/ دڵفراوان.
(اَلخِرِّيــق): جوامێرێکــی زۆر بەخشــندەو دڵفراوان.
(اَلمِخْراق (ج) مَخاريق): دڵفراوان/ ســەغی/ بەخشندە.
١٠-(اَلخُــرق والخَرَق والخُرْقَــة): دڵڕەقیی/

بێبەزەیی.
(اَلمِخــراق (ج) مَخاريق): شـۆخو شــەنگ/ لەشــولار جــوان ٢-كارامــەو بەكردوبــزان/ خاوەنئەزموون.
(«هُوَ مِخراقُ حَربٍ»)ئەو جەنگكردەو تيادا چابوكو قاڵە.
خرم: ١-(خَرَمَ- ہ. خَرْماً):١-بڕیو كەلیكرد ٢-كونیكرد ٣-كۆڵەكەی لووتی قڵیشاند.
(«مــا خَرمْتُ مِنهُ شــيئاً») هیچم لێ كەل نەكردووەو نەبڕیوە.
(خَرَمَ- الخَــرزَةَ): مووروومكەی درزتێكرد/ قڵیشاند.
(- الإبرَةَ): كونی دەرزییەكەی هەڵهێنایەوە/ كونەكەی شكاند.
(خَــرِمَ. خَرَمــاً): كۆڵەكەی لووتی قڵیشــاو كونیتێبوو.
أَخْــرَم: یەكێكــە كــە كۆڵەكــەی لووتــی قڵیشابێت.
(خَرَّمَ- الخَرزَ): درزیكردە مووروومكەوە.
(تَخَــرَّمَ): مووروومكــە، دریــزی تێبــوو/ شەقیبرد.
(إنْخَرَمَ- أَنْفُهُ): كۆڵەكەی لووتی قڵیشا.
(أَلخَرْم (ج) (خُروم): لووتە شاخ.
(أَلخَرَمَةُ): شوێنی قڵیشانی كۆڵەكەی لووت.
(أَلأخْرَم): ١-نازناوی شایەكی رۆمەكانە ٢-لای دامێنی شان.

(أَلأَخْرَمــان (ج): دوو ئێســقانی خواربووی هەردوو سەری كاكیلەی سەرەوە.
(أَلخَرْماء): گوێی سمراو.
(- مِــنَ العِناز):بزنێك كە گوێی لە باریپانی هەڵدرابێت.
(أَلمَخْــرِم (ج) مَخارِم): كۆتایــی دەرپەڕیوی شاخ.
(أَلمَخــارِم): رێــی نــاو چیاو دەمی شــەقامی فراوانی ناوچیا.
(مَخارِمُ اللَّيل): سەرەتایشەو.
(أَلخَورَمَــة (ع أ):بەڵكــی گوێچكە/ نەرمایی گوێ یان كۆڵەكەی لووتی مرۆڤ.
٢-(خَرَمَ- عَــنِ الطَّريقِ. خَرْماً): لە رێگەكە لایدا.
٣-(خَرَمَ- تْهُ الخَوارِمُ. خَرماً): مرد.
(تَخَــرَّمَ واختَــرَمَ- هُ): فەوتانــدیو لە بنو بێخی دەرهێنا.
(- هُ المَوْتُ): مەرگ بۆ خۆی بردەوە.
(إنْخَــرَمَ- القَــرنُ): ســەدەكە كۆتاییهــاتو تێپەری.
(أُخْتُرِمَ- عَنا): لە ئێمە رۆیشتو مرد.
٤-(خَــرُمَ. خَرامَةً): بەرەڵاو داوێنپیســبوو/ بێئابڕووو بێڕەوشتبوو.
(خــارِم و خَريــم): بــەرەڵاو داوێنپیــسو بێئابڕو.
(إختَرَمَ- هُ المَرَضُ): نەخۆشی لاوازیكرد.

(اَلخُرمان): درۆ.

٥-(خَرْمَــشَ- الكِتــابَ): كتێبەكەی (تێكدا/ خراپكرد).

٦-(خَرْنَفَ- هُ بِالسَّيفِ): شمشێری پێداكێشا.

٧-(اَلخِرْنِــق (ج) خَرانِق) (ح): كەروێشــكی تازە تەمەن/ گەنج.

(اَلخَوَرْنَــق): ١-ئــەو كۆڕەی شــاتیایدا دەخواو دەخواتەوە ٢- (ن):رووەكێكە (فارسيٌ مُعَرَّب).

خــزا: ١-(خَــزَّ- الحائِــطَ. خَــزّاً): ســەری دیوارەكەی دركاویكرد تا سەرینەكەون.

٢-(خَزَّ يَخْــزُزُ- الثَّمرُ): خورماكە كەمەكێك ترشبوو.

(تَمرٌ خازٌ): خورمای مزر.

٣-(خَزَّ- واخْتَــزَ- هُ بِالرُّمحِ. خَزّاً): نێزەی پێداكرد.

٤-(خَــزَّ واخْتَزَ- الرَجُلَ. بَبَصَرِه. خَزّاً): بە چاویەوە كرد.

٥-(اَلخَــزّ (ج) خُــزُوز): ١-ئاوریشــم (لــە (مَخَــزَّة)ەوە هاتووە كە شــوێنی كەروێشــك دەگرێتــەوە واتــا وەك تووكــی كەروێشــك نەرمە) ٢-چنراوی ئاوریشمو خوری یان هەر ئاوریشم.

(اَلخَزّ (عند العامَّة): قەوزە.

(اَلخُــزَز (ح) خِــزّان وأَخِــزَّة (ح)): نێرەی كەروێشك.

(اَلمَخَزَّة): كونە كەروێشك.

(اَلخَزِيز): تووتركی زۆر وشك.

(اَلخَــزّاز): ئاوریشــمفرۆش یان فرۆشــیاری چنراوی خوریو ئاوریشم.

خزب: ١-(خَــزِبَ وتَخَزَّبَ- الجِلْــدُ: خَزَباً): پێستەكە بێئازار ئاوسا.

(خَزِبٌ): پێستی ئاوساوی بێئازار.

(- تِ الشاةُ): گوانی مەڕەكە هەڵاوسا.

(خَزِبَة وخَزباء): مەڕی گوانئاوساو.

(اَلخَيْزَب والخَيْزَبَان): گۆشتی سەرچەمبەر/ گۆشتی هەرزان.

(خَيزَبَــة وخَيزَبانَــة): پارچە گۆشــتێكی هەرزان.

٢-(اَلخِزْباز والخازباز (ح):١-مێشیسەرتەرسی وڵاخ ٢-ویزەویزی مێشی سەرتەرس.

خــزر: (خَزَرَ. خَزْراً): بــە زۆر زانییەوە بە تیلەیچاو تەماشایكرد.

(خازر): تیلەتێكەری زۆرزانیی.

(خَزَرَ- ت عَينُهُ): چاوی تەسكبووەوە.

(أَخْزَر): چاوتەسكو بچووك.

((م) خَزْراء (ج) خُزْر): ئافرەتی چاوتەسكو بچووك.

(خَزَّرَ – الشيءَ): شتەكەی تەسككردەوە.

(تَخازَرَ): پێڵوی هێنایەوە یەك تا تیژ تەماشا بكات.

(اَلخَزَر): ١-تەسكیی چاو ٢-كۆمەڵە خەڵكێكن كە چاویان تەسكەو بچووكە.

(بَحر الخَزَر): دەریای قەزوێن.

(اَلخُزرَةُ): تەواو خێل. خێلێکە گلێنەی چاوی زۆر خــوار بێتەوە. بۆ قنچکی چاوی کە ئەوە ناشیرینترین خێلییە.

٢-(خَزِرَ- الرَّجُلُ خَزَراً): پیاوەکە هەڵات.

٣-(اَلخَزْرَةُ والخُزرَةُ): ئازارپیشت.

(اَلخَیزَران): دارحەیزەران.

(خَیزَرانة (ج) خَیْزُرانات): دارحەیزەرانێك: ڕووەکێکــە لــە بنچینەدا لە چینو ئاســیای جەمسەرو هندســتانەوە هاتووە بەوە ناودارە کــە گەورەیــەو زوو پێدەگــاتو کەمگوڵــە. قەدەکەی لــە خۆرهەڵاتدا بۆ دروســتکردنی کورســی بەکاردێت ٢-هەمــوو دارێکی نەرم/ چێوێکی نەرم ٣-نێــزە لەبەر ئەوەی نەرمەو دەنوشتێتەوە.

(اَلخَیْزَرانة (ج) خَیْزَرانات): ســوکانی پاپۆر کــە لــە دواوەی دەبێــتو ڕووی پاپۆڕەکەی پێدەگۆڕێت.

(اَلخَیزور) (ن): دارخەیزەران.

(اَلخَــوْزَرَی والخَیْزَری): ڕۆیشــتنی نارێكو شلەپەتەیی.

٤-(اَلخَزرَح): بای وەشت/ بای باشوور.

٥-(خَزرَفَ- فِي مَشیِتِه): لە ڕۆیشتندا دەستی بەرزکــردەوەو دانەوانــدەوە/ دەســتی توند ڕاوەشاند.

خزع: ١-(خَزَعَ- الشَــيءَ. خَزْعاً): شتەکەی بڕی.

(- عَن القَوم): لە خوێشگەل بڕاو دواکەوت.

(- مِنهُ شیئاً): شتێکی لێسەند/ لێبرد.

(خَزَّعَ- الشَيءَ): شتەکەی بڕیو لەتلەتیکرد.

(- الشَّــيءَ بَینَهُم): شــتەکەی لە نێوانیاندا بەشکرد.

(- هُ ظَلَــعُ فِي رِجلِــهِ): خەوشــێك یــان نەخۆشــییەك لــە قاچیــداو لەپێیخســت/ شەلیکرد.

(تَخَزَّعَ- الشَيءَ): شتەکەی بڕی.

(- عَن القَوم): لە خوێشگەل دواکەوت.

(تَخَزَّعوا- الشَــيءَ): شتەکەیان پارچەپارچە بەشکرد.

(إنْخَزَعَ- الحَبْلُ): پەتەکە لە ناوەڕاستدا قرتا، پچڕا.

(إخْتَزَعَ- هُ): بردی.

(- هُ عَــنِ القَوم): لە خوێشــگەلی (پچڕاند/ بڕی/ کرد).

اَلخَزْعَةُ: شەلیی قاچێكو کورتهێنانی.

(اَلخَزْعَةُ): کوتە گۆشتێك.

(اَلخَزُوع): ئەوەی دەست بۆ ماڵیخەڵك دەباتو دەیبات.

(اَلخُزاع): مردن.

(اَلخُزاعَةُ): پارچەیەك کە لە شتێك ببڕێتو بکرێتەوە.

(اَلخَوْزَعَــةُ): کۆمەڵەلێك کە لــە لە زۆرەکە

ببچرێت.

٢-(إنْخَــزَعَ- الرَجُلُ): پیاوەکە لەبەر پیریی‌و بێهێزیی کۆمایەوە.

(اَلخَوزَع): پیر/ ئیختیاری کۆماوە.

٣-(اَلخَزْعَبَل والخُزَعْبِل والخُزَعبِيل): قسەی پروپووچ‌و بێبنچینەو پێکەنیناوی.

(اَلخُزَعْبَلَةُ (ج) خُزَعْبَلات): قسەی هەلەق‌و مەلەق/ قسەی گاڵتەو گەمەو پێکەنین.

٤-(خَزْعَلَ- في مَشيِهِ): لە ڕۆیشتندا لەنگیی/ شەلیی.

(- الماشــي): وەك شــەل ڕۆیشــت/ خــۆی لەنگاند.

(اَلخَزْعَل) (ح): کەمتیار.

(اَلخُزعالَــة): گاڵتەجاڕی/ یاریــی‌و مەزاق/ گەمەو پێکەنین.

خــزف: (خَــزَفَ- في مَشــيِهِ. خَزْفــاً): لە ڕۆیشتندا دەستی ڕاوەشاند.

(- الثَّوبَ): بەرگەکەی دادڕی/ یەکالآیکردەوە.

(- الشيءَ): شتەکەی هەڵدڕی.

(اَلخَزَف): ئەوەی کە لە قوڕ دروســتکرابێت‌و بــە ئاگــر ســوورکرابێتەوە، وەك کاشــیی/ فەخفووریــی‌و گــۆزەو دیــزەو چینــی‌و لەو بابەتانە.

(خَزَفَــةٌ): فەخفورییــەك یــان شــتێك لەو بابەتانە.

(اَلخَزّاف والخَزَفِــيُّ): گۆزەفرۆش‌و گۆزەکەر چین‌و فەخفوریکەرو فرۆشیاری.

خزق: ١-(خَزَقَ- هُ بِالسَّهْمِ. خَزقاً): تیرێکی پێداچەقاند/ بەرخست.

(- هُ بالرِّمح): سووکە نێزەیەکی پێداکرد.

(- الشَــيءَ في الأَرضِ): شــتەکەی لــە زەویدا چەقاند.

(تَخَزَّقَ وانْخَــزَقَ): ١-بەرتیر یان نێزە کەوت ٢-پێدا چەقی.

(إختَرَقَ- السَّيفُ): شمشێرەکە هەڵکێشرا.

(اَلخازِق) (فا): ١-نووکی نێزە ٢-تیری تێچوو.

(اَلمِخزَقَة): سونگی.

(اَلخازوق (ج) خَوازيــق): تێلایەکی درێژی نووکتیــژە بــە کۆمــی تاوانبــاردا دەکرێت‌و پێیدەمرێت (ئەمڕۆ دەوترێت) (فِعلُ خَوزَق): تێلا تێبرین‌و کوشتن.

٢-(خَــزَقَ- الطَّائِــرُ. خَزْقــاً): باڵندەکــە ڕیقنەیکرد.

٣-(خَــزَقَ- الثَّــوبَ) (عامية): کراســەکەی دادڕی.

خزل: ١-(خَزِلَ. خَزَلاً): پشتی لە ناوەڕاستدا شکا.

(اَخْزَل ومَخْزُول): پشتشکاو.

(اَلخُزلَةُ): پشتشکان.

٢-(خَزَلَ- الشَيءَ): شتەکەی لەتکرد/ بڕی.

(تَخَزَّلَ): پارچە پارچە بوو/ لەتلەتبوو.

(إنْخَزَلَ- في كَلامِهِ): لە قسە کەوت.

(- مِــنَ المَــكانِ): بــە تەنیا لە شــوێنەكەدا مایەوە/ تەریك بوو.
(إخْتَــزَلَ- الشــيءَ): لــە شــتەكەی لابردو لێكردەوە/ لێیدابڕی.
(- هُ عَــن قَومِــهِ): لە خوێشــگەلی دابڕی/ تاكیكردەوە.
(- بِرَأيِــهِ): خۆباوەڕییكــرد/ هــەر بە ڕای خۆیكردو ڤیرسیچمەییكرد.
(- الوَديعَةَ): دەســتی بەســەر ســپاردەكەدا گرتو نەیدایەوە بە خاوەنەكەی/ ناپاكیكرد.
(ألإختِزال (ع ح): لێكەمكردن/ كورتكردنەوە/ لێدابڕین.
(عِندَ الكَتَبَة): لای نووســەران) لێقرتاندنی هەندێــك پیــت لــە نووســیندا بــە نیازی كورتكردنــەوەو خێرایــی لە نووســیندا (لە لێبڕینەوە وەرگیراوە).
(إختِــزال كســر واختِصــارِهِ) (ع ج): كورتكردنەوەی سەرەوژێرەی كەرتی ئاسایی.
(إختزال ٢٠/٦٠ بە كورتكردنەوەی ئەو كەرتە دەبێتە ٣/١ بەڵام ٥/٣ و ١٣/١١ كورتتاكرێنەوە.
٣-(خَــزَلَ- هُ عَــن حاجَتِهِ خَــزْلاً): بەری خواســتەكەی لێگــرت/ نەیهێشــت بگاتــە پێداویستیەكەی/ تەگەرەی هێنایە ڕێی.
(إنْخَزَلَ – عَنِ الجَواب): بە تەنگ وەڵامدانەوە نەهات.
(ألخُزْلَــةُ): بەربەســتكەری ئامانجەكانــت/ ڕێلێگری نیازەكانت/ نەهێڵو تەگەرەهێن.
٤-(تَخَــزَّلَ): سســتەپێ بوو/ لە ڕۆیشــتندا/ گرانرەو بوو.
(- السَّحابُ): هەورەكە گرانرەو بوو.
(إنْخَــزَلَ): سســت ڕۆیشــت/ بێتابوشــتانە ڕۆیشت.
(ألخَوزَلــي والخَيزَلي): ڕۆیشــتنێكی گرانو بەلەقەلەق.
٥-(إخْتَزَلَ- هُ): خەوشــی لێگرتو تەشــەری لێدا.
خزم: ١-(خَزَمَ اللآلِئَ. خَزماً): مرواریيەكانی هۆنیەوە.
(خَــزَمَ وخَزَّمَ- البَعيرَ): ئەڵقەی كردە لووتی حوشترەكەوە.
(«خَــزَمَ- أنْــفَ فُــلان» و «جَعَــلَ في أنْفِهِ الخِزامة»): ١-لووتەوانەی كردە لووتی ٢-كنری كردە لووتی فلاّن واتا زەبوونو سەرشۆڕیكردو چەوساندیەوە.
(تَخَــزَّمَ- الشَّــوْكُ في رِجلِــهِ): (چقڵەكــە/ دركەكە) بە پێیدا چوو/ تێیچەقی.
(ألخَــزَم (ن): درەختێكــە لــە توێكڵەكــەی گوریسو پەت دروستدەكرێت.
(ألخِــزام): قوڵفەیەكــە دەكرێتــە لووتــی حوشترەوەو ڕەشمەكەی پێوە بەند دەكرێت.
(ألخِزامَة = ألخِزام): قوڵفەی لووتی حوشتر.
(خيزامَــةُ النَّعــلِ): قایشــێكی تەنكــە كە

ئەملاولاو قایشی پچڕاوی سۆلەکە بەیەك دەگەیەنێت.
(اَلمَخـزوم- مِنَ الشُـرُك): قایشی پچڕاوی سۆل.
٢-(خـازَمَ- هُ الطَريقَ. مُخازَمَـةً): بە دوو ڕێگەی بەیەکگەیشتنی یەکتردا ڕۆیشتنو لە شوینێکدا یەکتریان گرتەوە.
(تَخازَمَ- الجَيشانِ): دوو سوپاکە بەرەنگارییەکبوون.
(اَلمَخرَم (ج) مَخازِم): ڕێگەی ناوشاخ.
٣-(اَلأَخْزَم) (ح): نێرەمار.
(اَلخُزامـى) (ن): گوڵەلالـە/ گوڵەخازێـم/ بەرزەلنـگ. گوڵێکـە لە کۆمەڵـەی زەمبەقە پیـازدارە. گوڵەکەی زۆر جـۆرەو زۆر ڕەنگی هەیە. هۆڵەندە پێی بەناوبانگە.
(اَلخُزامى والخَزام): گوڵە سمڵ/ (ن) هەلاڵە. گوڵێکە بۆنی زۆر خۆشە عەتری لێدەگیرێت.
خـزن: ١-(خَزَنَ واختَـزَنَ- المـالَ خَزْناً): دارایی کۆکـردەوەو عەماریکرد/ کەڵەکیکرد/ گەنجینەیکرد.
(- السِـرَّ): نهێنییەکەی پۆشـی/ شـاردەوەو نەدرکاند.
(- اللِسـانَ): زمانـی خـۆی بەسـت/ زمانی پاراست.
(أَخْـزَنَ): دارابـوو/ دەوڵەمەند بـوو کە لە پێشدا هەژار بوو.
(إِستَخْزَنَ- المالَ): سامانو دارای گرد کردەوەو عەمارکرد/ گەنجینەیکرد.
(- هُ المالَ): داوایلێکرد داراکە بخاتە عەمارەوە/ گەنجینەیبخات.
(اَلخـازِن (فـا) (ج) خَزَنَـة و خُـزّان): ١-گەنجینەوان/ عەمارکەر ٢-زمان.
(خازِنُ الأَمير): گەنجینەوانی میر/ کلیلداری مـیر/ کە ئاگـای لە داراکە دەبێتو بوویشـی بەختدەکات.
(اَلخَزَنَـةُ): سـامانو دارای گەنجینەکـراو/ عەمارکراو.
(اَلخَـزّان): ١-زمـان ٢-تانکیئـاو/ عەمـاراو/ ئەسـتێڵ/ ئـەوەی کـە ئـاوی تێـدا عەمار دەکرێتو ڕادەگیرێت.
(اَلخَزينَـة (ج) خَزائِـن)= اَلخَزْنَـة): گەنجینەکراو.
(اَلخَزينَة والخِزانَة (ج) خَزائِن): گەنجینە/ عەمار.
(اَلخِزانَـة): گەنجینەداریی/ گەنجینەکاریی/ عەمارکاریی/ گەنجینەوانیی.
(اَلمَخزَن (ج) مَخازِن): گەنجینە- عەمار.
(مَخزَنُ البِضاعَة): عەماری کەلوپەلو کاڵای بازرگانیی.
٢-(خَـزَنَ و خَـزِنَ وخَزُنَ- اللَّحْـمُ. خَزْناً و خُزُونـاً و خَزَنـاً و خَزانَةَ): گۆشـتەکە بۆگەنیکرد.
(خَزين): گۆشتی بۆگەن.

٣-(إِخْتَزَنَ- الطَّريقَ): نزيكترين ريگەيگرت.
(مَخـازِنُ الطَّريـقِ): كورتترين رێ بۆ ئەو شوێنەی نیازە.
خزا: (خزا- هُ. خَزْواً): ١-راميكردو خستيە ژێر ركێفی خۆیەوە/ بەسەریدا زالبوو ٢-نەیهێشت بگاتە ئارمزووەكانی وە بوو بە ناحەزیو دوژمنایەتیی لەگەڵدا كرد.
(خزا- الدابَّةَ): چوارپێكەی رامكردو راهێنا.
خزي: ١-(خَزِيَ. خِزياً و خَزىً): ١-سەرشۆرو رسوا بوو ٢-تووشی وەیو ناوزڕانێكبوو بەوە رسواو سەرشۆڕ بوو.
(خَزَى- هُ خَزْياً): سەرشۆڕو سووكيكرد/ ئابڕويبرد ٢-لەو سەرشۆڕترو ئابڕوچووترو رسواتر بوو ٣-پاشەڵی هەڵماڵیو ئابڕويبرد.
(خـازى- هُ مُخازاةً): تووشی ئابڕوچوونو رسوايیكرد.
(أَخْزى- هُ إخزاءً): ١-سەرشۆڕيكردو تووشی ئابڕوچوونيكرد ٢-سووك/ رسوايكرد.
(أَلخِزيُ): ١-سەرشۆڕيی ٢-سوكی ٣-ئابڕوچوون ٤-سزا.
(أَلخِزيَـةُ والخَزْيَـةُ): ١-وەی/ چورتـوم ٢-پووشتی خەسڵەتێكو رەوشتێك كە مرۆڤی پێ سووكو رسوا ببێت.
(أَلمَخـزاة): هـۆی سـوكیی/ رسـوابوونو سەرشۆڕيی.
٢-(خَـزِيَ- هُ و مِنـهُ. خَزايَـةً و خَـزىً): شەرمی لێكرد.
(خَـزِ (م) خَزِيَـة و خَزْيـان (م) خَزْيـاء (ج) خَزَايا): شـەرمكەر/ بەشـەرمو خەيا/ شەرمن.
(إِستَخزى): شـەرميكرد. لە تەريقيدا ژنەكە خۆی شاردەوە/ خۆی داپۆشی.
٣-(أَلخِزي): دووريی ٢-رسـوايیو سـووكيی ٣-سەرشۆڕيی ٤-ئابڕووچوون ٥-سزا.
خس: ١-(خَسَّ. خَسَاسَةً و خُسُوسَةً و خِسَّةً): ١-رسوابوو/ سووكبوو/ ترۆ بوو ٢-بێبەها بوو.
(-فُـلانٌ. خِسَّـةً و خَساسَـةً): فيسـار دەروونسووكو هيچو پووچ بوو/ بێبەها بوو.
(خَسَّ وخَسَّـسَ- نَصيبَهُ: خَسّاً): بەشەكەی هيچو پووچو بێبەها كردو زۆر كەمبوو.
(أَخَـسَّ): كردەوەيەكـی ناشـيرينو رسوايانەيكرد.
(أَخَسَّ- هُ): ١-بە رسـواو سوكی هاتە بەرچاو ٢-ئابڕويبردو سوكيكرد/ بێڕێزيكرد.
(إِسـتَخَسَّ- هُ): بـە رسـواو سـووكيدانا ٢-رسوايكردو ئابڕويبرد/ بێڕێزيكرد.
(أَلخَسِـيس (ج) أَخِسَّـة و خِسـاس): ئابڕووچوو/ رسـواو سـووك، حيز/ پووشت/ سەرشـۆڕ، بێناموس، هيچو پووچ، بێبايەخو نزم، نامەرد، ناڕەسـەن/ بێڕێز/ نەويستراو/ پەركراو.
(أَلخَسيسَـةُ (ج) خَسـائِس): مێـی وشـەی

(ألخَسيس)
(خَسائِسُ ألأُمُور): كارى (سووكو رِسوايى/ هيچو پووچ) كارى بێبايەخ.
(ألخُساس والمَخسوس- مِنَ الأشياء): شتە سووكو بێبەهاو نەويستەكان.
٢-(خَسَّ. خَساسَةً و خُسُوسَةً و خَسَّةً): كێشى كەميكرد يان پايەو پلەى نزمبووەوە.
(خَسِيس (ج) خِسَاس وأَخِسَّة): پايەنزم يان سەنگسووك.
(أَخَسَّ- حَظَّهُ): ١-لە بەختى كەمكرد ٢-كەمبەهرەيكرد ٣-كەمبەشيكرد.
(ألخُساسَة): ماڵێكى كەم/ داراييەك كەم.
٣-(تَخاسّوا- الشَيءَ): شتەكەيان دەستاودەستكردو زوو بۆيچوون.
(ألخِساس): ئەوەى كە خەڵك دەستاو دەستى دەكەن پێوەى خەريكدەبن.
٤-(ألخَسّ) (ن): كاهوو.
(خَسُّ الحِمارِ و خَسُّ البَقَرِ) (ن): كاهووە كەرانەو كاهووە مانگايانە دوو گياى دەشتەكين.
(ألخُسَّان (فك): ئەو ئەستێرانەى كە ئاوا نابن، وەك حەوتەوانە.
خسأ: ١-(خَسَأَ- الكَلْبَ. خَسْأً): چغەى لە سەگەكە كرد/ سەگەكەى دەركرد.
(خَسَأَ و خَسِئَ و انْخَسَأَ – الكَلْبُ خَساً): سەگەكە چغەى لێكراو دوورخرايەوە.
(خاسَأَ و تَخاسَأَ القَومُ مُخاسَأةً و تَخاسُؤاً): خوێشگەل يەكتريان بەردەبارانكرد/ بەرديان گرتە يەك.
(ألخاسِئُ- مِنَ الخَنازيرِ والكِلاب): بەرازو سەگە دوورخراوەكان، كە ناهێڵن توخنى مرۆڤ بكەون.
٢-(خَسَأَ- البَصَرُ. خَسْأً و خُسُوءً): چاوەكە ماندوو بێهێز بوو.
٣-(ألخَسِيء): خوريى يان شتى وەهايترى خراپ.
خسر: ١-(خَسِرَ. خَسْراً و خُسْراً و خُسُراً و خَسَاراً و خَسارَةً و خُسْراناً و خَسَراً): ١-زيانيكرد/ زيانى لێكەوت، دۆراندى ٢-گومرابوو/ رێى هەڵەكرد ٣-فەوتا/ مرد.
(خاسِر و خَسِير و خَيسَرى): ١-زيانكردوو ٢-دۆڕاو ٣-گومرا/ رێهەڵەكردوو ٤-فەوتاو.
(خَسِرَ- المالَ. خَسْراً و خُسراناً): داراكەى/ سامانەكەى (لەدەستچوو/ لەدەستدا/ زيانكرد).
(خَسَّرَ- هُ): ١-زيانى پێگەياند/ زيانى لێدا/ لەدەستى چواند ٢-گومرايكردو فەوتاندى.
(أَخْسَرَ- هُ): زيانى (پێگەياند/ لێدا)/ لەدەستى چواند گومرايكردو فەوتاندى.
(- الرَجُلُ نَفْسَهُ): خۆى بە دۆڕاندندا/ زيانى بە خۆى گەياند ٢-خۆى گومرا كردو فەوتاند.

(ألخاسِـــر (فا): زيان لێكەوتـــوو/ زيانكردوو- دۆڕاو.

(كَــرَّةٌ خاسِــرَة): هێــرش و پەلامارێكــى سەرنەكەوتوو/ بەزيان/ بێئەنجام و كەڵك.

(ألخَنْسَر والخَنْسَرِيّ (ج) خَناسِرَة): كەسێكە كە لەبەر زيانبەركەوتن و دۆڕاندندا بێت.

٢-(خَسَـــرَ- الميـــزانَ. خَسْـراً و خُســـراناً): ترازووبازييكرد/ كەمفرۆشييكرد/ سەنگەكەى كەمبوو.

(أخْسَرَ- الميزانَ): يارييى بە ترازووەكەيكرد و كەمفرۆشييكرد.

خسع: (خُسِــعَ – عَنهُ كذا. خَسْعاً): ئەوەى لێدوور خرايەوە و لێلابرا.

ألخَسِع (عامية): لاواز- بێبڕشت.

(خاسِــعُ وخَســيعَة القَــومِ): ڕســواترين و سووكترينى ناو خوێشگەل.

خسف: ١-(خَسَفَ- القَمَرُ خُسوفاً): مانگگيرا/ ڕووناكيى برا.

(خُسوف القَمَر): مانگگيران.

(خَسَــفَ- المَــكانُ): شــوێنەكە ڕۆچــوو/ بە قوواتدا چوو.

(- فُــلانٌ في الأرضِ): فيســار لــە زەويەكەدا ونبوو.

(- تِ العَينُ): چاوەكە كوێر بوو/ پووكايەوە.

(- العَينَ): چاوەكەى دەرهێنا.

(- اللهُ الأرضَ): خــودا زەويەكــەو ئــەوەى بەسەريشــيەوە بــوو بــە ناخيــدا بــردو ڕۆيچوواندن.

(- اللهُ الأرضَ بفُــلان): خــودا فيســارى بە ناخيزەويدا برد.

(خُسِــفَ- الرَجُــلُ بــالأرض): پياوەكــە لە زەويەكەدا ونبوو.

(أخْسَـــفَ وانْخَســـفَ- تِ الأرضُ): زەوييەكە بەوانەيشەوە كە بەســەريەوە بوون ڕۆچوو/ بەقووتدا چوو/ بەناوداچوو.

(- ت عَينُهُ): چاوى كوێر بوو.

(ألخاسِف (ج) خُسف) (فا): ١-ڕۆچوو/ ونبوو ٢-چاوى بە قووڵدا چوو، پووكاوە.

(ألخَســيف- مِنَ العُيون): چــاوى پووكاوە/ بەقووڵدا چوو.

(ألخَسْــفَةُ- مِــنَ الأرض) (عاميــة): زەويى نيشتوو/ تەپيو/ ڕۆچوو.

(ألأخاسِف والأخاسيف): سستەكە زەوى.

٢-(خَسَـــفَ- السَّقفُ. خُســوفاً): بنميچەكە كەوت/ تەپى.

(أخْسَـــفَ وانْخَســـفَ- تِ البِئــرُ): چاڵاوەكە تەپى.

٣-(خَسَفَ- الشَيءَ. خَسْفاً): ١-شتەكەى بڕى، قڵيشاند ٢-لەتكرد.

إنخَسَفَ: ١-قڵيشا ٢-لەتبوو.

(- البِئــرَ): تاوێــرى ناوبيرەكەى قڵيشــاندو شكاند. ئاوێكى هەميشەيى لێدەرپەڕى.

(اَلخَسْف): دەمی چالاّویّکی بە ئاو/ سەرچاوەی چاولاّویّکی بە ئاو.

(اَلخَسِيف (ج) أَخْسِــفَة وخُسُف. والخُسُوف (ج) خُسُــف – مِــنَ الآبــار): بیریّــك كە لە تاویّردا هەلّكەندرابیّتو هەمیشە ئاوبیّت.

(- مِنَ النُّوقِ): میّحوشتریّکی زۆر بەشیر ە لە زستاندا زوو وشکبکات.

(- مِــنَ السَّــحاب): هەوریّك كە ئــاوی زۆر هەلّگرتبیّت.

٤-(خَسَفَ- الشيءُ): شتەکە کەمیکرد.

(- الرَّجُلُ): پیاوەکە لاواز بوو.

(اَلخَسْف): کەمبوون/ کەمکردن.

(«باتوا على الخَسْــفِ»): بیّشیوو بیّخواردن سەریاننایەوە.

(«شَــرِبنا على الخَســفِ»): بەسکی برسیّتی خواردمانەوە.

(اَلخاسِــف (ج) خُسُــف): ١-لاواز ٢-پیاوی لە نەخۆشیی تازە هەستاو ٣-برسی.

٥-(خَسَفَ- فُلاناً. خَسْفاً): سەرشۆڕو ناچاری شتیّکیکرد كە خۆی نەیدەویست.

(اَلخَسْف): سەرشۆڕیی‌و سووکیی٢-شەرمەزاریی‌و پووشتیی‌و ئابرووچوون.

(اَلخَسْــف وأَلخُسْــف): ســەرپیّدانەواندن/ سەرپیّشۆڕکردن. ناچارکردنی شتیّك كە خۆی نەیەویّت.

(«ســامَهُ الخَسْفَ و سامَهُ خَسْفاً و خُسْفاً»): تــالاّوی سەرشــۆڕیی‌و ســووکیی پیّنۆشــی‌و باریگرانی پیّهەلّگرت.

٦-(اَلخَسْف والخُسْف): گویّز.

(اَلخُسفَة): گویّزیّك كە بخوریّت.

خسق: (خَسَقَ- السَّــهْمُ. خَسْقاً و خُسُوقاً): تیرەکە تەواو نەچەقی.

(اَلخَسَّاق): درۆزن.

(اَلخَسَقات): پەشیمانی‌و بادانەوە.

(«هُــوَ ذو خَسَــقان في البَيعِ»): لــە کڕین‌و فرۆشــتندا بادەداتــەوەو پەشــیمانیهەیە/ پاشگەز دەبیّتەوە.

خسل: (خَسَلَ- هُ. خَسْلاً): ڕسواو بیّرِیّزیکردو دەریکرد.

(اَلخِســالَة والخُســالَة): (گەنــدە/ خراپ)ی هەموو شتیّك.

(اَلخَسِــيل (ج) خِســال و خَســائِل): دارِزاو ٢-ڕسواو سووك/ بیّبەها.

(اَلخُسَّل والخُسَّال): ڕسواو بوودەلّە/ بیّتوانا.

(اَلمُخَسَّل والمَخْسُول): سەرشۆڕکراو/ ڕسواکراو/ شکیّنراو/ سووککراو/ بیّتواناکراو.

خسى: (خاسَى وأَخْسى و خَسَّى –هُ. مُخاساةً و إِخْســاءً و تَخْسِــيَّةً): بە گویّزیاری لەگەلّدا کرد. یەکیەك یان جووتە جووتە.

(اَلخَسا (ج) اَلأَخاسي): تاك.

خَــشّ: ١-(خَشَّ- زَيداً . خَشّــاً): تیغیّکی بە زەیدا کرد.

(- فيهِ): تێچوو/ پێیداچوو.
(- البَعيرَ): چیلکەی بە لووتی حوشترەکەدا کرد.
(إنْخَشَّ- فيهِ): تێچوو/ پێیداچوو/ ڕۆیشتە ناوەوە.
(- بَينَ القَومِ): خۆیکرد بە ناو خوێشگەلداو ونبوو.
(ألخَش) (مص): درزی شتێك.
(ألخِشاش): چیلکەی ئێسکی لووتی حوشتر کە بە لووتیدا دەکرێت.
(خِشاشَة (ج) أخِشَّة): چیلکەیەکە دەکرێت بە ئێسکی لووتی حوشتردا.
٢-(خَشَّ- الرَجُلُ. خَشّاً): تێپەڕیو خۆی بەناودا کرد.
٢-(ألمِخَش): ١-بێباك/ بوێرو لە کاردا بە هەڵمەت ٢-ئەسپی ئازاو بە هەڵمەت.
(ألخُشاش): ئازا/ دلێر/ بوێر/ نەبەرد.
٣-(خَشَّ- السَّحابُ. خَشّاً): هەورەکە ڕشێنەیکرد/ بارانێکی کەمی هێناو باراند.
(ألخَش): ڕشێنە باران/ بارانێکی کەم.
٤-(ألخَش): ١-شتی زبر ٢-پیادەڕەو.
(ألخُشّ): گرد/ تەپە.
(ألخاشّ): پیادەیەك.
(ألخُشَاش): خراپ/ بەد.
(ألخَشاش. ألواحدة خِشاشَة (ج) بأخِشَّة) (ح): ١-مۆریانی زەوی و چۆلەکەو ئالەوانە ٢-(ح) ماری کێو ٣-ڕق/ تووڕەیی.
(«حَرَّكَ خِشاشَهُ»): تووڕە بوو.
(خِشاشا- الشيءِ): ئەمـلاو لای شـتەکە/ هەردوو تەنشتی شتەکە.
(ألخَشّاء (ج) خَشّاوات وخَشاشِيّ): زەویی بەردین و قوڕین.
(ألخُشّاء): ئێسقانی بەرزەوەبووی پشتگوێ کە دوانن.
٥-(خَشْخَشَ و تَخَشْخَشَ- السلاحُ أوِ الحُليُّ. خَشخَشَةً): تەقەی چەك هات یان زرنگەی خشڵ هات کاتێك بەریەك کەوتن.
(- فُلانٌ بَينَ الشَّجَرِ أوِ القَومِ): فیسار خۆیکرد بەناو دارەکاندا یان خوێشگەلداو ونبوو.
(ألخَشخاش) (ن): خاشخاش.
خَشْخاشَة (ن): خاشخاشێك: ڕووەکێکی گیاییە قاشی سپی دەگرێت کە خەوهێنەرو سڕکەرە.
(-) (ن): ڕووەکێکە گیاییە لە ئەمەریکاوە هاتووەو گەلاپانە. بەرەکەی بە کوڵاوی دەخورێت. چێژی وەك چێژی کاڵەکە. لە وڵاتە گەرمەکاندا دەروێنرێت وەك میسر.
خشب: ١-(خَشَبَ- الشَيءَ: بالشَّيءِ. خَشْباً) (ضد): ١-شتەکەی تێکەڵی شتەکەیتر کرد ٢-شتەکەی لە شتەکەیتر جیاکردەوە.
(ألمَخشوب): شتی ئاوێتەی بە ئەندازە.
٢-(خَشَبَ- الشَيءَ. خَشْباً) (ضد): شتەکەی

هەڵبژارد. شتەکەی هەڵنەبژارد.
(اَلخَشِــیب (ج) خُشُــب وخَشـائِب- مِــنَ السیوف): شمشێری هەڵبژاردە.
٣-(خَشَــبَ- السَّیفَ. خَشْــباً): شمشێرەکەی سافو لووسکرد.
(تَخَشَّــبَ السَّیفَ): شمشــێری سافو لووسو تیژی بەدەستەوە گرت.
(إخْتَشَبَ السَّــیفَ): شمشێری سافو لووسو تیژی بە دەستەوە گرت.
اَلخَشْب: تیژ.
(اَلخَشــیب (ج) خُشُــب وخَشـائِب- مِــنَ السُّیوف): شمشێری سافو لووسکراوو.
(- مِــنَ القِسِــيّ): لێهەڵکەنــراو داخــوراو/ خراپ.
٤-(خَشَبَ- الكلامَ والعَمَلَ. خَشْباً): قسەکەی نەرازانــدەوەو نەپێــکا، کارەکــەی (چــاك دانەمەزراند/ نەسازاند/ باش نەکرد).
(خَشَبَ واختَشَبَ- الشِـعْرَ): هەڵبەستەکەی بێچاککردنو هەرەمەکیی دانا.
(اَلخَشــیب (ج) خُشُب وخَشـائِب): خراپ/ ناتەواو.
(- مِن السُّــیوف): شمشــێری تازە داڕێژراوو لووسو ساف نەکراو.
(اَلمَخشــوب): ١-بــاش نەچەســپاوو نەکــراو ٢-ئەو کەسەی باش فێرو پەروەردە نەکرابێت/ مرۆڤی شڕو دڕ.

٥-(خَشُبَ- الشيءُ): وەك دار ڕەقو زبر بوو.
(تَخَشَّــبَ): لــە لەوەڕگاکــەدا پــووشو وشکەوەبووی خوارد.
(إخْشَوشَــبَ): لە ڕەوشو ڕەفتــاردا وەك دار سەختبوو.
(- في عَیشِــهِ): بەرامبەر سەختییو ڕەنجی ژیان پتەو بە ئارامبوو.
(اَلخَشَــب (ج) خَشَــب و خُشُــب و خُشْبْ و خُشْــبَان): تەختــە، دار ٢-(ز) بەشــی ڕەقی رووەك چ لە قەددداو چ لە ڕەگەکانداو چڵدا.
(اَلخَشَــب الوردي) (ز): تەختەی گوڵێن (ز) ئەمــە زۆر جۆری تەختەو دار دەگرێتەوە کە بە نرخــنو وەك (جاکەرەنــدە) کە بەرازیل بەرهەمیدەهێنێت.
(اَلخَشِبِ والأخْشَب): ڕەق/ سەختو ئەستوورو زبر.
(عَیــشُ خَشِــبٌ): ژیانی ســەختو پــڕ لە کوێرەوەرییو ناڕێك.
(اَلخَشیب): درێژی ڕەقەڵەی ئێسکدەرپەڕیو.
(«جَمَلٌ خَشِــیب»): حوشــترێکی ڕەقەڵەی ئێسکدەرپەڕیو.
(اَلخَشّــاب (ج) خَشّابَة): ١-دارو تەختەفرۆش ٢-دارکەر.
(اَلمِخْشَاب): کورتەی ئەندامئەستوور.
(اَلخَشْــباء): زەوییــەك ڕەقــەنو چەولگو بەردەڵانیو قوڕینبێت.

خشـــر: ١-(خَشَرَ): پاشــماوەی خواردنەکەی لەسەر خوانەکە هێشتەوە.

(- الشــيءَ): شــتەکەی لە پاشــماوەو گەندە پاککردەوە.

(خَشِرَ. خَشَراً): چلێسیکرد/ زۆر خۆرییکرد.

(اَلْخُشَــار والخُشارَةِ): ١-پاشــماوەی خواردنی ســەرخوان ٢-گەندەی هەموو شــتێك ٣-جۆی پووچــەك ٤-سەرســەری‌و ڕســواکانی (نــاو کۆمەڵ/ خەڵك).

(اَلخاشِــر الواحِدَةُ خاشِرَة): پوشت‌و سووکی ناو خەڵك/ خەڵکانی نزم‌و ڕسوا.

(خاشِــرَةُ الناس): خەڵکی پوشــت‌و نامەردو سووك.

٢-(خَشِرَ. خَشَراً): زیرەکردو هەڵات.

٣-(خَشْــرَمَ- تِ الضَّبــعُ): کەمتیارەکــە مرقەمرقی خواردنی بوو.

(اَلخَشْرَم (ج) خَشارِمَة): ١-کووره هەنگ یان کووره زەردەواڵەو زەردەزیرە ٢-(ج) شاهەنگ ٣-کــووره هەنــگ ٤-بەردیی نەرم کــە بەردە گەچەو بە گەچ دەکرێت.

(اَلخُشارِم): ١-لووتیزل ٢-دەنگیبەرزو قەبە.

خشــع: ١-(خَشَــعَ- لَهُ. خَشُــوعاً): ســەری ملکەچیــی‌و زەبوونــی بەرامبەر پیشــانداو نەویکرد.

(خُشــوع): ملکەچیــی‌و ســەربۆدانەواندن‌و کورنووشبردن.

(خاشِــع (ج) خُشَّع و خَشَــعَة وخاشِعُون): ملکــەچ/ ســەربۆدانەویوو و خۆبەکەمزان‌و زەبوون/ کورنووشبەر.

(خَشَعَ- بَصَرُهُ): چاوی داخست‌و چاوی شۆڕ بوو.

(- بِبَصَرِهِ): چاوی دانەواند/ داخست/ چاوی شۆڕکرد.

(- الصَّوتُ): دەنگەکە کپبوو/ بڕا.

(اَخْشَعَ- هُ): سەری پێدانەواند/ ملکەچیکرد/ سەرشۆڕیکرد.

(تَخَشَّعَ): لاڵایەوە/ پاڕایەوە/ کرووزایەوە.

(تَخَشَّــعَ و تَخاشَعَ): بە درۆ سەری نەویکردو پاڕایەوە.

(إِخْتَشَــعَ- لَهُ): خۆی بە دەستەوەداو سەری بۆ دانەواند.

٢-(خَشَعَ- تِ الشَّمسُ خُشُوعاً): خۆر داکەوت خەریکی ئاوابوونبوو.

(- الوَرَقُ): گەڵاکە سیسبوو.

(- تِ الأَرضُ): زەویەکە وشکەڕۆی گەیشتێ‌و بارانی لێنەباری.

٣-(اَلخُشْعَةُ (ج) خُشَع): گردۆڵکە.

(اَلخِشعَةُ): بەچکەی زیندووی ناوسکی ولاخی مردارەوەبوو. ناوسکەکەی هەڵدەدڕن‌و بەچکە زیندووەکەی لێدەردەهێنن.

(مَکانٌ خاشِــعٌ): شــوێنێکە/ پەی پێنابەن/ پێینازانن.

(جدارٌ خاشِع): ديواری تەختبوو.

(بَلْدَةٌ خاشِـعَة): شـارێكی كاولە كە خانووی بەپێوە نەمابێت.

(ألخاشِع): بە چۆكدا هاتوو/ كورنووشبردوو.

خشـف: ١-(خَشَفَ. خُشـوفاً و خَشَـفاناً): بەزەویەكەدا ڕۆیشتو دیار نەما.

(- خَشَفاناً): بەشەو ڕۆیشت.

(خَشَـفَ وانخَشَـفَ- في الشـيءِ): چووە ناو شتەكەوە.

(ألخَشـوف): ١-كەسـێكە خـۆی دەهاوێتـە كارێكەوە دەسـتی تێدەنێ/ خۆتێهەڵقورتێن ٢-بوێرێك كە بە شەو بڕوات.

(ألمِخْشَـف = الخَشـوف): كەسـێكە كە خۆی بهاوێتە كارەوە یان بە تاریكە شەو بڕوات.

(ألخُشّاف (ح)= الخُفّاش): شەمشەمەكوێرە.

٢-(خَشَفَ- في السَّيرِ. خَشْـفاً و خَشَفَةً): لـە ڕۆیشتنەكەدا پەلەیكرد/ خێرایكرد.

(خاشَـفَ- إلى الشَّرِّ): دەسـتی دایە (خراپە/ بەدیی).

(سَيفٌ خاشِف): شمشێرێكی تیژی بڕەر.

(ألخَشُـوف- مِنَ الرِجَال): پیـاوی چابوك/ گورج/ ئازا.

(- مِنَ السُّيوف): شمشێری تیژو بڕەر.

٣-(خَشَـفَ- البَـردُ خُشُـوفاً وخَشَـفاناً): سەرماكە تیژ بوو.

(- الماءُ): ئاوەكە بەستی.

(مـاءٌ خاشِـفٌ و خَشْـفٌ): ئاوی بەسـتوو/ سەهۆڵ.

(ألخَشَف والخَشـيف): ١-بەفری كولوو گەورە ٢-نیمچە بەستوو.

(ألمَخْشَف): بەستگە.

٤-(خَشَفَ- بالقَوم. خَشافَةً): خوێشگەلیبردو ڕانومایكردن.

(خَشَّفَ): ڕێگەی پیشاندا/ ڕانومایكرد.

(ألمِخشَف): ڕێپیشاندەر.

٥-(خَشَـفَ-الجليدُ. خَشْـفاً و خَشَـفَةً): بەفرەكە كە بە سـەریدا ڕۆیشتن كرپەیكرد/ كرپەیهات.

(خاشَـفَ- السَّـهمُ): تیرەكـە كـە پێـكای خرچەیهات.

(ألخَشْف والحَشْفَةُ والخَشَفَةُ): ١-دەنگ، كرچە/ خرچـە/ كرپە ٢-جووڵەو هەسـتپێكردنێكی نادیار.

٦-(خَشِـفَ- البَعيرُ. خَشَـفاً): گەڕیی لەشی حوشترەكەی گرتەوە.

(أخْشَـف (م) خَشْفاء (ج) خُشْف): حوشتری گەریگرتوو/ گەر.

٧-(أخْشَفَ- تِ الظَبيَةُ): ئاسكەكە كارمامزێكی تازە ساوای بوو.

(ألخِشْـف والخَشْف والخُشْـف (ج) خِشفَة): كارمامزی تازە ساوا/ تازەبوو.

٨-(ألخَشْف): سەرشۆڕیی و زەبوونی.

(أَلخِشْف والخُشَف (ح):

(خُشْفَة) (ح): مێشە سەوزمیەك.

(أَلخِشَــاف) (ط): شــەربەتیمێوژ کــە نانی پێوەبخۆن.

(خِشــافُ الرُمّان) (ط): ئاوی هەنار شەکری تێدەکەنو حەڵوای پێدروستدەکەن.

خشــل: ١-(خَشَــلَ- ہُ. خَشْلاً): شــکاندیو سوکیکرد.

(- الشَرابَ): شەربەتەکەی پاڵاوت.

(خَشِلَ- الثَّوبُ خَشَلاً): جلەکە کۆنبوو.

(خَشَّلَ- ہُ): شکاندی/ سووکیکرد/ ڕسوایکردو بێبەهایکرد.

(تَخَشَّلَ): شتێکی خراپو بێکەڵکی هێنا.

(أَلخَشْــل): هێلکــەی بــۆش کــە ناوەکــەی دەرهاتبێت.

(خَشْــلَة): هێلکەیەکــی بۆش کــە ناوەکەی دەرهاتبێت.

(أَلخَشْل والخَشَــلَة الواحِدَةُ خَشَلَة): هەموو شتێکی خراپ/ داڕزاو/ پۆرتکاو.

٢-(تَخَشَّلَ): سەرشۆڕو ڕسوا بوو.

(أَلخَشْل والخَشِل): لاواز/ بێتوانا- بێبڕشت.

(رَجُلٌ خَشْــلٌ فَشْلٌ و خَشِلٌ فَشِلٌ): پیاوێکی بێتوانای سەرنەکەوتوو پیاوێکی بێبڕشت.

٣-(تَخَشَّلَ): دانەوی/ چەمیەوە.

أَلخَشَــل الواحِــدة خَشْــلَة: هەموو شــتێکی بۆش.

خشم: (خَشَــمَ- ہُ خَشْــماً): بنەوەی لووتی شکاند.

(خَشِــمَ خَشَــماً. خَشَماً وخُشــوماً): لووتی فشبوو.

(-الأَنْفُ): بۆنی لووتی (گۆڕا/ ناخۆشبوو).

(خَشِــمَ وأَخْشَــمَ وتَخَشَّــمَ اَللَّحْمُ. خَشَماً): گۆشتەکە بۆنیکرد/ بۆگەنبوو.

(-خُشِّمَ- اللَّحْمُ): گۆشتەکە بۆگەنبوو.

(-الشَّرابُ): بۆنی (خواردنەکە/ شەرابەکە)ی بە لووتدا چوو مەستیکرد/ سەرخۆشیکرد.

(أَلأَخْشَم (م) خَشْماء (ج) خُشم): ١-لووتفش ٢-لووتگیراو کە کەم بۆن بکات.

(أَنْفٌ أَخْشَم): لووت بۆنناخۆش.

(أَلخُشَام): لووتن/ لووتزل.

(أَلخَيْشُوم (ج) خَيَاشِــيم): بێخیلووت/ بنی لووت.

(أَلخَياشِيم): ڕەگی ناو لووت.

(خَياشِيمُ الجبال): لووتە شاخەکان.

خشن: (خَشُنَ. خُشْنَةً وخَشَانَةً و خُشُونَةً و مَخْشَنَةً): ١-زبر بوو ٢-ڕەقبوو/ دڕ بوو/ توند ڕەفتار بوو.

(خَشِن) (ج) خِشان: ١-زبرو ڕەق ٢-دڕ ٣-توند ڕەفتار.

(خَشَّــنَ- ہُ): زبــرو ڕەقیکــرد ٢-دڕیکــرد/ سەختیکرد.

(«خَشَّنَ صَدرَہُ»): دڵی (ڕەقو پڕ لە قینکرد/

سەختکرد).

(خاشَن- ُه): لەگەڵیدا ڕەقبینواند.

(تَخَشَّـنَ): ١-تەواو ڕەقو توند بوو ٢-ژیانێکی سـەختو تاڵ ژیا ٣-بەرگێکی زبری پۆشی ٤-قسە (ڕەق بوو/ نەکوڵوك بوو).

(تَخاشَـنَ): خۆی ڕەق پیشـاندا- شتی ڕەقو زبری هێنایە پێشو دەریخست.

(إِسْتَخْشَـنَ- الشيءَ): شـتەکەی (بە زبر بە ڕەق/ سەخت) هاتە بەرچاوو زانی.

إِخْشَوشَنَ: ژیانێکـی سـەختو ناناسان ژیا ٢- زۆر ڕەقبوو.

(«إِخْشَوشَـنوا فَإِنَّ النِعَـمَ لا تدوم»): ژیانی سـەختو ڕەق بژین چونکە ژیانی ناسـانو نەرم تا سەر نابێت (ئەم وتەیە هی حەزرەتی عومەرە).

(أَخْشَوشَنَ- عليه صَدرُهُ): قینی لێهەڵگرت.

(أَلخَشـين): مرۆڤێکی دەروونو ڕەفتار ڕەقو توند/ توند سروشت.

(أَلأَخْشَن (م) خَشْـناء (ج) خُشن): سروشت توند ڕەفتار ڕەق.

(«رَجُلٌ أَخْشَن»): پیاوێکی ڕەوش ناشیرینو گوزەران تاڵ.

(«أَخشَـنُ الجانِـبِ»): هەڵکـردن لەگەڵیدا سەختە/ ستەمە.

(«كَتيبَةٌ خَشناء»): دەسـتە سەربازێکی پڕ چەك.

خشي: (خَشِـيَ- ُه. خَشْياً و خِشْياً و خَشْيَةً و خَشَـاةً و خَشَياناً و مَخْشِـيَةً و مَخْشاةً): ١-لێیترساو خۆی لێپاراست.

(خَشّى- ُه: تَخْشِيَةً و خَشّاءً): ترساندی.

(- ُه فُلاناً): وایلێکرد لێیبترسێت.

(تَخَشّى- ُه تَخَشِّياً): سامیلێکرد/ لێیترسا.

(أَلخَشـي والخاشِي والخَشْـيان والخَشِيّ (م) خاشِـيَة وخَشِـيَة وخَشْـيانَة وخَشْياً (ج) خَشَايا): ترساو/ ترسنۆك/ سام لێنیشتوو.

(أَلأَخْشى): ترساوتر/ ترسنۆکتر/ سامگرتووتر.

(«هذا المكانُ أَخشـى من ذاك»): ئەم شوێنە لەویتر بەسامترە.

٢-(أَلخَشِي والخَشِـيّ- مِنَ النَّبات): ڕوومکی وشکبوو.

خَـصَّ: ١-(خَـصَّ- فُلاناً بالشَّـيء. خَصّاً و خُصُوصاً و خُصوصَةً و خُصُوصِيَّةً و تَخِصَّةً و خِصِّيَّةً خِصِّيصَي و خِصِّيصاء): شتەکەی بـە تایبەتی بـەوداو ئەوی لە پێشـتر گرتو پەسندکرد.

(«خَصَّـهُ بالوِدِّ»): خۆشەویسـتیی تایبەتی دایە/ بە تایبەتی هەر ئەوی خۆشەویست.

(خَصَّ- الشيءُ خُصوصاً): شتەکە تایبەتمەند بوو/ تایبەتیبوو.

(- الشَّـيءَ لِنَفسِـهِ): شـتەکەی بە تایبەتی بـۆ خـۆی هەڵبـژارد/ شـتەکەی بـۆ خۆی تەرخانکرد.

(خَصَّـص- الشَـيءَ): شـتەكەی تەرخـانو تایبەتییكرد.

(- هُ بالشَّيءِ): شتەكەی بە تایبەتی بەودا.

(إخْتَصَّ- بالشَّيء): ١-ئەو شتە ٢بە تەنها هی ئەو بوو. ٢-لەو شـتەدا بە تەنها بۆ ئەو بوو/ ئەو پسپۆڕ بوو- وەستابوو.

(-ه٘ بالشَّيءِ): بە تایبەتی ئەو شتەی بەودا/ تەنها ئەویكرد بە خاوەنی.

(«اللهُ يَخْتَـصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشـاءُ»): خودا دڵنەرمیـی تایبەتیـی بەرامبەر بەو كەسـە دەبێت كە خۆی بیەوێت.

(تَخَصَّصَ- بالشَّـيءِ): لەو شتەدا تایبەتمەند بو/ وەستابوو/ پسپۆڕ بوو.

(- الرَّجُلُ): بوو بە پیاوە تایبەتیەكان.

(إسْـتَخَصَّ- الشَـيءَ): داوایكـرد شـتەكە تایبەتبێت بە خۆی/ بەو.

(ألخاص) (فـا): تایبەتمەند/ تایبەتیی هەر بۆ ئەو یـان ئەوان بێتو كە پێی بناسـرێت ٢-جیاوتاك.

(ألخاصَـة (ج) خَـواص): ١-تایبەتمەنـد/ تایبەتیی ٢-ئەوەی كە بـۆ خۆتی دادەنێیتو تایبەتی خۆتێدەكەیت.

(خاصَّةُ المَلِكِ): پیـاوە نزیكو تایبەتیەكانی شا.

(ألخَواص والخَصّان والخِصّان — مِنَ القَوم): پیاوە مەزن/ كەڵەو پیاوچاكانی میللەت.

(«إنَّما يَفْعَلُ هذا خُصَانُ الناس»): ئەوە هەر لـە پیاوە گەورانو پیاوچاكان دەوەشـێتەوە/ ئەوان دەیكەن.

(ألخاصَّـةُ (ج) خاصِیـات و خَصائِـص): ١-تایبەتمەندیی.

(ألأَخَص): باشترینو تایبەتیترین.

(ألخَصُـوص والخُصُـوص): هەڵبـژاردە/ تەرخانكراو- تاكەو پوختە.

(«لَـم يَكُن في أَطِبّائِهِ أَخَـصُّ مِن هذين»): لەناو پزیشـكەكانیدا لەم دوانەیان باشـتریان نەبوو.

(ألخَصوص والخُصـوص): ١-تایبەتی/ جیا/ تاك پێچەوانەی گشـتییە ٢-پەنگدان/ سنوور بۆدان پێچەوانەی ڕەهاكردن.

(«على الخُصوص خُصوصاً= لاسـيَّما»): بە تایبەتی.

(خُصوصِيَّةُ الإنسـان): ئـەوەی بۆ خزمەتی مرۆڤ تەرخانە.

٢-(خَصَّ. خَصاصَةً و خَصاصاً و خَصاصاء): (هەژار/ نەدارا) بوو/ نەبووبوو.

(إخْتَصَّ): دەستكورت بوو/ نەبوو بوو.

(ألخَصاصَة): هەژاریـی/ نەداراییی/ گوزەران خراپ.

(«سَدَدتُ خَصاصَةَ فلان»): ١-كەمدەستیی/ نەدارایی فیسارم بڕیو نەمهێشت ٢-پێویستیم لابرد.

٣-(أَلْخُـص (ج) أَخْصَـاص و خُصُـوص و خِصَـاص): ١-كەپرەخانوو كە بە قامیش یان پەلیدرەخت دروسـتدەكرێت/ قوڵغ/ كۆختە ٢-مەیخانە.
(أَلخِصّ): ناتەواو/ كەموكوور.
(«شَهرٌ خِصٌّ»): مانگێكی ناتەواو/ كوڵەمانگ.
(خاصَـةُ- النَّبـات): هێز/ گوڕو شـكۆفەی رووەك.
(أَلخُصاصَة (ج) خُصَاص): ١-پاشـەرۆی رەز پاش رنینی رەزەكە ٢-شتێكی كەم.
(أَلخَصـاص (الواحدة خَصاصَـة): كون یان درز یـان كەلەبەر/ دەلاقە/ كەلێن لە دەرگادا یان لە شتو شوێنیتردا.
(«بدا القَمَرُ مِن خَصاصِ الغَیم»): مانگ لە درزی هەورەكەوە دەركەوت.
(«لَمَحْتُـهُ مِن خَصَاصِ البـاب»): لە درزی دەرگاكەوە چاومكرد/ دیم/ بەدیمكرد.
(أَلخَصـاص): درزو كەلەبەری دیوارو خانەو شتی لەو بابەتە.
الملحق:
خـص: ألإختِصاص (مـص): ١-پسـپۆریی ٢-خۆتەرخانكردن تەنها بۆ كارێك.
(«لیـس هـذا مِـن إختِصاصـي»): ئـەوە شـارەزایی من نییە/ تیایدا پسپۆر نیم ٢-خۆ تەرخانكردن بۆ لكێكی زانستی یان زانیاریی.
(ألإختِصـاص في القَضـاء): دەسـەلاتی تایبەتـی وەرگرتن لە دادوەریداو دەسـەلاتی تەماشاكردنو بڕیاردان لەسەر داواكان.
(إختِصاصُ مَحْكَمَة): دەسەلاتی دادگا.
(أَلتَّخَصُّـص): ١-پسـپۆڕبوون/ تەرخانبوون ٢-بۆ شـتێك لێكۆڵینـەوەو تۆژینەوەی لكێكی زانستیو زانیارییو رەنجتیادانی.
(أَلبَحـثُ العلمـي يَتَطَلَّـبُ التَخَصُّـص): تۆژینـەوەی زانسـتی دەبێـت بـە تایبەتیی خۆتی بۆ تەرخان بكەیت/ ئەوە پێویستی بە پسپۆریی هەیە.

---

خصب: (خَصَبَ و خَصِبَ – المَكانُ. خِصباً): ١-شـوێنەكە بە پیـتو فەر بوو ٢-شـوێنەكە سەوزەو گژوگیای زۆر بوو.
(خَصِب و خَصیـب و مُخْصِب و مِخْصاب): ١-بەپیـتو بە بژوێـن/ بەبیر/ بە برشـت/ بەپێز.
(أَخْصَبَ- المَـكانُ): شـوێنەكە بەپیتو فەر بوو- سەوزو پڕ گژوگیا بوو.
(أَخْصَـبَ- اللهُ المَكانَ): خودا شـوێنەكەی پڕ پیتو فەرو بێر كرد.
(أَخْصَبَ- تِ الشَـاةُ):مەڕەكە بەری زۆریدا/ بەبەربوو.
(أَخْصَـبَ- القَومُ): خوێشـگەل خێرو بێری زۆریان دەستگیر بوو.
(«أَخْصَبَ جُنابُ القَـوم»): خێرو بێرو فەر لای خوێشگەلی گرتەوە.

(ألخِصْيب (ج) أَخْصـــاب): ١-فەر/ خێروبێر ٢-ســەوزایی زۆر ٣-بژوێنــی چــاك ٣-پیت ٤-گوزەرانی تێرو تەسەل.

(بَلَدٌ خِصْبٌ وأَخْصــابٌ): ولاَتێکی پڕ خێرو بێرو سەوزایی.

(أَرْضٌ خِصْــبٌ وأَرْضُــونَ خَصْــبٌ و أَرْضٌ خِصْبَــة أو خَصْبَــة»): خاکێکــی بەپیــتو بەرەکەتە/ فەروبێری زۆرە.

(ألخِصــاب الواحدة خِصابَــة): دارخورمای پربەر.

(ألخَصيــب): بەپیتو بە برشــت/ فرە بەرو بەرهەم/ بەخێروبێرو بەرفراوان.

الملحق:

خصب: ألإخْصاب) (مص): ١-بوونی سەوزایی زۆر لە شوێنێکدا ٢-شــوێنەکە والێبکرێت بە پیتو بەری زۆر بێت.

(ألإخصاب في عِلمْ الأحياء): لە زیندەوەرزانیدا: کەڵگرتــن/ پیتێن/ تێهەڵکێشــکردنی خانەی نێر لــە خانــەی مێــدا/ یەکپێگرتنی تۆوی نێرومێ.

---

خصر: (خَصِرَ- اليَومُ. خَصَراً): ڕۆژ ســارد بوو/ هەواساردیکرد.

(- الرَجُلُ): سەرما کاریکردە قاچو دەستی.

(أخْصَــرَ- القَــرُّ أنامِلَــهُ): پەنجەکانــی سەرمابردی.

(ألخَصَر): سۆڵە/ سەرما.

(ألخَصِر): سارد.

٢-(خاصَــرَ- هُ مُخاصَــرَةً): ١-لە ڕۆیشــتندا دەستی بە دەستیەوە گرت ٢-شان بە شانی ئەو ڕۆیشت یان دەستی خستە کەمەریەوە.

(تَخَصَّرَ): دەستی بە کەمەریەوە گرت.

(تَخاصَرَ): دەستی خستە سەر کەمەری.

(- القَومُ): خوێشکەل دەستی یەکتریانگرت.

(إخْتَصَرَ- بالعَصا): بەداردەست ڕۆیشت.

(ألخَصر (ج) خُصُور): کەمەر، ناوقەد.

(ألخِصار): ١-پەشتەماڵ ٢-بەرکۆش.

(ألخاصِــرَةُ (ج) خَواصِــر مِــن الإنســان): کەمەر/ ناوقەد.

ألمُخَصَّر: کەمەرباریك.

(رَجُلٌ مَخْصُور): پیاوێکی کەمەر یان غالیگە ژانگرتوو.

(ألمِخْصَرَة (ج) مَخاصِر): ئەوەی کە پیاو خۆی بەسەردا دەداتو پێیدەڕوات وەك داردەستو گۆچان.

٣-(تَخَصَّــرَ- بالمِخْصَــرَة): داردەســتەکەی/ دارحەیزەرانەکەی بەدەستەوە گرت.

(إخْتَصَــرَ- الرَجُلُ): پیاوەکە داردەســتی بە دەستەوە گرت.

(ألمِخْصَــرَة (ج) مَخاصِــر): دارحەیــزەران/ داردەست/ یان شتێکە وەك قامچی/ ئەوەی کە شــا بە دەستیەوە دەگرێتو ئاماژەی پێدەکات کاتێ کە دەدوێت.

٤-(إختَصَرَ- الكَلام): قسەکەی کورتکردەوە.
(مُختَصَر): کورتە.
(- الطَريق): ڕێگە کورتەکەیگرت/ قەدبڕیکرد.
(- فِي الشيءِ): زیادەی شتەکەی لێکردەوەو فڕێیدا.
(أخْصَر): کورتترین (کە ئەمە شازە).
(مَخاصِرُ الطَريق): کورتترینو نزیکترین ڕێگا.
(ألإختصار (ع ح): کورتکردنەوە.
٥-(خَصْرُ (ج) خُصُور القَدَم): سنگیپێ.
(ألمُخَصَّر): سنگپێ ساغ، پێساغ.
هُوَ مُخَصَّرُ القَدَمَين: سنگی هەردوو پێی ساغە واتا تەخت نییەو کە دایدەنێ بۆشایی لە سنگی پێیدا دەبێت.
خصف: ١-(خَصَفَ وأخْصَفَ واخْتَصَفَ- النَعلَ. خَصْفاً): پارچەیەکی تری بە بنی سۆلەکەدا گرتو بە دەزوو سوژن پیایدا درو.
(-الشَيءَ على الشيءِ): دوو شتەکەی پێکەوە نووساندو لەیەکیدان.
(«هُم يَخصِفُونَ أقْدامَ القَومِ بأقدامِهِم»): ئەوان شوێنپێی خوێشکەل هەڵدەگرن. پێ دەخەن سەر شوێنپێیان.
(خَصِفَ- بِهِ): بە ئەندازەی ئەو گیراو پێوەی لکێنرا.
(ألخَصْف (مص): پێلاو.
(ألخَصَف والخَصَفَةُ): پارچەیەکە کە بە پێلاوەکەوە دەدروێت.
(ألخُصْفَةُ): سوژنو دەزووەکەی کە پێوەیدەکەنو پێی دەدروون.
(ألخَصّاف): پینەچی/ پینەدۆز.
(ألخَصِيف): پێلاوی (پارچەلێدراو/ بنلێدراو).
(ألمِخْصَف (ج) مَخاصِف): پینەچی/ پینەدۆز.
٢-(خَصَّفَ): بەدرەوشتبوو.
٣-(خَصَّفَ): ڕەنجێکی ئەوتۆیدا کە لە توانایدا نەبوو/ خۆی زۆر ڕەتاند.
٤-(خَصَّفَ- هُ الشَّيبُ): قژی بۆز بوو/ نیوەی سپیو نیوەی ڕەشبوو.
(ألخَصَف): ڕەنگی ماشوبرنج/ نیوە سپیو نیوە ڕەش/ ڕەنگی بۆز.
(ألخصيف): خۆڵەمێش.
(ألخَصِيف والأخْصَف): ١-ڕەنگبۆز/ ئەوەی ڕەنگی سپیو ڕەشی تێدابێت/ ڕەنگ خۆڵەمێشیی ٢-چارەوێو مەری ناوقەد سپی.
(شاةٌ مَخْصُوفَة): مەرێکە ڕەنگ ڕەشوسپی.
٥-(ألخَصَفَة (ج) خَصَف و خِصَاف): ١-سەبەتەی گەڵادار خورما کە بۆ خورماو شتیتر دەکرێت ٢-بەرگی ئەستوور.
(ألخَصِيف): شیر کە ماستی بەسەردا دەکرێت.

(ألخَصّاف): ١-درۆزن.

خصــل: ١-(خَصَــلَ- الشَــيءَ: خَصْــلاً): شتەکەیبڕیو جیایکردەوە/ کوتکوتیکرد.

(خَصَّلَ- هُ): لەتلەتیکرد/ پارچەپارچەیکرد/ کوتکوتیکرد.

(- الشَّجَرَ): درەختەکەی هەڵپاچی.

(ألخُصْلَةُ (ج) خُصَلْ): ١-کاکۆڵ (قژی کۆمەڵ) ٢-ئەندامێکی گۆشتین وەك گوێ.

(ألخُصَل): پەلە شۆڕەکانی درەخت.

(ألمِخْصَل): شمشێری تیژو بڕەر.

(ألخَصيلَة (ج) خَصيل و خَصائِل): ١-کاکۆڵ/ قژی کۆمەڵ.

(ألمُخْصال): داس.

٢-(خَصَــلَ- القَــوْمَ. خَصْــلاً و خِصالاً): ١-سەرووی هەموو خوێشگەل کەوتو لە هەموان چاکتر دەرچــوو ٢-لە تیرئەندازەیدا بردیەوەو پێشیانکەوت.

(خاصَلَ- هُ. خِصالاً ومُخاصَلَةً): پێشــبڕکێو گــرەوی تیرئەندازەییانکــرد/ گــرەوی نیشانەشکاندی لەگەڵدا کرد.

(أخْصَــلَ- الرامــي): تیرهاوێژەکــە نیشانەیشکاند/ پێکای.

(تَخاصَلَ- القَومُ): خوێشگەل گرەوی نیشانە شکاندیانکرد.

(ألخَصل (ج) خُصُول): ١-نیشانەشــکاندن ٢-بــە ئامانجگەیشــتنو ســەرکەوتن ٣-کارێکی پڕمەترســی کە گــرەوی لەســەر دەکرێت ٤-ئەوەی قوماری لەسەر دەکرێت.

(«أَحْرَزَ خَصْلَهُ وأصابَ خَصْلَهُ»): سەرکەوتو زاڵبوو نیشانەی پێکا.

ألخَصْلَــةُ (ج) خِصــال): مەبەســتپێکان/ بەئامانجگەیشتن.

٣-(ألخَصْلَــة (ج) خِصال): خوو/ ڕەوشــت/ نیشانەی مرۆڤ/ خەســڵەتی باش یان خراپ بە زۆریی بە باش دەوترێت.

(ألخَصْلَةُ والخُصْلَةُ (ج) خُصَل): ١-هێشوو ٢-چیلکەیەکی دڕکاوی ٣-ســەری توولێکی تەڕو نەرم.

(ألخصيلَة (ج) خَصِيل وخَصائِل): گۆشــتی دەماراویی.

(إرْتَعَــدَت فَرائِصَهُ واضْطَرَبَــت خَصائِلُهُ): لە ترســاندا گیانــی هاتە لەرزیــنو دەماری کرژبوو.

خصــم: (خَصَمَ- هُ. خَصْمــاً): لە نەیارییو دوژمنایەتیدا بەسەریدا زاڵبوو.

(خاصَــمَ- هُ): بەگژیدا چوو شــەرە قســەو شــەرە دەنووکــی لەگەڵدا کــرد/ ناکۆکبوو/ نەیارییکرد.

(خِصــام و مُخاصَمَــة): بەگژداچــوون/ ناکۆکیی/ تەیاریی/ دوژمنایەتیی.

(ألخُصُومَــة): ناحەزیــی/ نەیاریــی/ دوژمنایەتیی/ بەگژداچوون.

(أَخْصَمَ- هُ): دۆستەکەی فێری بەڵگە کردو بەو بەڵگەیە نەیارەکەی بەزاندو بەسەریدا زاڵبوو.

(تَخاصَمَ واخْتَصَمَ- القومُ): خوێشگەل نەیارانە چەلەحانێیانکردو بەگژیەکدا چوون/ مشتومڕیانکرد.

(ألخَصم (ج) خُصُوم و خِصام): نەیار/ ناحەز/ چەلەحانێکەر (وشەی (خَصْم) بۆ تاك و دوان و کۆ و نێرو مێ دەوترێت و دەبێت).

(فَيقال): دەوترێت.

(هُما وهُم وهي خَصمي): ئەو دوانەو ئەوان و ئەو ئافرەتە ناحەزمە/ نەیارمە/ ناکۆکیکارە.

(خَصم (ج) أَخصام) (عامية): نەیارەکان ناحەزەکان.

(ألخَصِم (ج) خَصِمون و الخَصوم): نەیار/ ناحەز/ ناکۆکیکار/ بەگژداچوو/ مشتومڕکەر.

(ألخَصيم (ج) خُصَماء و خُصْمان= ألمُخاصِم): نەیاریکار/ ناحەز/ ناکۆکیکەرو چەلەحانیکەر/ مشتومڕکەر.

٢-(ألخُصْم (ج) أَخْصام وخُصُوم): ١-گۆشە ٢-تەنشت ٣-کەنار/ لا.

خصى: (خَصَى- هُ. خِصاءً): خەساندی.

(ألخَصِي): کەسێکە هاواری ئازاری گونی بکات.

(ألخَصِيّ (ج) خِصِيَة وخِصْيان): خەساو/ گوندەرهاتوو/ گونپەکخراو.

(ألخُصيَة (ج) خُصىً) (ع ا): هێلکەی گون.

(خُصْيَةُ البَحر وخُصَى الثَّعْلَب وخُصَى الدِّيك و خُصَى الكَلْب) (ن): گونە دەریاو گونەڕێوی و گونە کەڵەشێرو گونە سەگ (ناوی ڕووەکن).

خض: ١-(خَضَّض- الجارِيَة): بە مووررووی سپی کەنیزەکەکەی ڕازاندەوە.

(ألخَضَض): مووررووی سپی کە ئافرەتە کۆیلەکان لە ملیدەکەن.

(ألخَضاض): ملوانکەو خشڵی هەرزان.

٢-(خاضَّ- هُ. مُخاضَّةً): بە گۆڕینەوە پێیفرۆشت یان لێیکڕی.

٣-(ألخَضَض): نادروستیی و ناتەواویی لە گفتەدا.

(مَنطِقٌ خَضَض): گفتەی نادروست/ ناڕاست/ ناتەواو.

(ألخَضَض): خواردنی هەمەجۆر.

(ألخَضاض): ١-مەرەکەب ٢-کۆتی دیل ٣-تەوقی ملی سەگ یان پشیلە.

(رَجُلٌ خَضاضٌ أَو خَضاضَةٌ): پیاوێکی گەوج.

(مَكانٌ خَضيض): شوێنێکی تەڕ/ تەڕانیی.

٤-(خَضْخَضَ- الماءَ و نَحوَهُ): ئاوەکە یان شتیوای شڵەقاند.

(تَخَضْخَضَ): شلەقا.

(أَلخُضاخِض- مِن الأَماكِن): ١-شوێنی ئاوداری پردارو درەخت ٢-پیاوی قەڵەوی ورگن.

(أَلخُضاخِض والخُضخُض): بایوەشت.

خضب: (خَضَبَ و خَضَّبَ- الشَيءَ. خَضْباً): شتەکەی ڕەنگکرد/ بۆیەکرد.

(تَخَضَّــبَ واخْتَضَبَ- بِالحَنّــاء): بە خەنە ڕەنگبوو/ خەنەی تێگرت.

(خَضیب (ج) خُضُب و مَخْضُوب و مُخَضَّب): خەناویی.

(أَلخِضــاب): خەنەو وســمەو ئــەوەی بۆیەو ڕەنگی پێدەکرێت.

(أَلخُضَبَــةُ): ئافرەتێــك كــە خەنــە زۆر بەكاربهێنێت.

(أَلخَضیب): خەناوی/ بەخەنە ڕەنگکراو.

(«كَــفٌ خَضِیــبٌ»): (لەپیدەســتێکی/ بەریدەستێکی) خەناوی.

(«إِمْرَأَةٌ خَضیب»): ئافرەتێکی خەناوی/ کە خەنەی بەکارهێنابێت.

(أَلمِخْضَب): ســوێنەی جلشتن/ تەشت. یان بۆ ڕەنگکردن/ بۆ خەنەتێداگرتنەوە.

٢-(خَضَــبَ و خَضِبَ و خُضِــبَ و أَخْضَبَ- الشَّــجَرُ أَو المَكانُ): درەختەکە یان شوێنەکە ســەوز چــووەوە/ ســەوز بــوو شــوێنەکە ڕووەکەکەی هاتەدەری.

(إِخْضَوْضَبَ الشَجَرُ. إِخْضِیضَاباً): درەختەکە تەواو سەوز بوو/ گەڵایدەرکرد.

(أَلخَضْب (ج) خُضُوب): ١-ســەوزیی درەخت ٢-گیای ســەوز بوو/ تازەدەرهاتــوو کە باران لێیدەداتو سەوز دەبێت.

(-) (ز): مــادە ســەوزەکەی ڕووەك کــە پێیدەڵێــن (کلۆرۆفیل) کە بریتییە لە دەنکە وردە کــە لەناو خانەی ڕووەکدایە بە تایبەتی لــە خانەکانی گــەڵادا، ئەو دەنکە ســەوزانە یاریــدەی ڕووەك دەدەن کە کاربۆنی لە هەوا وەربگرێت بیخاتــە خانەکانیەوە ئەویش بە هۆی تیشکیخۆرەوە دەبێت.

(أَلخَضُــوب): گیاو ڕووەکی تــازە دەرهاتووی پاش باران بارین.

خضد: ١-(خَضَدَ- العُودَ. خَضْداً): چێوەکەی شکاند بێئەوەی پێوەی دیاربێت ٢-چیلکەکەی چەماندەوەو نەیشکاند.

(- الشَّجَرَ): درکیدرەختەکەی بڕی.

(خَضَّدَ- هُ): کوتکوتیکرد/ پارچەپارچەیکرد.

(تَخَضَّدَ- العودُ): چیلکەکە شکا.

(إِنْخَضَدَ- العودُ): چیلکەکە شکا.

(- تِ الثِّمارُ): بەرەکە/ میوەکە قلیشــایەوە/ شەقیبرد.

(أَلخَضَد): چیلکەی شکاو یان بڕراو.

(أَلخَضَد والخُضَاد): ئازارێکە دەداتە ئەندامانی لەش کە ناگاتە پلەی ئیسکشاندن.

(خَضَدُ البَدَن): تێشــکانی لەشو ژانکردنیو

لەشقورسیی.

(- السَّفَر): ماندوێتی گوزارکردن/ سەفەر.

(اَلخَضِـد والمَخْضُود): گولۆڵە بوو/ کەفتەکار ٢-بێهێز/ لاواز.

(«رَجُـلٌ مَخْضُـود»): پیاوێکـی زمانلەدەمدانەبوو وەك بەزیوو پەککەوتە.

(اَلأَخْضَد والمُتَخَضِّد): تێشکاوو چەماوە.

٢-(خَضَدَ- الرَجُلُ. خَضْداً): کابرا کرمەیهات/ شتێکی کرماندو خوارد وەك گێزەر.

(اَلمِخْضَد): زۆرخۆر/ ورگدڕاو.

٣-(اَلخَضَـد): ١-پووکانەوەی میوە ٢-لاوازیی‌و بێهێزیی رووەك.

خضر: ١-(خَضِـرَ. خَضَراً): رەنگی سـەوز بوو/ سەوز هەڵگەڕا.

(- الـزرعُ): کشـتەکە شـکۆفەدار بـوو/ شکۆفەیکردو جوانبوو.

(خَضَّرَ- الشَيءَ): شتەکەی رەنگ سەوز کرد.

(خاضَـرَ- هُ مُخاضَرَةً): بە سـەوزیی بەری کشتوکاڵەکەی یان میوەکەی بە درەختەکەوە پێفرۆشت.

(أَخْضَرَ- الريُ النَباتَ): ئاوداشتن رووەکەکەی گەشاندەوەو شکۆفەی پێدا.

(إِخْضَـرَّ واخْضَوضَـرَ): سـەوزهەڵگەڕاو جوانبوو.

(إِخْتَضَـرَ- الفاكِهَـةَ): بـە كاڵـی میوەکەیخوارد.

(- العُشْبَ): گیاکەی بە سەوزی ڕنی.

(أُخْتُضِـرَ): جوانەمەرگبـوو/ بـە گەنجیی مرد.

(- الشيءُ): شتەکە بە تەڕو تازەیی بڕا.

(اَلخَضِـرْ): ١-سـەوز/ کەسـك ٢-چڵـی تەڕ ٣-کشـتوکاڵ (ز) ٤-سـەوزەوات ٥-شـوێنێك سەوزبێت‌و گیای زۆر بێت.

(اَلخَضار) (ز): سەوزەی تازەچین.

(اَلخَضِير): ١-سەوزایی ٢-(ز) سەوزەوات.

(اَلخُضْـرَةُ (ح) خُضَـر وخُضَـر): ١-ڕەنگی سەوز/ کەسك (ز) ٢-سەوزەوات ٣-نەرمو نەرم‌و ناسکیی.

(«غُصْنٌ فيه خُضْرَةٌ»): چڵێك ناسك‌و نەرم‌و تەڕ بێت.

(خُضْـرَةُ الدِمَـنِ): گیـای سـەوزی سـەر سـەرەلوێنك واتا جوانییەکی ڕۆکەش ناوەوە دزێو.

(اَلأَخْضَر): ڕەنگی سەوز/ کەسك.

(اَلأَخْضَران): گیاو درەخت.

(«هُـوَ يَجـرِفُ الأَخْضَرَين»): سـەوزایی‌و درەخت‌و ڕادەماڵێت. ئێمە دەڵێین تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێنێت.

(اَلخَضْـراء (ج) خَضْـراوات): مێی وشـەی (الأَخْضَر)ە.

(اَلقُبَّة الخَضراء): ئاسمان.

(اَلخَضَّار): سەوزیفرۆش. تەڕەفرۆش.

(اَلخُضارَة): سەوزەوات/ تەرە.
(الأُخَيضَر) (ح): مێشە سەوزە.
(اَلمُخْضَرَة): سەوزایی/ شوێنی سەوز.
(اَلخُضارِيّ والخُضَيْـــرِی (ج) خَضارِيّ (ح)= الأَخْيَل): كەنەسمە.
٢-(خَضَرَ- النَّخْــلَ. خَضْراً): دارخورماكەی بڕییەوە.
٣-(إخْضَرَّ- اللَّيلُ): شەو تاریكبوو.
٤-(اَلخُضرَةُ- في اَلوانُ الناسِ): مرۆڤی سەوزە/ سەوزەی گەنمڕەنگ.
(- في اَلــوانُ الإبِــلِ والخَيــلِ): حوشـــتر یان چارەویی دێزی مەیلەو ڕەش.
(اَلخَضار): شـــیری شینباو، لەبەر ئەوەی ئاوی زۆر تێكراوەو ڕوونە.
(خَضْراءُ القَوم): زۆربەی خوێشگەل/ بەشی زۆری نەتەوە.
(اَلأَخاضِر): زێڕو گۆشتو مەی.
(-الأُخَيْضَر): دەردێكی چاوە.
٥-(خَضْرَمَ- الأُذُنَ): كەمێك لە دامێنی گوێی بڕیو لێیگەڕا پێداشۆڕبێتەوە.
(ناقَةٌ مُخَضْرَمَة): مێحوشـــترێك كە لە گوێی بڕرابێتو پەیادا شۆڕبووبێتەوە.
٦-(اَلخِضْرِم): چاڵاوێكـــی فرەئاو- دەریایەكی گەورەی ئاوزۆر.
(«بَحــرٌ خِضْـــرِم»): دەریایەكـــی گـــەورەی فرەئاو.
(«رَجُلٌ خِضـــرِم»): پیاوێكی دڵفراوانی زۆر بەخشندە.
(اَلخِضْـــرِم (ج) خِضرِمُـــون و خَضَـــارِم وخَضارِمَـــة والخُضـــارِم): جوامێرێكـــی بەخشـــندەی بەرگەگـــر لەبـــەر چورتـــوم/ لێقەومان/ باری ڕۆژگاردا.
(الخُضَرِم):١-ئاوێكی نیمچە سـوێرو نیمچە شیرین/ نە سـوێرەو نە شیرین ٢-(ح) بەچكە مارمێلكە.
(اَلمُخَضْـــرَم):١-خەتەنـــە نەكراو ٢-ناجســـن/ كەسێك باوكی سپی بێتو خۆی ڕەش بێت ٣-كەسێكە نارەسەن بێتو خۆی بە وەجاخزادە نیشانبدات ٤-كەســێكە تەمەنی لە سەردەمی پێشئیســلامداو لـــە ســـەردەمی ئیســـلامدا بەسەربردبێت.
(«شاعِرٌ مُخَضْرَم»): شاعیرێكە پێشئیسلامو پاش هاتنی ئیسلام ژیابێت.
(ماءٌ مُخَضْرَم): ئاوێكە نەشیرینەو نە سوێر.
الملحق:
خضـــر: اليَخضـــور: مـــادە ســـەوزەكە لـــە ڕووەكدا.

---

خضـــع: ١-(خَضَـــعَ. خُضوعـــاً و خَضْعاً و خُضْعاناً):١-ملیشـــۆڕكرد/ خۆی بە دەستەوە داو دامركا ٢-بێهەوا بوو.
(خاضِـــع (ج) خُضَّع و خَضُوع (ج) خُضّع): ١-خۆبەدەســـتەوەدەر/ ملكـــەچ/ گەردنكـــەچ

٢-دامراو ٢-بێهەواو فیز.
(خَضَـعَ- الرَجُلَ): ١-پیاوەکـەی دامرکاند ٢-سەری پێدانەواند/ سەری پێشۆڕکرد.
(- لَهُ): ملـی بۆ دانەوانـدو فەرمانیکرد بە قسەیکرد/ شوێنیکەوت.
(خَضِعَ- الرَجُـلُ. خَضَعـاً): پیاوەکە کووڕ بوو/ کۆمبوو.
(أخْضَع (م) خَضْعاء): کۆم/ کووڕ.
(خَضَّعَ- هُ): ١-ملی پێشـۆڕکرد ٢-ڕامیکرد ٣-هێنایە ژێربار/ دایمرکاند.
(خاضَعَ- هُ): بە نەرمیی لەگەڵیدا دوا.
(أخْضَعَ= خَضَعَ): ١-ملیشـۆڕکرد ٢-دامرکا ٣-خۆی بەدەستەوەدا/ ملکەچبوو ٤-بێهەوابوو.
(- هُ): ١-دایمرکانـدو ملـی پێشـۆڕکرد/ ملکەچبوو ٢-ڕامیکرد.
(«أخْضَعَتی إلَیكَ الحاجة»): پێداویسـتیی‌و نەبوونیی ملکەچ‌و ناچاری لای تۆیکردم.
(- الكِبَـرُ فُلانـاً): تەمـەن نەرمیکردو ملی پێشۆڕ کرد/ سەری پێدانەواند.
(تَخضَّعَ واخضَوْضَعَ): ملشـۆڕیی‌و بێفیزیی پیشاندا.
(إختَضَـعَ): ١-ملیدا/ خۆی بەدەسـتەوە دا/ گەردنکەچبوو ٢-بێفیز بوو.
(- الصَقْـرُ): هەڵۆکـە سەریشـۆڕکردەوە بۆ داپەڕینە سەر نێچیرەکەی داکەوت.
(ألخَضْع (مص): ملکۆڕیی زگماکیی.

(ألخُضَعَةُ (ج) خُضَع): ١-هەمیشـە سەرشۆڕ/ کەسێکە کە سەر بۆ هەموو کەسێك دانەوێنێت ٢-ئـەو کەسـەی کـە مـل بـە هاوەڵەکانـی دابنەوێنێت/ شکستیان پێبهێنێت.
(ألأخْضَع): ١-قایل بە سەرشـۆڕیی‌و ملدان ٢-ئەوەی کە ملکوری زگماکە.
(ألخَضْعَةُ والخَضَعَةُ): ١-شمشێر یان قامچی کە لە خەڵك دەوەشێنرێت/ دادێتە سەر خەڵك ٢-دەنگی وەشاندنی شمشێر یان قامچی.
(«سَمِعْتُ لِلسِّیاطِ خَضْعَةً»): گوێم لە دەنگی‌و شەقەی قامچیبوو کە دەوەشێنرا.
(ألخَیْضَـعَ- مِـنَ الرجال): پیاوی ملشـۆڕو سەرحیز کە بە زەبوونیی قایلدەبێت.
٢-(خَضَـعَ- النَجـمُ. خُضُوعـاً و خَضْعاً و خُضْعاناً): ئەستێرەکە ڕووەو ئاوابوونبوو.
٣-(خَضَّعَ- اللَّحْمَ): گۆشتەکەی پارچەپارچەکرد.
٤-(إخْتَضَـعَ- فِي سَـیرِهِ): پەلـەی لـە ڕۆیشتنەکەیدا کرد.
٥-(الخَضیعَة): ١-قۆرەی سـکی وڵاخ ٢-هاژەی لافاو.
(ألخَیْضَعَـةُ): ١-دەنگ‌و ناڵەو گرمەی شـەڕ/ جەنگ ٢-شەڕو تۆزی هەسـتاوی جەنگەکەو پەلاماری جەنگەکە.
خضف: (خَضَـفَ. خُضَافاً و خَضْفاً): تری/ تریکەند.
(خَضِیف و خَضُوف و خَضَّاف): ترکەن.

خضـل: ١-(خَضِـلَ وأَخْضَـلَ واخْضَـلَّ واخْضَوْضَـلَ): ١-تـەڕ بـوو ٢-شـێدار بوو/ شێیهێنایەوە.

(خَضِلٌ و خاضِلٌ): ١-شێدار ٢-تەڕ.

(خَضَّلَ واخْضَلَ- الشـيءَ): شتەکەی (شێدار کرد/ تەڕکرد).

(إِخْضالٌ واخْضالَ): شـێی پەیداکرد/ شێدار بوو.

(- الشَـجَرُ): درەختەکە پەلوپۆو گەڵای زۆر بوو.

(اَلخَضِل): هەموو شـتێکی شێدار کە شێکەی بداتەوە.

(«عَيـشٌ خَضِـلٌ»): ژیانێکـی خۆشـی تێروتەسەلی نەرم.

(«شِواءٌ خَضِلٌ»): برژاوێکی چاك برژاو.

(«سِنانٌ خَضِلٌ»): نووکینێزەی خوێناوی.

(اَلخُضُلَّة): ١-پیتو فەڕو سەوزایی ٢-ئاوداشتن ٣-ڕەنگسووریی خۆشییژیان ٤-خۆشگوزەرانیی و تێروتەسەلیی ٥-ژنی نەرمو نیان.

(يَومٌ خُضُلَّة): ڕۆژی خۆشییو تێروتەسەلییو ناز.

(اَلخَضيلَة): گوڵزار، باخی تێرئاو.

(اَلمُخْضَـل والمُخضَـلّ): گوزەرانخـۆش/ گوزەراننەرمو پڕنازو تێریی.

٢-(اَلخَضْـل. الواحِـدَةُ خَضْلَـة والخَضَل): ١-مرواریـیو دوڕی بێگـەردو ڕوون ٢-جۆرە مووروویەکە.

خضم: ١-(خَضَمَ واخْتَضَمَ- الشيءَ. خَضْماً): شتەکەی بڕیو لەتکرد.

(اَلخِضَم): تیغیدەمدار- کاردیتیژ.

(- مِنَ السُيوف): شمشێری تیژو بڕەر.

٢-(خَضَـمَ وخَضِـمَ- الطَّعـامَ. خَضْمـاً): خواردنەکەی بە کاکیلەکانـی دواوەی هاڕیو جوو/ خواردی.

(اَلخُضـام والخُضامَة): ئەوەی بە کاکیلەکانی دواوە جووراو خورا.

(اَلخَضيمَة): ١-گیا کە ئاژەڵ دەیخوات ٢-زەویی پڕگیاو سەوزایی ڕووەك.

٣-(خَضَمَ واخْتَضَمَ- لَهُ مِن مالِهِ. خَضْماً): شتێکی لە سامانەکەی خۆی بڕیو دایە.

(أَخْضَم- لَهُ في العَطاءِ): زۆری پێبەخشی.

(اَلخِضَـمّ): ١-دەریـای گـەورە ٢-سـەروەر/ گەورەپیـاو ٣-جوامێر/ بەدەسـتو دڵ/ زۆر بەخشندە (ئەمە بە ژن ناوترێت) ٤-کۆمەڵێکی (بێشومار/ زۆر).

٤-(اَلمُخْضَـم والمُخَضَّـم): کەسـێکی (بووە/ خۆشگوزەران).

(اَلخُضُمَّـة): ١-ناوەڕاسـت، نێرینەی شـت ٢- زۆربەهێشت.

خطّ: ١-(خَطَّ- بالقَلَم. خَطّاً): بە پێنووسەکە/ قەڵەمەکە نووسی هێڵیکێشا.

(- الشـيءَ أو غيرَه): شـتەکەی بـە قەڵەم/

پێنوس یان شتێتر نووسی.
(- على الشيءِ):لەسەر شتەكە وێنە یان هێڵی كێشا یان نیشانەیەكی دانا.
(- الرياحُ الرَمْلَ):باكە شێوەرێی لاكێشەیی لەسەر لمەكە پەیداكرد.
(- في الأَرض):هێڵی لەسەر زەویەكە كێشا.
(«جاراهُ فَما خَطَّ غُبارَهُ»):شوێنیكەوت بەلام بە تۆزی پێیشیدا نەگەیشت.
(«فلانٌ يَخُطُ في الأرض»):فیسار هێڵی كاروباری دەكێشێت واتا بیردەكاتەوە.
(خَطَّ- الخِطَّةَ لِنَفسِهِ):بەرنامەو پلانی بۆ خۆی دانا.
(خَطَّطَ):١-هێڵی كێشا ٢-پلانیدانا ٣-نووسی.
(- الخُطوطَ):هێڵیكێشا.
(- البلادَ):هێڵی سنوورو شارەكانی ولاتەكەی كێشا.
(إختَطَّ- الوَجهُ أَو غيرُهُ):هێڵ كەوتە سەر رووی یان هیتر.
(- الأَرضَ أو الدارَ):سنووری بۆ زەویەكە یان خانووەكە دیاریكرد تا بزانێت هی خۆیەتی.
(- خِطَّةً):پلانی بۆ خۆی دانا (دیاریكرد)و لەسەری رۆیشت.
(أَلخاطّ (ج) خُطّاط):جادووگەر چونكە لە جادووەكەیدا هێڵكاریی دەكات.
(أَلخُطّ):١-رێ ٢-شەقام.
(أَلخَطّ (ج) خُطوط):١-نووسین ٢-دێر ٣-رێگەی لاكێشەیی ٤-هێڵ ٥-رێ ٦-شەقام.
(أَلخُطّ) (هـ):هێڵێكە هەر درێژیی هەیەو ئەستووریی‌و پانی نییە. زۆر جار بە هێڵی راست دەوترێت كە وەكو پەتێكی درێژكراوو بەستراو وایە.
(-نصف مستقيم):نیوەراست: بەشێكی هێڵێكە سەرێكی دیاریكراوەو سەرەكەی تری بەرەلایەو بێسنوورە (- قطعَة مستقيم) پارچە هێڵێك: كەرتی هێڵێكە كە هەردوو سەری دیاریكرابێت.
(خَطُّ حَلَزوني (حاصل من إنطباق مستقيم كائن في مستو اذا لف المستوى على سطح اسطواني دوراني):هێڵی لوولپێچ لە لوولبوونی هێڵێكی سەر رووە تەختێك لوولەیی.
(قَدَم الخط الحلزوني: البعد بين نقطتين متتاليتين مشتركتين بينه وبين احدى راسمات السطح):پێهێڵی لوولبوو: دووریی نێوان دوو خاڵی یەك لە دوای یەك هاوبەش نێوان ئەوو یەكێك لە خاڵەكانی‌و وێنەكراو لە رووتەختەكەدایە.
(أَلخط الفراغي او اليساري لايحويهِ مستو): هێڵی بۆشایی یان چەپەوانە ناكەوێتەو رووتەختەوە.
(الخَط المُنكسِر):هێڵی شكاوە چەند هێڵێكی یەك لە دوای یەكی شكاوەن.

(الخَـــط المنَحَنى):هێڵــی چەماوەیە کە نە ڕاستەو نە شکاویشە.

(أَلخَط المُغلَق):هێڵی داخراو هێڵێکە هەردوو سەرەکەی پێکەوەلکاون وەك بازنە.

(أَلخَط المَفْتُوح):هێڵی کراوە کە دو سەرەکەی یەك ناگرن.

(أَلخَط المُنکسِــر المَحَــدَّب): یکون مِن جهة واحــدة من جمیع قِطعِــةِ اذا مدت):هێڵی شــکاوەی قۆقز ئەگەر ڕاستو درێژ بکرێتەوە هەموو پارچەکانی ڕێکدەبن.

الخط المنکســر المقعر عکس المحدب:هێڵی شکاوە قوپاو بە پێچەوانەی قۆقز دەبێت.

(خط الإســتِواء أَو الإعْتِــدال) (فك):هێڵی کەمەرەی گــۆی زەوی. هێڵێکی گەورەی گۆی زەوییە. یان هێڵی یەکسانی ڕۆژ کە شەوو ڕۆژ بە درێژایی ســاڵ یەکســان دەبنو ئەو هێڵە گۆی زەوی دەکات بە دوو کەرتی چوونیەکەوە نیوەی باکور نیوەی باشوور.

(خط الإستواء الســماوي أَو الفلك المستقیم أو مَعْــدِلُ النهــار) (فك):هێڵــی کەمەرەی ئاسمانیی یان کەشکەلانی ڕێك یان ناوەڕاستی ڕۆژ بازنەیەکــە گــۆی ئاســمان دەبڕێــت لە ئاستێکی ستوونی سەر تەوەرەی زەوی هێڵەکە بە کۆمەڵە ئەســتێرەی مــەزنو گوڵە گەنمو هیتردا تێدەپەڕێت.

(خط المَسری):هێڵی ڕێڕەوی گوللەیەکە هەر لە دەرچوونیەوە تا دەگاتە شــوێنی نیشانەو شوێنی بۆ هاویشتنی.

(الخَــط أَو دائر نصف النهار أَو خط الزوال أَو الهاجــرة لــکانٍ معین) (فــك):بازنەی نیوەڕۆ بۆ شــوێنێکی دیاریکــراو بازنەیەکی گۆی ئاســمانە کە بە ستوونی سەر شوێنەکەو هەردوو جەمســەری گۆکەدا تێپەڕێت کاتێك کە خۆر دەگاتە ســەر ئەم هێڵــە ئەوا ڕۆژ لە نیوەڕۆدا دەبێت.

(خُطوط الکَف):هێڵەکانی لەپیدەست.

(أَلخِطّ والخِطّة (ح) خِطَــط):١-خاکێك تۆ یەکەمکــەس بیت کە چووبیتە نــاوی ٢-ئەو زەوییەی کە بۆ خۆت ڕەنگیدەڕێژیت.

(أَلخُطَّــةُ (ج) خُطَط)٣-پلان/ نەخشــە یان کارێك.

(«تِلك خُطَّةُ لَیْسَت من بالي»)تەوە پلانێکە یان کارێکە کە بە دڵمدا نەهاتووە.

(«في رأسِهِ خُطَّةُ»)کارێکی لە ژوور سەردایە/ پلانێکی لە مێشــکدایە/ نیازێکی لەدڵدایە ٢- کاری گــرانو ئاڵۆز کە چارەی بۆ ناکرێتو بۆ نادۆزرێتەوە.

(«فُــلان یَبنــي خُطَــطَ المَکارِم»)فیســار ڕەنگرێژیی پایە بڵندییدەکات.

(أَلمِخَطّ)داری هیل کێشــانی ئەندازەی جل/ هێڵێکیــش ئەندازەی جل کــە جۆلا بە کاری دەهێنێت.

(ألخَطوط): ١ـئەو کەسەی شوێنپێی لەسەر زەوی بەجێدێڵێت ٢ـبۆیەی ڕەنگکردنی برۆی ژن.
(ألخَطّاط): خۆشنووس/ جوانـنووس- زۆرنووس.
(ألمُخَطَّط): شتی هێڵدار.
٢-(خَطَّ- الغُلامُ. خَطّاً): لاوەکە/ هەرزەکارەکە ڕووی موویدەرکرد/ مووی لێڕووا.
(- عِذارُهُ): لاجانگی مووی دەرکرد.
(إختَطَّ- الغُلامُ): هەرزەکارەکە مووی لێڕووا.
٣-(خَطَّ- القَبْرَ: خَطّاً): گۆڕەکەی هەڵکەند.
٤-(خَطَّ- الطَّعامَ وفي الطَّعام خَطّاً): دەمی لە خواردنەکەوە داو کەمێکی لێخوارد.
٥-(خَطَّ- في نَومِهِ. خَطّاً): لە نوستنەکەیدا پرخاندی/ پرخەپرخیکرد/ پرخەیهات.
٦-(الخُطّ والخَطّ): شوێن گەرەك.
(ألخُطَّةُ (ج) خُطَطْ): ١ـنەزانین/ تێنەگەیشتن ٢ـنیشانە/ سیفەت.
(ألخَطِّيّ (ج) خَطِّيَّة): نیزەی دروستکراوی میناى (خەت) کە خەت مینایەکی بەحرەینەو نیزەی لێ دروستدەکراو دەفرۆشرا.
(ألمُخَطَّط): جوان/ قەشەنگ.
الملحق:
خـط: (التَّخطِيطُ): ١ـهێڵکێشان – دێر دیاریکردن
(«تَخْطِيطُ رَسْم»): ١ـهێڵکێشانی وێنەیەك ٢ـدیاریکردنی سنوورێك.
(تَخطيطُ ملعب كرة القَدَم): هێڵکێشانی سنووری یاریگایەکی تۆپی پێ.
(ألتَّخطيط في الساحة): ڕەنگڕشتن لە ڕووپێوانـدا دابەشکردنو دیاریکردنی زەوییەكو بەشە پێویستەکانی.
(تَخطيطُ الطَّريق): هێڵکێشانی ڕێگایەكو چۆنیەتیی بردنی.
(عِلمُ التَّخطيط): زانستیی پلانی ئابووری. کە ئامانجەکانو بەرنامەکانو ڕێگاو چونیەتیی پەیداکردنی پارەی پێویستو جێبەجێکردنی ئەو پلانو بەرنامانە بۆ گەیشتنە ئەنجامی ئامانجەکان تێدا دیاری بکرێت.
(ألمَخْطوط): دەستنووس.
(كِتابٌ مَخْطُوط): کتێبێکی دەستنووس.
(ألمؤلف المكتوب باليَد): دانراوێك کە بە دەست نوسرابێتەوەو چاپ نەکرابێت.
(مَخطوط على ورق البردى): دەستنووسێك لەسەر توێکڵی قامیش کە زۆر کۆن لەسەریاندەنووسی بە تایبەتی لە میسردا.
(مخطوط مُصَحَّح): دەستنووسێکی ڕاستکراوە.
(ألمَخطُوطَة): مێی وشەی (المخطوط).
(رِسالَة مَخطوطَة): نامەیەکی دەستنووس.
مخطوطة: دانە کتێبەکەی دانەر کە ئامادەی

چاپەو بە دەست نوسراوە.
(سَـلَّمَ المَخطوطَةَ للناشِـر): دانە کتێبەکەی دا بـە بڵاوکەرەوەکـە بـۆ لەچاپدانـیو بڵاوکردنەوەی کە بنچینەییە.

خطِـئ: ١-(خَطِـئَ. خَطَـأً): هەڵەیکـرد/ بەهەڵەداچوو/ لە راستی دوورکەوتەوە.
(أَخْطَأَ – الرامي الغَرَضَ. إِخْطاءً و خاطِئَةً): تیرهاوێژەکە نیشانەکەی نەپێکا/ هەڵەیکرد.
(- في عَمَلِهِ): هەڵەی لە کارەکەیدا کرد.
(- الطَّريقَ): بە هەڵە بە ڕێگەکەدا ڕۆیشـت/ ڕێگەکەی هەڵەکرد.
(تَخَطَّأَ- لَهُ في المَسْأَلَةِ و بِها): بە پرسیارکەدا چووەوەو بۆ هەڵەکەی گەڕا بیدۆزێتەوە.
(تَخاطَأَ- السَّهمُ الرَمِيَةَ): تیرەکە لە نیشانەکە لایداو تێپەری.
(الخطء والخَطاء): هەڵە- ناراستیی.
(اَلخَطَأَ (ج) أخطاء): هەڵە- ناراستیی.
(اَلخَطَـأُ المُطلَـق) (ع ح): هەڵـەی تـەواو ئـەو جیاوازییەیە لە نێوان نرخی ڕاسـتی/ ڕاستەقینەو نرخی نزیکیی/ نزیکە نرخ.
(اَلخَطَأ النِسبي): ڕێژەی هەڵەی تەواو/ ڕەها/ لە چاو نرخی ڕاستیدا.
(حِسابُ الأَخطاء): ژمێرەی هەڵەکان لقێکەو بەشـێکە بە دوای ئەو هەڵانەدا دەگەڕێت لە کردەکاندا کاتی گۆڕینی ڕاسـتە نرخەکان بە نزیکیەکانی.

٢-(خَطِئَ – في دينِـهِ. خَطَأً): لە پەیڕەویی دیندا هەڵەیکرد یان بە هەڵەداچوو سـا یا بە ئارەزوو یان بێئاگایانە.
(خَطَئَ خِطأً و خِطْأَةً): گوناهیکرد.
(خاطِـئ (ج) خَطَـأَة (م) خاطِئَـة (ح) خَواطِئ): گوناهبار/ گوناهکار.
(خَطَّـأَ- هُ. تَخْطِيئـاً و تَخطِئَـةً): بە هەڵە چوویدانا/ پێیوت هەڵەتکردووە.
(أَخْطَـأَ. إخطـاءً و خاطِئَـةً): هەڵەیکرد/ بەهەڵەداچوو.
(- الرَجُلَ): پیاوەکەی بەهەڵەدا برد/ هەڵەی پێکرد.
(تَخَطَّأَ و تَخاطَأَ): هەڵەیکرد.
(- هُ): بە هەڵەیدا برد/ هەڵەپێکرد/ خستیە هەڵەوە.
(اَلخِطْء): گوناه.
(اَلخَطَـأُ والخِطْء والخَطَاء): گونـاه. (دەڵێن گوناهێکە کە بە ئـارەزوو نەکرێتو بە هەڵە بکرێت).
(اَلخَطّاء): گوناهکارێکی گەورە- هەڵەکەرێکی گەورە/ کەسێکە کە هەڵە زۆر بکات.
(اَلخَطيئَة (ج) خَطَايـا و خَطيئات): گوناه (دەڵێـن ئـەو گوناهانەیـە کە بە ئـارەزوو بکرێت).
٣-(خَطِـأَ- تِ القِدرُ بِزَبَدِهـا): مەجەڵەکە هەڵچوو کەفەکەی ڕژاند.

خطــب: ١-(خَطَــبَ. خُطْبَــةً و خَطْبــاً و خَطابَــةً): ١-وتاريــداو ئامۆژگاريكــرد ٢- وتارەكەی بۆ ئامادەبوان خوێندەوە.

(خَطَبَ- القَوْمَ وفي القَوم): لەناو خوێشگەلدا بۆ نەتەوە وتاری خوێندەوە/ وتاری بۆ دان.

(خَطُبَ. خَطابَةً): بوو بە وتاربێژ.

(خاطَــبَ- هُ. خِطابــاً و مُخاطَبَةً): قســەی لەگەڵدا كرد/ دواندی.

(«خاطَبَــهُ في فُــلان»): دەربــارەی فيســار لەگەڵيدا دوا.

(تَخاطَبا): قسەيان لەگەڵيەك كرد/ يەكتريان دواند.

(إخْتَطَبَ- على المِنبَر): لەســەر مينبەرەوە، وتارگەكەوە وتاريدا.

(ألخِطاب): ١-ئاخاوتنی ڕووبەڕوو.

(«فَصلُ الخِطــاب»): ئەوەيە كە وتاربێژەكە پاش ســتايشو سوپاســی خودا بڵێــت («أما بَعدُ»): واتا پاش ئەوە ٢-زمانپاراويی.

(الخُطبَة): وتاردان- ئاخاوتن/ دوان.

(ألخَطيب (ج) خُطَباء): وتاربێژ/ وتاردەر.

(رَجلٌ خَطيب): وتاربێژی چاك/ وتارەكەی وتاری چاكە.

(ألأخْطَب): بالاترینو چاكترين وتاربێژ.

(«كان أخْطَــبَ أهــلِ زمانِه»): باشــترينو زمانپاراوتريــن وتاربێــژی ســەردەمی خۆی بوو.

(ألخَطّاب): قســەزان/ فرە وتاربێژ/ بەدەمو دوو.

(ألخَطّابَة): قسەزان/ بە دەمو دوو فرەوتاربێژ (بۆ نێرومێ دەڵێن).

٢-(خَطَــبَ- الفَتــاةَ. خَطْبــاًو خِطْبَــةً و خَطبــی): كچەكــەی خواســت/ خوازبێنــی كچەكەيكرد.

(خاطِب): خوازبێنيكەر.

(«خَطَبَ الفَتــاةَ على فُــلان»): خوازبێنی كچەكــەی بــۆ فيســار كــرد. كــردی بــە دەستگيرانی.

(إختَطَــبَ- الفَتــاةَ): كچكــەی خواســت/ خوازبێنی كچەكەيكرد.

(- القَــومُ فُلانــاً): خوێشــگەل داوايــان لە فيساركرد كچێكيان لێبخوازێت.

(ألخاطِب (ج) خُطَبَــاء) (فا): خوازبێنيكەر داواكاری كچ.

(«أرسَلتُهُ خاطِباً فَتَزَوَّج»): ناردم خوازبێنيم بۆ بكات كەچی بۆ خۆی داواكرد/ شــتێكم بۆ وەرگرێت بۆ خۆیبرد.

(«خاطِبُ الدنيا»): دنياخوازو ســەركەوتوو تيايدا.

(ألخِطْب (ج) أخْطاب): ١-دەستگيران/ داواكاری ژن/ خوازبێنيكەر ٢-ئافرەتی خوازبێنيكراو/ ئافرتی دەستگيران.

(«هُوَ خِطْبُهــا وهِيَ خِطبُــهُ»): ئەو دوانە

دەســتگیرانی یەکترین/ ئــەو ژنو پیاوە ئەو کورو کچە دەستگیرانی یەکترین.
(اَلخِطبَــةُ) (مــص): ١-خوازبێنــی ژنکردن/ ژنداواکردن ٢-ئافرەتی خوازبێنیکراو ٣-ئەوەی ژنی خوازبێنیکراوی پێ نیشانە دەکرێت.
(اَلخَطیب (ج) خُطَباء الخاطِب): ١-وتاربێژ ٢-خوازبێنیکەر/ داواکار ٣-وتاربێژی زمانپاراو.
(اَلخِطّیب (ج) خِطّیبــون): خوازبێنیکەری ژن/ داواکاری ئافرەت.
(اَلخَطّــاب (م) خَطّابَــة): دەســترۆییو لــە خوازبێنیەکەدا.
(اَلخِطّیبَــی): ئافرەتی دەســتگیراندار/ ژنی داواکراو/ خوازبێنیکراو.
٣-(خَطِبَ- الشــيءُ. خَطَباً): ١-شتەکە هاتە بەردەست ٢-شتەکە ڕەنگی پەیداکرد.
(- تِ الحُنطَةُ): گەنمەکە ڕەنگیگرت.
(- الحَنظَــلُ): گوژاڵکەکــە زەرد بــوو میلی سەوزیشی تێدا پەیدابوو.
(اَلخُطْبَــةُ): ڕەنگێکــی تەڵخــی زەردی سوورباوە.
(اَلأَخْطَب): ئەوەی کــە زۆرتر ڕەنگی تەڵخی زەردو سوورباو بێت.
(- مِنَ الحَنْظَلْ): گوژاڵکێك کە هێڵی سەوزی پەیداکردبێت.
٤-(أَخْطَــبَ- الصَّیــدُ فُلانــاً): نێچیرەکە لە ڕاوکەرەکە نزیکبووەوە.

(- الشيءُ): شتەکە هاتە بەردەست.
٥-(اَلخَطْب (ج) خُطُوب): کار- پەیوەندیی.
(«ماخَطبُــكَ»): چیتــە چ کارێکت هەیە؟ چ پەیوەندییەکت هەیە بەسەر ئەو شتەوە؟ چی پاڵی پێوە نایت بۆ ئەوە.
(اَلخَطب): نەهامەتیو هەومــاو گەورە بێت یان بچووك. بەڵام بــە زۆریی بۆ نەهامەتیی گران دەوترێت.
(خُطْبَــةُ الكتاب): پێشــەکیی کتێبو نامەو نووسین.
(فَصلُ الخِطاب): ١-بڕیاردان لەسەر کێشەیەك بە بەڵگە پیشــاندان یان بە سوێندخواردن ٢-پوختەی باسەکە.
(اَلأَخْطَب): ١-هەڵۆ ٢-ئەوەی کە زۆرتر ڕەنگی تەڵخی زەردو سوورباو بێت.
(اَلخَطّابِیَّــة): تاقمێکــن ڕافزی کە ســەر بە (أبو الخَطّاب) بوون، فەرمانی دەدانێ بە درۆ شایەتیی لەســەر ئەوانە بدەن کە سەر بەوان نین.
الملحق:
خطب: اَلخطابَة: وتــاردان: جۆرە وێژەیەکە دارشــتنە ئامانجی کارکردنە لەسەر ئەوانەی دەیبیسن.

---

خطــر: ١-(خَطَــرَ- فِي مَشــیَتِهِ. خَطَرانــاً وخَطیراً): لە ڕۆیشتنیدا دەستی ڕاوەشاند.
(- بِیَدِهِ): لە ڕۆیشتندا دەستی بۆ پاش و پێش

هێناو برد.
(-الجَمَلُ بِذَنبِهِ. خَطْراً وخَطَراناً و خَطِيراً): حوشترەکە کلکی بەملاولایدا هەڵدەسووراندو دەیدا بە ڕەفیچکیدا.
(ألخاطِر) (فا): هەڵسووڕێن.
(ألخَطَّار): کلك یان دەســت هەڵسووڕێنێك کە زۆر هەڵیسوڕێنێت.
(ألخَطِر): بەفیز/ خۆبادەر/ خۆلەنجێن.
٢-(خَطَــرَ- الرمــحُ: خَطَرانــاً وخَطِيراً): نێزەکە لەرییەوە.
(- بِسَیفِهِ أو رُمْحِهِ): بە خۆنازینەوە شیرەکەی یان نێزەکەی ڕاوەشلاندو هەڵسوراندن.
(ألخَطَّار): ١-نێزەوەشێن ٢-نێزە ٣-قۆچەقانی.
٣-(خَطَرَ- الأمرُ لَهُ خُطُــوراً): کارەکەی بە مێشکیدا/ بەبیریدا هات.
(- الأمــرُ بِبالِهِ وعلى وفِي بالِــهِ): کارەکەی بەبــیردا هاتــەوە/ بیریکەوتــەوە کــە بیریچووبووەوە.
(- تِ الحَــوادِثُ): (قەوماوێــك/ ڕووداوێك) ڕوویداو هاتە پێش.
(أخْطَرَ- الشيءَ في أو على أو ببالِهِ): شتەکەی بەبیر هێنایەوە/ بیریخستەوە.
(ألخاطِر (ج) خَواطِر): ئەو کارەی بەدڵدادێت بیرێك و تەگبیرێك و پلانێــك ٢-خولیایەك ٣- ئەوەی بەبیردا دێت و دێتەوە یاد (دڵ و دەروون بۆ خوازە لێرەدا بەکاردێت) دەوترێت («وقع في خاطِــري»): بە دڵمدا هات/ بە دەروونمدا هات.
(«جــاش الشِّــعرُ في خاطِــري»): شــیعر هوروژمی بە دڵ و دەروونمدا کرد.
(«فلانٌ سَــرِيعُ الخاطِر»): فیســار بۆ قســە دانامێنێــت و زوو دێتە ســەر زمانی و یادی/ قسە قوتە.
٤-(خَطُرَ. خَطَــراً و خُطُــورَةً): پایەبڵندو پایەدارو گرنگبوو/ بەڕێز بوو.
خَطِير وخُطْرٌ: مرۆڤــی پایەبەرزو پایەدارو گرنگ/ بەڕێز.
(أخْطَرَ- هُ): وەك ئەو پایەبەرزو باڵادەست و گرنگبوو/ بەڕێز بوو.
(ألخَطَــر (ج) أخْطَــار): ١-ســەروەریی/ پایەبڵندیــی و بەڕێزیــی ٢-هاووێنــەو هاوتا (تەنها بۆ ئــەوە دەوترێت کــە پایەداربێت و پایەخیەهبێــت وەك: («في ظِلِّ عَيشٍ خَطِير مالُهُ خَطَرٌ): لە ژیانێکی پڕ ســەروەریدا کە هاوتای نەبێت.
(ألخَطِر): پایەدار/ سەروەرو ڕێزدار.
(ألخَطِــير): ١-پایەبڵنــد ٢-هاوتــا/ هاووێنە/ وەکو/ لەشکۆداریی و پایەبەرزیدا.
(«لَیــسَ لَــهُ خَطِــيرٌ = عَدِيــلٌ»): هاوتا/ هاووێنەی نییە/ شان لە شانی نادرێت.
(الخَطير): مەزن و خانەدان.
٥-(خاطَــرَ- بِنَفسِــهِ. مخاطَــرَةً): خــۆی

هاویشته مەترسییەوە.
(أَخْطَـرَ- المَریـضُ): نەخۆشـەکە کەوتـە مەترسییەوە.
(مُخْطِر): نەخۆشێك کە لە مەترسیدا بێت.
(أَلخَطَـر (ج) أَخْطار): مەترسـیی فەوتان/ لەناوچوون.
(«رکبـوا الأَخطـارَ»): خۆیـان خسـتە مەترسییەوە.
(أَلمَخاطِـر): مەترسـی (تاکـی نییـە). مەترسییەکان
٦-(خاطَـرَ- هُ علی کَذا. مُخاطَرَةً): لەسـەر ئەو شـتە ترسـناکە گـرەوی لەگەڵـدا کرد/ مەرجکاریی لەگەڵدا کرد.
(أَلخَطَـرَ المـالَ): پارەکـە یـان ماڵەکەی لە گرەوەکەدا خستە بریتی.
(تَخاطَرَ- القَومُ علی الشـيءِ): خوێشـگەل گرەویان لەسەر شتەکە کرد.
(أَلخَطَر (ج) خِطار و (جج) خُطْر): ئەوەی گرەوی لەسـەر دەکرێت ئەویش لەو شـتەدا پێشبرکێیە.
٧-(تَخَطْـری= تَخَطَّـی): لێیتێپـەری/ لێپەڕیوە/ لێپەرتبوو.
(«تَخَطراني شَـرٌّ فلانٍ»): خراپەی فیسـار کەس خۆی لێلادام.
٨-(أَلخَطْر): پێوەرێکی مەزنە.
(أَلخَطْر والخِطْر): ١-گەمرەی سمتو کولۆتی حوشتر ٢-هەوری تازەی دەرکەوتووی ئاسۆ.
(أَلخِطر (ج) أَخْطار): ١-شیری ڕوون کە ئاوی زۆر تێکرابێت ٢-گەلە حوشترێکی زۆر ٣-(چڵ/ لق/ پەل)ی درەخت.
(أَلخِطْرَ) (ن): وسمە/ ڕوومکێکە ڕەنگی ڕەشی پێدەکرێت.
(أَلخِطرة): یەکێك لەو ڕووەکەی وسمەیە.
(أَلخَطْرَة): جارێك.
(مالَقَیتُـهُ إلاّ خَطْـرَةً»): تەنهـا جارێـك پێیگەیشتووم/ هەر جارێك پێیگەیشتم.
(أَلخَطِـیر): ١-هەوسـارو ڕەشـمەی وڵاخ ٢-دەزوولەی هەتاو کە وەك دەزوولەی جاڵجاڵۆکە لـە قرچـەی نیـوەڕۆدا دەبینرێـت وەك لە ئاسمانەوە سەرەوخوار ببێتەوە. پێشی دەڵێن: (مُخاطُ الشَّیطان): ٣-تاریکی شەو ٤-هەرەشە ٥-چالاکیی.
(أَلخَطّار): ١-وردەواڵا فرۆش/ عەترفرۆش ٢-ڕۆنێکی شلە، یان ڕۆنی زەیتوونەو بۆنیخۆشی تێدەکەن.
(أَلخَطّارَة): گەوری حوشتر.
٩-(خَطْرَفَ وتَخَطْـرَفَ): گورگە لۆقەیکرد/ خێرا ڕۆیشت.
(خِطْریـف و خُطْـرُف): گورگەلۆقەکەر لە ڕۆیشتندا/ خێرا ڕۆشتوو/ گورج.
(خَطْـرَفَ- هُ بالسَّـیفِ): بەشمشـێر لێیدا/ شمشێری پێداکێشا.

خطف: ١-(خَطِفَ- الشَيءَ خَطْفاً): شتەکەی خێرا فراند/ ڕڕپێداکردو بردی.

(_البَـرقُ البَصَـرَ): برووسـکەکە چـاوی کوێرکرد.

(- السَمعَ): بەدزییەوە گوێی هەڵخست.

(خَطِـفَ وخَطَـفَ خَطَفانـاً): گـورج بۆی دەرچـوو/ فرکەیکـرد/ خێـرا (تێیتەقان/ ڕۆیشت).

(خَطيـفٌ و خَيْطَـفٌ): گورجـە پەلـە لە ڕۆیشتندا/ چابوك/ زۆر خێرا.

(خَطَّـفٌ): ئـازاو چابوك/ زۆر خێـرا/ زۆر گورج.

(أَخْطَفَ- الرَجُلُ): سووکە نەخۆشییەکیگرت و زوو بەریدا.

(تَخَطَّـفَ واختَطَفَ- الشـيءَ): ١-شـتەکەی زەوتکـرد ٢-شـتەکەی ڕاپسـکاندو لە چنگی دەریهێنا.

(أَلخَطف): فراندن/ ڕاپسکان و زەوتکردن.

(أَلخَطفَةُ): ١-بەدزییەوە لێدەرکێشان و لێدزین ٢-ئـەو ئەندامـەی کە درنـدە لـە ئاژەڵێکی زینـدووی دەردەکێشـێت و دەیفڕێنێـت. ٣-سووکە شیردانێکی خێرا.

(أَلخاطِف (فـا) (ج) خَواطِف): ١-ئەو تیرەی کە دەکەوێتە سـەر زەوی و ڕاسـتدەبێتەوەو بەرەو نیشـانەلێگیراوەکە دەچێـت ٢-لێدز ٣-لێدەرکێش ٤ زەوتکەر.

(أَلخَطَفى والخَيْطَفى): (چابوکیی/ خێرایی) لە ڕۆیشتندا.

(«هُوَ يَمشي الخَطفى»): ئەو چابوکانە خێرا دەڕوات.

(أَلخاطُوف): داسـولکە کە بە داوی ڕاوەکەوە دەبەسترێت ئاسـك و نێچیری وای پێدەستگیر دەکرێت.

(أَلخَطّـاف): ١-زۆرفڕیـن/ چابوکزەوتکـەر ٢-شەیتان.

(أَلخُطّـاف): ١-دز- (ح) =الخَطـف (ج) خَطاطيـف: تەیـرە عەبابیلـە. باڵندەیەك وەك پەرەسـێلکەیە باڵدرێـژەو پێکورتـەو ڕەنگرەشە.

(أَلخُطـاف= خَطاطِـف): قاڵنگـە/ چنگـە (ئاسنێکە سـەرچەماوە لە شت دەگیرێنرێت و پێیرادەکێشرێت).

(خَطاطيـفُ السِّـباع): چنگـی درنـدە گۆشتخۆرەکان.

٢-(أَخْطَفَ- هُ): نەیپێکا.

٣-(أَخْطَـفَ- هُ المَـرَضُ): نەخۆشـییەکەی لەسەر سووکبوو یان بەریداو ڕزگاریبوو.

(أَلخَطَـف والخُطُـف): تێقوپـان و باریکیی کەمەر.

(ألأَخْطَف المَشي): ناوسك و تێقوپاو.

(لَونُـهُ مَخْطـوفٌ) (عاميـة): ڕەنگـی (هەڵبزرکاوە/ زەردبووە).

خطل: ١-(خَطِلَ وأَخْطَلَ- في كَلامِهِ. خَطَلاً): قسەی هەرچیوپەرچیکرد/ زۆریوتو قسەی (بێسەروبەریکرد/ هیچو پووچیکرد).

(-في مَنطِقِـهِ أو رأيِـهِ): گفتـەورای هەڵەی دەربری.

(ألخَطَلُ (مص): ١-گەوجیی ٢-ناوەزسـووکیی ٣-زۆروتـنو قسـەی بێسـەروبەرو گـەن ٤-گفتەورای چەواشەو هەڵە.

(«إصالَةُ الرأيِ صانَتْني مِنَ الخَطَلِ»): رای دروستو تەواوم لە هەڵەو قسەی بێسەروبەر پاراستمی.

(ألخَطِل (ج) أَخْطَال): ١-هەڵەشە ٢-گەوج.

(ألخَطِلُ- مِنَ السِّهام): تیری نەپێك كە بەرەو نیشانەكە نەروات.

(الخاطِل): نارەوا/ ناراست/ پووچ.

(ألأَخْطَل (م) خَطْـلاء (ج) خُطْل): ١-گەوج ٢-هەڵەشـە ٣-قسـەی بێسـەرو بەرکـەر ٤-قسـەوكردەوەی پیسو ناشیرین/ هەڵەوەر ٥-داوێنپیسو بێئابروو.

٢-(تَخَطَّـلَ- في المَشـي): بەخۆبـادانو گەنجەفەوە رۆیشت/ لەنجەیكرد.

(ألخَطَـل): شـلیو خواروخێچیـی لـە رۆیشتندا.

(«أرى في مَشْـيَتِهِ خَطَلاً»): رۆیشـتنەكەی نارێكو ناتەواو، بێهێزانە دێتە بەرچاوم.

٣-(ألخَطَل): ١-خێرایی/ گورجیی ٢-درێژیی ٣-شـپرزەیی لە مرۆڤو چارەوێو ناتەواویی لە نێرەدا.

ألخَطِـل: گـورج دەستوەشـێن/ لـە نێـزە تێچەقاندندا بەكار.

(«أخْوَضُ في الهَيْجاءِ بالرِّمحِ خَطِلٌ»): ئازا لە شەرداو گورج لە نێزە وەشاندندا.

(ثَوبٌ خَطِلٌ (ج) أَخْطال): بەرگێكی درێژی زبری لە زەوی خشاو.

(«رَجُلٌ خَطِلُ اليَدَين»): پیاوێكی دەستبڕ.

(رمـحٌ خَطِـلٌ): نیزەیەكی درێـژی خوار/ خێچ/ نارێك.

(خَطِلٌ بالمَعروف): لە بەخشیندا پەلەكار.

(ألأَخْطَل (م) خَطْلاء (ج) خُطْل): درێژگوێی شۆرەگوێ.

(ألخَيْطَل): ١-(ح) سەگ (ح) پشیلە ٢-زۆرزانو بەفێڵ ٤-عەتار ٥-پۆلەكوللە.

خطـم: ١-(خَطَـمَ- هُ بالخِطـام خَطْماً): هەوساری كردو خستیە سەرلووتی.

(- الرَحلَ): بە لووتی پیاوەكەیدا كێشا.

(خَطَّـمَ- هُ بالخطام): پەتی هەوسـارەكەی كردە سەر قەپۆزی.

(إخْتَطَمَ- الخِطامَ): پەتی هەوسـارەكەی لە لووتی یان لە قەپۆزی توندكرد.

(ألخَطْم (مـص): ١-لووتی مرۆڤ ٢-دەنووكی باڵندە.

(- مِنَ الدابَّةِ): (لۆزی/ قەپۆزی) چوارپێ.

(اَلخاطِم (فا): هەوسار/ جڵەوگیر/ ڕەشمە.
(«فُـلان خاطِمُ أَمْـرِ بَني فُلان»): فیسـار جڵەوگیرو سـەردارو بەڕێوەبـەری کاروباری فیسار بەرەیە.
(اَلخِطام (ج) خُطم): ڕەشـمەی/ هەوسـاری حوشـترەکە دەکرێتـە فەپۆزیو لـە ملیەوە دەنالێنرێت/ هەرچی بکرێتە لووتی حوشترو پێرابێکشرێت.
(اَلأَخْطَـم (م) خَطْمـاء (ج) خُطْـم): لووتدرێژ.
(اَلمَخْطِـم والمِخْطَـم (ج) مَخاطِـم): لووت/ کەپوو.
(اَلخَطَّام): کەسکوونو لووتچووزێنەوە.
(مِسـكُ خَطَّام): بۆنێکی تیژ/ کەسکوون کە لووت دەچووزێنێتەوە.
٢-(خَطَـمَ- هُ بِالـكَلامِ. خَطْماً): بە قسـە قـوری بەدەمیـدا دا/ سـەری پێدانەوانـدو دەمکوتیکرد.
٣-خَطَمَ- القَوْسَ بِالوَتَرِ خَطْماً و خِطاماً): ژێکەی بە کەوانەکەوە بەستو هەڵواسی.
(اَلخِطام (ج) خُطُم): ژێیکەوان.
٤-(اَلخَطْم): کۆستی گەورە.
(اَلأَخْطَم (م) خَطْماء (ج) خُطْم): ڕەش.
(اَلخَطْمِـيّ والخِطمِي الواحِـدَةُ خِطْمِيَّة): ١-(ن) هێرۆ. گوڵێکە لاسـکێکی درێژی ڕاستی هەیـە گوڵێکـی جوانی سـوورو سـپیو مۆر دەگرێت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا پەیدابووە
٢-(ن) ڕووەکێکـە لـە کۆمەڵـەی تۆڵەکەیـە گەورەیە لە شوێنی شـێداردا دەڕێ. جاری وا هەیە بۆ دەرمـان دەروێنرێت. وەك دەرمانی سك ڕۆیشتن بەکاردێت.
خطا: (خَطا. خَطْواً): هەنگاوینا.
(خَطّی و أَخْطی – الرجُلَ): هەنگاوی پێنا.
(تَخَطّـی واخْتَطـی- هُ إِلی كـذا. تَخَطِّيـاً واخْتِطاءً): لێیتێپەڕیو پێشیکەوت.
(اَلخُطْوَة (ج) خُطیً و خُطُوات وخُطَوات و خُطْوات): ١-هەنگاو ٢-ماوە.
(فَشخَة) (عامية): هەنگاو.
(«قَرَّبَ اللهُ عَلَيْكَ الخُطْوَةَ»): خودا ڕێگەکەت بۆ نزیك بکاتەوە.
(اَلخَطْوَة (ج) خَطَوات وخِطاء): ١-هەنگاوناێك ٢-هەنگاو
٣-في المسـاحة: هەنگاوێك کە شەش پێبێت (لە پێواندا).
٢-(خُطِّـيَ- عَنـهُ الشَـيءُ): شـتەکەی لێدوورکەوتەوە/ شتەکەی لەسەر لاچوو.
٣-(اَلخَطِيَّة): گوناه/ کاریخراپ.
خظـا: (خَظَـا- لَحْمُهُ. خُظُـوّاً): خرتبوو/ گۆشتەکەی نیشتە سەریەك/ قەڵەو بوو.
(أَخْظى- الرَجُلُ): پیاوەکە قەڵەو بوو.
(- هُ): قەڵەویکـرد/ گۆشـتی پێگـرت/ گۆشنیکرد.

(ألخَظِيِّ): گۆشتن/ خرت/ قەڵەو.
(«إمْــرَأةٌ خَظِيّــة بَظِيَّــة»): ژنێكی خرتو خۆڵ/ ژنێكه هەر غەزوبەزە/ زۆر گۆشتن.
خــفّ: ١-(خَــفَّ. خَفّــاً و خِفَّــةً و خَفّةً): سووكبوو.
(خَفَّــفَ- الشَّــيءَ): شــتەكەی (ســووككرد/ كەمسەنگكرد).
(- الثَّوبَ): (جلەكەی/ بەرگەكەی) تەنككرد.
(-الحَرْفَ): پیتەكەی لەسەر زمان سووككردو گرتنی تێدا نەبوو.
(أخَفَّ): سووكباربوو/ نەبووبوو.
(تَحــافَّ): ١-لەشسـووكانە راپــەڕی ٢-خۆی بەلەشسووك نواند.
(إسْــتَخَفَّ- ه): ١-بە ســوكی زانی ٢-بەهیچی زانیو گوێنەدایە/ داوای لێكرد سووكبێت.
(ألخِفّ): سووك.
(الخَفيف): سووك.
(ألخِفَّة) (مص): ١-سووكیلەش ٢-سووكیئاوەز ٣-ســووكیی لــە كاركردنــداو چابوكیــی ٤-ئێسكسووكیی.
(ألخَفيــف (ج) أخِفَّاء و خِفــاف وأخْفاف): ١-سووك/ كەمسەنگ ٢-چابوك.
(خَفيفُ العَقْلِ): گێل/ ئاوەزسووك.
(خَفيــفُ الــرّوح): ١-ئێسكســووك ٢-ڕەفتار ناسكو هەڵكرد.
(خَفيــفُ القَلْــبِ): زۆر زیــرەك/ دڵوریــا/ زرنگ.
(ألخَفيف): جۆرە كێشێكی شیعری عەرەبییە لەبــەر ســووكیی وا ناونــراوە كێشــەكەیش ئەمانەن.
(فاعِلاتُنْ. مُسْــتَفْعِلُنْ فاعِلاتُنْ) (ألخُفاف): زۆر زیرەك/ زرنگ/ دڵوریا.
٢-(خَــفَّ- إلى العَدُوِّ خَفّاً و خِفَّةً و خُفُوْفاً): گورج/ خێرا لە دوژمن راپەڕی.
(- القَومُ): خوێشگەل بە پەلە كۆچیانكرد.
(تَخَفَّفَ): خێرایكرد/ پەلەیكرد/ گورجبوو.
(ألخَفيــف (ج) أخِفَّاء و خِفــاف وأخْفاف): ئازا/ چابوك/ لەكارو ڕۆیشــتندا بەدەستوبرد یان پێسووك.
(هُوَ خَفيفُ اليَدِ): ئەو دەستســووكە واتا لە كاردا خێرایە/ دەستگورجە.
٣-(خَفَّ. خَفّاً و خِفَّةً و خَفَّةً): كەمســامانو دارابوو.
(- المَطَرُ): بارانەكە كەمیكرد/ كەمبوو.
(- القَومُ. خَفّاً و خِفَّةً و خُفوفاً): خوێشگەل كەمیانكرد/ كەمبوونەوە.
(أخَفَّ): كەمدەســت بوو/ نەدارابوو/ نەبوو بوو.
(ألخِفّ): كۆمەڵێكی كەم.
(«خَــرَجَ فِي خِــفٍّ فِي أصْحابِــهِ»): لەگــەڵ كۆمەڵێكی كەمی دۆستەكانی هاتەدەرێ.
(ألخَفيــف (ج) أخِفّاء وخِفــاف وأخْفاف):

کەمهێزو کەمپشتیوان.
(«هو خَفیفُ الظَّهر»): ئەو پشـتیوانی قایم نییە واتا زارۆڵەی کەمە.
(«هُوَ خِفیفُ العارِضَین»)؛ ئەو کەمتووکە/ نیمچە کۆستەیە.
٤-(خَفَّ. خَفّاً و خِفَّةً و خَفَّةً): جرتوفرتیکرد/ هەڵەشەییکرد.
(أَخَــفَّ- الرَّجُــلَ): ١-پیاوەکەی چەواشـەو نەزانکرد ٢-خەوشی لێگرت ٣-گاڵتەپێکرد ٤-کەموکووریی دەرخستو لێدەرهێنا.
(إِسْــتَخَفَّ- هُ): لـە رێبراسـت/ رەوا لایـداو دووریخسـتەوە ٢-بە نەزان‌و نەفامیدانا ٣-بە سووکیدانا.
(- بِهِ): بەسـووك هاتە بەرچاوی/ بە هیچی زانی/ گاڵتەپێکرد.
(- هُ الغِناءُ): گۆرانییەکە خستیە هەڵەکەسەما/ کەیفی پێپەیداکرد.
(- هُ الطَرَبُ): کەیفخۆشیی‌و گۆرانیی تووشی بەرەڵاییکرد.
(اَلخَفیــف (ج) أَخِفّاء و خِفــاف وأَخْفاف): سووك.
(«هُــوَ خَفیفُ العَقلِ»): ئــەو گەوجە ئاوەز سووکە.
٥-(تَخَفَّفَ): پێڵاوی لەپێکرد.
(أَلخُفُّ (ج) أَخْفاف و خِفاف): ١-پێڵاو.
(«خُفَّ ضاحِك»): پێڵاوێکە پێدەکەنێت واتا دراوەو قاچی لێوە هاتۆتەدەرێ ٢-پێ/ قاچ کە دەکەوێتە سەر زەوی.
(- لِلبَعیرِ والنَّعام): سمیحوشترو پێیحوشترمرخ.
(اَلخَفّاف): پێڵاوفرۆش.
٦-(اَلخُفّ): رەقەنە زەوی.
(اَلخَفُّوف) (ح): کەمتیار.
٧-(خَفْخَــفَ- الخِنْزیرُ أَو الضَّبعُ. خَفْخَفَةً): بەرازەکە پرماندی یان کەمتیارەکە مراندی.
(- الرَّجُــلُ قَمیصَهُ الجدیــدَ أَو القِرطاسَ): کراســە تازەکەی یان کاغەزەکەی راوەشـاند ورشەورشی لێوەهات.
(اَلخَفْخاف): مرۆڤی منگن.
خفأ: (خَفَأَ- الشَيءَ. خَفْأً): شتەکەی لە بنەوە هەڵکەندو دایبەزەویدا.
(- البَیتَ): خانووەکەی تێکداو تەختیکرد.
خفــت: ١-(خَفَتَ. خُفاتاً): لەپــڕ دەنگیبڕاو مرد.
(- الصَّوتُ خُفُوتاً): دەنگەکە کپ بوو/ بڕا.
(خافِت و خَفِیت): دەنگ کپبوو.
(خَفَــتَ بِکَلامِــهِ و بِصَوتِهِ خَفتاً): قسـەو دەنگی نزمکردەوەو بە چرپە دوا (- وایلێکرد کە نەبیسترێت‌و شاردیەوە).
(- بِالقِراءَة): بە دەنگینزم خوێندیەوە.
(خافِتَهُ): (بەدەنگینزم/ بە سرپە/ بە چرپە) دواندنی.
(خافَت بِکَلامِهِ): قسەو دەنگەکەی هێواش‌و

نزم كرد.

(- بالقِراءَةِ): بەدەنگینزم خوێندیەوە.

(تَخافَتَ): وایپیشـاندا كە بە هێواشیو نزمی دەدوێت كە وایشنەبوو.

(- بِكَلامِهِ وبِصَوتِهِ): قسـەو دەنگەكەی نزم كردەوە.

(- بالقِراءَة): بە دەنگی نزم خوێندیەوە.

(اَلخُفُوت): ١-كزیی‌و كپیی دەنگ.

٢-(اَلخُفْت) (ن): ئەسپەند/ پێچن. رووەكێكی پزیشـكییە. گوڵێكـی زەردی مەیلەو سـەوز دەگرێت.

(اَلخافِت): هەورێكی وشك‌و بێباران.

(زَرْعٌ خافِت): كشتێكی كورتەباڵا/ كوور.

(اَلخَفْتـان) (فارسـیة): قەفتـان كە جۆرە بەرگێكە.

خفـج: (خَفَجَ- البَعیرُ خَفَجاً): حوشـترەكە تووشی پێلەرزە بوو.

(اَلخَفَج): پێلەرزەی حوشتر.

(الأَخْفَـج): ١-پێكێـر ٢-كەسـێك كـە لاقلەرزەبێت.

(عَمودٌ أَخْفَج) (ب): ستوونێكی گێر/ خوار/ لار.

(اَلخَفیج): ١-رایج/ ناقایم ٢-بێهێز ٣-نەرم.

خفـد: (خَفَدَ وخَفِـدَ. خَفْـداً و خَفَداناً. وخَفَـداً): لـە رۆیشـتندا تكانیدایە خۆی/ پێیهەڵگرت/ خێرا رۆیشت.

(اَلخُفْدُد والخُفْـدُود) (ح): باڵندەیەكە وەك شەمشەمەكوێرەیە.

(اَلخَفیدَد (ج) خَفادِد وخَفادِید) (ح): نێرە وشترمرخ.

خفـر: ١-(خَفَـرَ- ه و بِهِ و عَلَیـهِ خَفْراً و خَفَـراً): پەنایداو پاسـیكرد/ ئێشـكیگرت‌و بەرگریلێكرد دڵنیاییدایە.

(- ه): بـە پـارە پاسـەوانیكرد/ پاراسـتی، ئاگاداریكرد.

(خَفَّرَ- ه): ١-پاراستی‌و دڵنیایكردو ئاسایشیدایە ٢-شووورای بە سووردا/ دەورداكێشا.

(أَخْفَـرَ- ه): پاسـەوانێكی لەگەڵـدا نـارد/ دایەدەست پاسەوانێك ئاگاداریبكات.

(تَخَفَّرَ- بِهِ): ١-پەنایداو پاراستی ٢-پەنای بۆ ئەو برد/ خۆی دایە پەنای ٣-داوایلێكرد ببێتە پاسەوانی‌و بیپارێزێت/ پاسەوانییبكات.

(اَلخُفْرَة): ١-ئێشكگرتن ٢-پەنادان ٣-پاسەوانیی.

(«هُـوَ فِي خُفْـرَةِ اللهِ»): ئـەو لـە پەنـای خودادایە.

(«هذا خُفْرَتي»): ئەمە پاسەوان‌و پەنادەرمە/ ئاگادارمە.

(- اَلخُفْرَة): حەسحەس.

(اَلمَخْفَـر (ج) مَخافِـر): پاسـگەی پۆلیس/ پۆلیسـخانە/ قشـڵەی پۆلیس یان سەرباز بۆ پاراسـتنی ئاسایشـی ناوخـۆ یان پاراسـتنی سنووری وڵات.

(اَلخَفير (ج) خُفَراء):١-حەسحەس/ پاسەوان/ ئێشکگر ٢-پارێزگار ٣-پەنادەر ٤-پەنادراو.
(اَلخَفارَة والخُفارَة والخِفارَة): حەسـحەس-پەنادەریی/ پاسەوانیی/ پارێزگاریی/ ئێشگرتن ٢-دەستەبەریی ٣-کرێی پاسەوانیی/ کرێی حەسحەسیی.
٢-(خَفَرَ- بالعَهْدِ. خَفْراً و خُفُوراً) (ضد):١-بەڵێنی بردە سەر ٢-بەڵێنو پەیمانی شکاندو نەیبردە سەر.
٣-(خَفَـرَ- فُلاناً. خَفْـراً و خُفُوراً) (ضد): پەیمانەکەی فیساری شکاندو نەیبردە سەر ٢-پەیمانەکەی فیساری بردە سەر ٣-ناپاکیی لەگەڵدا کرد.
(أخْفَـرَ-ه):١-پەیمانەکەی لەگەڵدا نەبردە سەرو شکاندی ٢-ناپاکیی لەگەڵدا کرد.
٤-(خَفِـرَ- تِ الجارِيَـةُ. خَفَـراً و خَفارَةً): دۆتەکە یان کەنیزەکەکە زۆر بە شەرمو شکۆ بوو.
(خَفِر و خَفِرَة ومِخْفـار): نافرەتی زۆر بە شەرمو شکۆ/ بە نابروو/ بە حەیا.
(تَخَفَّرَ- تِ الجارِيَةُ): کەنیزەکەکە یان کچەکە زۆر شەرمیکرد.
(خفـس: ١-(خَفَسَ. خَفْسـاً): زۆر قسـەی ناشیرینو پیسیکرد.
(- ه): گاڵتەی پێکرد.
(أخْفَـسَ): قسـەی (بیرعـەتو دزێویکرد/ ناشیرینیکرد).
(شَرابٌ مُخْفِس):مەیەك زووسەرخۆشتبکاتو بتگرێت قسەی ناشیرینت پێبکات.
٢-(خَفَـسَ- الطَّعامَ أو الشَّـرابَ. خَفْسـاً): خواردنێکـی کەمیخـوارد یـان کەمەکێـك خواردنەوەی خواردەوە.
٣-(خَفَسَ- البِنَاءَ. خَفْساً): خانەکەی رماند/ رووخاند/ کاولکرد.
(تَخَفَّسَ- الرَجُلُ): پیاوەکە پاڵکەوت.
٤-(إنْخَفَـسَ- المـاءُ): ئاوەکـە گەراوەتەوە/ گۆراوە/ گەرایەوە.
خفـش: ١-(خَفَشَ- بِهِ. خَفْشـاً): تووریدا/ فرێیدا/ هەڵیدا.
(- البِنَاءَ): خانەکەی کاولکرد/ رووخاند.
(خَفَّـشَ- البِنـاءَ): خانەکـەی/ بیناکـەی رووخاند.
(- الرَجُـلَ): پیاوەکـەی بەزەویـداداو پێشێلیکرد.
٢-(خَفِـشَ. خَفَشـاً):١-کزبـوو/ بێتینبوو ٢-چـاوی کـزی زکماکیبوو ٣-چـاوی بچکۆلە بووەوە/ تەسکبووەوە ٤-بە شەو دەیبینیو بە رۆژ نەیدەبینی/ رۆژ کوێر بوو.
(خَفِشٌ وأخْفَشُ): شـەو بینبوو و رۆژ کوێر بوو.
(خَفَّشَ- البَدَنُ): جەستەکە لاوازو بێتینبوو.
(اَلخُفَّاش (ج) خَفافِيش) (ح): شەمشەمەکوێرە.

٢-(خَفَّشَ- بِالأَرضِ): به زەویەکەوە نووسا/ لەسەر زەوییەکە تەختبوو.

خفض: ١-(خَفَضَ- ـُ خَفْضاً): دابنیشـاند/ داینەواند/ هێنایە خوارەوە.

(- الصَّوتَ): دەنگەکەی نزمکردەوە وایلێکرد نەبیسترێت.

(- الكَلِمَةَ): پاشێوی وشەکەی ژێردار کرد.

(إِنْخَفَـضَ): ١-لە بەرزییەوە هاتە خوارەوە ٢-پایەی نزمبووەوە.

(- الصَّـوتُ): دەنگەکـە کزبـوو/ نزمبـوو/ دابەزی.

(إِنْخَفَضَ- السِّعرُ): نرخەکە داشکا/ دابەزی.

(ألخافِـضُ) (فا):١-هێنـەرە خـوارەوە ٢-لـە نـاوە پیرۆزەکانـی خوداوەندە، بـە واتا ئەوە کـە زۆردارو ملهوورو فیرعەونـەکان دێنێتە خوارێو دەیانفەوتێنێت.

(«هُـوَ خافِضُ الطيرِ و خافِـضُ الجَناحِ»): سەنگین/ مەند/ بێدەنگە.

٢-(خَفَضَ- الرَّجُلُ. خَفْضاً): پیاوەکە مرد.

٣-(خَفَـضَ- الصَّـوتُ): دەنگەکـە نـەرمو ئاسکبوو.

(- تِ الإبِلُ): حوشـترەکە نەرمو لەسەرخۆ/ هێواش رۆیشت.

(- بِالمَكانِ): لە شوێنەکەدا نیشتەجێبوو.

(خَفُـضَ العَيْشُ. خَفْضاً): ژیانەکە ئاسـانو خۆشبوو.

(خَفِيـضٌ و خَفْضٌ و خافِضٌ و مَخْفُوضٌ): ژیانی ئاسانو خۆش/ تێرو تەسەلو نەرم.

(خَفَّضَ- الشيءَ):١-شتەکەی نەرمو ئاسانکرد ٢-سووککرد.

(«خَفِّـضْ عَنكَ»): ئارام بــە دڵیخۆت بدەو هێندە گوێیمەدەرێ.

(تَخَفَّـضَ- الأَمْـرُ): کارەکـە ئاســانبوو/ سووکبوو.

(ألخَفْضُ والخَفيضَةُ) ئاسانیو خۆشیگوزەرانو تێروتەسەلییو نەرمیی.

(«هو في خَفضٍ مِنَ العَيـشِ»): لە ژیانێکی ئاسانو خۆشو تێروتەسەلدایە.

الملحق:

خفض: (التَّخفيضُ): ١-داشـکاندن ٢-لێبڕین ٣-سووککردن.

(تَخفيضُ الأَسـعارِ): نرخ داشـکاندن/ نرخ (هێنانە خوارەوە/ دابەزاندن).

(تَخفيـضُ الأُجـورِ): کـرێ کەمکردنەوە/ هێنانە خوارەوە.

(تَخفيـضُ الحَـرارَةَ): گەرماشـکان/ هاتنە خوارەوەی گەرما.

(التَخفيضُ): سووککردن.

(تَخفيـضُ الأَعبـاءِ): ئـەرك (کەمکـردن/ سووککردن) باریشان سووککردن.

---

خفع: ١-(خَفَعَ. خَفْعاً): لە برسـاندا یان لە بەرشتێکیتر سەری گێژیخواردو کەوت.

(- هُ بالسَّيفَ): بە شمشێر لێیدا.

(أَخْفَـعَ- هُ الجـوعُ): برسـێتی (خسـتی/ دایبەزەویدا).

(إنْخَفَـعَ): چـاوی ڕەشـكەو پێشـكەیكردو خەریكبوو (ببوورێتەوە/ بكەوێت).

٢-(خَفَعَ- السِتْرُ. خَفْعاً و خَفَعاناً): پەردەكە جوولایەوە.

خفق: ١-(خَفَقَ- هُ بِالسَّيفِ. خَفْقاً): نەرم بە شمشێرەكە لێیدا.

(أَخْفَقَ- ه): دایبەزەویدا.

(أَلخِفقَـةُ): شـتێك كـە پێیلێبدرێـت وەك قایش.

(أَلمِخْفَق): شمشێری پان.

(أَلمِخْفَقَةُ): قامچی كە پێی لێدەدرێت دەیشلێن قامچی دارین.

٢-(خَفَقَ- تِ النَّعـلُ): پێلاوەكە جیڕەیهات/ دەنگی لێوەهات.

(خَفَّاقُ القَدَم): كەسێكە سنگی پێی پانبێت.

٣-(خَفَقَ- الفُؤادُ أَو الرايَةُ أَو البَرقُ أَو الريحُ): دڵەكـە كەوتـە ترپەترپ. ئاڵاكە شـەكایەوە بروسكەكە شەوقیدایەوە چەخماخەیدا. باكە هەڵیكردو گێژیدا.

(- الطّائِرُ خُفُوقاً): باڵندەكە باڵی بەیەكداداو فڕی.

(أَخْفَقَ): پەشۆكا/ شپرزەبوو/ شڵەژا.

(- الطائِرُ): پەلەوەرەكە باڵی بەیەكدادا.

(- بِرَأْسِـهِ): بە دەم وەنەوزەكوتێوە سـەری جووڵاند.

(- بِثَوبِـهِ): ئامـاژەی بـە بەرگەكەیكـرد/ ڕایوەشاند.

(إخْتَفَـقَ العَلَـمُ أَو السَّـراب): بەیداخەكە شەكایەوە یان تراویلكەكە شەپۆلیدا.

(أَلخَفـق والخَفِقَـة والخُفَـق والخُفَقَة (ج) خِفـاق وخَفِقـات وخُفَقـات): چارەوێـی كەمەرباریـك (ئـەو «ت»ێیـەی (خَفِقَـة وخُفقَة): بۆ زیادەوەییە.

(أَلخَفْقَة): جارێك دڵەكوتێ. یان شـەكانەوە یان باڵبەیەكدادان یان شەپۆلدانی تراویكە.

(أَلخافِـق (فـا): شـەكاوە/ ترپەترپكـەر- لەرەلەركەر.

(أَلخافِقان): خۆرهەڵاتو خۆرئاوا.

(أَلخَفَّاق): زۆر شەكاوە- زۆر ترپەترپكەر- زۆر شەپۆلدەر.

(أَلخوافِـق والخافِقـات): (كـۆی وشـەی (خافقة)یە: بەیداخەكان.

(خَوافِقُ السَّـماءِ): هەڵگەی كـۆی چوارباكە- چوارلا.

(أَلخَيفَق): ١-بیابانی وشكی بەرفراوان كە تیایدا تراویلكە شـەپۆلدەدات ٢-حوشـترو چارەوێی زۆر خێرا (لە تیژیی باوە وەرگیراوە).

(أَلمَخْفَق): تەختە زەوی كـە تراویلكە تیایدا شەپۆلدەدات.

(اَلمَخْفوق) (مفع): شێت.
٤-(خَفَقَ- النَّجمُ): ئەستێرەکە ئاوا بوو.
(- اللَّيلُ): شەوگار زۆری ڕۆیشت.
(- الرَجُـلُ فِي البِـلادِ): پیاوەکـە بە وڵاتدا ڕۆیشتو گەڕا.
(أخفَقَ- النَّجمُ): ئەستێرەکە ئاوابوو.
(رَجُـلٌ خافِـقُ العَـينِ): پیاوێکـە چاو بە قوڵداچووی چاونیشتوو.
(مَخافِقُ النَجم): شوێنی ئاوابوونی ئەستێرە/ ئەستێرەئاو/ گا.
٥-(خَفَـقَ- المَـكانُ. خُفُوقـاً): شـوێنەکە چۆڵبوو.
(أخفَقَ- القَومُ): خوێشگەل خواردنیان لێبڕا.
(مَكانٌ خافِق): شوێنێکی چۆڵەوانی کە کەسی تێدا نەبێت.
٦-(أخفَقَ): ١-سـەرنەکەوت ٢-پێداویستیەکی ویست دەستینەکەوت/ تێکشکا ٣-کەوت.
٧-((ألخَفيفَق): زۆرزان یان وەی.
خفن: (ألخَفَن): شلبوونو کشانی سك.
(ألخَيفان) (ح): کوللە.
(خَيفانَة) (ح): کوللەیەك.
(ألخُفَّـان) (عاميـة) فصيحهـا (الرَّخْفَة): بەردێکی سووکی نەرمە وەك کاشییە.
خفـا: (خَفا- البَـرْقُ. خَفْـواً و خُفُـوّاً): بروسکەکە شەوقیدایەوە/ چەخماخەیدا.
(- الشيءُ): شتەکە دەرکەوت.

خفى: ١-(خَفى- الشَـيءَ. خَفيـاً و خُفِيّاً) (ضد): ١-شـتەکەی ونکرد/ شـاردەوە/ پۆشی ٢-شتەکەی ئاشکرا کرد/ دەرخست.
(خَفِيَ. خَفاءً و خُفْيَةً و خِفْيَةً): دەرنەکەوت/ شاردرایەوە/ ونبوو.
(خافٍ و خَفِيّ): شـاردراوە/ نهێنی/ پەنهان/ پۆشراو/ ونبوو/ نادیار/ دەرنەکەوتوو.
(خَفِيَ و خَفَّى- الشـيءَ): شتەکەی داپۆشی/ شاردیەوە/ نهێنپۆشیکرد.
(أَخْفى- الرَجُلُ): خۆیشاردەوە/ خۆی ونکرد/ دیارنەما.
(- الشَـيءَ): شـتەکەی شـاردەوە/ پۆشـی/ ونیکرد.
(«أَخْفِ عَنا»): نهێنپۆشمانبە/ بمانشارەوە.
(تَخَفَّى واسـتَخفى): شـاردرایەوە (ونبوو/ دیارنەما).
(إخْتَفى- مِن فُلان): خۆی لە فیسار (ونکرد/ شاردەوە).
(ألخَفاء) (مص): شاردراوە/ پەنهانی/ نهێنی/ نادیار/ دەرنەکەوتوو.
(«بَرِحَ الخَفاءُ»): شاردراوەکە دەرکەوت/ کارە نهێنیەکە ئاشکرابوو.
(ألخَفاء (ج) أخفِيَة): ١-سـەرقاپ/ ڕووپۆش ٢-بەرگێکە لەبەردەکرێتو جلەکانی ژێرەوەی دەشارێتەوە/ سەربەرگ/ عەبا ٣-شتی نهێنیو شاردراوە.

